ناوی کتێب: جوگرافیای کوردستان

- نووسەر: عەبدوڵڵا غەفور
- ئاپێک (APEC)
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: سەیوان
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- ژمارەی سپاردن: ١٥٠
- تیراژ: ٢٠٠٠
- نرخ: ٥٠٠٠
- چاپ: چاپی چوارەم ٢٠٠٥
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب -٣٩ - (١٤٢)

ناونیشان
دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی
هەولێر - پشت رۆژنامەی خەبات
پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@maktoob.com
ژمارەی تەلەفۆن: ٢٢٦٠٣١١
www.mukiryani.com

**ئەم بەرهەمە پێشکەش بێ بە:**

**- یادی دایکی ئازیزم "سـەنیـە" کـە لە ١٦-١١-١٩٥٨ دا مـاڵاوایی لێ کردین.**

**- گەلاوێژی خوشکم.**

## پێڕست

## پێشەکی

لە ڕاستیدا، دەربارەی جوگرافیای کوردستان، گەلێ شت نووسراووە، بەڵام بەشی هەرە زۆری، لە چوارچێوەی ئەو باسانەدا دەخولێتەوە، کە لەسەر جوگرافیای تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا ئەوەندەکەی دیکەش دەربارەی هێندێ نێوچە لە کوردستاندا نووسراون. واتا هەتاکوو ئێستا جوگرافیزانان، بابەتێکی تایبەتیی جوگرافیی سەربەخۆیان، لەسەر کوردستان وەکوو یەک وڵات و یەک خاک نەنووسیووە. بۆیە دەتوانم بڵێم، لەم ڕووەوە ئەم پەرتووکە، لەوانەیە یەکەم هەنگاو بێ.

هەر نووسەرێ بیەوێ، لەسەر هەر بابەتێکی دیاریکراوی جوگرافیی بنووسێ، لە هەر وڵاتێکدا بێ، یاخود لە هەر هەرێمێکی دیاریکراودا بێ، گیروگرفتی تایبەتیی لەبەر دەمدا قووت دەبێتەوە و تووشی چەندین تەنگوچەڵەمە دەبێ، بە تایبەتیی ئەگەر وڵاتێک، وەکوو کوردستان داگیر و دابەشکراو بێ، ئەوا گیروگرفتەکان چەندین جار زیاد دەکەن. تاکوو ئەوڕۆ، کوردستان وەکوو وڵاتێ، سنوورێکی دەسنیشانکراو و چەسپاو و دانپێدانراوی نییە. لە ئەنجامدا، چەندین دید و بۆچوونی جیاواز پەیدا دەبێت. نووسەری ئەم پەرتووکە لەسەر جوگرافیای ئەو وڵاتەی نووسیووە، کە بە بڕوای خۆی، بە خاکی کوردستانی دادەنێ.

سەرچاوە ڕەسەنەکانی جوگرافیای کوردستان، هەموویان بە زمانەکانی تورکی، فارسی و عەرەبی نووسراون. بۆ ئەوەی سوود لەم سەرچاوانە وەربگیرێت باش بوو گەر نووسەر شارەزاییەکی تەواوی لەو سێ زمانەدا هەبێت. نووسەری ئەم پەرتووکە، جگە لە زمانی تورکیی، کە ئاشنایەتییەکی کەمی لەتەکدا هەیە، هەردوو زماناکەی دیکە تاڕادەیەک دەزانێت. لە کاتی بەکارهێنانی سەرچاوە تورکییەکانیشدا، پەنای بۆ بەر وەرگێڕاوە ڕووسییەکانیان بردووە.

کۆکردنەوە و وەرگرتنی کەرەسەی ئاماریی لە سەرچاوە ڕەسەنەکانیانەوە، جگە لەوەی کاتێکی زۆری هەر نووسەرێ دەگرێ، لە هەمان کاتیشدا خۆی لە خۆیدا، بە کارێکی ورد و گرنگ دادەنرێ و بە گیروگرفتێکی مەزن لە قەڵەم دەدرێ. بۆ نموونە، ئەگەر لێکۆڵەر بیەوێ، لەسەر کۆی دیاردەیەکی جوگرافیی کوردستان بنووسێ، وەکوو ژمارەی گشتیی دانیشتووان، بەرهەمی ساڵانەی بەروبوومێکی کشتوکاڵیی دیاریکراو، بەرهەمی ساڵانەی نەوت، بەرهەمی ساڵانەی یەکێ لە پیشەسازییە جۆراوجۆرەکان ... هتد، ئەوا لەو کاتانەدا، دەبێ نووسەر زانیاری لەسەر (٣٠) سی پارێزگای کوردستان، کۆ بکاتەوە و شییان

بکاتەوە. پارێزگای واش هەیە، هەموو قەزایەکانی ناکەونە نێو خاکی کوردستانەوە، یان بە پێچەوانەوە، تا ژمارەی ئەو یەکەئیداریانەش، لەگەڵ ژمارەی سەرجەمی پارێزگاکاندا کۆ بکاتەوە، یاخود لێی دەربکا. ئەم کارەش هەرگیز بۆ کەس سەرناگرێ، لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە ئامارە پێویستانە، لە لایەن دەزگاکانی دەوڵەت، وەکوو پێویست بڵاو ناکرێنەوە و دەست ناکەون.

تاکوو ئێستا لە کوردستاندا، ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردیمان نییە. هەندێ دەنگ لە ناوە جوگرافییەکاندا هەن، ئەگەر بە پیتی لاتینی نووسرابن، ئەوا بە پیتی عەرەبی نانووسرێنەوە، بە پێچەوانەشەوە هەر ڕاستە، چونکە جاری وا هەیە، ناوی جێگایەک یاخود کەسێک، بە زیاتر لە ڕێنووسێک نووسراوە. بۆ نموونە، بدلیس، بەدلیس، بیتلیس. سلیمانی، سلەیمانی، سولەیمانی، سولێمانی، سلێمانی. ئادیەمان، ئادیەمان... تاد. لێرەدا نووسەر زۆر هەوڵی داوە، کە یەک ڕێنووسی یەکگرتوو، بۆ نووسینەوەی هەموو ناوەکان پەیڕەو بکات.

بۆ هەندێ سەرچاوە و کەرەسەی ئاماریی جوگرافی، لەسەر دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا، جاری وا بووە، هەتاکوو دەست کەوتووە، پێنج ساڵی خایاندووە، کە ئەوانەش هەندێ جار ناتەواو بوون.

هەموو ئەم زانیاریانەی لە دوو توێی ئەم پەرتوکەدا جێیان بۆتەوە و لەبەر دەستتان دان، لە سێ دەستە سەرچاوەوە وەرگیراون و شی کراونەتەوە و پاشان بەکار هێنراون. بۆ پڕکردنەوەی هەموو ئەو کەموکوڕیانەی لە سەرچاوەکاندا هەبوون، پەنامان بۆ بەر کاری مەیدانی و پرسیارکردن لە خەڵکی نێوچە جیاوازەکانی کوردستان کردووە. سەرچاوەکانیش ئەمانەن :

١/ دەزگا ئامارییەکانی دەوڵەت تورکیا، ئێران، عێراق و سووریا، لەسەر لایەنە جۆراوجۆرەکانی وڵات زانیاری هەمەچەشنە بڵاو دەکەنەوە. ئەوانەی زیاتر بۆ نووسینی ئەم بابەتە کەڵکیان هەبووە، وەکوو سەرژمێری گشتیی دانیشتووان، سەرژمێرە کشتوکاڵییەکان، سەرژمێرە پیشەسازییەکان، هەروەها ساڵنامەی ئاماریی، لێرەدا جێمان کردونەتەوە. بەڵام ژمارەکانمان بەبێ چەند و چوون و گومان وەرنەگرتووە، لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە زانیارییانە، بە شێوەیەکی گشتیی لەو وڵاتانەدا، ئەو کەرەسانەی پەیوەندیشیان بە کوردستانەوە هەیە بە تایبەتی، کەموکوڕییان زۆر تێدایە. بۆیە ژمارەکانی

نێو ئەم پەرتووکە، وێنەیەکی تەواویی ڕاستەقینەی ئاماری کوردستان نادەن بە دەستەوە، بەڵام چار نییە و هەرچی چۆنێ بێ، لەمە باشتر نییە و بەم زوانەش لەمە باشتر نابێت.

٢/ بەپێی پێویست و بۆ نووسینی ئەم پەرتووکە، کەڵک لە نووسینی نووسەران و شارەزایان وەرگیراوە، بە تایبەتی ئەوانەی نووسینەکانیان پەیوەندیی بە جوگرافیا و مێژوو و باری ئابووریی و ئایینی کوردستان و تورکیا و ئێران و عێراق و سووریاوە هەیە. هەندێ لەو سەرچاوانە، بۆ نووسینی هەندێ پەرەگرافی باسەکان، زۆر بە فراوانی بەکار هێنراون، ئەمەش زیاتر لەبەر ئەوە بووە، کە سەرچاوەی دیکە لەسەر ئەو بابەتە نەبووە، یا هەبووە و دەست نووسەر نەکەوتووە.

٣/ بڵاوکراوەی دەزگا نێونەتەوەییەکان، لە پێش هەموویانەوە، ئەو کەرەسانەی لە لایەن بەشی دانیشتووان، لەسەر دانیشتووانی جیهان بڵاو کراونەتەوە، سوودیان لێ وەرگیراوە. لێرەدا پێویستە بەو بۆنەیەوە بڵێین، ئەو فۆرمولەیەی بۆ دەرهێنانی ژمارەی دانیشتووانی کوردستان، لەم سەدەیەدا بەکار هێنراوە، سەر بەم دەزگایەیە.

هەرچەندە ئەم پەرتووکە لە هەندێ جێگادا، لە لایەکەوە زیاتر پێویستیی بە ڕوونکردنەوە و لەسەرنووسین هەیە، لە لایەکی دیکەشەوە، پێویستیی بە بەکارهێنانی هەندێ زاراوەی جوگرافیی گونجاوتر هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بەو شێوەیەی کە هەیە و لەبەر دەستتان دایە، ئەز لەو بڕوایەدام، ئەو کەلێنە گەورەیە لە نامەخانەی کوردیی و جوگرافیای کوردستادا پڕ دەکاتەوە، کە تاکوو ئەوڕۆ بە بۆشی مابۆوە. بە دڵنیاییشەوە دەیڵێم، هەتاکوو ئەم پەرتووکە چاپ نەکرێ و بڵاو نەکرێتەوە و پێشکەش بە خوێندەواران نەکرێ، نە لەمە باشتر دەنووسرێ و نە هەنگاوی دووەمیش لەم بوارەدا دەهاوێژرێ،

لە کۆتاییدا، پڕ بە دڵ سوپاسی بێئەندازەم، پێشکەش بە دوکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز دەکەم، کە بە چەند سەرنجێکی تایبەتیی خۆی، باسەکەی دەوڵەمەندتر کرد و بە زمانی نووسینەکەدا چووەوە و لە داڕشتنەوەی بابەتەکەدا، دەستی یارمەتیی بۆ درێژ کردم، هیوادارم وێنەی زۆر بێ و هەر سەرکەوتووبێت.

عەبدوڵڵا غەفور

١٩٩٦/٦/٤

Nynäshamn, Sweden

## بەشی یەکەم: شوێنگەی جوگرافی

کوردستان دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای کیشوەری ئاسیاوە. سنوورەکەی لە باکوورەوە، لەگەڵ ئازەربایجان و ئەرمینیا و تورکیا دایە. لە باشوورەوە، ئێران و کەنداوی (فارسی – عەرەبی). لە ڕۆژهەڵاتەوە، ئێرانە. لە ڕۆژئاواشەوە، عێراق و سووریایە. تەماشای نەخشەی ژمارە (١) بکە.

### ١. شوێنگەی فەلەکی و ڕێژەیی

#### شوێنگەی فەلەکی

واتا شوێنگەی وولات بەگوێرەی تۆڕی هێڵەکانی درێژیی و پانی. کوردستان لە نێوان هێڵی پانی ٤٠,٣٩ ی باکوور و ٣٠,٦١ ی باکوور، (واتا ٩,٧٨ هێڵ) و لە نێوان هێڵی درێژی٥٢,٦١ ی ڕۆژهەڵات و ٣٦,٠٠ ڕۆژهەڵاتدا (١٦,٦١ هێڵ) ڕاکشاوە. درێژایی خاکی کوردستان لە باکوورەوە تاکوو باشوور، نزیکەی ١٣٠٠ کیلۆمەترە.. پانایییەکەشی لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، خۆی لە ٥٥٠ کم دەدات. ئەو پانایییە لە هەموو لایەکەوە، وەکوو یەک نییە. لە لای باکوورەوە، پانایییەکەی دەگاتە ٥٧٨ کم و لە ناوەڕاستدا کەم دەبێتەوە، تا دەگاتە ٢٣٢ کم. هەتا بەرەو باشووریش بڕۆین، ئەو پانایییە تەسکتر دەبێتەوە. لە بەشی کۆتایی باشووردا، لە ١١٢ کم زیاتر نابێ.

لە شوێنگەی فەلەکی کوردستاندا بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەم وولاتە کەوتۆتە بەشی باشووری نێوچەی سازگاری باکوورەوە، واتا شوێنی کوردستان لە نێوان ئاووهەوای بیابانی گەرم و زەریای ناوەڕاست دایە.

#### شوێنگەی ڕێژەیی

ئەم شوێنگەیە، لە ئەنجامی گۆڕینی بارودۆخی مرۆیی و ئابووری و مێژوویی‌دا، بە بەردەوامی لە گۆڕان دایە. لە کاتی شیکردنەوەی ئەم خاڵانەی خوارەوەدا، بایەخی شوێنگەی ڕێژەیی کوردستانمان بە تەواویی بۆ ڕوون دەنێتەوە.

#### شوێنگەی ئاویی

لە دەوروپشتی خاکی کوردستاندا، زەریای خەزەر و ڕەش و ناوەڕاست و سوور و

## نەخـشـەی ژمـارە (١)



کـەنداوی عـەرەبی و کـەنداوی  ئەسکەندەرون هەن. لەمـانە تەنیـا زەریای ناوەڕاست و کەنداوی عـەرەبی نەبێ، ئەگینا ئەوانی دیکە هەموویان، لە کارتێکردنی ئاووهەوای بترازێ، کارێکی ئەوتۆ لە شوێنگەی ڕێژەیی کوردستان ناکەن.

کەنداوی عـەرەبی لە بـاشـوورەوە و ئەسکەندەرون لە باکووری ڕۆژئـاواوە، بایەخـیـان بۆ کـوردسـتـان گـەلێک زۆرە. لـەو ڕێگایانەوە دەتوانرێ، بـە ئاسـانی پـەیوەندی هـاتوچۆ لەگـەڵ وولاتەکـانی ڕۆژهـەلاتی ناوەند و جـیـهـاندا ببـەسـرێت. هـەرەکـوو دەزانین، هـاتوچۆکـردن بە ڕێگای ئاویدا و هێنان و بردنـی شتـومەک، لەچاو ڕێگاکانی دیکەی زەمـینیی و ئاسـمانیدا، زۆر هـەرزانتر دەکەوێ.

**شوێنگەی ئاسمانی**

ئاسـمـانی کـوردسـتـان بۆی هـەیـە، لە نێـوان ئـەوروپای ڕۆژئاوا و باشـووری ڕۆژهـەلاتی ئاسـیـادا، ببێ بە ڕێگەیەکی گرنگی هـاتوچۆی ئاسـمـانی . بەلام بە داخـەوە، لەبەر ئەوەی فـڕۆکەخـانەیەکی نێـونەتەوەیی لەسـەر خـاکی کوردسـتـان دروست نەکراوە، ئەم کارە تاکوو ئەوڕۆ بـە ئەنجـام نەگـەیەنـدراوە و سـوودی لـێ وەرنەگـیـراوە. لە هەمـان کـاتیـشـدا، فـڕۆکەخـانەکانی تورکیـا و ئـێران و عێراق و سووریا، لـەو جـۆرە فـڕۆکەخـانانـە نین، کە هـاتوچۆیان زۆر لەسـەر بێت. هەرەوها کۆمـپانییە ئاسمانییـەکانی ئەوڕۆ، ئەوەندەی ژمارەی سـواربووەکان و پۆسـتـە و بارگواسـتنەوە و ئاسـانکردنی کاری کۆمـپـانیـاکان لەبەر چاو دەگرن، لە لایەن ئەو دەوڵەتانـەوە کـە فـڕۆکەکانیـان لەسـەر خـاکەکانیـان لێ دەنیشـێـتـەوە، ئەوەندە دوور و نزیکی لەبەر چاو ناگرن.

**شوێنگەی زەمینی**

خاکی کوردستـان بەشێک لەو خاکە پێک دەهێنێ، کە ڕێگەی زەمـینی نێوان وولاتەکانی ئەوروپا لە لایـەکـەوە و دەوڵەتەکانی بـاشـووری ڕۆژهـەلاتی ئاسـیـا لە لایەکی دیکەوە، پێـیدا تێـپـەڕ دەبێ. ئەم خـەسـڵـەتە تایبـەتیـیـە، توانای سـوود لێ وەرگـرتنی زیاتر دەبوو، ئەگـەر بهـاتـایە جـادەی پانوبـەرین و قـیـرتـاوی هـەبووایە و باری ڕامـیـاری هێـمن بـووایە. هـەرووەها لەسـەر ڕێگاوبانەکاندا، کـاری خـزمـەتگوزاری بـە شێـوەیەکی باش بەڕێوە بڕۆشـتـایە. بەلام کوردسـتـان ئەوڕۆکە، لە هـەموو ئەو شتـانە بێبەشـە، بـۆیە هـەڵکەوتی ڕێگای زەمینیش، ڕۆڵی گەورە لە ژیانی دانیشتووانی ئەم وولاتەدا نابینێ..

## ٢ . كارتێکردنی شوێنگەی ڕێژەیی لە ژیانی ئابووری، کۆمەڵایەتی و ڕامیاریدا

کارتێکردنی شوێنگەی ڕێژەیی، کە لەسەرەوە بە کورتی باسمان کرد، لەسەر ژیانی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و ڕامیاریی، خەڵکی کوردستان زۆر گەورەیە. دەتوانین بڵێین، ئەم وڵاتە لەم قۆناغەی ئەوڕۆیدا، بە بەرهەمی ئەو سێ فاکتەرە گرنگە دادەنرێت، کە لە خوارەوە باسیان دەکەین.

### ژیانی ئابووری

ڕۆڵی شوێنگەی فەلەکی کوردستان، لە ژیانی ئابووریدا، بە تایبەتی لەسەر کەرتی کشتوکاڵ گەلێ گەورەیە. هەروەکوو لە پێشدا بۆمان دەرکەوت، ئەم وڵاتە دەکەوێتە باشووری نێوچەی سازگاری باکوور ئەو نێوچەیەوە، کە زۆربەی بارانەکەی لە کەژی زستاندا دەبارێ و هاوینیشی جگە لە پانتاییەکی زۆر کەم، بارانی لێ نابارێ و وشکە. ئەم سیستەمی بارانبارینە لە کوردستاندا کارێکی کردووە، کە زۆربەی کشتوکاڵەکان لە زستاندا بکرێ و لەسەر باران ڕابوەستێ. وەکوو دەزانین، ئەو نێوچانەی لە کشتوکاڵدا تەنیا پشت بە ئاوی باران دەبەستن، بەرهەمی ساڵانەی کشتوکاڵیان، بە شێوەیەکی توند بە چەندایەتی ئەو بارانەوە بەستراوەتەوە، کە لە کەژی زستاندا دەبارێ. ئەو ساڵانەی کە باران زۆر ببارێ و لە کاتی پێویستی خۆیدا ببارێ، ئەوا داهاتێکی باش بە دەست دەهێندرێ و ژیانی هەموو لایەکیشی پێ دەگەشێتەوە. بە پێچەوانەشەوە ئەو ساڵانەی کە باران کەم بێ، یا لە کاتی پێویستی خۆیدا نەبارێ و پەڵە نەدات، بەروبوومی کشتوکاڵ کەم دەبێ و ژیانی خەڵکیش دەکەوێتە تەنگوچەڵەمەوە.

ژیانی ئابووریی دانیشتووانی کوردستان، بە تایبەتی لە نێوچە شاخاوییەکاندا، بە بەراوردکردن لەگەڵ ئێستادا، گەلێک باشتر دەبێت، ئەگەر بێتو لە پاشەڕۆژدا، ئەو نێوچانە وەک هاوینەهەوار بەکار بهێنرێ و گرنگی بە جوولانەوەی گەشتگوزاری بدرێ و هەموو جۆرە پێویستییەکانی بزووتنەوەی توریزم دابین بکرێ. بەڵام ئەوڕۆ لەبەر باری نالەباری ڕامیاریی کوردستان، نەوەک بە هیچ شێوەیە جوولانەوەی توریزمی تێدا نییە، بەڵکوو دانیشتووانی ئەو نێوچانە خۆشیان، ناتوانن تێیدا بژین و بمێننەوە.

### ژیانی کۆمەڵایەتی

هەر لە کۆنەوە، کوردستان سەرەڕێ و جێگەی پێکگەیشتن و شوێنی ژیانی، هەموو ئەو شەپۆلە مرۆییانە بووە، کە لە نێوچە جیاجیاکانی ئاسیا، یاخود لە نیمچە دوورگەی

عـەرەبی، یاخـود لە وولاّتـەکـانی ئەوروپاوە تێپـەڕیوون و هاتوون و هەندێکیـشـیـان لێ نیشتـەجێ بوون. واتا هەندێکیـان تەنیا پێیدا تێپەڕیوون، هەندێکی دیکەیان بۆ ماوەیەک تێیدا ژیاون و فەرمانڕەواییان تێدا کردووە، لە دواییدا دەسەلاّتی فەرمانڕەواییان لە دەست دەرچووە و کۆمەڵێکی دیکە دەستی بەسەر دامودەزگاکانی دەوڵەتدا گرتووە. ئەم خەسڵەتی هاتنە بە بەردەوامی بۆ کوردستان، بۆتە هۆی ئەوەی، چەند نەتەوەی جیاواز بە ڕەچەڵەک و زمان و مێژووی نەتەوەیی و دابونەریتی تایبـەتی، لە کوردسـتاندا پەیدا بێن و بە تەواویی جێگیر بێن، کە هەتاکوو ئەوڕۆش هەندێکیان، تایبەتمەندێتی نەتەوەیی خۆیان پاراستووە و هەر ماون، بە تایبەتی لە نێوچە شاخاوییەکاندا.

**ژیانی ڕامیاری**

شوێنگەی جوگرافی کارێکی یەکجا زۆر گرنگ، لە ژیانی ڕامیاری کوردستان دەکات، بۆیە دەتوانین بڵـێین، مـێـژووی ئەم وولاّتە، بە بەرهـەمی ئەم فـاکـتـەرە دادەنرێ. ئەو بارە نالەبارەی بەسـەر ئەم خـاکـەدا هـاتووە، بۆ هـەڵکەوتی وولاّتەکـە دەگـەڕێتـەوە، کـە لە #نێـوچەیەکی تخـوبی ‹تامـپـۆنی› دیارنـەبووی نێـوان دەوڵەتی تورکـیـا و ئێـران پێک هاتووە"(١٩،ل١٥٤).

کـوردسـتـان لە سـەدەی شـازدەیەمـەوە، هـەتا جـەنگی یەکـەمی جـیـهـانی، گـۆڕەپانی پێکدادانی هێـزەکانی هەردوو ئیـمـپـراتـۆرییـەتی سـەفـەوی (ئێـران) و عـوسـمـانی بووە. گەورەترین جـەنگێ لە نێوان ئەو دوو دەوڵـەتەدا ڕووی دابێ، جەنگی (چاڵدێران)ی ساڵی ١٥١٤ی زایینی بوو، ئەنجامـەکەشی ئەوە بوو، #یەکێتی جوگرافی خاکی کوردستان، بە تەواویی تێک چوو" بەشی ڕۆژهـەلاّتی کـەوتە بندەسـتی سـەفـەوییـەکـان و بەشـەکـەی ڕۆژئاواشی کـەوتە ژێر دەسـەلاّتی عـوسـمـانییـەکـانەوە. پاشـتـریش ئەم بەشـە، دوای کۆتاییهاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی و ڕوخاندنی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، جارێکی دیکە دابەش کرایەوە. بـەشێ هەرە گەورەی بەر تورکیای تازە کەوت و بەشێکی دیکەشی خرایە سـەر سووریا. ئەوەی کـە مـاشـەوە (ولایەتی مـوسڵ)، لەگـەڵ ولایەتەکانی بـەغدا و بەسرەدا، دەوڵەتی عێراقی ئەوڕۆیان لێ دروست کرد.

## بەشی دووەم: ستركتوری جیۆلۆجی

### ١. جوڵانەوەی تکتۆنی

کوردستان لە چەرخی یەکەمی جیۆلۆجیدا، بەشێک بوو لە کیشوەری گۆندوانالاند، کە لە کوردستان و ئێران و عێراق و نیمچە دوورگەی عەرەبی و ئەرمینیا و باکووری هیندستان و نیوەی باکووری کیشوەری ئەفەریقا و هەروەها نیوەی باکووری کیشوەری ئەمەریکای باشوور پێک هاتبوو.

لای باشووری ڕۆژئاوای کوردستان، لە چەرخی یەکەمدا، لەچاو بەشەکانی دیکەدا کەمێک نزمتر بوو. لە باشووری ڕۆژئاواشدا، تەپۆڵکەی نیمچە دوورگەی عەرەبی هەڵ کەوتبوو. لەو کاتەوە ئاوی زەریای تیس زیادی کردووە، هەموو کوردستانی لەگەڵ خۆیدا ڕامالیوە، هەروەها زۆربەی نێوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەشێک لە باشووری ئەوروپا و باکووری ئەفەریقاش، هەموو لە ئاوی زەریای تیسدا نقوم بوون.

زەریای تیس بە درێژایی سەدەی دووەم و سێیەم (جۆراسی، تیریاسی و کریتاسی) و لە سەرەتای چەرخی سێیەمدا (ئیاسۆن)، هەموو باشووری ڕۆژئاوای ئاسیا بە کوردستانیشەوە، خستبووە ژێر ئاوەوە. لەو ماوەیەدا گەلێ مەتیریای جۆراوجۆر لەسەر ئەو پارچە زەمینە نیشت، کە زۆربەی زۆریان لە لم و زیخ و بەردی (تەفەل) پێک هاتبوو، دیارە ئەم مەتیریایانەش، لە بەرزاییەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە، بە هۆی شەپۆل و جوڵانەوەی ئاوەکەوە دەهاتن و لە بنی زەریاکەدا دەنیشتن.

ئاوی زەریای تیس، لە سەرەتای سەدەی ئۆلوگسیندا، لەبەر بەرزبوونەوەی زەوییەکەی بن ئاوەکە و پەیدابوونی چەند چینێکی نیشتوو، بەرەبەرە کەم دەبووەوە، هەتا وای لێ هاتووە، لە زەریایەکی گەورەی فراوانەوە، بووە بە زەریایەکی تەسکی نێوخۆ.

گرنگترین ئەو مەتیریایانەی لە سەردەمی مێوسیندا، لە زەریای تیسدا نیشتوون، بریتی بوو لە لم، کێچ و ئەنهەندایت ... هتد لە کۆتایی ئەو سەدەیەشدا، مەتیریا نیشووەکان زیاتر لم و قوڕ بوون.

## ٢ ـ پێکهاتەی جیۆلۆجی

لێکۆڵینەوەی جیـــۆلۆجی لە کـوردســتـاندا، بۆ دوا ســاڵەکـانی چەرخی نۆزدەیەم دەگەڕێتەوە. زۆربەی زۆری ئەو لێکۆڵینەوانە، لە لایەن کۆمپانیاکانی نەوتی ئەوروپاوە، بە تایبەتی ئینگلیزیی و ئەڵەمانیی و فەرەنسیی و ئەمەریکیی و رووسییەوە بە ئەنجام گەیەندراوە. لە دوای ئەمانیش، کۆمپانیاکانی تورکیی و ئێرانیی و عێراقیی و سووری دێ. لە ئەنجامی هەمـوو ئەو کـارانەی کـە کۆمـپـانیـا جـۆراوجـۆرەکـان پێی هـەسـتـاون، ئەورۆ زانیارییەکی زۆر دەربارەی پێکهاتەی جیۆلۆجی لەبەر دەست دایە. بەڵام زۆر لەو کارانە، هەتاکوو ئەورۆ بڵاو نەکراونەتەوە،

لەبەر رۆشنایی ئەو زانیـاریانەی لەبەر دەست دان، بە کـورتی لە خـوارەوە باسی پێکهاتەی جیۆلۆجی کوردستان دەکەین. تەماشای نەخشەی ژمارە (٢) بکە.

### یەکەم: سەردەمی کامبری و بەر لە کامبریی

بەردەکانی ئەم قۆناغە جیۆلۆجیە، بە شێوەیەکی گشتی لە میکاشیست و گرانایت و ئەردواز... پێک هات بوون، هەمـووشـیـان لەو جـۆرە بەردانە بوون، کـە لە ئاگـر دروست بووبوون و (ئاگـردەر). ئەو بەردانە لە نێـوچەکـانی ورمێ و هەکـاری و دەریک رۆژئاوای ماردین و هەندێ شوێنی دیکە دوزراونەتەوە. بەردەکانی قۆناغی کامبریش، لە نێوچەکانی هەکـاری و خـۆی و حـاجی ئۆمـەران و مـالکیـە دۆزراونەتەوە، بەڵام ژێر بەردی کـێـچی کەوتوون.

### دووەم: سەردەمی یەکەم - پالیوزویک

١۰ ئۆردۆڤیسیان: لێکۆڵینەوەکانی جیۆلۆجی ، بەدەگمەن نەبێ، بەردەکانی ئەم چەرخە نیشان نادەن. تاکوو ئێستا بە تەواویی نازانرێ، ئەم جۆرە بەردانە لە چ نێوچەیەک هەن، لە چی پێک هاتوون و چۆنن.

٢۰ سیلوریان: بەردەکـانی ئەم چەرخـە، ئەگەرچی لە زۆربەی نێـوچەکانی کوردسـتـان دەبێ هەبن، بەڵام هەتا ئـەورۆکـە، لەبەر نـەبوونی پشـکنین و هەڵکۆڵینـی جـیـۆلـۆجی تەواو، نازانرێ لە چ شوێنێک هەن.

٣۰ دیڤـونیــان: پشکنینە جـیـۆلۆجـیـیـەکـان نیـشـانی داوە، بەردەکـانی ئەم جـەرخـە جیۆلۆجییە، لە نزیک شـاری مەلاتیە و لـە چیای بیگاگی و چیاکانی هەکاری هـەن. دیڤونی ژێری بریتییە لە بەردی رەش، کە تێکەڵاوە لەگەڵ بەردی رێتحۆنیل.

## نەخـشـەی ژمــارە (٢)




**نەخشەی ٢**

**پێکهاتەی جیۆلۆجیای کوردستان**

٠٤ كاربونيفير: له نێوچەی ماکۆ و له هەندێ شوێن له چیای زاگرۆس و هەروەها له باکووری رۆژهەلاتی دیاربەکر، بەردەکانی ئەم چەرخە جیۆلۆجییە دۆزراونەتەوە. ژێرکاربونی بریتییه له مەتیریاڵه نیشتووەکانی کیشوەرە.

٠٥ پیرمیان: بەردەکانی پیرمیان له نێو چینەکانی ژێرەوەی زەوی کوردستاندا هەیە. پشکنین و هەڵکۆلینه جیۆلۆجییەکان، هەتا ئەورۆکە، له نێوچەکانی سلێمانی و ڕواندز و ئامێدی و کولی و سندی و گەلێ شوێنی دیکه، بوونی ئەم جۆرە بەردەیان سەلماندووە.

**سێیەم: سەردەمی دووەم - میزۆزۆیک**

بەردەکانی سەردەمی میزۆزۆیک، له زۆربەی نێوچەکانی کوردستاندا هەن و ڕۆڵی سەرەکییان له دروسکردنی زنجیره چیاکاندا وازی کردووە. بۆ نموونە، زیاتر له نیوەی بەردەکانی چیاکانی، کە له بەرزایی ٧٠٠ مەتر و بەرزترن، لەم جۆره بەرده جیۆلۆجییانە پێک هاتوون.

٠١ ترسیاس: پێکهاتەی ترسیاس له کوردستان، له نێوچەکانی هەڵەبجە و تەپۆڵکەکانی چەمی گوگسەر و له لای باکووری ڕۆژهەلاتی سورداش و باکووری ڕانیه و له هەندێ شوێن له ڕواندز و له باکووری ئاکرێ و له بەرزاییەکانی دەوروپشتی ئامێدی و له باکووری نێوچەی نێروه و ڕێکان و له سندی و له چیای کورد دۆزراونەتەوە.

٠٢ کریتاسیۆس: بەردەکانی سەردەمی کریتاسۆس، له لم و مارن و دۆلومیت و فۆسفۆر ... هتد پێک هاتووە. پێکهاتەی مەتیریالەکانی ئەو سەردەمە، کە له هەندێ نێوچەی سلێمانی و کۆیه و ڕواندز و زێبار و چیای کورد دۆزراونەتەوە.

**چوارەم: سەردەمی سێیەم - ساینۆزیک**

زۆربەی بەردەکانی خاکی کوردستان، بۆ سەردەمی ساینۆزۆیک دەگەڕێتەوە و نزیکەی دوو لەسەر سێی پانتایی ئەو وولاتە دەگرێتەوە.

٠١ ئۆلیگۆچین: مەتیریاڵه نیشتووەکانی ئۆلیگۆچین، له نێوچەکانی گازی ئانتەب و فورات و هەندێ شوێنی دیکه دۆزراوەتەوە.

٠٢ پالیۆگین: چینەکانی پالیۆگین له ژێر زەویدا، له نێوچەی عەفرین، به قولایی چەند مەترێک (١ - ١٠ مەتر) به نێو چینەکانی زەویدا بڵاو بووەتەوە. بەلام له نێوچەی چیای

کورد ئەم چینە تەنکترە. بەردەکانی پالیۆگین بریتییە لە لم و مارن و شیست. زۆربەی نەوتی کوردستان ، لەم چەرخەدا دروست بووە.

۰۳ نیۆگین: بەردەکانی نیۆگین لە کوردستاندا، بە زۆری بریتین لە لم و مارن و کۆنگلومیرا و کێچ و هەندێ بەردی دیکە. لە نێوچەی عەفرین و هەندێ شوێنی دیکەش، ئەم جۆرە بەردە دۆزراوەتەوە.

**پێنجەم: سەردەمی چوارەم - چارەکی**

بایەخی بەردەکانی سەردەمی چوارەم لەوەدایە، کە ڕۆڵێکی گرنگ لەسەر دۆزی مرۆیی و ئابووریی دەگێڕێ. هەروەها لە دروسکردنی پانتاییشدا گرنگە. مەتیریاڵە نیشتووەکانی سەردەمی چوارەم، لە بەردەزورگ و کونگلومیەرەکان پێک دێ. هەروەها لم و زیخ، زۆربەی نێوچەکانی کوردستان بە تایبەتی نێوچە دەشتایەکان دادەپۆشن.

## بەشی سێیەم: تۆپۆگرافیای کوردستان

تۆپۆگرافیای هەر وڵاتێ، لە فاکتەرەکانی ناوەوە و دەرەوە دروست دەبێ. پەیدابوونی چیاکان بۆ ئەو پێچ و لۆچانە دەگەڕێتەوە، کە لە توێکڵی زەویدا دروست دەبن. دەشتاییەکانیش زۆربەیان لە خواروخێچییە فراوانەکانی زەوی پەیدا دەبن، کە لە دوایدا بە مەتیریاڵی نیشتووی ڕووبار و دۆڵەکان پڕ بوونەتەوە.

تۆپۆگرافیای کوردستان، لە ڕووی بەرزیی و نزمییەوە، لە نێوچەیەکەوە بۆ نێوچەیەکی دیکە جیاوازی هەیە. نێوچەی باکوور و ڕۆژهەڵات، بە چیای بەرز داپۆشراون، کە بەرزایی هەندێکیان ، لە چوار هەزار مەتر زیاتر دەبێ. لە نێوان ئەو چیایانەدا، چەند دەشتاییەکی تەخت هەن. نێوچەی باشوور و ڕۆژئاوا، نزمن و چیایان کەمە و بە زۆری لە دەشتایی پێک هاتوون. لە نێوان ئەم دوو دیاردە سروشتییەدا، چەندین تەپۆڵکە هەن. بە شێوەیەکی گشتی، تۆپۆگرافیای کوردستان لە سێ بەشی جوگرافی جیاواز پێک هاتووە.

### یەکەم: چیاکان

زیاتر لە نیوەی تۆپۆگرافیای کوردستان، لە چیا پێک هاتووە. ئەم چیایانە، لە ئەنجامی بزووتنەوەیەکی زۆر بەهێزی ناوەوە و دەرەوە، کە بە بزووتنەوەی ئالپی ناسراوون، دروست بوون. ئەم بزووتنەوەیە لە کۆتایی چەرخی ئۆلوگسین و بە درێژایی چەرخی مێوسین و هەتاکوو سەرەتای چەرخی بلیۆسین، زۆر توند بووە و فشاری بۆ سەر چینە نەرمەکانی ژێر زەریای تیس بردووە. جا لەبەر ئەوەی ئەم چینانە، کەوتبوونەتە نێوان تەپۆڵکەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبی لە ڕۆژئاوا و تەپۆڵکە ڕەقەکانی ئێران لە ڕۆژهەڵاتەوە، هەروەها تەپۆڵکەکانی ئاسیای گچکە لە باکوور، ئەمانە هەموویان پێکەوە، بە هۆی یەکەمی بەرزبوونەوەی چیاکان دادەنرێن، کە شێوەیەکی قوڵی چەماوە وەردەگرێ و لە ئەنجامی پەیدابوونی چیاکانی ڕۆژهەڵاتی نێوەند، بە تایبەتی چیاکانی کوردستاندا دروست بوون. لە لایەکی دیکەوە، بزووتنەوەی ئالبی بۆتە هۆی دروسبوونی مەتیریای بازڵتی، کە زۆربەی نێوچەکان دادەپۆشن.

سەمتی بزووتنەوەی سەرهەڵدانی چیاکان، هەتاکوو ئێستاکە بە باشی نەزاندراوە. بە بڕوای هەندێ لە زانایان، سەمتەکە لە باکوورەوە بۆ باشوور بووە، واتا لە تەپۆڵکەکانی ئێرانەوە بەرەو میسۆپۆتامیا دەستی پێ کردووە. هەندێکی دیکەش لەسەر ئەو باوەڕەن، کە لە باشوورەوە بەرەو باشوور بووە.

دوای سەرهەڵدانی چیاکان لە کوردستاندا، لە لایەن ئەو ئاوانەی لە چیاکانەوە بەرەو خوار هاتوون، جوڵانەوەیەکی ڕووتاندنەوەی زۆر توند دەستی پێ کردووە. ئەو ئاوانە گاشە بەرد، بەرد، چەگل، زیخ و للمیان، لەگەڵ خۆیاندا ڕامالیوە و بەرەو شوێنە نزماییەکان هێناویانن و بەجێیان هێشتوون. وا لێرەدا، هەندێ لە خەسڵەتەکانی چیاکانی کوردستان دەخەینە ڕوو:

١. چیاکان، بە زۆری ڕوویان لە باکووری ڕۆژئاواوە، بەرەو باشووری ڕۆژهەڵاتن. تەنیا ژمارەیەکی کەم نەبێ، لەم یاسایە دەردەچن و سەمتیان لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوایە، یاخود بە پێچەوانەوەیە.تەماشای نەخشەی ژمارە (٣) بکە،. سەمتی دیکە لە باری کوردستاندا چاوەڕان ناکرێ، چونکە لە ڕۆژهەڵاتدا تەپۆڵکەی ڕەقی ئێران هەیە، لە ڕۆژئاواشدا نیمچە دوورگەی عەرەبی هەیە، کە بە هەمان شێوە ڕەقە. بزووتنەوەی ناوەوە هەر چەند بەهێز بێ، ناتوانێ کارێکی وا لەو دوو تەپۆڵکە ڕەقە بکات، کە سەمتی چیاکان بگۆڕێ.

٢. چیاکان لە بەرزایی ٥٠٠ مەتر لەسەر ئاستی زەریا دەست پێ دەکەن و بەرە بەرە زیاد دەکەن، هەتا دەگەنە پێنج هەزار مەتر. لەم ڕووەوە کەم نێوچەی دیکە هەیە، لە باشووری ڕۆژئاوای ئاسیادا، بەرزاییەکەی بگاتە ئەوەی کوردستان.

٣. لەبەر توندی بزووتنەوەی ناوەوە، چینەکانی چیاکان زۆر ئاڵۆزن. ئەوەش بووەتە هۆی تێکدانی یەک لە دوای یەکی چینەکانی زەوی، بەپێی چەرخی جیۆلۆجی، لە هەندێ شوێنی چیاکاندا، قاتی چەرخی هەرە مێژووی لەسەر لوتکەکانن. لە هەمان کاتدا چینەکانی چەرخی نوێ کەوتوونەتە ژێرەوە.

٤. لوتکەی چیاکان زۆر بڵند و قەدەکانیان زۆر ڕکن و پێچاوپێچن. لە هەندێ شوێنیشدا زۆر لە یەکدی نزیک دەکەونەوە و دۆڵی زۆر قوڵیان پێک هێناوە، کە قوڵایی هەندێکیان لە سەدان مەتر زیاتر دەبێ.

٥. پرۆسێسی ڕووتاندنەوەی زەوی لە چیاکاندا، زۆر بە توندی ڕووی داوە، هۆکەشی بۆ بەفر و بارانێکی زۆر دەگەڕێتەوە، چونکە لەو کاتانەدا هێشتا بە تەواوی چیاکان خۆیان نەگرتووە.

تاکوو ئێستا بە تەواوی، ژمارەی هەموو چیاکانی کوردستان نازاندرێ. سەرچاوەکان ژمارەیەکی زۆری جیاوازیان تۆمار کردووە. بۆ نموونە، پەڕتووکێک لە قەزای سنە، ناوی ٢٢٠ چیای هێناوە. لە هەمان قەزادا سەرچاوەیەکی دیکە، ناوی ١٢٢ چیای تۆمار کردووە. هەروەها درێژایی چیاکانیش لە یەکدی ناچن. کەبیرکوە لە سەرچاوەکاندا، ٢٦٠

## نەخـشـەی ژمـارە (٣)



کیلۆمەتره، ١٦٠ کیلۆمەتره، ٢٠٤ کیلۆمەتره. هۆکانی ئەو جیاوازییە، لە لایەکەوە بۆ ناتەواویی لێکۆڵینەوە و لە لایەکی دیکەشەوە بۆ ناونانی یەک چیای دیاریکراوەوە بە ناوی جیاجیاوە، لە شوێنی جیاجیادا دەگەڕێتەوە.

کوردستان چیای وای تێدایە، کە بڵندییەکەی زیاتر لە پێنج هەزار مەتر دەبێ. هەندێ چیای دیکەشی لێ هەن، لە یەک هەزار مەتر کەمترە، بۆ ئاسانکردنی باسەکە، بەسەر چوار دەستەدا دابەشیان دەکەین:

**١. چیا هەرە بەرزەکان (٤ هەزار مەتر و بەرەو ژوور)**

ئاگری گەورە (ئارارات) – ٥١٣٧ مەترە. دینار – ٤٤٠٩ مەترە. زەردەکوە – ٤٢٢١ مەترە. ئولودۆروک (لوتکەی ڕەشکۆ) – ٤١٣٥ مەترە. بوزوی (جیلۆ) – ٤١١٦ مەترە. سیپان – ٤٠٥٨ مەترە. ئۆشترانکوە – ٤٠٥٠ مەترە. لێرەدا یەکە یەکە لەو چیایانە دەدوێین، کە زانیاریمان لەبەر دەست دایە.

**چیای زاگرۆس**: ڕشتەی (کوهستان) هەرێمی چیای زاگرۆس، گەلێ پان و بەرینە. لە باکووری ڕۆژئاواوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە. درێژاییەکەی لە سنووری باکوورەوە، کە چیاکانی باشووری زەریاچەی ورمێیە، هەتاکوو سنووری باشووری، کە تەنگەی هورمز دەکات، ١٤٠٠ کیلۆمەترە. پانایییەکەی لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، لە نێوان ١٠٠ هەتاکوو ٣٠٠ کیلۆمەترە. ڕووبەرەکەی ٠٠٠ ٣٣٢ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە.

ڕشتەی زاگرۆس، ئەگەر بە تەواوی تەماشای چۆنێتی باری ساختمانی و پانایی و پەیوەندی چیاکان لەگەڵ یەکدیدا و چەشنی ئاو بەخشینەوە بکەین، دەبینین جیاوازییەکی زۆر لە نێوان نێوچەکانیدا هەیە. جوگرافیزانەکان ئەو ڕشتەیەیان بەسەر سێ نێوچەی چیاییدا دابەش کردووە، زاگرۆسی باکوور و زاگرۆسی ناوەند و زاگرۆسی باشوور. وا لە خوارەوە باسی یەکەم دووەمیان دەکەین و سێیەمیشیان پشگوێ دەخەین، لەبەر ئەوەی لە دەرەوەی خاکی کوردستان هەڵکەوتووە: (٤٩, لاپەڕە ٢٧٨–٢٨١).

**زاگرۆسی باکوور**: زاگرۆسی باکوور، لە باکوورەوە لەگەڵ چیاکانی دامێنی باشووری زەریاچەی ورمێ و دەرەی ڕووباری گدار، یاخود چەمی دورود و ڕووباری سییاه (قەرەسوو) (سنووری خولگەی ٣٧ پلەی پانی باکوور). لە ڕۆژئاواوە، لە سەرەتاوە بە دەرەی ڕووباری لاوین، یاخود ڕووباری کلاس لە دوایدا بە دەرەی ڕووباری چۆمان

بەسراوە. (ڕووباری کلاس و چۆمان، چیاکانی زاگرۆسی باکوور لە چیاکانی باشووری کوردستان جیا دەکاتەوە.)، پاشان لەگەڵ دەرەی شلیرکە بەرەو باشوور درێژ دەبێتەوە و بە چیاکان و دەشتەکانی هەڵەبجە و خورماڵدا تێپەڕ دەبێ. لە پاشان بە چیاکانی قەزاکانی پاوە و سەرپێڵی زەهابدا دەڕوا، هەتا لە ئەنجامدا دەگاتە دامێنی ڕۆژئاوای کەبیرکوە. لە باشوورەوە، بە دامێنی چیاکانی باکوور و ڕۆژهەڵاتی دەشتی خۆزستان و لە دوایدا بە دامێنی چیاکانی کەناری باکووری دەشتەکانی کەناری کەنداوی فارس و تەنگەی هورمز کۆتایی دێ. لە ڕۆژهەڵاتەوە، کەناری باشووری زەریاچەی ورمێ و ڕووباری زەرینەرود و ڕێگەی نێوان سەقز و سنە و ڕێچکەڕۆی نێوان سنە و هەمەدان، لە دوایدا بەرەو باشوور دەکشێ، هەتاکوو دەگاتە ئاوەڕۆی باکووری ڕووباری دز.

بەرزایی زاگرۆسی باکوور، لەچاو بەرزایی زاگرۆسی ناوەندا کەمترە. لای باکووری ئەم بەشەی زاگرۆسەوە بەرزە و تێکڕایەکەی نزیکەی ٢٠٠٠ مەتر دەبێ، لای باشووریشییەوە، لە دەشتاییەکی پانوبەرین پێک هاتووە و بە یەکێ لە ئاوەدانترین نێوچەکانی کوردستان دادەنرێت.

زاگرۆسی باکوور، لە سەدان چیای گەورە و گچکە پێک هاتووە، بەرزایی هەمووشیان هەتا بەرەو باشوور بڕۆین، بەرە بەرە کەم دەبێتەوە، بڵندترین لوتکە چیایان، چیای گەرینە، کە بڵندییەکەی ٣٦٤٥ مەتر دەبێ و ٢٨ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژئاوای بروجەرد و ٥٣ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژهەڵاتی خوڕەم ئابادەوە دوورە. چیای میش پەڕرۆیش، کە بڵندییەکەی ٣٦٠٦ مەتر دەبێ، ٤٢ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژهەڵاتی خوڕەم ئابادەوە دوورە.

لە زاگرۆسی باکوور، ڕووبارێکی گەلێ زۆر سەرچاوە هەڵ دەگرن، کە هەندێکیان بەرەو ڕۆژئاوا دێن و هەندێکیشیان بە ڕووبارەکانی کەرخە و کارون تەواو دەبن، وەکوو: مهاباد، تالاهو (سیمینەرود)، زرینە رود، خوڕخوڕە، ئاوی سیروان، زیمکان، قرەسوو، گاماسیاب، سیمەرە و بە دەیانی دەیکەش.

بەڵەنسی بارانی ساڵانەی زاگرۆسی باکوور، لە قەزایەکانی سەردەشت و سەقز و بانە و مەریوان و سنە، لە نێوان ٦٠٠ هەتاکوو١٠٠٠ ملیمەتر دایە. لە نێوچەکانی پاوە و کرماشان، لە نێوان ٦٠٠ هەتاکوو ٨٠٠ ملیمەتر دایە. لە شوێنەکانی دیکەی ٣٠٠ هەتاکوو ٦٠٠ ملیمەتر دەبێ.

تێکڕای گەرمایی ساڵانەی ئەو بەشەی چیای زاگرۆس، لە شوێنە بەرزاییەکاندا، لە ٥ هەتاکوو ١٠ پلەی سانتیگرادە. لە نێوچەی کرماشان و لە نێوچە نزمەکانی دیکەی لە ١٠

هەتاکوو ١٥ پلەی سانتیگرادە. لە پارێزگای ئیلام و نێوچەکانی باشووری لوڕستان، ١٥ هەتاکوو ٢٥ پلەی سانتیگرادە.

**زاگرۆسی ناوەندیی**: زاگرۆسی ناوەند، کە لە باکووری ڕۆژئاواوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە، لە باکوورەوە بە ڕووباری دز دەست پێ دەکات، لە باشوورەوە بە کەویری مەروەست (سنجەمروست) و باکووری زەریاچەی بەحێگان و سنووری تەوەری کازرون و ڕووباری شاهپور یاخود دالکی تەواو دەبێت. ئەو بەشەی ڕشتەی چیای زاگرۆس، کە تێکڕای بڵندییەکەی، لە دەوروبەری ٢٥٠٠ مەتر دەبێ، بە بڵندترین بەشی ئەم ڕشتە چیایە دادەنرێ و لە ژمارەیەکی زۆر لە چیای بەرز بەرز پێک هاتووە، بەرزترینیشیان کوەدنا (دینار) ە و بەرزاییەکەی ٤٤٠٩ مەترە و بە ٣٧ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژئاوای یاسوچەوە هەڵ کەوتووە، لە دوای ئەو چیایە، زەرد کوە دێ، بەرزاییەکەی ٤٢٢١ مەترە و ٧٣ کیلۆمەتر لە شەهری کوردەوە دوورە، پاشان ئۆشتۆران کوە دێ، بەرزاییەکەی ٤٠٥٠ مەتر دەبێ و ٢٩ کیلۆمەتر لە باشووری ڕۆژهەڵاتی دورودەوە دوورە.

زنجیرە چیای زاگرۆسی ناوەندی، سەرچاوەی ژمارەیەکی زۆر لە ڕووبارە مەزنەکانی کوردستان پێک دەهێنێ، کە هەندێکیان لە ڕێگەی ڕووبارەکانی کارون و جراحی و زەهرە و شوور و دالکی، لە کەنداوی فارس بە یەک دەگەنەوە، هەندێکی دیکەشیان، بە دەشتەکانی نێوخۆ کۆتاییان پێ دێت.

بەڵەنسی بارانی ساڵانەی نێوچە بڵندەکانی ئەو زنجیرە چیایانە، لە نێوان ٦٠٠ ملیمەتر هەتاکوو ١٢٠٠ ملیمەتر دەبێت، لە دامێنی چیاکاندا لە نێوان ٣٠٠ ملیمەتر هەتاکوو ٦٠٠ ملیمەتر دەبێت. لەبەر ئەوەی لەو نێوچانەدا بارانێکی زۆر دەبارێ و شێدارە، بە شێکی زۆر لە نێوچەکانی زاگرۆسی ناوەندی، بە گژوگیا و دارودرەخت داپۆشراوە.

تێکڕای گەرمیی ساڵانەی زاگرۆسی ناوەند، لە بەرزاییەکاندا لە نێوان ٥ هەتاکوو ١٠ پلەی سانتیگرادە، لە جێگا نزمەکاندا لە نێوان ١٠ هەتاکوو ١٥ پلەیە. لە شوێنەکانی حەوارەی کەنداو،ی فارس لە نێوان ١٥ هەتاکوو ٢٠ پلەی سانتیگرادە.

**دینار**: دینار یاخود دناکوهستانیکە کەوتۆتە قەزایەکانی بروجەن، بوێر ئەحمەدی سەردەسیر. پانتاییەکەی ٢٢٠٠ کچگ دبێ، لە چیاکانی میمەند (٢٨٥٠ مەتر)، کەڕە (Kerih) (٢٥٥٠ مەتر)، زەنگویی (٣١٥٠ مەتر)، مەل (٢٥٥٠ مەتر)، هجال (Xical)

(٣٤٣٠ مەتر)، ئاب نەهر (٣٢٢٠ مەتر)، دومازە (Dumazix) (٢٩٥٠ مەتر)، چال کەلاغ (٣٥٣١ مەتر)، ... هتد پێک هاتووە. بڵندترین لوتکەی کە بە ناوی دینارەوەیە، ٤٤٠٩ مەتر بەرزە، لە باکووری ڕۆژئاوای شاری یاسوجدا هەڵ کەوتووە. ڕووبارەکانی ماربر، ڕیگان، تل گردل و ڕووباری قر، لە دامێنی باکووری ئەم چیایەوە سەرچاوە هەڵ دەگرن. ڕووبارەکانی ئابزا، بنرو، کهگول، سریس، مهریان، لە دامێنی باشوور و ڕووبارەکانی خالە، کال شوور، تیزئاب، لە دامێنی ڕۆژهەڵاتی ئەم چیایەوە، سەرچاوە هەڵ دەگرن.

دامێنەکانی باشوور و باشوری ڕۆژئاوای ئەم کوهستانە، تا دەرەی ڕووباری بشار کشاوە، دامێنەکانی باکووری گەیشتۆتە دەرەی ڕووباری مارنر و دامێنەکانی ڕۆژئاوای لەگەڵ ڕوباری خۆراساندا سنوور دارە. دامێنەکانی ڕۆژهەڵاتی بە دەرەی ڕووباری مهریان و سەرچاوەی ڕوباری ماربر و دەوروبەری یاسوچ کۆتایی پێ دێت.

بەڵەنسی بارانی ساڵانەی ئەم کوهستانە، لە نێوان ٦٠٠ هەتاکوو ١٢٠٠ ملیمەتر دایە. تێکڕای گەرمایی ساڵانەی، لە نێوان ٥ هەتاکوو ١٥ پلەی سانتیگراد دایە. لوتە بەرزەکانی، بە درێژایی ساڵ بەفریان لێ ناچێتەوە (٤٩، لاپەڕە ٢٦٨).

**زەردەکوە:** کوهستانی زەردەکوە، لە چیاکانی لەم لەمی (٢٩٣٥ مەتر)، تورەک (٣٣١٩ مەتر)، گەللە سەگا (٣١٥٠ مەتر)، کورە (٢٢٥٠ مەتر)، شەنگی (٢٦٥٠ مەتر)، گرد(٢٦٢٠ مەتر)، کەمەر بێکەس (٢٥٥٠ مەتر)، دالانەک (٣٤٠٢ مەتر)، میلی (٢٩٠٣ مەتر)، حەفت کەرتان (٢٩٤٩ مەتر)، چری (٣١٦٣ مەتر)، قەیسەری (٢٣٥٠ مەتر)، چهل خشت (٣٢٢٠ مەتر) و کەهنو (٣٥٥٠ مەتر) پێک هاتووە. درێژایی ئەو چیایەی لە نێوان دەرەلاوە و گوندی برد شەمشیر (١٢٨ کیلۆمەترە باکووری ڕۆژئاوای شەهری کورد) هەتا گوندی کاج (٤٠ کیلۆمەتر باشووری ڕۆژئاوای شەهری کورد)ی نزیکی دەرەئابی کوهرەنگ، ١٢٣ کیلۆمەترە و تێکڕای پانایی ٢٠ کیلۆمەترە و لە باکووری ڕۆژئاواوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە.

کوهستانی زەردەکوە، چەند لوتکەیەکی هەیە، کە بڵندییەکانیان لە ٣٠٠٠ مەتر کەمتر نییە، لە ناو ئەوانەشدا لوتکەی کلوچی (٤٢٢٥ مەترە) لە هەموویان بڵندترە. لوتکەکانی دیکەش ئەمانەن: شاە شەهیدان (٤١٥٠ مەتر)، پنبە گال (٤٠٠٠ مەتر)، میش چال، زەردە، چری و هەفت تنان. زەردەکوە، بە بڵندترین ڕشتەی زاگرۆس دادەنرێ.ژمارەیەکی زۆری ڕووبارەکانی ئەم نێوچەیە، لەم چیایەوە هەڵ دەقوڵن. بەڵەنسی بارانی ساڵانەی لە

نێاون ٨٠٠ هەتاکوو ١٨٠٠ ملیمەتر دەبێ، تێکڕای گەرمایی لە نێوان ٥–١٥ سانتیگرادە (٤٩، لاپەڕە ٢٨٦).

**ئۆشترانکوە:** ئەم چیایە دەکەوێتە ڕۆژئاوای باشووری شارۆچکەی ئەلیگودەرزەوە. بەرزاییەکەی دەوروبەری ٤١٥٠ مەتر دەبێ. ئۆشترانکوە، کە بە یەکێ لە بڵندترین چیاکانی کوهستانی زاگرۆس دەژمێردرێ، لە باشووری ڕۆژئاوای دورود دەست پێ دەکات و تا باشووری گوندی چڤاگرگ بە درێژایی ٥٠ کیلۆمەتر و پانایی لە نێوان ٢ – ١١ کیلۆمەتر درێژ دەبێتەوە. هەندێ لە لوتکە بەرزەکانی ئەم چیایە ئەمانەن: گلگل ٤٠٥٠ مەتر، سنبران ٤١٥٠ مەتر، پیارەدرە تەخت ٣٨٠٠ مەتر.

**٠٢ چیا بەرزەکان** (٣ - ٤ **هەزار مەتر**)

ئاگری گچکە ٣٨٩٦ مەتر، مۆر ٣٨٠٧ مەتر، سامدی ساتسیڤر یسی ٣٧٩٤ مەتر، قەرەداغ ٣٧٥٢ مەتر، باشتەق ٣٦٨٤ مەتر، یسپیرین ٣٦٦٨ مەتر، تەندورەک ٣٦٦٠ مەتر، گەرین ٣٦٤٥ مەتر، بەردە ڕەش ٣٦٠٨ مەتر، دەرەرەش ٣٦٠٨ مەتر، سومبول ٣٦٠٧ مەتر، هەڵگورد ٣٦٠٧ مەتر، سیاە کوە ٣٥٧٨ مەتر، موارت باش ئالاداغ ٣٥١٠ مەتر، شاهۆ ٣٣٩٠ مەتر، قەندیل ٣٤٥٢ مەتر، پەررۆ ٣٣٥٧ مەتر... هتد.

**گەرین:** یەکێ لە چیاکانی پارێزگای لوڕستانە، کەوتۆتە دێستانی دەرەحمەی قەزای خوڕەم ئاباد و ٥٣ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری خوڕەم ئابادەوە دوورە. بەرزاییەکەی ٣٦٤٥ مەترە. سەرچاوەی ڕووباری کەهمان. دەکەوێتە ئەو چیایەوە. گەرین لە باشووردا گەیشتۆتە چیای میش پەروار ٣٦٠٦ مەتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری خوڕەم ئاباد و بە بەشێک لە کوهستانی زاگرۆس دەژمێردرێ (٤٩، لاپەڕە ٤٧٤).

**بەردەڕەش:** بڵندترین چیای ئازەربایجانی غەربیە. ئەم چیایە دەکەوێتە دێستانی تەرگەوەڕی قەزای ورمێیە و ٣٦ کیلۆمەتر لە ڕۆژئاوای باشووری شاری ئورمێوە دوورە. بەرزییەکەی ٣٦٠٨ مەتر دەبێ. چەمی نازلو سەرچاوەکەی لەم چیایەوە هەڵ دەقوڵێ.

**شاهو:** ئەم چیایە بە یەکێ لە بەرزترین چیاکانی کوهستانی زاگرۆس دەژمێردرێ. بەرزاییەکەی ٣٣٩٠ مەتر دەبێ. شاهو سەرچاوەی چەمەکانی پاوە و دووریسانە. ئەم چیایە لە باکووری ڕۆژئاواوە گەیشتۆتە چیای گاول ٢٤٢٥ مەتر، لە ڕۆژهەڵاتەوە چیای قەلاگۆر(٢٧٥٠ مەتر). شاهو لە باکووری ڕۆژئاواوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات هەتاکوو

باکووری ڕەوانسەر درێژ دەبێتەوە. درێژاییەکەی ٥٥ کیلۆمەترە وپانایییەکەی لە ١٠ – ١٥ کیلۆمەتر دەبێ. بڵندترین لوتکەی بە ناوی شاهو (شاکر)، کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەڵاتی گوندی شەمشیرەوە.

ڕووباری تەنگور یاخود تەنگەبەر، لە نێو دامێنی ئەو چیایەدا سەرچاوە هەڵ دەگرێ، لە پاشان تێکەڵ بە ئاوی سیروان دەبێت. لە ڕاستیدا، چیای شاهو دەکرێ بە کوهستانی بژمێرین، لەبەر ئەوەی لە چەندین چیای جیاواز پێک هاتووە، وەکوو گاول، قەلاگور، قەلای نانەوێژە (٢٣٢٠ مەتر)، هۆل ئاوەر (١٨٩٩ مەتر)، تاقە سەفید (٢٠٥٠ مەتر)، شور (٢٠٢٠ مەتر). پانوپۆڕییەکەی ٨٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە دەبێ. بەشێکی گچکە لە کوهستانی زاگرۆسی مەزن پێک دەهێنێت.

پلەی گەرمایی ئەو کوهستانە، لە نێوان ١٠ – ١٥ سانتیگرادە، بەڵەنسی تێکڕای بارانی ساڵانەی، لە بەشەکانی باکووریدا، لە دەوروبەری ٨٠٠ ملیمەتر دایە، لە بەشەکانی باشووریش لە نێوان ٥٠٠ – ٦٠٠ ملیمەتر دەبێ (٤٩، لاپەڕە ٣٥٧).

**پەڕۆ**: پانوپۆڕی کوهستانی پەڕۆ یاخود پەرۆ یاخود بێستونی قەزای کرماشان، لە دەوروبەری ١٠٢٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە دایە و لە ڕۆژهەڵاتی گوندی دارچیمانی باکووری ڕۆژئاوای کرماشان، بە ٤٥ کیلۆمەتر دەست پێ دەکات و بە گوندی سەنقور ئاباد و بێستوونی ڕۆژهەڵاتی باکووری کرماشان بە ٣٦ کیلۆمەتر تەواو دەبێت. درێژایی ئەو کوهستانە، لە باکووری ڕۆژئاواوە هەتاکوو باشووری ڕۆژهەڵات، ٦٢ کیلۆمەتر دەبێ و پانایییەکەشی لە باکوورەوە هەتاکوو باشوور، لە پانترین شوێنیدا ٢٦ کیلۆمەترە.

کوهستانی پەڕۆ لە چیاکانی قرال (Kıral) (١٩٥٨ مەتر)، دوقرال (Dü kıral) (٢٤٥٠ مەتر)، ڕاق چەرمی (٢٨٥٠ مەتر)، داربید (٢٨٥٠ مەتر)، بێستون (٢٨٠٥ مەتر)، نوچ بەران (٢١٠٠ مەترە) پێک هاتووە و بەرزترین لوتکەی پەڕۆیە کە بەرزاییەکەی (٣٣٥٧ مەترە) و بە ناوی شێخ عەلی خانەوە ناو براوە. هەندێ لە لوتکە بەرزەکانی دیکەی ئەو چیایە ئەمانەن: شاە ئاودالان (٣٢٠٠ مەتر)، سەکل (٣١٠٠ مەتر)، سیرولە (٣٠٠٠ مەتر)، قتە چەرمی، ماسی، کل بازرگان. ئەشکەوتی پەڕۆ (٥٧٢ مەتر قووڵە). قووڵترین ئەشکەوتی ڕۆژهەڵاتی نێوڕاست، کەوتۆتە دامێنی باشووری لوتکەی قتە چەرمییەوە. تێکڕای گەرمایی ساڵانەی ئەو کوهستانە، لە دەوروبەری ٥ – ١٠ پلەی سانتیگراد دایە و بەڵەنسی بارانی ساڵانەی، لە نێوان ٥٠٠ – ٨٠٠ ملیمەتر دایە (٤٩، لاپەڕە ١٣١).

**٠٣چیا ناونجییەکان** (٢ - ٣ هەزار مەتر)

لێرەدا ناوی هەندێ لە چیا ناونجییەکان دەهێنین، وەکوو: ئایدن (٢٩٧٣ مەتر)، شەوانت (٢٩٧٠ مەتر)، چوتەلە (ئاقچە قەرە)(٢٩٤٠ مەتر)، کومانا حاسان (٢٩٢٧ مەتر)، شایتان (٢٩١٣ مەتر)، کاڤاکی (تۆسیک) (٢٩٠٤ مەتر)، زیارەت (٢٨٨٧ مەتر)، شەق شەق (٢٨٥٨ مەتر)، کەبیرکوە (٢٧٩٠ مەتر)، کونە کۆتر (٢٦٩٢ مەتر)، پیرەمەگرون (٢٦٢٠ مەتر)، کاروخ (٢٥٦٠ مەتر) و مانشت (٢٤٢٩ مەتر)... هتد.

**شەوانت:** ئەم چیایە، ٣٩ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژهەڵاتی تکاب لە قەزای میاندوئاوەوە دوورە. بەرزاییەکەی دەوروبەری ٢٩٧٠ مەتر دەبێ. ئەم چیایە لە باکوورەوە بە کوەشەوەند (٢٨٥٠ مەتر) و لە باکووری ڕۆژئاواوە بە کوەپەڕۆخان (٢٩٤١ مەتر) و لە ڕۆژئاواوە بە کوەقوش دانی (٢٨٥٠ مەتر) و لە باشوورەوە بە کوە سندوق سندران (Senduk Sindiran) (٣٢١٤ مەتر) دەورە دراوە.

**کەبیرکوە:** ئەم کوهستانە لە باشووری دەرەی ڕووباری ئاب ئافتاب و چەمی کەنجانەوە (قەزای مەهران) دەست پێ دەکات و بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات دەکشێ، هەتاکوو بە دەرەی ڕووباری کەرخە ( قەزای خوڕەم ئاباد) کۆتایی پێ دێ. دامێنی باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی بە دەرەی ڕووباری سیمەرە و کەرخە و دامێنی باشوور و باشووری ڕۆژئاوا، بە ڕێگەی نێوان مەهران بۆ دێهلۆران کۆتایی پێ دێت.

درێژایی چیای کەبیرکوە، لە دەرەی چەمی کەنجانەوە هەتاکوو دەرەی ڕووباری کەرخە (١٥ کیلۆمەتر ڕۆژئاوای حوسەینیە) ١٧٥ کیلۆمەترە. پانایییەکەی لە نێوان ڕووباری سیمەرە و یاخود کەرخە، هەتاکوو نێوچەکانی میهران و موسیان لە نێوان ٤٥ هەتاکوو ٨٠ کیلۆمەترە، پانوپۆڕییەکەی ٩٥٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە.

کوهستانی کەبیرکوە، لە چیاکانی مۆواز (١٩٧٠ مەتر). سیاەکوە (١٤٠٨ مەتر)، دینارکوە (١٩٥٥ مەتر)، سەمەند (١٦٥٠ مەتر)، تەختی پیران (١٧٢٠ مەتر)، ئەناران (١٤٣٥ مەتر)، ئابادان (١٢٠٠ مەتر) هەندێکی دیکەش پێک دێت. بەرزایی بڵندترین لوتکەی کە ناوی کەبیرکوەیە، ٢٧٩٠ مەترە و لە ڕۆژهەڵاتی گوندی ئەرکەوازی بە ١٨ کیلۆمەتر هەڵ کەوتووە.

ڕووبارەکانی ئاب ئافتاب، چنگولە، میمە، خروزان، ئابدانان، ئاوی هلیوە و چەندین ئاوی دیکە، سەرچاوەکانیان لە کەپیرکوەوە هەڵ دەگرن.

بەڵەنسی بارانی ساڵانەی ئەم كوهستانە، لە بەشەكانی تێكڕای لە دەوروبەری ٣٠٠ مليمەتر دايە و لە بەشەكانی دیكەشدا لە نێوان ٢٠٠ – ٣٠٠ مليمەتر دايە. تێكڕای پلەی گەرمايی ساڵانەی، لە بەشەكانی باكووری لە ١٠ – ١٥ پلەی سانتيگرادە و لە بەشەكانی ناوەند و باشووريشدا، لە ١٥ – ٢٥ پلەيە (٤٩، لاپەڕە ٤٢٢).

**مانشت:** ئەم چيايە، يەكێ لە چياكانی قەزای ئيلامە و لە باكووری ڕۆژئاوای شاری ئيلامەوە ٦ كيلۆمەتر دوورە. بەرزاييەكەی ٢٤٢٩ مەترە. سەرچاوەكانی ئاوی زەنگان و ڕووباری مورتە لەم چيايەوە هەڵ دەقوڵێن. مانشت لە باكووری ڕۆژئاواوە بە كوەبانكول (٢٣٠٤ مەتر) و لە باشووری ڕۆژئاواشەوە بە كوەگاوە دەگاتەوە.

**٠٤ چيا نزمەكان** (١ - ٢ **هەزار مەتر**)

قەرەجە (١٩٣٨ مەتر)، زۆزگ (١٨٢٩ مەتر)، بەمۆ(١٨٢٨ مەتر)، داڵاهۆ (١٨١٠ مەتر)، كوەدرا (١٧٠٦ مەتر)، ئەزمەڕ (١٧٠٢ مەتر)، گۆيژە (١٥٢٤ مەتر)، قەرەقاش (سۆڤ داغ ) (١٤٩٦ مەتر)، ڕامان (١٢٦٠ مەتر) و گەلێكی ديكەش...

**داڵاهۆ:** كەوتۆتە دێستانی پشت تەنگ، لە قەزای قەسری شيرين، لە باكووری ڕۆژهەڵاتی شارۆچكەی قەسری شيرينەوە ٣٣ كيلۆمەتر دوورە. بەرزاييەكەی لە دەوروبەری (١٨١٠ مەتر) دايە. سەرچاوەی چەمی پۆل زەهاب دەكەوێتە ئەم چيايەوە. ئەم چيايە لە لای باكووری ڕۆژئاواوە، بە كوەبەندزەردە (١٣٥٠ مەتر) و لە لای باشووری ڕۆژهەڵاتيشەوە بە كوەگولبان (٢٠١٠ مەتر) دەگاتەوە.

**ئەناران:** چيای ئەناران كە بەرزاييەكەی ١٤٣٥ مەتر دەبێ، لە دەرەی ڕووباری چنگولەی باشووری گوندی تيماوە دەست پێ دەكات و لە باكووری ڕۆژئاواوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە. درێژاييەكەی ٥٠ كيلۆمەتر دەبێت. پانايیەكەشی ١٠ كيلۆمەتر دەبێت. سەرچاوەی ڕووبارەكانی ميمە، شەكر ئاب، سەگلال، درازبيشە و هەندێكی ديكەش، لەم چيايە دان. ئاناران يەكێ لە چياكانی قەزای دهلرانە و ٥٥ كيلۆمەتر لە ڕۆژئاوای شارۆچكەی دهلرانەوە دوورە.

**كوەدرا:** ئەم چيايە، ٣٦ كيلۆمەتر لە باشووری ڕۆژئاوای نورئابادەوە دوورە.

بەرزاییەکەی ١٧٠٦ مەترە. ئەم چیایە بە درێژایی ٥٠ کیلۆمەتر و بە پانایی ١٢ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژئاواوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە. ڕووباری شەکشان لە دامێنی باکووری ئەم چیایەدا سەرچاوە هەڵ دەگرێ.

**٠٥ چیا هەرە نزمەکان (لە یەک هەزار مەتر کەمتر)**

لەوەند (٤٧٠ مەتر)، تاسڵوجە (٩١١ مەتر)، یانارسو (گارزان) (٨٦٥ مەتر)، ئارات (٨٤٠ مەتر)، سوسو (٨٠١ مەتر)، تەقتەق (٧٤٩ مەتر)، کوەزیرزەردی (٧٥٠ مەتر)، جودی (٦٢٧ مەتر)، لیراک (٩٤٦ مەتر) و گەلێکی دیکەش..

**چیای حەمرێن**: ئەم چیایە ٣٥ کیلۆمەتر لە باشووری ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی دهلران و باشووری گوندی نەهرعەنبەرەوە دوورە. بەرزاییەکەی ٢٤٢ مەترە.

**چیای حەمرێن**: ئەم چیایە کە بەرزاییەکەی ١٧٥ مەترە، لە لای ڕۆژئاواوە دەگاتەوە کوە قەلاویزان (١٥٠٠ مەتر)، لە لای ڕۆژهەڵاتیشەوە بە کوە قەلا ئاویزان (٢٦٠ مەتر) و لەوێشەوە بە کوە چکە موسی (Cıkkıx mûsa) (٣٩٠ مەتر) کۆتایی پێ دێت.

**چیای حەمرێن**: ئەم چیایە، لە ڕۆژئاوای شارۆچکەی مەندەلییەوە، بە چەند کیلۆمەترێک دەست پێ دەکات و لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو باشووری ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە و بە نێوچەی (فەتحە) کۆتایی پێ دێت. درێژاییەکەی بە دەیان کیلۆمەتر دەبێت.

**لیراک**: بەرزایی ئەم چیایە، ٩٤٦ مەتر دەبێت.لیراک ٤١ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی دێزفولەوە دوورە. دامێنەکانی باکوور و ڕۆژئاوای ئەم چیایە، بە زەریاچەی ئاوبەندی دز کۆتایی پێ دێت.

**دووەم: گردەکان (تەپۆڵکە)**

گردەکانی کوردستان بە زۆری لە زنجیرەیەکی خواروخێچی چەماوە پێک هاتووە. لەچاو چیاکانی دەوروبەریان، زۆر بەرز نین، بەڵام ئەگەر لە نزیک ئەو چایانەوە نەبوونایە، ئەوا هەر یەکەیان بۆ خۆی چیایەک دەبوو. ئەم گردانە کەڵکیان زۆرە، لە لایەکەوە بۆ چاندنی دەغڵودان بەکاردەهێنرێ و لە لایەکی دیکەشەوە بە دەیان مێگەلی مەڕوماڵاتی لێ دەلەوەڕێندرێ. هەندێ لەو گردە بەناوبانگای کوردستان، ئەمانەن:

**بایەزید**: لە باکووری ئەم گردەوە، چیاکانی ئاگری (ئارارات) گەورە و گچکە و لە باشوورەوە چیاکانی تەندروک هەیە. لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ماکۆ و خۆی درێژ دەبێتەوە، جادەی نێوان کوردستان و ئێران و تورکیا، بە نێو ئەم گردانەدا تێپەڕ دەبێ.

**بەرزنجە**: لە باکووری ئەم گردەوە، چەمی قەڵاچوالان و لە ڕۆژهەڵاتەوە چیاکانی هەورامان و لە باشوورەوە دەشتی شارەزوور هەڵ کەوتوون. لە تەنیشت گردی بەرزنجەوە، کۆمەڵە چیایەکی بڵند هەیە، کە بەرزایی هەندێکیان لە ڕووی زەریاوە، خۆی لە ٢٢٠٠ مەتر دەدات، وەکوو چیاکانی کورەکاژاو، کالاکرە.

**پاسینلەر**: پاسینلەر دەکەوێتە نێوان زنجیرە چیایەکەوە. لە باکوورەوە بە چیاکانی کارگابازار و لە باشوورەوە بە چیای پالاندۆگین (٣١٢٤ مەتر) و لە ڕۆژهەڵاتیشەوە بە پشتە چیاکانی تالا (٣١٣٤ مەتر)، چواردەورە دراوە. گردی پاسینلەر، لە هەندێ سەرچاوەی جوگرافیدا، بە گردی ئەرزەڕۆم تۆمار کراوە. ئەم گردە بایەخی ئابووری بۆ کوردستان زۆرە، بە تایبەتی لە سایەی بەرهەمهێنانی دەغڵوداندا، وەکوو گەنم و جۆ، ئەمەش دوای ئەوەی هێڵی ئاسنینی نێوان ئەرزەڕۆم و ئەنقەرە ڕاکێشرا، بە تەواویی بایەخی ئابووریی ئەم گردە زیادی کرد. بەرزایی گردی پاسینلەر لەسەر ئاستی زەریاوە، دەگاتە ١٧٥٠ مەتر. ڕۆژهەڵاتی ئەم گردە، لەچاو ڕۆژئاوایدا بەرزترە و چەمی. ئارپاچای بە نێو ئەم گردەدا دەڕوات.

**پشدەر**: ئاوەی سیروان لە باکوورییەوە، دۆڵی سیوەیل لە باشوورییەوە، قەڵاچولان لە ڕۆژئاوایەوە هەڵ کەوتوون. چەند چیایەک لە نێو ئەم گردەدا قوت بوونەتەوە، لە هەموویان گرنگتر، چیاکانی کەنێو (٢٣١٦ مەتر) و سەرشو (٢١١٦ مەتر).

**پێنجوین**: گردی پێنجوین، لە هەر چوار لاوە بە زنجیرە چیایەکی ئاڵۆز دەورە دراوە،

وەکوو چیاکانی قـایە و هـەرزەلە و یاسمـال ... تاد. بەرزایی ئەو چیایانە لـە نێوان ١٥٠٠ – ٢٠٠٠ مـــەتردا دەبێ. لـە ڕووی ئابـووریـیـــەوە، گـــردی پێـنجـــوین بـە زۆری بۆ لـەوەڕگـــا بەکاردەهێندرێ.

**چوارتا**: لە نێوان دۆڵی سـیـوەیل و قـەڵاچـولانـدا هـەڵ کـەوتووە. چـیـای سـەرسـیـر (١٥٨٩ مەتر)، بە یەکێ لە چیاکانی ئەو گردە دەژمێردرێ.

**کەرکووک**: گردی کەرکووک لە نزیک ڕووباری دیالەوە دەست پێ دەکات و بەرەو ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە، هـەتاکوو دەگـاتە دەشـتی هـەولێر. بەرزاییەکەی لە ڕووی زەریاوە، لە نێـوان ٦٠٠ – ١٠٠٠ مـەتر دایە. ئەم گردە لای ڕۆژئاوای (٥٠٠ مـەتر)، لەچاو ڕۆژهـەڵاتیدا (٣٠٠ مــەترە)، بـەرزترە. پەیدابوونی گـردی کــەرکــووک، بـۆ بەرزبوونـەوەی زەوی دەگــەڕێتــەوە. چیاکـانی ڕۆژئاوایان، زۆربەیان لە ئەنجامی بزووتنەوەیەکی پێچاوپێچی چەماوەدا دروست بوون، کـە لەم چـیـایانـە پێک هـاتوون: تسـاق، خـەڵخـالان و... هتد. چـیـاکـانـی ڕۆژهـەڵاتیش، وەکوو باسکی زەنور و ئۆمەردەلی... هتد.

زێی گەورە و لقەکانـی ڕووباری عوزێم (خاسە، تاوغ و ئاوەسپی) گردی کەرکووکیان لە زۆر جێگادا بڕیوە و بوونـەتـە هـۆی پەیدابونی چەندین گرد و شـیـو. لە نێـوان ئەم گردانەدا، چەند دەشتێکی تەسک هـەن، وەکوو دەشتی ئاوەسپی.

**کواندە**: کەتۆتە باکووری شاری دهۆکەوە. بەرزاییەکەی لە سەر ڕووی زەریاوە، لە نێوان ٢١٠٠ – ٢٤٣٠ مەتر دایە. گردی کواندە بەردەڵانە و بە چیای بڵند و ڕک دەورە دراوە، کە لە زستانانـدا بەفرێکی یەکجار زۆریان،لێ دەبارێ.

**گـەوەر**: بەرزایـی ئەم گـردە لە ڕووی زەریـاوە، ٢٠٠٠ مــەتر دەبـێ. ڕووبەرەکــەی ٢٥٠ کچگە، کە لە ١٥٪ی زەلکاوە. چیـای جـیـلو (٤١٦٨ مــەتر) لە باکـووریـیـەوە هـەڵ کـەوتووە. بەرزترین چیای ئەو نێوچەیەیە و بە درێژایی ساڵ، بەفر لەسەر لوتکەکانی ناتوێتەوە.

**مەلاتیە**: لە باشووری چیای بۆزەوە (٢٥٨١ مەتر) هەڵ کەوتووە، زەوییەکەی بە زۆری لە قوڕ و زیخ پێک هاتووە. لە هـەندێ شوێنیدا کشتوکاڵی لێ دەکرێت، بە تایبەتی گەنم و جۆ. هـەندێ شوێنی دیکەش بۆ لەوەڕاندنی مەڕومالات زۆر باشـە.

**مەلازکیرت**: چیای بینگۆڵ (۳۱۱۱ مەتر) دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای و چیای سیپان (٤٠٥٨ مەتر) لە باشووری ڕۆژهەڵاتییەوەیە. ئەم گردە، بەرزاییەکەی ١٥٠٠ مەتر لە ڕووی زەریاوە دەبێ. خاکەکەی لە مەتیریاڵە نیشتووەکانی زەلکاوی بازیلت پێک هاتووە. لە باشووری مەلازگرددا، دوو گۆمی گچکە هەن، یەکەمیان پێی دوترێ هاچلی (١٦کچگ)، بەرزاییەکەی ١٥٨٣ مەترە و دووەمیشیان ناوی نازیکە (٤٨ کچگ)، کە بەرزاییەکەی ١٨١٦ مەتر دەبێت.

**مـوسڵ**: لە ڕۆژهەڵاتیەوە زێیی گەورە و لە ڕۆژئاواوە چیاکانی شەنگار، برایم و عەتەشانە. بەرزاییەکەی لە نێوان ٣٠٠ – ٤٥٠ مەتر دایە. ڕووبەرەکەی نارێکە و گەلێک چیا و گردی نزمی تێدایە، بەڵام بەرزاییەکانیان لە ٣٠٠ مەتر لەسەر ئاست زەریاوە، زیاتر نین، جگە لە چیای مەقلوب، کە بەرزاییەکەی ١٠٥٧ مەتر دەبێت.

**موش**: لە باکوورەوە پشتە چیاکانی بینگۆڵ (۳۱۱۱ مەتر)، لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە چیای نەمرود (٢٨٢٨ مەتر). تێکڕای بەرزایی گردی موش ١٤٠٠ مەترە. ڕووبەرەکەی ١٦٠٠کچگە. خاکەکەی زۆر بە پیت و بڕشتە، لەبەر ئەوەی لە بنەڕەتدا لە مەتیریاڵە نیشتووەکان پێک هاتووە، کە ئەستوراییەکەی لە نێوان ٨ – ١٠ مەتر دایە. لە ڕۆژهەڵاتی ئەم گردەدا، نێوچەیەکی زەلکاو هەیە، کە ڕووبەرەکەی ٦٠ کچگ دەبێ.

## سێیەم: دەشتەکان

دەشتـەکانی کوردسـتـان وەکوو سـەلمێندراون، بە زۆری لە پێچـاوپێچی چەمـاوە پێک هـاتوون، هەندێکیشـیان  وەکوو بیری لێ دەکرێتـەوە، هەر لە بنەڕەتدا دۆڵ بوون، لە پاشاندا بەرە بەرە بە مەتیریاڵی نیشتووی ڕووبارەکان پڕ بوونەتەوە.

ڕێژەی دەشتـاییەکـان بە لە ١٥٪ی گشت ڕووبەری خـاکی کوردستـان دادەنرێت. هەندێ لەو دەشتاییانەی کوردستان، ئەمانەن:

**ئەمیـر ئاباد:** ڕووبەرەکـەی بە دەیان کـچگ دەبێ و دەکـەوێتـە نێـوچەی کـامـێـارانەوە. تێکرای بەرزایی لە ڕووی زەریاوە، ١٦٠٠ مـەتر دەبێت. ڕووباری ئـەمـیـر ئابادی بـە نێـودا تێـپـەڕ دەبێت و تەنیـا ڕووباریشــە کـە بە درێژایی سـاڵ وشک ناکـات، ئەوە جگە لەوەی ژمارەیەک لە شیو و دۆڵی تێدەکەوێ، کە بە زستانان و بەهاران ئاویان تێدا ڕادەوەستێ.

**ئیغدیر:** یەکێکە لە دەشتە بەپیت و بڕشتەکانی کوردستان. بەرزاییەکەی لە ڕۆژهەڵاتەوە لە نێـوان ٧٠٠ – ٨٠٠ مـەتر دەبێت. ئەم بەرزاییـە زیاد دەکات، هەتا بـەرەو ڕۆژئاوا بڕۆین، تا دەگاتە ١٢٠٠ مەتر لە ڕووی زەریاوە.

**بیجار:** تێکرای بەرزایی دەشتی بیـجاڕ، لەسەر ئاسـتی زەریا لە دەوروبەری ١٧٥٠ مەتر دایە. ڕوبەرەکەی دەگاتە ١٤ کچگ.

**.تاڵ:** دەکـەوێتــە نێـوچەی بانـەوە. بەرزاییـەکـەی لـە ڕووی زەریاوە، لە نێـوان ١٤٠٠ ـــ ١٤٥٠ مەتر دایە. ڕوبەرەکەی چەندین کچگ دەبێ.

**جیـزرە:** سنووری ئەم دەشتــە لە باکوورەوە مـاردین و ئورفـەیە، لـە باشـوورەوە سنووری نێـوان کـوردسـتــان و تورکـیــایە، لە ڕۆژهـەڵاتـەوە چیـای شـەنگارە و لە ڕۆژئاواشــەوە بە ڕووباری فوڕات کۆتایی دێت.

لێژایی ئەم دەشتـە، بە شێـوەیەکی گشـتی، لە باکوورەوە بەرەو باشـوورە. بەرزاییـەکەی لە ڕووی زەریاوە ٣٥٠ مـەترە. سـەمـتی جـزیرە لە نێـوچەی دەریک لە باکـووری ڕۆژهـەڵات بەرەو بـاشـووری ڕۆژئـاوایە، بە نیـشــانەی ئەوەی کــە ئاوەکــانی نێـوچەی دەریک، ڕوو لە ڕووباری خـابور دەکـەن . سەمتی ئەم دەشتـە، لە نێوچـەی ماردین و قـەرەچوغ لە باکووری ڕۆژئاوا، بەرەو باشـووری ڕۆژهـەڵاتە، بەڵگەش بۆ ئەمـە، ڕووبارەکـان بـەرەو ڕووباری دیجلە دەڕوات.

**حەویجە**: دەشتێکی فراوانە و دەکەوێتە نێوان زێی گەورە و ئاوی سیروان. لێژاییەکەی لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو باشووری ڕۆژئاوایە، واتا بەرەو ڕووباری زەغەیتون دەڕوا. خاکەکەی لە قوڕ پێک هاتووە.

**ڕانیــە**: لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە. درێژاییەکەی ٣٠ کم دەبێت. ڕووبەرەکەی لە نێوان ٢٠ ـــ ٣٠ کچگ دایە. ڕووباری سیروان بە ناویدا تێپەڕ دەبێت و دەیکات بە دوو بەشەوە. بەشی ڕۆژهەڵاتی بە دەشتی پشدەر بەناوبانگە، بەشەکەی ڕۆژئاواشی بە دەشتی بیتوێن ناو دەبرێ. بەرزایی دەشتی ڕانییە، بە شێوەیەکی گشتی، لە نێوان ٥٠٠ ـــ ٦٠٠ مەتر دایە.

**شەنگار**: ئەم دەشتە لە ئەستێڵێکی گەورە پێک هاتووە. ڕووی زەوییەکەی لەبەر پرۆسێسی ڕووتاندنەوەی زەوی، هەمووی دادراوە. دەشتی شەنگار لەگەڵ چیای شەنگار، بەرەو نێوچەی دەریک درێژ دەبێتەوە. ڕووبەرەکەی لە دەوروبەری ١٨٠ کچگ دایە. لە نێو ئەم دەشتەدا، کۆمەڵێ شیو هەن، کۆمەڵێ چەمیشی پێدا تێپەڕ دەبێت، کە لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات درێژ دەبنەوە، هەمووشیان دەڕژێنە ڕووباری دیجلەوە.

**ساحب**: دەکەوێتە نێوچەی سەقزەوە. ڕووبەرەکەی لە نێوان ٣٠٠ ـــ ٤٠٠ هێکتار دایە. لەم دەشتەدا، چەندین جۆر دەغڵودانی لێ دەچێندرێ، بە تایبەتی گەنم و جۆ.

**سلێمانی**: درێژاییەکەی لە دەوروبەری ٦٥ کم دایە. پانایییەکەی لە نزیک شاری سلێمانییەوە، ١٥ کم دەبێ. بڵندی لە ڕووی زەریاوە، بە سەدان مەتر دەبێت. لای باشووری نزمە و زەلکاوییە. ڕووباری تانجەرۆ لەگەڵ چەندین ڕووباری دیکەدا، بە نێو ئەم دەشتەدا تێدەپەڕن. دەشتی سلێمانی لەگەڵ دەشتی شارەزوور، پێک دەگەنەوە.

**سندی**: پانایی دەشتی سندی (زاخۆ)، لە دەوروبەری ٦ کم دایە. درێژاییەکەی لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا ٦٠ کم دەبێت. تێکڕای بەرزایی لە ڕووی زەریاوە، لە نێوان ٤٠٠ – ٦٠٠ مەتر دایە. چیای بەرواری باڵا (مەتینە)، دەکەوێتە باکووری و چیای بەرواری ژێرێش (گارە)، لە باشوورییەوە هەڵ کەوتووە. ڕووباری خابور ئەم دەشتە ئاو دەدات.

**شارەزوور**: چیای چوارتا لە باکووری دەشتی شارەزور هەڵ کەوتووە، لە ڕۆژهەڵاتەوە بە چیای هەورامان دەورە دراوە، لە باشوورەوە چیای بالامبور هەیە. درێژاییەکەی لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، نزیکەی ٤٥ کم دەبێت. ڕووبەرەکەی لە نێوان ١٥ – ٢٥ کچگ دەبێت. تێکڕای بەرزایی لە نێوان ٤٥٠ – ٦٠٠ مەتر دەبێت.

دەشتی شارەزوور، بە بۆچوونی هەنێک لە شارەزایان، چەماوەیەکی دەرپەڕیوە. بە

بڕوای دەســتــەیەکی دیکەش چەمـاوەیـەکی قـوپاوە، کـە لە دواتردا پڕ بووە لـە مـەتیـریاڵی ڕووبارەکان. ئەم دەشتـە زۆر بەپیت و بڕشتـە، چەندین ڕووباری بە نێودا تێپـەڕ دەبێت، لە هـەمـوویان گرنگتر ڕووباری تانجـەرۆیە. باشووری ئەم دەشتـە، لەبەر نزمی لە زستـانان و بەهاراندا، دەبێتە زەلکاو.

**شوی:** دەکەوێتە نێوچەی بانەوە. ڕووبەرەکەی لـە نێوان ١٥٠٠ – ٣٠٠٠ هێکتـار دایە. بەرزاییـەکەی لە ڕووی زەریاوە، لە دەوروبەری ١٤٥٠ مـەتر دایە. ڕووبارەکانی شـوی و نژو، بە نێو ئەم دەشتەدا تێدەپەڕن و کەڵکی زۆریان بۆ ئاودانی دەغڵودان لێ وەردەگیرێ، وەکوو گەنم و جۆ و چەوەندەر و نۆک و تووتن.

**قەراج:** لە بنەڕەتدا نوشتـاوەیەکی قـوپاو بووە، لە دوایدا بە زیخ و تەفـەل پڕ بۆتەوە، کە ئاوەڕۆکان لە بەرزایی چیاکانەوە، لەگەڵ خۆیاندا هێناویانن. بەرزاییەکەی لە نێوان ١٨٠ – ٢٣٥ مەتر لە ڕووی زەریاوە دەبێ.دەشتی قەراج لە بناری چیـای قەرەچوغەوە، بەرەو گردی کەرکووک و توزخورماتوو درێژ دەبێتەوە.

**قرەو:** ڕووبـەرەکەی نزیکەی ٥٩ هـەزار هێکتار دەبێت. بەرزاییەکەی ١٨٠٠ مەتر لە ڕووی زەریاوەیە.. چەمی شۆر بە نێویدا تێپەڕ دەبێت.

**کەندیناوە:** ئەم دەشتە درێژاییەکەی ٨٠ کم و پانایيەکەی ١٦ کم دەبێت. بەرزاییەکەی لە ڕووی زەریاوە ٢٧٥ مـەترە. دەشتـی کەندیناوە لە نـێوان زورگـەزراو چیـای قەرەچوغدا هـەڵ کـەوتووە. لێـژایی لای بـاکـووری ڕۆژئاوای، بەرەو زێـی گـەورەیە و ئـەوەی لای باشــووری ڕۆژئاواشـی بەرەو زێی گچکەیە.

**کامیاران:** بەرزاییـەکەی لە ڕووی زەریاوە، خـۆی لە ١٤٠٠ مـەتر دەدات. ڕووبـەرەکـەی لە دەوروبەری ١٨ هـەزار کـچگ دەبێت. دەشتـێکی بەپیت و بڕشتـە، چەندین جـۆر بەرهـەمـی لێ دەچێندرێ، بە تایبەتی گەنم و جۆ. هـەروەهـا لەوەڕگەیەکی زۆریشـی لێ هـەیە.

**ماردین:** ئەم دەشتـە لە باشـووری شـاری مـاردین دایە. درێژاییـەکەی لە باکـوورەوە بۆ باشـــوور، لـە دەوروبەری ٢٥ کـم دایە، لـە ڕۆژهـەڵاتـەوە بۆ ڕۆژئـاوا، ٣٠ کم دەبێت. گـــردی مـــاردین کــە بەرزاییــەکــەی لە ڕووی زەریاوە، ١٠٠ مــەتر دەبێت، کـەوتـۆتە باکـووری ئەم دەشتەوە. بەرزایی دەشتی ماردین لە باکورەوە ٦٠٠ مەترە و لە ناوەڕاستەوە ٥٠٠ مەترە و لە باشوورەوە ٤٥٠ مەترە.

**مەریوان:** لە باکووری دەشتی مەریوان، پشتە چیاکانی پشت شەهیدان هـەڵ کەوتووە، لە باشوور و ڕۆژئاواوە، کێوەکانی وەیسە و میرحاج، لە ڕۆژهـەڵاتیشـەوە گردەکانی ڕووباری گارانە. تێکڕای بەرزایی لە ڕووی زەریاوە، لە نێوان ١٢٦٠ – ١٣٥٠ مەتر دایە.

**هەولێـر**: درێژایی دەشـتی هەولێـر، لە باشـووری ڕۆژهەڵاتەوە هەتاکـوو باکـووری ڕۆژئاوای، لە دەوروبەری ٣٠ کم دایە. پانییەکەشی نزیکەی ٤٢ کم دەبێت. ئەم دەشـتە لە بنەڕەتەوە، چەمـاوەیەکی قـوپاو بووە، لە دوایدا بە مـەتریاڵی نیـشـتـووی ڕووبـارەکـان پڕ بۆتەوە، کە لەگەڵ خـۆیان ڕایانداوە. ڕووبەرەکەی بەرز و نزم هەڵ کەوتووە و چەندین دۆڵی تێدایە، کە لەو ڕێگایانەوە، ئاوەکەی دەڕژێتە نێو زێی گچکە و گەورەوە.

بەرزاییـەکـەی لە ڕووی زەریاوە، لە لای ڕۆژهەڵاتییـەوە خـۆی لە ٤٦٠ مـەتر دەدات، لە هەندێ شـوێنیـشـدا بۆ ٥٥٠ مـەتر بەرز دەبێتـەوە. بەڵام بەرزایی ڕۆژئاوای لە ٣٠٠ مـەتر زیاتر نابێ. چیای دیدەوان لە ڕۆژئاوای و زورگەزراو لە باشووری هەڵ کەوتوون.

**ئورفە**: ئەم دەشـتـە دەکەوێتە باشـووری شـاری ئورفەوە. درێژاییەکەی لە باکوورەوە بۆ باشـوور، نزیکەی ٥٠ کم دەبێت. پانایـیـەکـەی لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، ٣٠ کم دەبێت. تێکڕای بـەرزایی لە ڕووی زەریاوە، لە نێـوان ٦٠٠ – ٧٠٠ مـەتر دایە. بەڵام لای ڕۆژهـەڵاتی لە تێکڕای بەرزیی گشتی کەمێک نزمترە و لە نێوان ٥٠٠ – ٦٠٠ مەتر دایە.

دەشتاییەکانی نێوان بەرزاییەکانی ئەڵوەند لە ڕۆژهەڵات و چیای بیدسورخ و سەحەنە

پانایی ئەو دەشتە، نزیکەی ٥٥ کچگ دەبێت. لە باکوورەوە بەرزە، لەبەر ئەوە هاتوچۆی خـۆش نییـە. بەڵام لای باشـووری بـە تەواویی ئاواڵە و ڕێکە، هـەر لەبر ئـەم هۆیەشـە، ڕێگای نێوان قەزای نەهاوەند و تویسرکان بەم لایەدا کێشـراوە. ئەم دەشـتـە بەپیتـە و کشـتوکاڵی جۆراوجۆری تێدا دەکرێ.

**دەشتی نێوان سەحنە و کرماشان**: ئەو دەشتە لەبن پای بەرزاییەکانی بید سورخەوە دەست پێ دەکات و بـە بەرزاییەکانـی نەعلشکن کۆتایی پێ دێت. پانتـایی نزیکەی ٩٠ کیلـۆمەترە و بارزاییـەکانی پەررۆ و شـاهـۆ کەوتوونەتە باکوورییـەوە. دەشـتی ناوبراو بـەپیتـە و چەندین ڕووباریشی پێـدا تێـدەپەڕێ، بەڵام لەبـەر ئەوەی ڕووبارەکـان قـوڵن، ناتوانرێ هـەروا بە ئاسـانی ئاوەکانیـان بگەیەندرێتە ڕۆخی زەوییە کشـتوکاڵییـەکان، لەبەر ئەوە، ئەم کـەرتە ئابوورییە لەو دەشتەدا، زۆر سەرکەوتوو نییە (٣٦، لاپەڕە ١٠٧).

**دەشـتی مـاهی دەشت**: ڕۆژهەڵاتی ئەم دەشـتـە بەرزاییـەکـانی نەعلشکن و ڕۆژئاوای بەرزاییەکانی حـەسـەن ئاباد و چەهار زەبەر دەریدەیە. پانایـیەکەی نزیکەی ٢٥ کیلـۆمـەتر دەبێت و لە دوو لاوە کراوەیە. لەبەر ئەوەی ئەم دەشـتە ئاوی زۆرە و خاکەکەشی بەپیتـە، لە نێوچەی کرماشـاندا، بە یەکێ لە دەشـتە سـەرەکییەکانی کشـتوکاڵ دادەنرێت (٣٦، لاپەڕە ١٠٧).

**دەشتەکانی ئیسلام ئاباد و کەرەند:** ئەم دەشتانە لە ڕۆژهەڵاتەوە بە چیاکانی داڵاهۆ وفەرح دەورەیان گیراوە. دامێنی لایەنەکانی بە دار داپۆشراون و خاکەکەی بۆ کشتوکاڵ بەپیتە. دەشتی ئیسلام ئاباد، پانایییەکەی نزیکەی ٤٥ هێکتار دەبێت و دەشتی کەرەندیش نزیکەی ١٠ هەزار هێکتارە.

**دەشتی نێوان بەرزاییەکانی پاتاق و خەسەروی:** پانایی ئەم دەشتە، لە نێوان ٢٠ – ٧٠ کیلۆمەتر دایە. بەرزاییەکەی لە ڕووی زەریاوە کەمە و ئاووهەواشی گەرمە.

## بەشی چوارەم: ئاووهەوا

سەرەتای تۆمارکردنی ڕەگەزەکانی ئاووهەوا لە کوردستاندا، بۆ کۆتایی ساڵەکانی بیست دەگەڕێتەوە. ئێسگەی ئاوی دەوڵەتی و ئێسگەی میترولوژی دەوڵەتی لە ساڵی ١٩٢٩دا و ئێسگەی تۆمارکردنی پلەی گەرما و بارستایی بارانیان، لە سەنتەری پارێزگاکانی دیاربەکر، گازی ئانتەب، ئورفە، سیرت و لە ساڵی ١٩٣٩دا، لە سەنتەری ماردین دامەزراند. لە دوای ئەم ساڵەش، دەزگا ناوبراوەکان سەرەڕای دەزگاکانی تۆمارکردنی پلەی گەرما و بارستایی باران، ئێسگەی ئاووهەوایی دیکەیان، وەکوو ئێسگەی فشار، با، تەم، تۆز، لە سەنتەری پارێزگاکان و هەندێ شوێنی دیکەیان دامەزراند. ئێستا زیاتر لە ١٥٠ ئێسگەی هەمەچەشنەی ئاووهەوایی لە کاردان.

زانیاری ئاووهەوایی لە کوردستاندا، بێ کەموکوڕی نییە، لەبەر ناشارەزایی، یەک لایەنی ئیستگەکان (تەنیا باران یاخود تەنیا گەرما)، ناتەواوی لە هەڵبژاردنی شوێنەکاندا، لە کارکەوتنی هەندێ لەو مەکینە و ئیسگانە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن و جاری واش هەیە تا سەر بە خراپی دەمێنێتەوە و چاکیان ناکەن، کەمی ژمارەیان لەچاو ڕووبەری کوردستاندا، کۆبوونەوەی زیاتر و تەنیا لە سەنتەری پارێزگاکاندا، بێئاگایی لە بایەخی ئێسگەی ئاووهەوایی و دژواری باری ڕامیاری... هتد.

### ٠١ هۆکانی کارلێکردنی ئاووهەوا

ئاووهەوای کوردستان، بە هۆی ئەم چەند خاڵەی لای خوارەوە دواکەوتووە:

#### پانایی جوگرافی

بە یەکێ لە هەرە هۆ گرنگەکانی دیاریکردنی ئاووهەوا دادەنرێ، لەسەر ڕووی زەویدا. ئەو شوێنانەی دەکەونە نێوان هێڵی پانی ٤ –٥، ئاووهەوایان لە کەژەکانی ساڵدا زۆر لێک دەچێ و ماوەی تیشکی خۆر و ڕووناکی یەکسان دەبێ، بەڵام چەند بەرەو هێڵەکانی پانی دیکە بڕۆین، ئەم دیاردەیە دەگۆڕێ.

کوردستان هەر وەکوو لەمەو پێش باسمان کرد، دەکەوێتە نێوان هێڵی پانی ٤٠,٣٩ هەتاکوو ٣٠,٦١ باکوور. ئەم نێوچەیەش کەوتۆتە باشووری نێوچەی سازگاری باکوورەوە، ئاووهەوای ئەم پاناییە جوگرافییە، لە نێوان بیابانی گەرم و ئاووهەوای زەریای ناوەند دایە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، جیاوازی لە نێوان نێوچەکانی کوردستاندا، زۆر هەیە، بە

تایبەتی لە پلەی گەرما و بارستایی باران و جۆرە بارینەکانی دیکەدا، بۆ نموونە، پلەی گەرما لە باکووردا، لەچاو پلەی گەرمای باشووردا، سێ کەڕەت نزمترە. هەتا لە باکوورەوە بەرەو باشوور بڕۆین، بارستایی باران بەرەو کەمی دەڕوات. هەروەها جۆر و شێوەی بارینەکانیش دەگۆڕێ، ئەگەر هاتوو لە باکووردا، بەفرێکی ئاسایی ببارێ، ئەوا لە باشووردا بەدەگمەن نەبێ، بەفر نابارێ، بە تایبەتی لە باشووری ڕۆژئاوادا.

**دوور و نزیکی لە زەریاکانەوە**

کوردستان بە زەریاکانی خەزەر و ڕەش و ناوەندیی و سوور و کەنداوی عەرەبی و ئەسکەندەرون دەورە دراوە. لە ڕووی ئاووهەواوە، زەریای ناوەند بە پلەی یەکەم و کەنداوی فارسی بە پلەی دووەم، کاریخۆیان لەسر ئاووهەوای ئەم وولاتە دەکەن. بەشی هەرە زۆری باران سەرچاوەکەی تۆفەکانی زەریای ناوەندە. هەروەها سیستەمی بارانبارین، زستانی تەڕە و هاوین وشکە، لە سیستەمی هەمان زەریاوە وەرگیراوە.

**کەرتی وشکی ئاسیا**

کەرتی ئاسیا، بە گەورەترین بەشی وشکانی سەر ڕووی زەوی دەژمێردرێ. لەسەر ڕووەکەی هەمەچەشنە دیاردەی ئاووهەوا ڕوو دەدات، نەوەکوو هەر کار لە دروسبوونی ئاووهەوای خۆی دەکات، بەڵکوو لە هەندێ کاتیشدا، کار لە بەشەکانی دیکەی جیهانیش دەکات. ئاووهەوا لە کوردستاندا، تا ڕادەیەکی زۆر، لە ئەنجامی کارلێکردنی کەرتی ئاسیا پەیدا دەبێ، لە پێش هەمووشیانەوە با، لە دوایشدا پلەی گەرما و بارستایی باران.

**ڕوو**

بەرزی ڕووی زەوی لە سەر ئاستی زەریاوە، لە هەندێ نێوچەکانی باکووری کوردستاندا، لە پێنج هەزار مەتر زیاترە. بەڵام ئەم بەرزییە، هەتا بەرەو باشوور بڕۆین،نزم دەبێتەوە، هەتا وای لێ دێت، بەرزییەکە لە چەند مەترێک زیاتر نابێت، واتا پلەی گەرما لە باکوورەوە بەرەو باشوور زیاد دەکات. لە گوێرەی بارانیشەوە، دەتوانین هەمان شت بڵێین، واتا بارستایی باران لە باکوورەوە بۆ باشووری کوردستان، بەرەو کەمی دەڕوات. سەمتی چیاکان و بەرزاییان، کارێکی زۆر لە سەر سەمتی با و تۆفی ئەندامەکانی دیکەی ئاووهەوا دەکەن.

## ٠٢ ڕەگەزەکانی ئاووهەوا

پلەی گەرما، بارستایی باران، فشار و با، بەفر، شەختە، هەور، تەم، شێداری ڕێژەیی، ڕەگەزەکانی ئاووهەوا پێک دەهێنن. لێرەدا بەپێی توانا، باسیان دەکەین:

### گەرما

گەرمای هەوا، ئەو قەبارە گەرمایەیە کە ڕووی زەوی لە تیشکی ڕۆژەوە پێی دەگات. بە یەکێ لە بە بایەخترین ڕەگەزەکانی ئاووهەوا دادەنرێت. لە ڕاستیشدا، هەموو ڕووداوەکانی ئاووهەوا، بەرهەمی گەرمان. قەبارەی گەرما، ئەو فاکتەرەیە کە پۆشەکی ڕووەکی و جۆرەکانی ئاژەڵ و ژیانی ئاسایی مرۆڤ، لە قوژبنە جیاوازەکانی گۆی ئەم زەوییە پێک دەهێنێت.

### تێکڕای پلەی گەرمای ساڵ

تێکڕای پلەی گەرمای ساڵ لە کوردستاندا، لە دەوروبەری ١٥ پلەی سانتیگراد دایە، واتا ئاووهەوا لە ڕووی گەرمییەوە فێنکە (مامناوەندی). ئەمەش بۆ شوێنگەی جوگرافی نێوچەی فێنکی باکوور دەگەڕێتەوە. ئەم ژمارەیە لە هەندێ ساڵدا، ٣ – ٤ پلە زیاد دەکات، لە ساڵی واشدا هەیە، ١ – ٢ پلە کەم دەکات.

تێکڕای گەرمای ساڵانە، لە هەموو قوژبنەکانی کوردستاندا،هەمان شت وەکوو یەک نییە، ئەویش لەبەر جیاوازی بەرزیی و نزمی لە ڕووی زەریاوە و دوور و نزیکی لە هێڵی یەکسانی و شوێنگە بەگوێرەی باتۆفی زەریای ناوەڕاست و دوور و نزیکی لە زەریاوە. بڕوانە خشتەی ژمارە (١).

بەرزترین پلەی گەرما وەکوو لە ژمارەکانی ناو خشتەی ژمارە (١) دا دەردەکەوێ، لە شارەکانی ئورفە، خوڕەم ئاباد، ئیلام دان، نزمترینیشیان لە شارەکانی ئەرزەڕۆم و وان دان.

**خشتەی ١** **تێکڕای پلەی گەرما (سانتیگراد) لە ئێستگەکانی سینوپتیکدا**

| ئێستگەی سینوپتیک | بڵندی لە ڕووی دەریا (م) | لە ماوەی ساڵ | پلەی گەرما سانتیگراد |
|---|---|---|---|
| دیاربەکر | ٦٦٠ | ٦٢ | ١٥,٨ |
| ئەزرنجان | ١٢١٥ | ٥٨ | ٥,٩ |
| ئەرزەڕۆم | ١٨٦٩ | ٦٢ | ١٠,٩ |
| گازی ئانتەب | ٨٠١ | ٦٢ | ١٣,٦ |
| مەلاتیە | ٩٩٨ | ٦١ | ١٥,٩ |
| سیرت | ٨٩٥ | ٤٩ | ١٨,١ |
| ئۆرفە | ٥٤٧ | ٥٩ | ٨,٧ |
| وان | ١٧٢٥ | ٥١ | ١٣,٣ |
| ورمێ | ١٣١٣ | ٤٦ | ١٦,٤ |
| ئیلام | ١٣٦٣ | ١٠ | ١٧,٤ |
| خورەم ئاباد | ١١٢٥ | ٤٦ | ١٣,٣ |
| سنە | ١٣٧٣ | ٣٧ | ١٢,٨ |
| شەهری کورد | ١٩٩١ | ٤١ | ١٤,٠ |
| کرماشان | ١٧٥٤ | ٥٣ | ١٤,٧ |
| یاسوچ | ١٨٨٠ | ١٠ | ١٥,٨ |

**مەودای پلەی گەرمای ساڵانە**

تێکڕای پلەی بەرزی گەرما، ٣٠ پلە لەسەرو سفرەوەیە، تێکڕای پلەی نزمی، ٢٠ پلە لە ژێر سفرەوەیە. واتا جیاوازی نێوان بەرز و نزمی پلەی گەرمای ساڵانە، ٥٠ پلەیە، ئەم جیاوازییەش لە نێوان ئێسگەکانی کوردستاندا، گەلێ ڕوون و ئاشکرایە. تەماشای خشتەی ژمارە (٢) بکە.

جیاوازی پلەی گەرما، وەکوو لە ژمارەکانی نێو خشتەی ژمارە (٢) دەردەکەوێ، دەگاتە ئەو پەڕی بەرزی، لە گازی ئانتەب (٨٦ پلە)، قەرەکۆسە (٨١ پلە)، وان (٧٦ پلە) ... هتد. ئەوپەڕی پلەی نزمیش لە ئێسگەی سەلاحەدین (٧ پلە)، بەکرەجۆ (١٣ پلە)، دێزفول (١٦ پلە).

**تێکڕای پلەی گەرمای وەرزەکانی ساڵ**

تێکڕای پلەی گەرما لە وەرزەکانی ساڵدا، لەبەر جیاوازی قەبارەی گەرما، کە زەوی لە تیشکی ڕۆژەوە وەری دەگرێت، سەمتی تیرۆژی ڕۆژ و درێژ و کورتی تیرۆژی ڕۆژ و شوێنگەی زەوی بە ڕێژەی ڕۆژەوە ... هتد، هەموویان وەکوو یەک نین. بەرزترینپلەی گەرما لە وەرزی هاویندایە و بە شێوەیە بەرز دەبێتەوە، تا دەگاتە ٢١ سانتیگراد. ئەمش زیاتر لەبەر بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی هەوا و لە دەسدانی ئەو شێیانەی کە تەوژمی زەریاکان لەگەڵ خۆیان هەڵیان دەگرن، پێش ئەوەی بگەنە سەر خاکی کوردستان و هاتنی بای وشک بە تایبەتی لە لای باشوورەوە. ئەم بایانە هەموو کاتێک وشکن، چونکە خۆیان لە شوێنی وشکەوە هەڵ دەکەن. بە پێچەوانەوە لە وەرزی زستاندا، پلەی گەرمی نزم دەبێتەوە، هەتا دەگاتە پلەی ,١٥ ئەوەش بە پلەی یەکەم، بۆ هاتنی بای ساردی سیبریایی دەگەڕێتەوە، کە سەرچاوەکەی زۆر سارده و ڕێ لە بای وشکی باشوور دەگرێ، بە هۆی ئەوەوە کە فشار لەسەر خاکی کوردستان زۆر بەرزە.

تێکڕای پلەی گەرمای وەرزی بەهار – ١٧ سانتیگراد و پاییز – ١٥ سانتیگراد، زۆر گەورە نییە، لەبەر وێکچوونی ڕەگەزەکانی ئاووهەوا بە تایبەتی گەرما.

هەرێمە جیاجیاکانی کوردستان، لە ڕووی تێکڕای پلەی گەرمای وەرزی هاوینەوە، زۆر لە یەک دەچن. ئەم دیاردەیە لە باکوور – ٢٠ پلەیە، لە باشوور– ٢١ پلەیە، لە ڕۆژهەڵات – ٢١ پلەی و لە ڕۆژئاواش – ٢٢ پلەیە. بە هەمان شێوەش لە زستاندا، باکوور – ١١ پلە، باشوور – ١٢ پلە. ڕۆژهەڵات – ١١ پلە و ڕۆژئاواش – ١٤ پلەیە.

**خشتەی ٢** **جیاوازی نێوان بەرزی و نزمیی پلەی گەرمای ساڵانە لە ئێستگەکانی میترۆلۆژیدا (سانتیگراد)**

| ئێستگە | پلەی گەرما | | لە ماوەی ساڵ |
|---|---|---|---|
| | بەرز | نزم | |
| بەکرەجۆ | ٢٤ | ١١ | ١ |
| خۆی | ١٨ | ٥ | ٢٢ |
| خورەم ئاباد | ٢٦ | ١٠ | ٢٢ |
| دێزفول | ٣٢ | ١٦ | ٢٢ |
| دێرک | ٤٦ | ٦ | ١٨ |
| دیاربەکر | ٢١ | –٢٤ | ٤٢ |
| سنە | ٤٣ | ٥ | ٢٢ |
| سیرت | ١٩ | –١٩ | ٢٩ |
| سەقز | ١٩ | ٤ | ٢٢ |
| سەلاحەددین | ١٩ | ١٢ | ٤ |
| شەهری کورد | ٢١ | ٤ | ٢٢ |
| شەنگار | ٢٠ | ١١ | ١٨ |
| عەینولعەرەب | ٣٠ | ٥ | ١٨ |
| گازی ئانتەب | ٤٣ | –٤٣ | ٢٤ |
| قەحتانیە | ٣٠ | ٦ | ١٨ |
| قامشلی | ٣٢ | ٧ | ١٨ |
| قەرەکوسە | ٢٨ | –٤٣ | ٢٤ |
| کرماشان | ٢٢ | ٧ | ٢٢ |
| کەرکووک | ٢٨ | ١٥ | ٣٠ |
| مەلاتیە | ٤٢ | –٢٥ | ٤٢ |
| وان | ٤٧ | –٢٩ | ٣١ |
| ورمێ | ١٨ | ٥ | ٢٢ |
| ئەرزنجان | ٤١ | –٣٣ | ٣٨ |
| ئەرزەڕۆم | ٣٤ | –٣٠ | ٤٢ |
| ئورفە | ٤٧ | –٢٩ | ٣١ |
| موسڵ | ٢٧ | ١٤ | ٣٠ |

### تێکڕای پلەی گەرمای مانگەکان

پلەی گەرما لە مانگی یولدا، کە گەرمترین مانگی ساڵە، بەرز دەبێتەوە و لە هەندێ ئێسگەدا، دەگاتە ٣٤ پلە. لە مانگی ژەنیوەریدا کە بە ساردترین مانگ دادەنرێت، نزم دەبێتەوە بۆ یەک پلە و هەندێ جاری واش هەیە، بۆ کەمتریش نزم دەبێتەوە، واتا جیاوازی لە نێوان گەرمای ئەم دوو مانگەدا، یا لە نێوان بەرزترین و نزمترین پلەدا – ٣٣ پلەیە. تەماشای خشتەی ژمارە (٣) بکە.

پلەی گەرما وەکوو لە ژمارەکانی نێو خشتەی ژمارە (٣) دەردەکەوێ، لە مانگی مایدا زیاد دەکا و وردە وردە بەرز دەبێتەوە، هەتا دەگاتە لوتکە لە مانگی یولدا، بگرە لە ئۆگەستیشدا هەر بەردەوام دەبێت، لە پاشان لە مانگی ئەکتۆبەردا، بەرە بەرە نزم دەبێتەوە، هەتا دەگاتە نزمترین پلەی لە مانگی ژەنیوەریدا.

گەرمای مانگی یول – بە گەرمترین مانگی ساڵ دەژمێردرێ، تێکڕای پلەی گەرما ٣٠ پلەیە (بەرواری – ٢٦ پلە، جزیرە – ٣٤ پلە). لەبەر ڕوونی ئاسمان، کە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی ئەوەی، گەرماییەکی زۆر بگاتە سەر ڕووی زەوی، تیشکی ڕۆژ بە شێوەیەکی ستونی، گەیشتنی بای زەریاکان بەبێ شێدارەکانیان، نەهاتنی بای سیبریای سارد.

گەرمایی مانگی ژەنیوەری – پلەی گەرما لەم مانگەدا، تەنیا ٣ پلەیە (بەرواری – سفر، ئورفە – ٥ پلە). هۆکانی ئەم نزمی پلەی گەرمایە، بۆ گەیشتنی گەرماییەکی کەم لە تیشکی ڕۆژەوە بۆ سەر ڕووی زەوی دەگەڕێتەوە، لەبەر ئەوەی لەو مانگەدا، هەورێکی زۆر لە ئاسماندا بەری تیشکی ڕۆژ دەگرێ. هەروەها لەو مانگەدا بایەکی ساردی سیبیری هەڵ دەکات، لە نێوچە شاخاوییەکانیشدا فشار بەرز دەبێتەوە... هتد.

### تێکڕای پلەی گەرمای شەو و ڕۆژ

دوایێ ئەوەی خۆر هەڵ دێت، هەوا دەست بە گەرمبوون دەکات، هەتا وای لێ دێت، لە کاتژمێری یەکی پاش نیوەڕۆدا، دەگاتە ئەوپەڕی گەرمی، لە پاشان بەرە بەرە نزم دەبێتەوە و لە نیوە شەودا دەگاتە نزمترین پلە.

پلەی گەرمایی ڕۆژ، لە دەوروبەری ٢٥ پلەدا دەبێت (لە هاویندا – ٤٣ پلە، لە زستاندا – ٤ پلە) هی شەویش لە١٠ پلە نزیک دەبێتەوە (لە هاویندا ــ ١٤ پلە، لە زستاندا ــ ٤ پلە) واتا جیاوازی نێوان گەرمای شەو و ڕۆژ، ١٥ پلەیە. هۆکانی ئەم جیاوازییەش، بۆ ڕوونی ئاسمان و بارستایی ئەو گەرماییەی کە زەوی لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا وەری دەگرێ و سەمتی تیشکی ڕۆژ ... هتد دەگەڕێتەوە.




شوێنی کوردستان لە تۆفەکانی دەریای ناوەڕاست

**باران**

باران ڕەگەزێکی دیکەی گرنگی ئاووهەوایە، ئەو شوێنانەی بارانی باشی لێ دەبارێ، بە شوێنەوارێکی باش بۆ ڕووەک و گیانلەبەرە هەمەچەشنەکان دادەنرێ. بەپێچەوانەی ئەو نێوچانەوە، کە بارانیان کەمە و وشکن. باران ڕۆڵێکی گەورە، لە دیاریکردنی چالاکی ئابووری کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا دیاری دەکات.

**تێکڕای ساڵانەی باران**

تێکڕای ساڵانەی باران لە کوردستاندا، ٦٠٠ ملیمەترە. سەرچاوەی ئەم بارانەش، بە پلەی یەکەم بۆ تۆفەکانی زەریای ناوەڕاست دەگەڕێتەوە سەیری گرافی ژمارە (١) بکە.. هەرچەندە ژمارەی تۆفەکان زیاتر بێت، ئەوەندە باران زیاتر دەبارێت و بەپێچەوانەشەوە کەمبوونی ژمارەی تۆفەکان، تێکڕای بارانی ساڵانە کەم دەبێتەوە،واتا بارستایی باران لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی دیکە جیاوازە.

باران بە شێوەیەکی گشتی، لە نێوچەکانی باکوور و ناوەڕاستدا، لەچاو نێوچەی باشووردا زیاترە و لە باشووری ڕۆژئاوا و ڕۆژئاوادا، لەچاو نێوچەکانی باکوور و باکووری ڕۆژهەڵات کەمترە. لە نێوچە شاخاوییەکاندا، لەچاو نێوچە دەشتاییەکاندا، دوو تا سێ جار زیاترە. واتا جیاوازییەکی گەورە لە ڕووی بارستایی بارانەوە، لە نێوان نێوچەکانی کوردستاندا هەیە. تەماشای خشتەی ژمارە (٤) بکە.

جیاوازی نێوان بەبارانترین و بێبارانترین ئێسگە، وەکوو لە خشتەی ژمارە (٤) دەردەکەوێ، لە ١٠٠ ملم زیاترە (ساسۆن – ١٢٥٩ ملم، خۆی – ٢٥٨ ملم). هۆی ئەم جیاوازییەش، بۆ شوێنی ئێسگەکە لە تۆفانەکانی زەریای ناوەڕاستەوە و بەرز و نزمی لە ڕووی ئاستی زەریاوە و چەشنی تۆپۆگرافی خاکەکە دەگەڕێتەوە.

**خشتەی ٤** **تێکڕای بارانی ساڵانە**

| ئێستگە | تێکڕای بارانی ساڵانە ملم | لە ماوەی ساڵ | ئێستگە | تێکڕای بارانی ساڵانە ملم | لە ماوەی ساڵ |
|---|---|---|---|---|---|
| کیلیس | ١٠٥٠ | ٤٧ | بوجاق | ٦٥٢ | ٥ |
| گازی ئانتەب | ٥٥٦ | ٤٦ | چونگوش | ١٠٥٥ | ١٤ |
| ئەل بەیلی | ٤٠٥ | ١٢ | سیڤەرەک | ٥٤٨ | ٤٨ |
| یاوز ئەلی | ٥١٤ | ١٢ | چەرمیک | ٨٢٢ | ٢٣ |
| عارەبان | ٥٢٥ | ١٧ | قەرەکاچی | ٣٧٦ | ٩ |
| نیزیب | ٤٥٤ | ٢١ | قەرەجەداغ | ٣٦٨ | ١٠ |
| خالفەتی | ٤٦١ | ١٥ | بۆغوتلەن | ٣٧٨ | ١١ |
| بیرەجیک | ٣٧٣ | ٢٥ | بۆزۆڤا | ٤٠٧ | ١٩ |
| بەراک | ٣٤٠ | ١٣ | ئاقچەقەڵا | ٣١٨ | ٢٣ |
| یاییلاق | ٣٩٠ | ٧ | داغ باشی | ٤٩٢ | ١١ |
| سەمسات | ٥٠٨ | ١٥ | ئەرغانی | ٧٧٩ | ٢٠ |
| مورشید پینار | ٢٨٤ | ١١ | مەعدەن | ١٠١٣ | ١٨ |
| ئادیەمان | ٧٩٧ | ٤١ | وێرانشەهر | ٥٤٠ | ٢٧ |
| دوتلوجە | ٣٨٤ | ١٤ | دەمیرجی | ٥٨٧ | ١٠ |
| سوروج | ٣٦٠ | ٢٤ | جەیلان پینار | ٣٣٣ | ٢٣ |
| ئاق پینار | ٥٥٤ | ١٥ | دیجلە | ٨٨٦ | ٢١ |
| کەحاتە | ٦٦٠ | ٢١ | ئاری جاک | ١٢٠٢ | ١٣ |
| نارینجە | ٨٤٢ | ١٣ | قۆچەتەپە | ٣٧٤ | ٩ |
| ئورفە | ٤٧٠ | ٤٦ | دیاربەکر | ٤٨٨ | ٤٩ |
| ئاق زیارەت | ٣٧٩ | ١١ | دەریک | ٧٠٧ | ١٥ |
| تەپەخان | ٧٨٩ | ١١ | هانی | ١٠٥٠ | ١٥ |
| ئاقینجیلەر | ٦٥٧ | ١٢ | مەڕمەڕ | ٧٢١ | ٩ |
| حیلڤان | ٤٧٤ | ١٥ | چنار | ٣٨٠ | ١٢ |
| گەرگەر | ١٠٠٤ | ١٤ | نوسەیبین | ٤٨٥ | ٢٥ |
| یاردیمجی | ٣٠٦ | ٢ | بەشیری | ٥٩٧ | ٢١ |
| ئالتین بەشاق | ٣٨٢ | ٦ | میدیات | ٥٩٠ | ١٥ |
| چاملی دەرە | ٣٨٨ | ١٣ | گەرجوش | ٧٠٤ | ١٥ |
| گوڵ جوک | ٤٣٧ | ١٣ | ساسۆن | ١٢٥٩ | ١٨ |

| ئێستگە | تێکڕای بارانی ساڵانە ملم | لە ماوەی ساڵ |
|---|---|---|
| یانارسوو | ٨١٥ | ٥ |
| خەبەرلی | ٩٠٨ | ١١ |
| کورتەلان | ٦٤٥ | ٢١ |
| دارگەجیت | ٧٠٩ | ١٣ |
| سیرت | ٧٣٤ | ٤٧ |
| ئیروھ | ٨١٩ | ٢٠ |
| ئیدیل | ٧٥١ | ١٧ |
| ئایدینلەر | ٦٤٨ | ١٤ |
| دۆغانجە | ٦٢٩ | ٨ |
| جیزرە | ٧٠٣ | ٣٨ |
| شیرناق | ٨٠٥ | ٢٣ |
| بەرواری | ٦٨١ | ٢٢ |
| سلێمانی | ٧٠٦ | ١٧ |
| ئامێدی | ٨٨٢ | ٢٢ |
| موسڵ | ٣٩٢ | ٣٠ |
| حەویجە | ٢٥٨ | ٢٨ |
| خانەقین | ٣٠١ | ٣٠ |
| چەمچەماڵ | ٥٦٢ | ١٨ |
| هەڵەبجە | ٥٦٣ | ١٨ |
| شەقڵاوە | ٩٥٢ | ٢٤ |
| زاخۆ | ٦٩٧ | ٢٠ |
| سەرسەنگ | ٩٢٧ | ٢٠ |
| دهۆک | ٦٢٤ | ٢٦ |
| ئاکرێ | ٩٣٥ | ٢٤ |
| دیانا | ٨٧٢ | ١٢ |

| ئێستگە | تێکڕای بارانی ساڵانە ملم | لە ماوەی ساڵ |
|---|---|---|
| سەلاحەدین | ٨١٣ | ١٩ |
| ڕواندز | ٩٨٠ | ٢٣ |
| تەلعەفەر | ٦٥٨ | ٣٠ |
| شەنگار | ٤٠٤ | ٢٩ |
| هەولێر | ٤٧٤ | ٢٠ |
| دوکان | ٦٧٩ | ١٤ |
| مەخموور | ٣٦٣ | ٧ |
| خۆی | ٢٥٨ | ٢١ |
| ورمێ | ٣٥٥ | ٢١ |
| کرماشان | ٤٨٦ | ٢١ |
| دێزفول | ٣٦٨ | ٢١ |
| سەقز | ٤٨٦ | ٢١ |
| سنە | ٤٧٨ | ٢١ |
| شەهری کورد | ٣٤١ | ٢١ |
| خوڕەم ئاباد | ٥١٧ | ٢١ |
| قەحتانیە | ٣١٩ | ١٧ |
| عەینولعەرەب | ٣٢٨ | ١٧ |
| قامشلی | ٣٨٤ | ١٧ |
| ئەرزنجان | ٣٦٧ | ٤٦ |
| ئەرزەڕۆم | ٤٥٢ | ٥٢ |
| قەرەکۆسە | ٥٢٩ | ٢٩ |
| مەلاتیە | ٣٨٧ | ٥١ |
| سیرت | ٧٣٠ | ٤٩ |
| وان | ٣٧٧ | ٥٠ |

### تێکڕای باران لە وەرزەکانی ساڵدا

زۆربەی باران لە وەرزی زستاندا دەبارێ، چونکە تۆفانەکانی زەریای ناوەڕاست، لەبەر نزمبوونەوەی پلەی گەرما، لەم وەرزەدا بە تەڕی دەگەنە کوردستان. وەرزی بەهاریش بارانی تێدا دەبارێ، بەڵام لە وەرزی زستان، دوو تا سێ جار کەمترە. بارستایی باران لە وەرزی پایزدا، لە چەند ملیمەترێک زیاتر نییە. وەرزی هاوین لە کوردستاندا وشکە و بەدەگمەن نەبێ، ئەویش لە نێوچە شاخاوییەکاندا بارانی تێدا نابارێ، بەڵام هەندێ نێوچەی دیکە هەن، لەو ڕێڕەوە دەردەچن، وەکوو نێوچەکانی باکووری شاری قەرەکۆسە، کە بە هۆی هاتنی تۆفی تەڕەوە لە زەریای ڕەشەوە، باران لێ دەبارێ.

### تێکڕای باران لە مانگەکانی ساڵدا

لە کوردستاندا، لە مانگی نۆڤەمبەرەوە باران دەبارێ، بەرە بەرەش لە مانگەکانی دواییدا، بارستاییەکەی زیاد دەکات، هەتاکوو دەگاتە لوتکە لە مانگی دێسەمبەر و ژەنیوەریدا. پاشان ئەم لوتکەی بارانە، وردە وردە لە مانگەکانی دوایدا نزم دەبێتەوە، هەتاکوو دەگاتە ئەو پەڕی نزمی لە مانگی یوندا. بەڵام لە مانگەکانی یول و ئۆگەستدا، بەدەگمەن نەبێ باران نابارێ، لە زۆربەی نێوچەکانیشدا بە تەواوی باران نابارێ.

وا دیارە پەیوەندییەکی توند، لە نێوان بارستایی باران و پلەی گەرمیدا هەیە. ئەم دیاردەیە لە مانگەکانی ساڵدا، زیاتر دەردەکەوێ. هەتا پلەی گەرما نزم بێتەوە، ئەوەندە باران زیاتر دەبارێ و بەپێچەوانەشەوە، ئەمەش زیاتر لەبەر ئەوەیە، کە گەرما شێی هەوا دەکاتە هەڵم و ڕێگەی یەکگرتنی پێ نادات (تەماشای گرافی ٢ بکە).

جیاوازیی بارستایی باران لە مانگێکدا، لە نێوان ئێسگەکانی باراندا، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەگۆڕێ. تەماشای خشتەی ژمارە (٥) بکە. هەموو ئەو ئێسگانەی، کە کەوتوونەتە سەر ڕێگای تۆفانەکانی زەریاکانی ناوەڕاست و خەزەر و ڕەش، ساڵ دوازدەی مانگ بارانیان لێ دەبارێ، بۆ نموونە، دیاربەکر، گازی ئانتەب و کیلیس... تاد. بەڵام ئەو نێوچانەی لە ژێر کارتێکردنی ئەم تووفەدا نین و دوورن، لە مانگەکانی مای و یون و یول و ئۆگەستدا، بە تەواوی وشکن، بۆ نموونە، مەخموور، شەنگار و چوارتا ... هتد.

## خشتەی؟؟ گرافی ٢




**پلەی گەرما و باڕستایی باران لە هەندێ ئێستگەی ئاو و هەوای کوردستان**

**تێکرای باران له ڕۆژەکانی ساڵدا**

ژمارەی ئەو ڕۆژانەی کە لە ساڵێکدا، بارانی تێدا دەبارێ، لە هەموو ئێسگە باران پێوەکان، لە نیوەی ڕۆژەکانی ساڵ کەمترن. هەمان دیاردە، بە ڕێژەی بارانبارین لە مانگەکانیشدا، بە ڕاشکاوی دەبینرێ. بڕوانە خشتەی ژمارە (٦).

**خشتەی ٦** **تێکرا ڕۆژانی بەباران لە مانگێکدا**

| مانگ | ئێستگە | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | دیاربەکر | ئەرزەڕۆم | کەرکووک | موسڵ | دوکان |
| ژەنیوەری | ١١,٨ | ١,٢ | ١١,٣ | ٩,٩ | ٨,٩ |
| فێبروەری | ١٢,٢ | ١٢,٢ | ١٢,٦ | ١٠,٩ | ٨,١ |
| مارس | ١١,١ | ١٢,٧ | ١٠,٦ | ٩,٣ | ٥,٨ |
| ئەپریل | ٨,٤ | ١٤,٩ | ٥,٩ | ٤,٩ | ٣,٤ |
| مایی | ٢,٤ | ١١,٢ | – | – | – |
| یونی | ٠,٦ | ٦,٩ | – | – | – |
| یول | ٠,٣ | ٤,٨ | – | – | – |
| ئوگوست | ١,١ | ٥,٣ | – | – | – |
| سەپتەمبەر | ٥,٨ | ٨,٨ | ٤,٩ | ٢,٥ | ١,٩ |
| ئوکتۆبەر | ٨,٨ | ٩,٤ | ٨,٦ | ٧,٠ | ٦,١ |
| نۆڤەمبەر | ١٢,٦ | ١٠,٤ | ٩,٧ | ٨,٤ | ٦,٣ |
| دێسەمبەر | ١٣,٤ | ١١,٢ | ١١,٥ | ١١,٦ | ٨,٠ |
| کۆ | ٨٨,٥ | ١١٩,١ | ١٣٦,٢ | ٧٥,١ | ٤٨,٥ |

مانگەکانی مای، یون، یول و ئۆگەست، وەکوو لە خشتەکەی سەرەوەدا دەردەکەوێ، لە ئێسگەکانی کەرکووک و موسڵ و دوکان وشکە، بەڵام لە دیاربەکر و ئەرزەڕۆم تەڕە. مانگەکانی دیکەش هەموویان، کەم و زۆر بێباران نـــــــــــــــــــــــــــــــین.

**چەشنەکانی باران لە کوردستاندا**

لە کوردستاندا، چەند جۆرە بارانێ دەبارێ، کە هەر یەکەیان بە ناوی ئەو شتەوە ناو دەبرێ، کە دەبێتە هۆی باران بارینەکە. گرنگترین چەشنەکانی باران ئەمانەن:

بارانی سەر بە کڵاو

هەر وەکوو لەمەوبەر ئاماژەمان بۆ کرد، زۆربەی بارانی کوردستان، لە وەرزی زستاندا دەبارێ و سەرچاوەکەشی تۆفەکانی ئۆقیانووسی ئەتڵەسییە. دوای ئەوەی ئەو تۆفانە، دەگەنە سنووری زەریای ناوەڕاست، دووبارە هێز پەیدا دەکەنەوە و ڕووەو ڕۆژهەڵات دەڕۆن. هەندێکیان دەگەنە کوردستان و دەبنە هۆی بارانی سەر بە کڵاو.

بارانی هەڵەتان (بارانی ڕووبەر)

چیاکانی کوردستان، هۆیەکی زۆر گەورەن بۆ زیادکردنی باران. ئەم چیایانە، ڕێگە لە باکان دەگرن و ناچاریان دەکەن بەرز ببنەوە، بۆ ئەوەی درێژە بە ڕۆیشتنیان بدەن. لە هەمان کاتدا، ئەمەش دەبێتە هۆی نزمبوونەوەی پلەی گەرمایان و یەکگرتنی ئەتۆمەکانی هەڵم، کە لە ئەنجامدا، بە شێوەی بارانی هەڵەتان دێنە خوارێ.

بارانی بەرزەیی

بارانی بەرزەیی لە کوردستاندا، لەبەر نەبوونی ڕووگەی ئاوی گەورە، زۆر کەمە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، لە ئەنجامی بەرزبوونەوەی هەڵم لە ڕووبارەکان و بەستەڵەکان پەیدا دەبێت و بەشێک لە باران دەبارێ، زۆربەشی لە وەرزی بەهار و سەرەتای هاویندا ڕوو دەدات. هۆکەشی بۆ بەرزبوونەوەی پلەی گەرما و شێداربوونی زەوی، لە ئەنجامی بارانی زستان و بەهاردا دەگەڕێتەوە.

**فشار و با**

تێکڕای فشاری ئەتمۆسفێری ساڵانە لە کوردستاندا، لە دەوروبەری ١٠٠٠ میلیبار دایە. بەڵام ئەم ژمارەیە بەپێی بەرزیی و نزمی پلەی گەرما دەگۆڕێ. لە هاویناندا، لەبەر ئەوەی هەوا گەرم دەبێت، ئەم ژمارەیە کەم دەکات، هەتاکوو دەگاتە ٧٥٠ میلیبار. لە زستاناندا، ئەم ژمارەیە بەرز دەبێتەوە، هەتا دەگاتە ١٣٥٠ میلیبار. ئەم بەرزیی و نزمییە، زیاتر لە مانگەکانی ساڵدا دەردەکەوێ، وەکوو چاوەڕوانیش دەکرێ، لە مانگە هەرە

گەرمەکاندا، کە مانگی یول و ئۆگەستە، فشار لەو پەڕی نزمیدا دەبێت. لە مانگە هەرە ساردەکانیشدا (دێسەمبەر و ژەنیوەری)، فشار دەگاتە ئەو پەڕی بەرزی.

با لە کوردستاندا، لە ڕووی سەرچاوەی هەڵکردن و پەیدابوونییەوە، بەسەر دوو دەستەی سەرەکیدا دابەش دەکرێ، کە هەر دەستەیەکیشیان بەجیا، لە چەند جۆرێکی تایبەتی پێک دێن، کە ئەمانەی لای خوارەوەن:

**با گشتییەکان**

مەبەست لە با گشتییەکان، هەموو ئەو بایانەن کە لە دەرەوەی کوردستانەوە هەڵ دەکەن و بەسەریدا دێن و تێپەڕ دەبن، وەکوو:

شەماڵ

بای شەماڵ، لە زۆربەی ڕۆژەکانی ساڵدا دێت، لە باکووری ڕۆژئاواوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات دەست پێ دەکات. ئەمەش لە لایەکەوە، لەبەر ئەوەیە کە چیاکانی کوردستان بە هەمان شێوەی ڕەوتی باکان هەڵ کەوتوون و بە ناچاری پەیڕەویان دەکەن، لە لایەکی دیکەشەوە، لەبەر ئەوەی لە نێوچە جیاجیاکانی کوردستاندا، جیاوازییەکی زۆر لە فشاردا هەیە. بنکەی فشاری نزمی کەرتی ئاسیا، لە هاویناندا لە باکووری ڕۆژئاوای هیندستان دایە، لەبەر ئەوە بای شەماڵ، بەرەو ئەو نێوچە فشارە نزمە دەچێت و ناتوانێ بۆ نێوچەکانی دیکە بڕوات، لەبەر ئەوەی لەو نێوچانە، بنکەی فشاری بەرز هەیە، بە تایبەتی لە نێوچە شاخاوییەکاندا. بای شەماڵ لە کەژەکانی پایز و زستان و بەهار هەڵ دەکات و هەمان سەمتیشی هەیە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە بنکەی فشاری نزم لە کەنداوی عەرەبی دایە و بنکەی فشاری بەرزیش، لە نێوچە شاخاوییەکان دایە.

هورە (بای پێچەوانە)

هورە لە زستاناندا، لە زەریای ناوەندەوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات دێت. ئەمەش لە لایەکەوە لەبەر ئەوەیە، کە بنکەی فشاری نزم لە کەنداوی فارسیدا کۆ بۆتەوە و بۆ لای خۆی ڕایدەکێشێت، لە لایەکی دیکەشەوە، لەبەر ئەوەیە کە ڕووی چیاکان لە باکووری ڕۆژئاواوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵاتە.

بای هورە باران لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ، چونکە ئەو شوێنەی لێوەی هەڵ دەکات، وشکانییە، هەر بۆیە کە لە هاویناندا هەڵ دەکات، گەرم و وشکە و لە زستانانیشدا، سارد و وشکە.

**با خۆماڵییەکان**

مەبەست لە با خۆماڵییەکان، هەموو ئەو بایانەن کە لە زستانانادا یاخود لە هاویناندا، لە یەکێ لە نێوچەکانی کوردستانەوە هەڵ دەکەن. هۆکەشی بۆ جیاوازی پلەی گەرما و فشار دەگەڕێتەوە. ناوی باکانیش، بە ناوی ئەو شوێنانەوە ناودەنرێن، کە باکەیان لێوە دێت. هەندێ لەو با خۆماڵییانەش ئەمانەن:

قەهرە: ئەم جۆرە بایە بە تایبەتی لە گوندەکانی سەر بە نێوچەی مامەسێنەوە هەڵ دەکاتو بە درێژایی ڕووباری فەهلیان دێت. لە ڕووی کاتی هەڵکردن و پلەی گەرما و زیانبەخشینیدا، زۆر لە بای میترالی فەرەنسا دەچێت.

سام: ئەم بایە لە نێوچەی مێشانەوە هەڵ دەکات. بەرەو باکووری ڕۆژهەلات دەڕوات. ئەم بایە یەکێکە لە با گەرمە خۆماڵی.

ئاشوب: ئەم بایە لە سەر ڕوودی بوێری ئەحمەدی ژوورووەوە هەڵ دەکات. بۆ پوش و خواردەمەنی گیانلەبەران، بایەکی زۆر زیانبەخشە.

ئاب درەخت بو: ئەم بایە لە بەهاراندا پەیدا دەبێت، لە نێوچەی سەر ڕوودی بوێر ئەحمەدەوە هەڵ دەکات.

کوێرە با: لە لای باکووری ڕۆژهەلاتی نێوچەی بەهمەئی ئەحمەدییەوە دێ و لە سەرەتای پایزدا هەڵ دەکات.

بەر ڕۆژ: ئەم بایە لە ڕۆژئاواوە، بەرەو نێوچەی بەهمەئی ئەحمەدی دێ و لە وەرزەکانی بەهار و هاوین و پایزدا هەڵ دەکات.

گردلیلە: نێوچەی بوێر ئەحمەدی ژێرێ، کانگای هەڵکردنی ئەم بایەیە. سەمتێکی دیاریکراوی نییە. بە بڕوای خەڵکی نێوچەکە، هەڵکردنی ئەم بایە، شەڕ لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

بای مەیدان: بایەکی خۆماڵی گەرمە، لە نێوچەی بوێر ئەحمەدی گەرمەسێرەوە هەڵ دەکات.

بای چۆغان: بە دژوارترین بای نێوچەی بوێر ئەحمەدی ژێرێ دادەنرێت. بە زۆری لە زستاناندا بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ هەڵ دەکات، بایەکی زۆر بەهێزە و توانای لەنێوبردنی مرۆڤی هەیە.

ڕەشەبا: ئەم بایە لە زستانان و هاویناندا، بە شەو و بە ڕۆژ، لە نێوچەکانی سلێمانی، کۆیە، ڕانیە، هەڵ دەکات، بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ بەردەوام دەبێت. لە زستاناندا سەرما و

له هاوینانیشدا گەرما لەگەڵ خۆی دێنێ. ئەم بایە لە هەندێ نێوچەدا، بە (زریان) بەناوبانگە.

هەوەنوو: بایەکی ساردە، لە نێوچەی کوردستاندا هەڵ دەکات. سەمتەکەی لە ڕۆژئاواو باکووری ڕۆژئاواوە، بەرەو ڕۆژهەڵات دەروات.

بای ڕووس: لە کۆتایی هاوین و سەرەتای پایزدا، لە نێوچەی قروە هەڵ دەکات. بایەکی ساردە.

بای چەپ: لە هاویناندا بەو نێوچانەی بەسەریاندا تێدەپەڕێ، فێنکایی لەگەڵ خۆی دێنێت. ئەم بایە بۆ گیا سوود بەخشە. بەڵام لە زستاناندا ساردە. ئەم بایە بە تایبەتی لە نێوچەی قروەوە هەڵ دەکات.

بای بزن کوژ: بایەکی ساردە. لە پایز و زستاناندا لە نێوچەی پارێزگای کوردستانەوە هەڵ دەکات.

جگە لەو باخۆماڵییانەی لە سەرەوە باسمان کردن، هەندێ بای دیکەش هەن، وەکوو بورجی پیرێژن، بای دارئاوس... هتد.

**بەفر**

ساڵانە بە دەیان سانتیمەتر بەفر دەکەوێت. هەندێ ساڵ، لە هەندێ نێوچەدا، بارستایی بەفر لە یەک مەتر زیاترە. گەلێ شوێن هەن، بە درێژایی ساڵ بەفریان لێ ناچێتەوە. وەکوو لوتکەی چیاکانی ئارارات، قەندیل، کوەڕەنگ، کەبیرکوە و هەڵگورد ... هتد.

بەفر لە مانگی نۆڤەمبەرەوە، هەتاکوو مانگی مارس دەبارێ، واتا ماوەی بەفربارین پێنج مانگە. لەم ماوەیەدا، ژیان زۆر سەخت دەبێت، بە تایبەتی لە گوندەکاندا، ئەویش لەبەر نەبوونی پێویستییە هوێکانی ژیانە. لە نێوچە شاخاوییەکانیشدا، ڕێگەوبان بە تەواوی دەگیرێ.

هەموو ساڵێ بە لانی کەمەوە، ٤٣ ڕۆژ بەفر دەبارێ. ئەم ژمارەیە لە ئەرزەڕۆم زیاد دەکات و دەگاتە ١١٣ ڕۆژ، لە ئورفە کەم دەبێتەوە و دەبێ بە سێ ڕۆژ. تەماشای خشتەی ژمارە (٧) بکە.

ڕۆژەکانی ژەنیوەری و فێبروەری، لە ڕۆژەکانی مانگەکانی دیکە، زیاتر بەفری تێدا دەبارێ، چونکە کوردستان لەو دوو مانگەدا، زیاتر کەوتۆتە ژێر کارتێکردنی بای ساردی سیبریاوە. هەروەها تۆفە گەرمەکانی کەنداوی فارسی، لەبەر ئەوەی بنکەی فشاری بەرز، لەم مانگانەدا کۆ دەبنەوە و ناتوانن بگەنە ناوەڕاست و باکووریووڵات.

**خشتەی ٧ ژمارەی ئەو ڕۆژانەیلە مانگەکانی ساڵدا بەفریان تێدا دەبارێ**

| مانگ | ئێستگە | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | دیاربەکر | ئەرزنجان | ئەرزەڕۆم | مەلاتیە | سیرەت | ئورفە | وان |
| ژەنیوەری | ٥,٦ | ١٤,٨ | ٢٩,٢ | ١٣,٣ | ٧,٥ | ١,٦ | ٢٢,٠ |
| فێبروەری | ٤,٦ | ١٣,٤ | ٢٦,٢ | ١٢,٥ | ٦,٠ | ١,٠ | ٢٢,٧ |
| مارس | ٠,٨ | ٤,٨ | ٢٤,١ | ٣,٣ | ١,٧ | – | ١٤,٨ |
| ئەپریل | – | ٠,٢ | ٤,٧ | ٠,١ | – | – | ٢,٢ |
| مایی | – | – | ٠,٢ | – | – | – | – |
| یونی | – | – | – | – | – | – | – |
| یول | – | – | – | – | – | – | – |
| ئوگوست | – | – | – | – | – | – | – |
| سەپتەمبەر | – | – | ٠,١ | – | – | – | – |
| ئوکتۆبەر | – | ٠,١ | ٠,٨ | – | – | – | – |
| نۆڤەمبەر | ٠,١ | ٠,٩ | ٥,٢ | ٠,٥ | ٠,٣ | – | – |
| دیسەمبەر | ١,٨ | ٧,١ | ٢٢,٧ | ٤,٥ | ٢,٥ | ٠,٣ | ٠,٢ |
| کۆ | ١٣,٠ | ٤١,٣ | ١١٣,٢ | ٣٣,٢ | ١٨,٢ | ٢,٩ | ٧٩,٠ |

**شەختە**

لە زۆربەی نێوچەکانی کوردستاندا، بە درێژایی زستان شەختە دەبێت. لە ئەنجامدا ئاو دەیبەستێ و هاتوچۆ لەبەر خلیسکاندن ناخۆش دەبێت. شەختە لە هەندێ شوێندا، پاش نیوەڕوان دەست پێ دەکات، هەتا چێشتەنگاوێکی درەنگ لە ڕۆژی دوایدا بەردەوام دەبێت. پەیدابوونی ئەو دیاردە ئاووهەواییە، بۆ نەبوونی هەور لە ئاسماندا دەگەڕێتەوە، واتا لە شەوانی سایەقەدا دروست دەبێت. هەروەها لەو کاتانەشدا ڕوو دەدات، کە با پێش تۆفەکان دەکەوێ و لە چیاکانەوە بەرەو دۆڵەکان دێنە خوارەوە.

**هەور**

هەور لە دێسەمبەر، ژەنیوەری، فێبروەری و مارسدا، لە ئاسمانی کوردستاندا پەیدا دەبێت. ئەمەش بە دەوری خۆی، لە ژمارەی کاتژمێرەکانی گەیشتنی تیشکی خۆر، بۆ سەر ڕووی زەوی کەم دەکاتەوە. ئەم دیاردەیە کار لەسەر بارستایی باران و پلەی گەرما و هەروەها ماوەی ڕووناکی ڕۆژ دەکات. بۆ نموونە، درێژایی ڕۆژ لە شارۆچکەی قامیشلی – ٧,٧ کاتژمێرە. لە شاری دیاربەکر – ٨,١ کاتژمێرە. لە ئەرزنجان – ٧,١ کاتژمێرە. لە ئەرزەڕۆم – ٧,٢ کاتژێرە. لە گازی ئانتەب – ٨,٢ کاتژمێرە. لە مەلاتیە – ٧,٥ کاتژمێرە. لە سیرت – ٧,٥ کاتژمێرە. لە ئورفە – ٨,٤ کاتژمێرە. لە وان – ٧,٤ کاتژمێرە.

**تەم**

تەم بە زۆری لە نێو دۆڵ و شیوەکان و هەندێ جاریش لە دەشتاییەکاندا ڕوو دەدات. ژمارەی ئەو ڕۆژانەی تەم دروست دەبێت، لە دەوروبەری دە ڕۆژە لە ساڵێکدا. بەڵام لە زستاناندا دوو ئەوەندە دەبێ و لە بەهار و پایزاندا، نیو ئەوەندەیە و لە هاوینانیشدا بەدەگمەن نەبێ ڕوو نادات. بۆ دیاریکردنی ڕۆژە تەماوییەکانی ساڵ، سەرنجی خشتەی ژمارە (٨) بدە.

تەم لە مانگی ژەنیوەرییەوە دەست پێ دەکات و هەتاکوو ئەپرێل، لە دوایدا دووبارە لە نۆڤەمبەرەوە هەتاکوو کۆتایی دێسەمبەر پەیدا دەبێتەوە. واتا ساڵی شەش مانگ، لە ئاسماندا تەم دەبیندرێ. بوونی ئەم دیاردە ئاووهەواییە، دەبێتە هۆی نزمبوونەوەی پلەی گەرما، چونکە تەمەکە بەری تیشکی خۆر دەگرێ و لێ ناگەڕێ، بگاتە سەر ڕووی زەوی.

**خشتەی ٨** **ژمارەی ڕۆژە تەماوییەکان**

| مانگ | ئێستگە | | | | |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| | ئەرزەڕۆم | ئورفە | کەرکووک | موسڵ | خانەقین |
| ژەنیوەری | ٣,٠ | ١,٠ | ١,٠ | ٥,٠ | ٠,٦ |
| فێبروەری | ٣,٠ | ٠,٣ | ٠,٢ | ٣,٠ | ٠,٣ |
| مارس | ٣,٠ | ٠,٢ | – | ٢,٠ | ٠,٢ |
| ئەپریل | ٠,٣ | – | – | ١,٠ | – |
| مایی | – | ٠,٢ | – | – | – |
| یونی | – | – | – | – | – |
| یول | – | – | – | – | – |
| ئوگوست | – | – | – | – | – |
| سەپتەمبەر | ١,١ | – | – | – | – |
| ئوکتۆبەر | – | – | – | – | – |
| نۆڤەمبەر | ٠,٨ | ٠,٥ | ٠,٢ | ٣,٠ | ٠,٣ |
| دێسەمبەر | ٢,٠ | ١,٠ | ٠,٦ | ٠,٦ | ٠,٦ |
| کۆ | ١٢,٢ | ٣,٢ | ٢,٠ | ١٤,٦ | ١,٨ |

## شێداری ڕێژەیی

ڕێژەی شـێـداری ڕێژەیی، لە ئەتمۆسـفـێـردا نزیکەی لە ٥٣٪ یە. ئەم ڕێژەیە لەبەر جیاوازی پلەی گەرمیی و کارتێکردنی زەریاکان و بەرز و نزمی ڕووبەر و بارستایی بەفر، لە هەموو نێوچەکاندا، وەکوو یەک نییە. بڕوانە خشتەی ژمارە (٩) بکە.

شێدارترین نێوچە، شاری قەرەکوسەیە، هۆکەشی بۆ بەرزی لە ڕووی زەریا و بوونی نێوچەی بەفرێکی هەمیشەیی لە چیای ئارارات و بارانبارینێکی زۆر لە هاویناندا دەگەڕێتەوە. کەمترین شێداریش لە شارۆچکەی حەویجە دایە، ئەویش لەبەر بەرزی پلەی گەرما و نەبوونی ئاو لەسەر زەوی.

**خشتەی ٩ تێکڕا شێی ڕێژەیی**

| ئێستگە | شێی ڕێژەیی | ئێستگە | شێی ڕێژەیی |
|---|---|---|---|
| قامشلی | ٥٠ | کرماشان | ٥٠ |
| دیاربەکر | ٥٣ | موسڵ | ٥١ |
| ئەزرنجان | ٥٩ | خوڕەم ئاباد | ٤٥ |
| ئەرزەڕۆم | ٦٣ | خۆی | ٦٧ |
| گازی ئانتەب | ٦١ | ورمێ | ٦٢ |
| قەرەکۆسە | ٦٧ | سنە | ٥١ |
| مەلاتیە | ٥٣ | دوکان | ٤٧ |
| سیرت | ٦٥ | حەویجە | ٣٢ |
| ئۆرفە | ٤٨ | کەرکووک | ٤١ |
| وان | ٥٩ | هەولێر | ٤١ |
| شەهری کورد | ٤٧ | سلێمانی | ٣٣ |
| دێزفول | ٤٥ | – | – |

**شێداریی ڕێژەیی لە مانگەکاندا**

ڕێژەی شێداری ڕێژەیی، بە نزمبوونەوەی پلەی گەرما بەرز دەبێتەوە. بەپێچەوانەشەوە، بە بەرزبوونەوەی پلەی گەرما نزم دەبێتەوە. واتا شێی ڕێژەیی لە مانگەکانی زستاندا، لەچاو مانگەکانی هاویندا زیاترە. تەماشای خشتەی ژمارە (١٠) بکە.

## ٣. چوار وەرزی ساڵ

چوار وەرزی ساڵ، بە تەواوی لە یەکدی جیا دەکرێتەوە و هەست بە خەسڵەتەکانی هەر یەکێ لەو وەرزانە دەکرێت، وەکوو باران و پلەی گەرما و پۆشەکی ڕووەکی.

**بەهار**

یەکەم وەرزی ساڵە. هەموو ساڵێ لە ٢١ی مارسدا دەست پێ دەکات و لە ٢١ی یونۆدا تەواو دەبێت. پلەی گەرما لە بەهاردا – ١٥ سانتیگرادە. بارستایی باران – ١٧ ملیمەترە و زۆربەشی تۆفانییە و بۆ ماوەیەکی کەم دەبارێ و بە تەواویی زەوی دادەپۆشێ، هەندێ جار زیانی گەورە بە کشتوکاڵ دەگەیەنێت. ڕێژەی شێی بەرزە، لەبەر ئەوەی جاروبار باران دەبارێت و زەویش بە ئاوی بارانی زستان و ئاوی بەفری چیاکان لە کاتی تواندنەوەیدا، تەواو تەڕ و پاراو دەبێت. لە بەهاردا لەوەڕگەکان بە تەواوی زۆر دەبن و سەوز دەبن. لە سەرەتاوە لە دەشتاییەکان و دواتریش لە کوێستانەکانەوە دەست پێ دەکات.

**هاوین**

وەرزی هاوین لە ٢٢ی یونەوە دەست پێ دەکات و لە ٢٢ی سەپتەمبەردا تەواو دەبێت.پلەی گەرما لە چلەی هاویندا، بۆ ٤٢ سانتیگراد بەرز دەبێتەوە. باران جگە لە نێوچەیەکی تەسکی وەکوو ئاگری نابارێ. شێی ڕێژەیی زۆر نزم دەبێتەوە. درێژی ماوەی ڕۆژ لە نێوان ١٢ – ١٤ کاتژمێردا دەبێت. هەور لە ئاسماندا نابێت. پلەی گەرما لە نێوان کاتژمێری ١٢ – ١٥دا بەرز دەبێتەوە، کە خەڵکی بە زەحمەت خۆیان لەبەردا ڕادەگرن، بە تایبەتی لە دەرەوە.

**خشتەی ١٠** **شێی ڕێژەیی لە مانگەکانی ساڵدا، ١٩٨٠**

| مانگ | ئێستگە | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | حەویجە | کەرکووک | ئەرزەڕۆم | ئورفە | وان | شەهری کورد | ئیلام |
| ژەنیوەری | ٥٤ | ٧٥ | ٧٦ | ٧٨ | ٧٠ | ٥٥ | ٧١ |
| فێبروەری | ٥٩ | ٦٥ | ٧٥ | ٦٧ | ٧١ | ٥٢ | ٧٠ |
| مارس | ٤٩ | ٥٩ | ٧٤ | ٦٥ | ٦٩ | ٥٥ | ٥٦ |
| ئەپریل | ٤١ | ٤٩ | ٦٥ | ٥٣ | ٦٤ | ٥٠ | ٦٠ |
| مایی | ٢٦ | ٣٢ | ٦٠ | ٤٣ | ٥٧ | ٦٠ | ٥٥ |
| یونی | ١٦ | ٢٠ | ٦٥ | ٣٠ | ٥٠ | ٥٥ | ٤٥ |
| یول | ١٥ | ١٩ | ٥٠ | ٢٧ | ٤٤ | ٤٢ | ٣٦ |
| ئوگوست | ١٦ | ١٨ | ٤٦ | ٢٨ | ٤١ | ٣٢ | ٣٢ |
| سەپتەمبەر | ١٣ | ٢١ | ٤٩ | ٣٢ | ٤٣ | ٣٠ | ٢٩ |
| ئوکتۆبەر | ٢٥ | ٢٩ | ٦٠ | ٤٢ | ٥٨ | ٣٧ | ٤٧ |
| نۆڤەمبەر | ٣٣ | ٤٩ | ٧١ | ٥٨ | ٦٧ | ٤٥ | ٥٥ |
| دێسەمبەر | ٤٢ | ٦٩ | ٧٥ | ٦٩ | ٧٠ | ٥١ | ٥٦ |
| کۆ | ٣٢ | ٤٨ | ٦٣ | ٤٨ | ٥٩ | ٤٧ | ٥١ |

**پایز**

سێیەم وەرزی ساڵ، لە ٢٣ سەپتەمبەرەوە دەست پێ دەکات و ٢١ دێسەمبەر کۆتایی پێ دێت. لەم وەرزەدا، بە تایبەتی لە نێوچە شاخاوییەکاندا، پلەی گەرما نزم دەبێتەوە. کەمێکیش باران دەبارێ. بە شێوەیەکی ئاسایی، وردە وردە هەور لە ئاسماندا پەیدا دەبێت.

**زستان**

دوا وەرزی ساڵە و لە ٢٢ دێسەمبەردا دەست پێ دەکات و لە ٢٠ مارسدا کۆتایی پێ دێت. لە زۆربەی نێوچەکاندا، پلەی گەرما نزم دەبێتەوە تا دەگاتە ژێر سفر. بەفر و باران دەبارێن. هەور بەری ئاسمان دەگرێت. شێی ڕێژەیی لە ئەتمۆسفێردا زۆر دەبێت. سەختترین کاتی زستان چلەیە، کە لە ١٦ی ژانیوەرییەوە دەست پێ دەکات و لە ٢٤ی ژەنیوەریدا تەواو دەبێت. چلەش بەپێی توندوتیژی سەرماوە، بەسەر هەشت بەشدا دابەش کراوە: بێدرخە، بێلندە، مێرەم، ئۆغەن، پیت، پاڵۆز، خدر، ئەلیاس. هەریەکێ لەم بەشانە ، ماوەی پێنج ڕۆژ دەخایەنن.

## ٠٤ هەرێمەکانی ئاووهەوا

دوای ئەوەی بە درێژی، باسی ڕەگەزەکانی ئاووهەوامان کرد، بۆمان روون بۆوە، کە جیاوازییەکی زۆر، لە ڕووی پلەی گەرما و بارستایی باران و بەفر، لە نێوان نێوچەکاندا هەیە. واتا هەر نێوچەیەک، تا ڕادەیەک ئاووهەوای تایبەتی خۆی هەیە. هەرێمە سەرەکییەکانی ئاووهەواش ئەمانەن:

**هەرێمی وشکی کەناری گەرم**

ئەم هەرێمە ئاووهەواییە، لە نێوچەیەکی گچکەی باشووری کوردستان دایە، کە لە نێوان بەندەری ڕیگەوە، هەتاکوو باشووری بەهبەهان، لەسەر کەنداوی فارس هەڵ کەوتووە. ئەو هەرێمەیە لە بیابان پێک هاتووە و پلەی گەرما لە هاویندا، بۆ ٥٠ پلەی سانتیگرادە بەرز دەبێتەوە. لە زستانیشدا، ڕەنگە گەرمترین نێوچەی کوردستان بێت. بارانی زۆر کەم لێ دەبارێت، لەبەر ئەوەی لە ژێر کارتێکردنی تۆفەکانی وشکی نیمچە دوورگەی عەرەب دایە.

### هەرێمی بیابانی وشکی گەرم

ڕووبەری ئەم هەرێمە ئاووهەواییە، لەو نێوچەی پێشوو فراوانترە و تایبەتە بە باشووری پارێزگای ئیلام و قەزاکانی دێزفول و مەسجیدی سلێمان... هتد. پلەی گەرما لە هاویندا دەگاتە ٤٠ سانتیگراد. لە زستاناندا نزیکەی ٢٠ پلەی سانتیگراد دەبێت. تێکڕای بارستایی باران – ١٥ سانتیمەترە. ئەم هەرێمە لە ژێر کاری تۆفەکانی نیمچە دوورگەی عەرەب و تۆفەکانی زەریای ناوەند دایە.

### هەرێمی نیمچە بیابانی گەرم

نێوچەیەکی فراوان لە کوردستاندا، لە ژێر کاری سیستەمی ئاووهەوای ئەو هەرێمەدایە، وەکوو پارێزگای ئیلام و قەزاکانی دێزفول و ئەندێشمک و ئیزە و شوشتەر. پلەی گەرما لە مانگە هەرە گەرمەکاندا – ٣٥ پلەی سانتیگرادە، لە ساردترین مانگیشدا – ١٥ پلەیە. تێکڕای بارستایی بارانی ساڵانە – ١٧ سانتیمەترە و تۆفەکانی زەریای ناوەند دەگەنە ئەم هەرێمە.

### هەرێمی کوێستانی سارد

زۆربەی نێوچە شاخاوییەکانی باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لە چوارچێوەی ئەم هەرێمە ئاووهەواییە دان. پلەی گەرما لە زستاندا، زۆربەی شەوەکان و بگرە لە زۆربەی ڕێژەکانیشدا، لە ژێر سفرەوەیە و دەگاتە ١٠ پلەی سانتیگراد. لە هاویناندا، پلەی گەرمی لە دەوروبەری ١١ سانتیگراد دایە. لە زستاناندا بەفرێکی زۆر دەبارێ و لە هەندێ شوێنیش، بە درێژایی ساڵ بەفری لێ ناچێتەوە. بارستایی باران – ٨٠٠ ملیمەترە.

### هەرێمی زەریای ناوەند

بە پانترین نێوچەی ئاووهەوا دادەنرێت لە کوردستاندا. پلەی گەرما لە هاویناندا بەرز دەبێتەوە، هەتا دەگاتە ٣٠ پلەی سانتیگراد، لە زستانانیشدا پلەکە نزم دەبێتەوە، بۆ پێنج پلەی سانتیگراد، لە هەندێ شوێنیشدا بۆ ژێر سفر. بارانی بە زۆری لە زستاناندا لێ دەبارێ و لە هاویناندا وشکە.

## بەشی پێنجەم: سەرچاوەکانی ئاو

هەروەکوو کوردستان بۆ خۆی لە ئاودا دەوڵەمەندە، بەو چەشنەش بە سەرچاوەیەکی گەورە و گرنگی، ئاوی وولاتەکانی دیکەی ڕۆژئاوای ئاسیاش دەژمێردرێ. سامانی ئاوی سالانە، بە هەزاران ملیۆن مەتری سێگۆشە دادەنرێت، کە بەداخەوە، بەشی هەرە زۆری بە خۆڕایی دەڕوا و لە ڕێگەی ڕووبارەکانەوە دەڕژێنە کەنداوی عەرەبی و ئەسکەندەرون و زەریای خەزەر و ڕەش و زەریاچەکانی ورمێ و وانەوە.

ڕۆڵی ئاو لە ژیانی دانیشتووانی ڕۆژهەلاتی نێوەندا بە گشتی، وولاتەکانی ڕۆژئاوای ئاسیا بە کوردستانیشەوە بە تایبەتی، ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبوون دایە. لەبەر ئەوەی لە لایەکەوە، ژمارەی دانیشتووانی ئەو وولاتانە، بە بەردەوامی لە زیادبوون دایە، لە لایەکی دیکەشەوە، لەبەر ئەوەی پانتایی زەوییە بەراوە کشتوکاڵییەکان، لە فراوانبوون دایە.

### ۰۱ ئاوی سەر ڕووی زەوی

ئەم ئاوانە لە ئاوی ڕووباراکان و زەریاچەکان پێک هاتوون، وەکوو لە خوارەوە باسیان دەکەین:

#### ڕووبارەکان

کوردستان خاوەنی ڕووبارێکی زۆرە، دەتوانین لە ڕووی درێژیی و قەبارەی ئاوەوە، هەندێکیان لەگەڵ ڕووبارە مەزنەکانی جیهاندا بەراورد بکەین، هەندێکی دیکەشیان لەبەر کورتییان، تاکوو ئێستا شوێنیان لەسەر نەخشەکان دیاری نەکراون. تەماشای نەخشەی (٤) بکە.

ڕووبارەکان، زۆر بە خراپی لەسەریان نووسراوە، ئەو زانیارییانەی کە لەبەر دەست دایە، بێئەندازە ئاڵۆزن و هێشتا بە تەواوی ساغ نەکراونەتەوە، بەڵکوو ساغکردنەوەیان پێویستی بە ماندووبوونێکی زۆر هەیە.

لە ڕووی لۆجیکەوە، ڕووبار وەکوو ناوێک یەک ناوی هەیە. بەلام ئەوەی ئێمە لە کوردستاندا دەیبینین، بە تەواوی بەپێچەوانەوەیە، چونکە هەر ڕووبارێک لە سەرچاوەکەیەوە تاکوو دوا ڕێژگەی، چەند ناوێکی هەیە، ئەمەش بەپێی ئەوەی، بە لای هەر گوندێکدا تێپەڕ بوو، یا بە بناری هەر چیایەکدا، یا بە نێو هەر دۆڵێکدا ڕەت بوو، جۆرە ناوێکی تایبەتی لێ دەنێن.

**نەخشەی (٤) ڕووبارەکان**



درێژایی ڕووبارەکان لە سەرچاوەکانیانەوە تا ڕێژگەکانیان، وەکوو یەک نیین. لە هەندێ حاڵەتدا جیاوازییەکە، خۆی لە دەیان کیلۆمەتر دەدات.

بۆ ئاو، لە نێوچە جیاجیاکانی کوردستاندا، زاراوەی جۆراوجۆر بەکار دەهێنرێت. بۆ نموونە: لە باکوور – دەرە، چای، سوو، نەهر. لە ڕۆژهەلاتدا – دەرە، ئاب، ڕوودخانە،ڕود. لە باشـــوردا – جـــۆگـــە، ئاو، چەم (چۆم)، ڕووبار، زێ. لە ڕۆژئاوادا – وادی، نەهر. زاراوەکان بە تەواوی سنووریان دیار نییە.

سیستەمی ڕووبارەکان، سیستەمێکی چیاییە، واتا لەسەرچاوەکانیانەوە زۆر بە تیژی دێن و بە هەمان هێز دەڕژێنە ڕووباری لە خۆیان گەورەترەوە. ئاوەڕۆکەکانیشیان زۆر قوڵ و تەسک و بە کۆسپن.

ئەو ڕووبارانەی کە سەرچاوەکانیان لە بەفر و کانی هەڵ دەگرن، ئاویان هەمیشە نابڕێ، بەلام ئەو ڕووبارانەی کە سەرچاوەکانیان ئاوی بارانە، ئەوا دوای باران بڕان، ئەوانیش وشک دەکەن.

لافاوی ڕووبارەکان لە مانگەکانی ئەپرێل و مای دایە، چونکە بەفری سەر چیاکان لەم دو مانگەدا دەتوێنەوە.

ڕووبارەکانی کوردستان، لەبەر قوڵی دۆڵەکان و تیژ ڕۆیشتنیان، بۆ هاتوچۆی ئاوی دەست نادەن. بەلام لە ڕووی سامانی ئاوەوە، زۆر دەوڵەمەندن، بە تایبەتی ماسی.

ڕووبارەکان لە ڕووی ڕێژگەیانەوە، بەسەر چەند بەشێکدا دابەش دەکرێن، کە بە ڕووبەر و قەبارەی ئاو لێک جیاوازن. تەماشای نەخشەی ژمارە (٥) بکە.

ا – ئەو ڕووبارانەی دەڕژێنە حەوزی کەنداوی فارسەوە.

ب – ئەو ڕووبارانەی دەڕژێنە حەوزی کەنداوی ئەسکەندەرونوە

ج – ئەو ڕووبارانەی دەڕژێنە دەریای خەزەرەوە.

د– ئەو ڕووبارانەی دەڕژێنە زەریاچەکانەوە.

## نەخشەی (٥) حەوزی ڕووبارەکان



**١ - ئەو ڕووبارانەی دەڕژێنە حەوزی کەنداوی فارسەوە**

کەنداوی فارس ئاوەکەی گەرم و شۆرە. ڕووبەرەکەی لە دەوروبەری ٢٣٣ هەزار کچگ دەبێت. لەگەڵ زەریای عومان، لە ڕێگەی تەنگەی هورمزەوە یەک دەگرنەوە. درێژاییەکەی لە ڕێژگەی ڕووباری ئاروندەوە لە باکووری ڕۆژئاواوە، هەتاکوو تەنگەی هورمز – ٢٨٨ کیلۆمەترە. پانایيەکەی لە نێوان ٥٦ – ٢٨٨ کیلۆمەتر دەبێت. قوڵاییەکەی لە هەموو لایەکەوە، وەکوو یەک نییە. قوڵترین شوێنی دەگاتە – ١٨٢ مەتر، لە سەری مسەندەم کەمترین قوڵایی (٣٠ مەترە)، کە دەکەوێتە ڕێژگەی ڕووباری ئاروندەوە.

کەنداوی فارس یەکێ لە زەریا هەرە گەرمەکانی سەر ڕووی زەوی پێک دەهێنێت. پلەی گەرمی ئاوەکەی، لە پلەی گەرمی گشت ئاوەکانی نێوچەکە زیاترە. توندی گەرمای با لە مانگی ئۆگەستدا، دەگاتە – ٦٥ سانتیگراد. پلەی گەرمی ڕووی ئاو لە باشووری ڕۆژهەڵاتدا، دەگاتە – ٣٠ سانتیگراد.. ئاووهەوای کەنداوی فارس لە زستاندا لەبارترە. لە مانگی ژەنیوەریدا، کە ساردترین مانگی ساڵە، پلەی گەرمی کەم دەبێتەوە، تا دەگاتە ١٤ سانتیگراد، بە تایبەتی لە ڕۆژئاوادا.

شۆری ئاوی کەنداوی فارس، لەو وەرزانەدا کە ئاو کەمە، واتا وەرزی زستان، (٤٨ لە هەزار) لە شۆری ئاوی ئۆقیانووسی هیندی (٣٥ لە هەزار) زیاترە. زەریای خەزەر (١٤ لە هەزار)، بەڵام کە ئاو زیاد دەکات لە بەهاراندا، ڕێژەی سوێری ئاو کەمتر دەبێتەوە.

کەنداوی فارس لە ڕووی سامانی نەوتەوە، زۆر دەوڵەمەند. ئەورۆ لە زۆر شوێنیدا، نەوت دەردەهێندرێت. هەروەها بایەخی ستراتیژیی و بازرگانیشی کەم نییە. بەشەکەی کوردستان لە کەنداو، لە گناوەوە دەست پێ دەکات و بە چەند کیلۆمەترێک لە باکووری بەندەری دەیلەم کۆتایی پێ دێت.

**ڕووباری فورات**

درێژایی ڕووباری فورات، لە سەرچاوەکەیەوە هەتاکوو لەگەڵ ڕووباری دیجلەدا تێکەڵ دەبێت، ٢٨٠٠ کم. درێژاییەکەی لە نێو خاکی کوردستاندا، لە دەوروبەری ٢١٧٠ کم دایە، واتە درێژترین ڕووباری وڵاتە. ڕووباری فورات، لە تێکەڵاوبوونی ڕووباری قەرەسوو (٤٦کم) و موورات (٦١٥ کم)، دوای ئەوەی لە ئاوبەندی قەبان ــ Keban baraji دەڕژێن، پێک هاتووە.

یەکەم: ڕووباری قەرەسوو

ڕووباری قەرەسوو_ Kara su، سەرچاوەکەی لە ئاوەکانی چیای دوملوەوە _ Dumlu Daq هەڵ دەقوڵێ. دوای ئەوەی هەموو ئەو ئاوانە، لە باکووری شارۆچکەی ئیلچە _ Ilica ، تێکەڵاو دەبن، بە ناوی ڕووباری قەرەسووەوە دەناسرێت. ڕێڕەوی ئەم ڕووبارە، لە.ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات، لە دوایدا بەرەو باشوور هەتاکوو لە ئاوبەندی قەبان دەڕژێ. هەندێ لە لقەکانی ڕووباری قەرەسوو، ئەمانەن:

١٠ چەمی باشی .Bas. C

سەرچاوەی ئەم ئاوە دەکەوێتە نێو چیاکانی بۆزان _ Bozan Dagı و ئاکبابا _ Akbaba Dagı و یەشل چال _ Yesilcal Dagı و دوملو _ Dumlu Dagı ، پاشان، دوای چەند کیلۆمەترێک، لە باشووری شارۆچکەی ئاش قەڵا، دەڕژێتە ڕووباری قەرەسووەوە.

٢٠ ئاوی ئۆمەر تەپە _ .Omertepe S

ئەم ڕووبارە، لە ئەنجامی تێکەڵابوونی چەندین ئاوی پچکۆلە پێک هاتووە، کە سەرچاوەکانیان دەکەونە باکووری ڕۆژئاوای چیاکانی پالان دوکەن _ Palan doken Dagı ، لە دوایدا، لە ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی ئیلچە، بە چەند کیلۆمەترێک دەڕژێتە ڕووباری قەرەسووەوە.

دووەم: ڕووباری مورات _ Murat Nehri

ڕووباری مورات، لە تێکەڵاوبوونی ئاوی چیاکانی ئالا_ Ala Dagı و تەندروک _ Tendurek Dagı پێک دێت. سەمتی ڕووباری ناوبراو، لە سەرەتاوە بۆ ڕۆژئاوا دەڕوات و لە پاشان بەرەو باشوور دێت. پاشان درێژە بە ڕۆیشتنەکەی دەدات، هەتاکوو لە باشووری شارۆچکەی پالو _ Palu، بە چەند کیلۆمەترێک. لە ئاوبەندی قەبان دەرژێ. ئەم ڕووبارە، لە چەپ و ڕاستەوە، چەندین ڕووباری دیکەی تێدەڕژێ، کە هەندێکیان، لەمانەی خوارەوەدا خۆیان دەبینن:

١٠دەرەی شێخ ئیبرایم _.Seyhibrahim D

ئەم دەرەیە. لە ڕۆژهەڵاتی چیای قاندل (Kandil Dagı) سەرچاوە هەڵ دەگرێت و لە باشوورەوە بەرەو باکوور دەڕوات، هەتاکوو لە ڕۆژئاوای گوندی گەچیتواران _ Gecitvren، لە ڕووباری فورات دەڕژێت.

٠٢ دەرەی گەلوتان ــ Gelutan D.

ئاوی ڕۆژئاوای چیای قاندل، سەرچاوەی ئەم دەرەیەیە. درێژاییەکەی چەند کیلۆمەترێک دەبێت. لە لای ڕاستەوە دەرژێتە ڕووباری فوراتەوە.

٠٣ دەرەی قەرەکایە ــ Karakaya D.

ئەم دەرەیە ئاوێکی درێژە. لە ئاوەڕۆی سەروو کە ناوی بە دەرەی دەرین ــ Drein D. ناسراوە.دوای ئەوەی لە باشووری ئاوەدانی پاتون ــ Paton ، لەگەڵ چەندین ئاوی دیکەدا، تێکەڵ دەبێت، ناوەکەی دەگۆڕێ و دەبێتە قەرەکایە. لە دوایدا لە باشووری ڕۆژئاوای گوندی قەرەکایەوە، لە ڕووباری موورات دەرژێت.

٠٤ چەمی قوپکیران ــ Kupkiran C.

ئەم چەمە بە نێو شاری قەرەکوسەدا دەڕوات. بە چەند کیلۆکەترێک لە باشووری ئەم شارەدا، دەرژێتە ڕووباری موراتەوە.

٠٥ چەمی چوما ــ Cume C

سەرچاوەکەی لە ئاوەکانی ڕۆژئاوای چیای قزکازیا ڕەت ــ Kızıkazıyart هەڵ دەگرێت. دوای چەند کیلۆمەترێک ناوەکەی دەگۆڕێ و دەبێتە تاشل چای – Tasl C. و لە باشووری ڕۆژئاوای شاری قەرەکۆسەوە، دەرژێتە ڕووباری موراتەوە.

٠٦ چەمی شەییار – Serıyar C.

ئەم چەمە، سەرچاوەکەی دەکەوێتە باکووری چیای چاکماک – Cakmak C. و بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوات، هەتاکوو لە ڕووباری موورات دەرژێت.

٠٧ دەرەی باشمە – Basıma D.

ئاوێکی زۆر درێژە. سەرچاوەکەی دەکەوێتە باشووری چیای قیلیچ – Kılıc Dagı. ئەم دەرەیە لە دوو ئاو پێک دێت. پێش ئەوەی بگاتەوە ڕووباری موورات. چەند ئاوێکی دیکەی تێدەرژێت. دەرەی باشمە، لە ئاوەڕۆی ناوەڕاستدا بە ناوی دەرەی ئەلمالییەوەیە – Elmaı D. و لە ئاوەڕۆی خوارەوەی بە ناوی قەسیک چای – Kesik C. ناسراوە.

٠٨ ئاوی حەسەناوا – Hasanova S.

ئەم ئاوە لە تێکەوڵابوونی ئاوەکانی دەرەی چایۆنو – Cayönu D.، کە سەرچاوەکەی دەکەوێتە ڕۆژئاوای چیای ئاق دۆغان – Akdogan Dagı و زەریاچەی ئاق دۆغان – Akdogan Gölu و ئاوەکانی چیای بینگۆل – Bingol Dagı پێل دێت و دوایی بە چەند کیلۆمەترێک، لە ڕووباری موورات دەرژێت.

٠٩ چەمی گەن – .Gen C

ئەم چەمە لە گوینک چای – .Goynuk C، کە سەرچاوەکەی دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی چیای سەیتان – Seytan Dagı و دەرەی بایرام –.Bayram D ، کە سەرچاوەکەی دەکەوێتە باشووری چیاکانی قارا بۆغا – Karaboga Dagı پێک هاتووە.

ڕووباری فورات، جگە لەو ڕووبارانەی باسمان کردن، چەندین لقی دیکەی هەیە. وەکوو ئاوی گەڤلوک – .Gevluk S و ئاوی توزلە – .Tuzla C و چەمی گوڵان – .Gulan C و چەمی قورو – .Kuru C و چەمی قەدکی باشی – .Kedikbasi C و چەمی چاڵتی – .Calti C و بە دەیان ئاوی دیکەش.

## ڕووباری دیجلە

ئەم ڕووبارە لە زەریاچەی گولچوک – Gölcük Golu سەرچاوە هەڵ دەگرێت و لە باکووری ڕۆژئاواوە بەرەو باشوور دەڕوات، هەتاکوو لە ئاوەدانی (فەتحە)ی نێوان چیای حەمرین و مکیحل، لە خاکی کوردستان دەردەچێتە دەرەوە. درێژایی ڕووباری دیجلە، لە سەرچاوەکەیەوە هەتاکوو لەگەڵ ڕووباری فوراتدا تێکەڵاو دەبێت – ١٩٠٠ کم، درێژاییەکەی لە نێو خاکی کوردستاندا لە دەوروبەری ٨٤٧ کم.. هەندێ لە لقەکانی ئەم ڕووبارە، ئەمانەن:

٠١ چەمی بەرکیلین – .Berkilin C

سەرچاوەی چەمی بەرکیلین دەکەوێتە ڕۆژئاوای چیای ئاکچاقارەوە– Akcakara Dagi، لە باکوورەوە بەرەو باشوور درێژ دەبێتەوە، هەتاکوو لە ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی ئەغیل، دەڕژێتەوە نێو ڕووباری دیجلە.

٠٢ چەمی ئەمبار – .Ambar C

سەرچاوەی چەمی ئەمبار، دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی چیاکانی ئینجە بوروم – Inceburum Dagı، لە باکوورەوە بەرەو باشوور درێژ دەبێتەوە، هەتاکوو لە ڕۆژهەڵاتی گوندی ئەمبار – Ambar، دەڕژێتە نێو ڕووبای دیجلەوە.

٠٣ چەمی قورو – .Kuru C

ئاوی نێوچەی شارۆکەی مەڕمەڕ – Mermer، سەرچاوەکەی لە چەمی قوروە و لە باکوورەوە بەرەو باشوور دەڕوا، هەتاکوو لە ڕۆژئاوای شارۆکەی بیسمیل، دەڕژێتە نێو ڕووباری دیجلەوە.

٠٤ چەمی پامبوخ – Pamuk C.

ئاوی باراناو و بەفری باشووری ڕۆژئاوای چیای ئۆزون جاسەکی – Uzuncaski Dagı، سەرچاوەکەی چەمی پامبوخە. ئەم ڕووبارە لە ڕۆژهەڵاتی شارۆکەی بیسمیلەوە، دەڕژێتە ڕووباری دیجلەوە.

٠٥ چەمی سەلات – Salat C.

ئاوەکانی باشووری چیای ئۆزون جاسەکی، دوای ئەوەی تێکەڵاو دەبن، چەمی سەلات پێک دەهێنن. ئەم چەمە پێش ئەوەی بڕژێتە نێو ڕووباری دیجلەوە، چەند ئاوێکی دیکەی تێکەڵاو دەبێت.

٠٦ چەمی باتمان ــ Batman C.

یەکێکە لە لقە گەورەکانی ڕووباری دیجلە(١٧٠ کم). ئەم ڕووبارە، لە ئاوەکانی چەمی ساریم – Sarim C. و چەمی قوڵپ – Kulp C. و چەمی سورکان – Sorkan C. و چەمی ئاید ینلک – Aydinlik C پێک دێت. سەرچاوەی ئەم ئاوانە دەکەوێتە، چیاکانی ئاقچەقەرە – Akcakara C. و موش گونایی – Musgüneyi و ئنجە بوروم وبولاک ... تاد.

٠٧ چەمی کارزان ــ Garzan C.

ئاوی ڕۆژهەڵاتی چیای بولاک – Bulak Dagı و ئاوی ڕۆژهەڵاتی چیای موش گونایی، هەتاکوو لە باکووری شارۆکەی مەیدان تێکەڵاو دەبنەوە، بە ناوی چەمی ئوروسەوە – Uruc C. ناسراون. لە پاشاندا، لە ڕۆژهەڵاتی شارۆکەی کوزلوس ، ناوەکەی دەبێتە چەمی پانارسوو – Panarsu C. دوای گوندی ئیکی کۆپرو – Ikiköprü، ناوەکەی دەبێتە چەمی گارزان (١٢٢ کم) پاشان، دوای چەند کیلۆمەرێک، هەر بەو ناوەوە، دەرژێتە ڕووباری دیجلەوە.

٠٨ چەمی بۆتان

دوای ئەوەی ئاوی چیاکانی ساری – Sarı Dagi و داملا– Damla Dagi و گوکی – Gok Dagi و قارا –Kara Dagi تێکەڵاو دەبن، پێی دەوترێ چەمی چاتاک – Catak C. بەو ناوەوە بەرەو ڕۆژئاوای گوندی ئۆمورلی – Umuru دەڕوات، لە دوای ئەم گوندە، ناوەکەی دەگۆڕێ و دەبێ بە چەمی بۆتان.(٢٨٦کم).لە پاشاندا، دوای چەند کیلۆمەترێک دەڕژێتەوە ڕووباری دیجلە.

چەمی بۆتان لە سەرچاوەکەیەوە، هەتاکوو ڕێژگەکەی لەسەر ڕووباری دیجلە، چەند ئاوێکی تێکەڵاو دەبێت. هەندێ لەوانە، ئەمانەن: دەرەی کەندۆڵان ، چەمی زاراڤە، باخچە سارای، چەمی قازار.

٠٩ دەرەی قاواجیک – Kavacik D.

سەرچاوەی دەرەی قاواجیک دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی چیای شێخ هۆمەرەوە – Şeyhomer Dagi، لە دوای چەند کیلۆمەترێک، دەرژێتە ڕووباری دیجلەوە.

٠١٠ دەرەی ئینلی ــ Inli D.

ئاوی باشووری چیای یاسسی – Yassı Dagi و باکووری چیای قوپەلی – Küpelı Dagi، سەرچاوەی دەرەی ئینلین.ئەم دەرەیە، لە چەند ئاوێک پێک دێت و لە دوای چەند کیلۆمەترێک، دەرژێتە ڕووباری دیجلەوە.

٠١١ چەمی قزل – Kizilsu C.

سەرچاوەی چەمی قزل دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی چیای یاسسی و باکووری قایا ئونو – Kaya onu Dagi و ڕۆژئاوای ناماز – Namaz Dagi. دوای ئەوەی ئەو ئاوانە تێکەڵاو دەبن، بە چەند کیلۆمەترێک دەرژێنەوە نێو ڕووباری دیجلە.

٠١٢چەمی چاغلان – Caglayan C.

چەمی چاغلان لە ئاوەڕۆی سەروویەوە، چەند ئاوێکە، دوای تێکەڵابوونەوەیان، بەرەو ڕووباری دیجلە دەڕۆن و دەرژێنە ناوییەوە.

٠١٣ ئاوی نەزیل – Nezil S،

ئاوی نەزیل لە سەرچاوەکەیەوە لە چەند ئاوێک پێک هاتووە. لە هەمووویان گەورەتر دەرەی بەهرانجی – Behranci D. و چەمی ئۆرتە – Ortasu C.، دوای تێکەڵاوبوونیان، بە چەند کیلۆمەترێک دەرژێنەوە نێو ڕووباری دیجلە.

٠١٤ ڕووباری خابور – Nahr al Khabur،

ڕووباری خابور لە ئاوەڕۆی سەروویەوە، بە ناوی چەمی یەزیلوز – Yesilöz C. ناسراوە. دوای گوندی ئۆرتالی – Ortalı، ناوەکەی دەگۆڕێ و دەبێتە ڕووباری خابور. لە پاشان بە ناو شارۆچکەی زاخۆدا دەڕوات و لەگەڵ نەزیل سوو تێکەڵاو دەبن، ئینجا لە ڕووباری دیجلە دەرژێ.

ڕووباری خابور، لقێکی گەورەی هەیە، ناوی هیزیلە، کە ئەویش لە ئاوەکانی شرانش، چۆمی، بیجو، سرار، سابنە گوروکەرم پێک دێت.

٠١٥ زێی گەورە

زێی گەورە، لقی هەرە گەورەی ڕووباری دیجلەیە و سەرچاوەکەی دەکەوێتە چیاکانی ییگیت – Yigit Dagı ، مەنگەنە Mengene Dagi ، لە باکوورەوە بەرەو باشوور دێت، هەتا

دەگـاتە ئاوبـەندی بێـخـمـە، لە دویدا بەرەو باشـووری ڕۆژئاوا دەڕوات، هەتا لە باشـووری شاری موسڵ ، دەڕژێتە نێو ڕووباری دیجلەوە.

درێژایـی زێی گـەورە نزیکەی ٣٩٢ کـیلۆمــەتر دەبێت. حــەوزی ئاوڕێژی لـە ٢٦ هـەزار کچگ زیاترە.تێکڕای ئاوڕۆیشـتنی لە نێوان ٤٠ – ٧٠ مـەتری سێگۆشـەیە لە چرکەیەکدا. ڕووباری دیجلە ساڵی ٣٣٪ی ئاوەکەی لە زێی گەورەوە بۆ دێت.

زێی گـەورە، وەکـوو ڕووباری دیجلـە لە ئاوەڕووی سـەروو ناوەنـدیدا، چەند ڕووبـارێکی دیکەی تێکەڵاو دەبێت، لەوانە:

دەرەی خەشکان – kan D.__Ha

ئەم دەرەیـە، سـەرچـاوە لە ئاوەکـانی چیـای مـۆر – Mor dag هەڵ دەگـرێت و بەرەو ڕۆژئاوا و باشـووری ڕۆژئـاوا دێت، هـەتا لـە نزیک گـوندی ڕەزیوک، دەڕژێتـە نێـو زێی گەورەوە. ئەم دەرەیە، بە هەمان شێوە چەند ئاوێکی تێکەڵاو دەبێتەوە،

ڕووباری شـین – Rûbarî Sîn

ئەم ڕووبارە لە تێکەڵابوونی ئاوی چەمی شەمدینلی – Semdinli C. کە سەرچاوەکەی دەکەوێتـە چیـاکانی بایاز – Bayaz dag وئیکیـالی – Ikiyalca dag و چەمی بەیدەرەسی ـ Beyderesi Cay، کە سەرچاوەکەی دەکەوێتە چیاکانی هەکاری، بە تایبەتی چیای بوزول – Buzul dag پێک دێت. دوای ئەوەی لە باشووری گوندی سوتونی – Sutuni تێکەڵاو دەبن. لە دوایدا لە زێی گەورە دەڕژێ.

ڕووکوچوک

ڕووباری حــاجی بـەگ و چۆمی بەرازگـرد، لە بـاکووری ڕۆژئـاوای گـوندی خـێـرەزوک تێکەڵاو دەبن و ڕووکوچوک پێک دەهێنن و لە نزیک گوندی ڕێزانەوە، بە زێی گەورە کۆتایی پێ دێت.

ڕووباری ڕەواندوز

ئاوی چیاکانی نێوچەی حاجی هۆمەران و دەوروپشـتی، بە سـەرچاوەی ئاوی ڕووباری حاجی هۆمەران دەژمێردرێ. ئەم ڕووبارە لە سەرەتاوە لەم دوو لقەی خوارەوە پێک دێت:

١. ڕووباری حـاجی هۆمـەران – ئەم ڕووبارەش، لە دوو ئاو پێک هاتووە: یـەکەمـیـان، لە نێوچەی شـیـوە ڕەشـەوە دێت. دووەمـیـشـیـان، بە ئاوی سـیـیـەرە بە ناوبانگە و لـە نێوچەی کـوێسـتـانـەوە دێت. پاش ئەوەی ئەم دوو ئاوە، لـە باکووری حـاجی هـۆمـەران تێکەڵ دەبن، ناوەکـەی دەبێـتـە ڕووباری حـاجی هـۆمـەران. ئەم ئاوە لە پاشـان، بە گوندی ڕایاتدا تێـپـەڕ دەبێت و لەگـەڵ ڕووباری ئارانە، لـە نزیک گونـدی بابەکراوە یـەک دەگرن. لەوێشــەوە بەرەو

گوندی دەربەند دەڕوات، هەتا لەگەڵ ڕووباری گوندەژوور، کە لە نێوچەی کوێستانی بن هەڵگوردەوە دێت، تێکەڵ بە یەک دەبن، پاشان ناوەکەی دەبێتە ڕووباری دەربەند. لە پاشان ئەم ئاوە، لەگەڵ ڕووباری ناوەندە، لە نزیک گوندی گرکەنجیر یەک دەگرن و دەڕوات، هەتا لە پاشان ناوەکەی دەبێتە ڕووباری چۆمان و بە ناوپردانا تێپەڕ دەبێت، هەتا دەگاتە ڕووباری باسا (ڕووباری دۆڵی سەکران) ئەوەی دواییش لە ئاوی حەساری سەکران وێزێ پێک دێت، کە سەرچاوەکانیان دەکەوێتە کوێستانی سەکران و وێزێوە. پاشان ڕووباری چۆمان بە گوندی کەوەرتێدا تێپەڕ دەبێت، هەتا دەگاتە پردی گەڵاڵە، لەوێ لەگەڵ ئاوێکی گچکەدا تێکەڵ دەبێت، بە ناوی ئاوی گەڵاڵەوە، کە سەرچاوەکەی کانیاو و ئاوی باران و بەفراوی نێوچەی مەرزەیە. لە دواییدا ڕووباری چۆمان، بە گوندەکانی پردی زەرد و ڕێزان و ئۆمەراوا و ناوکێلان و پاشگۆزی و ڕێزانۆک تێپەڕ دەبێت و لە گوندی دواییدا لەگەڵ لقەکانی دیکەی ڕووباری ڕەواندوز تێکەڵ دەبێت.

٠٢ ڕووباری دوورماوان (ڕەژی کەریان) – لە دوو ئاوی سەرەکی پێک دێت. یەکەمیان، لە نێوچەی خوارتریشەوە دێت و بە گوندی زێوەی وەرتێدا تێپەڕ دەبێت، هەتا دەگاتە لقی دووەم لە گوندی خانەقا، ئەوەی دوایی، لە ئاوەکانی دەوربەری گوندی زەنگرین و چۆمە پێک دێت. پاش ئەوەی یەک دەگرنەوە، ناوەکەیان دەبێتە ڕووباری بارێ (دۆڵی بارێ) ئەو لقەی دوایی بە گوندەکانی ماونان قەرات و سانێ و چومە سارک و دیلمان و بەرتگرتکەدا تێپەڕ دەبێت و لە نزیک گوندی خانەقا، لەگەڵ ڕووباری وەرتێدا یەک دەگرنەوە. لە دواییدا ئەو گوندە ناوەکەی دەبێتە دیلمان و لە پاش چەند کیلۆمەترێک، ناوەکەی دەگۆڕێ و دەبێتە دورماوان (ڕەژی کەریان). پاش گوندی ڕێزانۆک، یاخود دوای ئەوەی ئاوی حاجی هۆمەران و دورمان تێکەڵ بە یەک دەبن، بە گوندەکانی بەرسرین و وارکەون و میراجیا و جنیراوە و بێشوک و ڕەواندوزدا تێپەڕ دەبن و دەڕژێنە زێی گەورەوە.

٠١٦ زێی گچکە

زێی گچکە لە ئاوەکانی دەشتی لاهیجانی ڕۆژئاوای شاری مەهاباد پێک دێت. لە سەرەتاوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات و لە دوییشدا بەرەو باشووری ڕۆژئاوا دەڕوات و لە ڕێگایا، ژمارەیەک لە چیا ڕەقەکان دەبڕێ و بە دۆڵی قوڵدا تێپەڕ دەبێت. ئەم ڕووبارەش، لە دوو ئاو پێک هاتووە:

چەمی بانە – سەرچاوەکەی دەکوێتە چیاکانی سنە، دوای ئەوەی لەگەڵ چەند ئاوێکی دیکە تێکەڵ دەبێت، لە دواییدا دەڕژێتەوە زێی گچکەوە. ڕوباری بانەش هەندێ لقی هەیە،

وەکوو: ئاوی ئەحمەد ئاباد کە لە چیاکانی جانەرەوە سەرچاوە هەڵ دەگرێت، ئاوی شاجو، کە سەرچاوەکەی لە چیاکانی بابوسە، چەمی کانی گوێزە، کە لە چیاکانی چی چۆران دێت، دل هەرزن کە لە چیاکانی دل هەرزن هەڵ دەقوڵێت و نێوچەکانی سەردەشت و بانە ئاو دەدات. جگە لەو ئاوانەی باسمان کردن، ئاوی چەند کانی پڕ ئاو بەروباری بانە کوتاییان پیدیت، وەک کانی دوکانیان، کە دەکەوێتە باکووری شارۆچکەی بانە بە سێ کیلۆمەتر و کانی مام خوا، کە لە چیای ئاربابای باکووری ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی بانە هەڵ کەوتووە و کانی هەفرەی باشووری بانە.

چەمی ماوەت – ئەو چەمە بە چەمی قەڵاچوالانیش ناو دەبرێ. لە بنەڕەتەوە لە دوو چەمی جیاواز پێک هاتووە: یەکەمیان، پێی دەوترێ چەمی سیوەیل، کە سەرچاوەکەی دەکەوێتە نێوچەی مەریوان. ئەو چەمانەی لە دوییدا، لەگەڵ ئەم ئاوە یەک دەگرنەوە، هەرە گرنگەکانیان ئەمانەن: قازیاوا، کامولا، میرەباسک، گۆماوان، کەنکی، بالغانین و برز ... تاد. ئاوی دووەمیان: بە چەمی گوگە سوور بە ناوبانگە. ئەم ئاوەش لەگەڵ چەندین ئاوی دیکە تێکەڵ دەبن، وەکوو چەمی ماوەکان، ئاوی هەزارکانیان ... هتد. ئاوی سیوەیل و گۆگە سوور، لە نزیک گوندی بەردەسین ، تێکەڵ بە یەکدی دەبن و ڕووباری ماوەت پێک دەهێنن.

زێی گچکە، ژمارەیەک ئاوی جیاوازی تێکەڵ دەبێت، کە هەندێکیان ئەمانەن: قەڵادزێ و ژاراوە و چەمی سوڵتانە دێ و چەمی بەستەسیش و شەهیدان و گافرین و ڕووباری باسلم و تایین و گەلێ شیویش، وەکوو شیوی بایزئاغا و شیوە ئاشان و سورداش و چەمی قەمچوغە و شیوە سوور و شەواسەر و چەمی بابلان و جۆلان و ... تاد.

درێژایی زێی گچکە، لە هەندێ سەرچاوەدا ٤٠٠ کیلۆمەترە، واتا بە درێژترین لقی زێی دیجلە دەژمێردرێ، پانتایی حەوزەکەی لە ٢٢ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە زیاترە. داهاتی ساڵانەی ئاوی، لە ٧ ملیار مەتری سێگۆشە زیاترە و تێکڕای ئاو ڕۆیشتنی، لە ئێسگەی پردێدا، لە یەکێ لە ساڵەکاندا، گەیشتۆتە ٢١٦ مەتری سێگۆشە. لە دوکان نزیکەی ١٨٠ مەتری سێگۆشە بوو لە چرکەیەکدا. ڕووباری دیجلە، ساڵی لە ١٧٪ی ئاوەکەی لە زێی گچکەوە بۆ دێت.

٠١٧ ئاوی سیروان

ئاوی کێوی پیر مەحموود و کێوەکانی دەوروبەری، لە چەند جۆگایەکدا کۆ دەبنەوە. لە دوایدا لە باشووری گوندی سیاسوانی ژێری تێکەڵاو دەبنەوە. پاشان بە ناوی ڕووباری قشلاقەوە دەناسرێ و بەرەو ئاوبەندی قشلاق دەڕوات. لە دوایدا بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە

هەتاکوو نزیکی گوندی بزلادە دەبێتەوە، هەر لەوێشەوە ناوەکەی دەگۆڕێ و دەبێتە ئاوی سیروان.

ڕووباری قشلاق لە لای ڕاست و چەپییەوە، لەگەڵ چەند ئاوێکی دیکەدا تێکەڵ دەبێت. هەرە گرنگەکانیان ئەمانەن:

چەمی شۆر

ئەم چەمە لە ئاوی کێوەکانی سوڵتان و شاخە، سەرچاوە هەڵ دەگرێ. لە ڕۆژئاوای حوسێن ئابادەوە، لەگەڵ ڕووباری قشلاق دەڕژێتەوە.

ڕووباری سەلەوات ئاباد

سەرچاوەی ئەم ڕووبارە لە کێوەکانی کوز و حنسروکیش هەڵ دەقوڵێ. دوای ئەوەی ئاوەکان تێکەڵاو دەبن، بەرەو ڕووباری قشلاق دەڕوا و لە باشووری گوندی بەهەشت محەمەدی تێکەڵاو دەبنەوە.

ڕووباری گاوە

ئاوی کێوەکانی خاڵ بەفر، کانی کۆتر، چەقچەقە، تێکەڵاو دەبن، لە پاشان دوای چەند کیلۆمەترێک، لە ڕۆژئاوای گوندی تویلانی ژێری، بە ڕووباری گاوە ناو دەبرێ و بەرەو ئاوی سیروان دەڕوات، هەتاکوو لە باکووری گوندی بزلانە تێکەڵاو دەبنەوە. ئەم ڕووبارە چەند ئاوێکی تێکەڵاو دەبێت، کە هەندێکیان ئەمانەن: چەمی شینە، چەمی میر ئاباد، ڕووباری گردگانە، چەمی ڕەش، دەربەندی گوهاجان ... هتد.

چەمی سەراب گامێش

ئەم چەمە لە تێکەڵاوبوونی چەمەکانی قلوزە، کە سەرچاوەکەی دەکەوێتە نێو کێوەکانی توکلان و کانی سەفید و سرسیوک و چەمی دویسە، کە سەرچاوەکەی دەکەوێتە کێوەکانی زەرد ئاباد و چال موش، پێک دێت.

چەمی سۆفیان

سەرچاوەی ئەم چەمە لە کێوی دوییسەوە هەڵ دەقوڵێ. لە دەوربەری گوندی ئارندان، لەگەڵ چەمی ئارندان تێکەڵاو دەبن. لە دویدا لە باکووری گردی برنان، لەگەڵ ڕووباری قشلاق تێکەڵ دەبنەوە.

هەندێ لە ئاوەکانی ڕووباری گاوە ئەمانەن: زیار گرجو، ئاوی دەروێشان، چەمی گردەلان، چەمی گران، چەمی شوشە، ڕووباری دوو تاق.

ئاوی ئەڵوەند

ئەم ئاوە سەرچاوەکەی لە کێوی تەختی گڕ دایە. لە پاشان، دوای چەند کیلۆمەترێک، لەگەڵ ئاوی سیروان تێکەڵاو دەبێت.

چۆمی هەورامان

چۆمی هەورامان، لە تێکەڵابوونی چەند ئاوێک پێک دێت، کە سەرچاوەکانیان لە چیاکانی هەورامانەوە هەڵ دەقوڵێ. ئەم چەمە لە ئاوەڕۆی سەرووییەوە، بە چەمی ڕەزاو ناسراوە. چۆمی هەورامان، دوای چەند کیلۆمەترێک لە ئاوی سیروان دەڕژێت.

ڕووباری مەریوان

سەرچاوەی ئەم ڕووبارە، بە گۆمی زرێبار (زرێوار) دادەنرێت. دوای چەند کێلۆمەترێک، دەڕژێتە نێو ئاوی سیروانەوە.

ئاوەکانی دیکەی ئاوی سیروان، هەندێکیان ئەمانەن: داری گەلال، لەیلا، زیمکان، زەرەشک، قورەتو، گەیلانی ڕۆژئاوا، جانرۆ ... تاد.

٠١٨ ڕووباری عوزێم

ئاوی باران و بەفری تواوەی نێوچەی سلێمانی و کەرکووک، لە چەند دۆڵێکدا، کە هەر یەکە ناوی خۆی هەیە، کۆ دەبنەوە و لە پاشان تێکەڵاو دەبنەوە و پێی دەوترێ ڕووباری عوزێم، لە دوایدا بەرەو ڕووباری دیجلە دەڕوات و بە چەند کیلۆمەترێک لە باشووری بەغداوە، دڕژێتە دیجلەوە. هەندێ لە لقەکانی ئەمانەن:

ئاوە سپی

سەرچاوەی ئاوی سپی (ئاق سوو)، لە چیاکانی توزخورماتووەوە هەڵ دەقوڵێ. دوای ئەوەی لەگەڵ ڕووباری نارین تێکەڵاو دەبێت، بەرەو ڕووباری عوزێم دەکشێ، هەتاکوو لەگەڵیدا تێکەڵاو دەبێت. ئاوەسپی لە نێوچەی زەنگنەوە بە ئاوی زغەێتون ناسراوە.

ئاوی داقوق

دوای ئەوەی ئاوەکانی نێوچەی سلێمانی تێکەڵاو دەبن، بە ناوی ڕووباری تاینال دەناسرێ و لە نزیک گوندی دێلێژەشەوە، بە ناوی باسەڕەوە و لە دوایشدا بە ڕووخانە (تاووق چای) و لە نێوچەی حەویجەش بە ناوی زەرگە دەناسرێ. پاشان بەرەو ئاوە سپی دەڕوات، هەتاکوو لە باکووری گوندی عەبد حوسێن، تێکەڵاو دەبنەوە و بەرەو ڕووباری عوزێم دەڕوا و دەڕژێتە نێوی.

## ڕووباری گاماسیاب

ئەم ڕووبارە لە نێوچەیەکی زۆر فراوانەوە ئاوی بۆ دێت. یەکێک لە لقە سەرەکییەکانی ناوی ئاوی نەهاوەندە، کە لە نێوچەی نەهاوەندەوە سەرچاوە هەڵ دەگرێت. پاشان لە ئەنجامی تێکەڵاوبوونی لەگەڵ ژمارەیەک لە ئاوی گچکە و سەرچاوەکاندا، بەرە بەرە ئاوەکەی زیاد دەکات. لە دوایدا بەرەو لقە سەرەکییەکەی دیکەی ڕووباری گاماسیاب دەڕوات، کە لە نێوچەی مەلایرەوە دێت و لە نزیکی نەهاوەندەوە تێکەڵ بەو ئاوەی پێش خۆی دەبێت. لقێکی سەرەکی دیکەی ڕووباری گاماسیاب، ئەو ئاوەیە کە لە باکووری ڕۆژهەلاتی بناری کوە ئەڵوەند سەرچاوە هەڵ دەگرێت و لە باکووری ڕۆژهەلاتی تویسرکان، لە دەرەی تویسرکان بە ناوی تویسرکان دەناسرێ و پاشان دەڕژێتە ئاوی نەهاوەندەوە، دوای ئەمەش، ئاوەکە بە ناوی ڕووباری گاماسیابەوە ناو دەبرێت.

ڕووباری گاماسیاب، لقی دیکەی زۆرن. بەڵام ئەوەندە بە ئاو نیین. لەو لقانەش: ڕووباری خوڕەم ئابادە، ئەم ڕووبارە لقێکی گەورەی هەیە پێی دەوترێ کنگاوەر، کە سەرچاوەکەی لە بەرزاییەکانی کنگاوەرەوە هەڵ دەقوڵێت، لقێکی دیکەی ڕووباری گاماسیاب، ئاوێکە بە ناوی جامیشان کە لە سەرچاوەکەیەوە، هەتاکوو بێستوون، بە ناوی دینەوەرەوە ناسراوە.

ڕووباری گاماسیاب، دوای بێستوون بەرەو باشوور دەڕوا و لە نزیک جامە شۆران، لەگەڵ قەرەسوو لێک دەدەن. ڕووباری قەرەسوو خۆشی لە تێکەڵابوونی ڕووباری مرگ، رازئاور و کانی ڕوانسەر پێک دێت. سەرچاوەی ڕووباری مرگ، چیاکانی سەبزعەمە و نسارە، ئەوەی کانی ڕوانسەریش، شا کوە و کوە ئاورە. ئەوەی راز ئاوریش بەرزاییەکانی چهار چالاب و شێخ میرزا و گورگانە(٣٥، لاپەڕە ٥٤).

## ڕووباری سیمەرە

ڕووباری گاماسیاب، لە باکووری گوندی کوردشت، هەتاکوو دەوروبەری گوندی چەمی کەلان، بە ڕووباری سیمەرە ناسراوە. ئەم ڕووبارە، دوایی تێکەڵبوونی بە ڕووباری قەرەسوو، لقەکانی دیکەی وەکوو ڕودماهی دەشت، هەلیلان و کەرەند، بە دۆڵی قوڵ و تەنگدا دەڕوا و بە بناری کەبیرکوەدا دێت و پاش ئەوەی لقەکانی وەکوو کەشکان، زال، غەزال ڕوو، هەرو ... هتد تێکەڵاو دەبن و بە دۆڵی قوڵتر و تەسکتردا دەڕوات و لە پل تەنگ تاڤگەیەکی بە بەرزایی ٤٣ مەتر و پانایی ٣ مەتر دروست دەکات. لە پاشان چەندین لقی دیکەی تێدەڕژێتەوە، وەکوو چنارە، سەرچاوەی کلان، سەرچاوەی زنجیرە و گرد و گەنجە و کلم و سیگان ... هتد.

ڕووباری کەرخە

ڕووباری سیمەرە دوای گوندی چەمی کلان، بە ناوی کەرخە بەرەو سنووری باشووری کوردستان دەڕوات. پاشان بە ڕۆژئاوای شارۆکەی شوشدا، بەرەو هێڵی پانی ٣٢ی باکوور تێدەپەڕێ. لە پاش چەند کیلۆمەترێک، دەگاتە خاکی ئێران، ئینجا زەلکاوی عەزیم و لە دوایدا بەرەو دیجلە و شەتی عەرەب، تا دەڕژێتە کەنداوی فارسەوە.

درێژایی ڕووباری گاماسیاب – سیمەرە – کەرخە، لە سەرچاوەکەیەوە هەتاکوو ڕێژگەکەی لە زەلکاوی عەزیم، ٧٥٥ کیلۆمەترە. خەرجی ساڵانەی ٤٥٠٠ ملیۆن مەتری سێگۆشەیە. ئاوەکەی لە زۆر شوێندا، بۆ خواردنەوە و کشتوکاڵکردن بەکار دەهێندرێت.

ڕووباری گەدارخوش

ڕووباری گەدارخوش، لە ڕۆژئاوای ئیلامەوە سەرچاوە هەڵ دەگرێت و لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات. لقە سەرەکییەکانی ڕووباری گەدارخوش، لە ڕووبارەکانی مدرن و چواراند  رودا، گال کورکیز، گلال چینا جام، لە کانی دول، لە دواییدا شیوی مورتەزا عەلی پێک دەگەنەوە و ڕووباری گەدارخۆش پێک هاتووە

لقە سەرەکییەکانی بە درێژایی ڕۆشتنیان، بۆ کشتوکاڵ سوود لە ئاوەکانیان وەردەگیرێت، بەڵام دوای ئەوەی کە تێکەڵ دەبن و ڕووباری گەدارخوش پێک دەهێنن، ئاوی ئەو ڕووبارە، لەبەر ئەوەی بە دۆڵی قوڵدا دەڕوات، توانای بەرزکردنەوەی ئاوی نییە، سوودی بۆ کشتوکاڵ کەم دەبێتەوە. لە لقە سەرەکییەکانی دیکەی ئەم ڕووبارە، چەمێکە بە ناوی چەم ئابەوەیە، کە لە حەوزی ئاوڕێژی ئیلامەوە سەرچاوە هەڵ دەگرێت و بۆ ئاودانی دەشتەکانی بناری کوە سامور بەکار دێت. دوایەمین لقەکانی دیکەی ڕووباری گەدارخوش، لە چیاکانی چکر و سرکور سەرچاوە هەڵ دەگرن. بەرزایی ڕۆخەکانی ئەو ڕووبارە، هەتا ڕۆخەکانی سەر زەوی ٣٢٠ مەترە. لەبەر ئەوە، تەنیا ڕێگایەک بۆ سوود وەرگرتن لە ئاوەکەی، بەکارهێنانی پەمپی ئاوە، بۆ ئەوەی بە فراوانی لە کشتوکاڵدا بەکار بهێندرێ. خەرجی ساڵانەی ئەم ڕووبارە، ١٦٠ ملیۆن مەتری سێگۆشەیە (٣٥، لاپەڕە ٥٥).

ڕووباری کەنجان چەم

ڕووباری کەنجان چەم، لە چیاکانی سیوان کە کەوتۆنەتە باشووری ئیلامەوە، سەرچاوە هەڵ دەگرن و لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو باشووری ڕۆژئاوا دەڕوات، هەتاکوو لە نزیکی میهرانەوە لە ڕووباری گاوی می دەرژێت. سەرچاوەی ئەم ڕوبارەی دوای چیاکانی

چنگینە، عەلی بەگ، چیای ملاشەیە، ڕووباری گاوی لەگەڵ ئاب ئافتاب، کە لە میشخاسەوە دێت، تێکەڵاو دەبێت. ڕووباری چەشمە مەلک، کە لە چیای شاەنخجیرەوە سەرچاوە دەگرێت، بە ڕووباری ئاب ئافتاب دەگاتەوە. ئەو ڕووبارە دوای ئەوەی ناحیەی ساڵح ئاباد و قەزای میهران دەبڕێت، لە ڕووباری دیجلە دەڕژێت. ساڵانە ١٥٠٠ هێکتار لە زەوی چاندراو، بە ئاوی ڕووباری گەنجان چەم ئاو دەدرێت. خەرجی ساڵانەی ئەم ڕووبارە ٢١١ ملیۆن مەتری سێگۆشەیە (٣٥، لاپەڕە ٥٥).

## ڕووباری گاوی

ئەم ڕووبارە لە بناری کەبیرکوەوە سەرچاوە هەڵ دەگرێت. ئەو لقانەی ئەم ڕووبارەیان لێ پێک دێت، بریتین لەمانە: چەشمەدەرە، بالشک ئاب میر محەمەد (ڕووباری میر محەمەد). ئەم ڕووبارە لە ڕۆژهەڵاتەوە، بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات، هەتا دەگاتە دەشتاییەک بە ناوی بردول. پاشان بە گوندی ڕۆستەم ئاباد و قەزای میهراندا دەڕوات، هەتا دەگاتە ڕووباری گەنجان چەم. ئەم ڕووبارە، بۆ ئاودانی پانتاییەکی نزیکەی ١٠ هەزار هێکتار، لە دەشتی موسین ئاب بەکار دەهێنرێت. خەرجی ساڵانەی ئەم ڕووبارە، نزیکەی ٣٥ ملیۆن مەتری سێگۆشەیە (٣٥، لاپەڕە ٥٥).

## ڕووباری چنگولە

ئەم ڕووبارە، سەرچاوەکەی لە ئاب بیوەرەوە هەڵ دەگرێت، کە کەوتۆتە ٤٠ کیلۆمەتر باشووری ڕۆژئاوای ئیلامەوە. لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو باشووری ڕۆژئاوا دەڕوات. لە ڕێگا چەندین ئاوی دیکەی تێکەڵاو دەبێت، وەکوو ئاوەکانی ئاب کنات و تاتسمورت و فرئاورد بەو ڕووبارە دەگەنەوە. لە دوایدا درێژ دەبێتەوە، هەتا دەگاتە دیجلە. ئاوی ڕووباری چنگولە کەمێک شۆر و گوگرد دارە (٣٥، لاپەڕە ٥٥).

## ڕووباری دویرج

ئەم ڕووبارە لە سەرچاوەی ئابدا ئان سەرچاوە هەڵ دەگرێت، کە بە ٣٨ کیلۆمەتر کەوتۆتە باکووری دیهلۆرانەوە. ئاوی گل گل و ڕووباری درەشور، بە ڕووباری دویرج دەگەنەوە. ئەم ڕووبارە دوای ئەوەی ماوەی ١٨ کیلۆمەترێک، بە نێو خاکی قەزای دیهلۆراندا دەڕوات، لە پاشاندا دە نێو خاکی ناحیەی موسیاندا دەڕوات، لەو شوێنەدا ناوی دەگۆڕێت و پێیدەوترێ ڕووباری عەنبەر. لقێک لە ڕووباری مورموری کە ناوی

جیخابە، لەگەڵ ئەم ڕووبارە یەک دەگرنەوە. ڕووباری دویرج کە لە باکوورەوە بەرەو باشوور درێژ دەبێتەوە، دوای ئەوەی بە نێو خاکی موسیاندا تێپەڕ دەبێت، بە ڕووباری دیجلە دەگاتەوە. ئەم ڕووبارە لە هەندێ نێوچەدا، بە ڕووباری ئابدانان و ڕووباری تالەزێ ناسراوە (٣٥، لاپەڕە ٥٦).

ڕووباری سەدە

ڕووباری سەدە لە بەرزاییەکانی بولییەوە سەرچاوە هەڵ دەگرێت. ڕووبارێکی هەمیشەییە و لە ڕۆیشتنەکەی خۆیدا، بە گەلێ زەوی کشتوکاڵیدا تێپەڕ دەبێت. ئەم ڕووبارە لە تێکەڵاوبوونەوەی چەندین ئاو پێک دێت. لە دەشتاییەکاندا بەرزایی ئەم ڕووبارە، لە ڕووی دەریاوە ٢٢٥ مەترە. ئاوی ڕووباری سەدە، لە زۆر شوێندا بۆ کشتوکاڵ، سوودی لێ وەردەگیرێت.

ڕووباری میمە

ئەم ڕووبارە لە کەبیرکوەوە، لە شوێنێکدا بە ناوی سەراب میمەوە، سەرچاوە هەڵ دەگرێت، کە ٧٢ کیلۆمەتر لە ڕۆژهەڵاتی مێهرانەوە دوورە. هەروەها ئاوی کانی لالەش لەم ڕووبارە دەڕژێت. ڕووباری میمە بەرەو باشوور دێت و لەگەڵ چەندین ڕووباری دیکەدا تێکەڵاو دەبێت، وەکوو ئاب تەختان، گرازان و کانییەکانی ئاب گوگردی.

**ڕووباری کارون**

ڕووباری کارون، لە دەوروبەری گوندی نافجی باکووری شەهری کوردەوە سەرچاوە هەڵ دەگرێت و بەرەو باشوور دێت. پانایی ئەم ڕووبارە لە نێوان ٢ – ٣ مەتردا دەبێت. دوای ئەوەی بە نێوچەی لیلی سریدا تێپەڕ دەبێت، بە ڕووباری کیار یاخود ئاب جهان دەگاتەوە.

ڕووباری کیار لە چیاکانی دەهنوەوە، کە کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتەوە، لە نزیک بروجەنەوە سەرچاوە هەڵ دەگرێت. دوای ئەوەی لەگەڵ ئاوەکانی ئەو نێوچەیەدا یەک دەگرن، بەرەو ڕۆژئاوا دەکشێ، هەتاکوو دەگاتە ڕووباری شەهری کورد. پاش تێکەڵاوبوونی ئەو دوو ڕوبارە (کیار و شەهری کورد)، دەبن بە یەک ڕووبار، ئینجا لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات، هەتاکوو دەگاتە ڕووباری سراب، لە دواییدا لەگەڵ ڕووباری دەرکش و ورکشدا تێکەڵاو دەبێت.

ڕووباری سـراب لە باکـووری ڕۆژئاوای گـوندی بابا حـەیدەرەوە، لە دێسـتـانی مـیـزدج سـەرچاوە هەڵ دەگـرێت و لە باکـووری ڕۆژئاواوە بـەرەو باشـووری ڕۆژهـەڵات دەڕوات. لە نێوان گوندی بیدنە، هەتاکوو بابا حەیدرە، قوڵایی ڕووباری سراب دەگاتە ٣٠ مەتر.

ڕووباری دەرکش و ورکش، کـە قـوڵاییـەکـانیـان لە دەوروبەری ٦٠ مـەتردا دەبێت، لە نزیکی دوپلان بە لقە سـەرەکـییـەکـەی کـارون دەگەنەوە، کـە لە چەندی ئاوی جیـاواز پێک هاتووە و سەرچاوەکانیان لە باکووری ڕۆژهەڵات هەڵ کەوتوون.

لقی سـەرەکی ئاوی کـارون، کـە دیسـانەوە بە نـاوی مـاربرە و دروغـونەوە ناسـراوە، لە ڕۆژهەڵاتی زەردەکوە، دەرە ئەشکەفتە، لە دێستانی بازفتەوە سەرچاوە هەڵ دەگرێت و لە باکووری ڕۆژئـاواوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات دەڕوات. لە پاشـاندا، لە نزیکی دوپلانەوە بە ئاب کوە زەرد یاخـود ڕووباری دەرکش و برکش دەگاتەوە. لە باشووری گوندی مـەعدەن، بە لقێکی دیکە بە ناوی لوردگان ەوە دەگاتەوە، لە دویدا بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوات.

ڕووباری لوردگان لە بەرمی لوردگانی نێوچەی دێستانی خان میرزاوە سـەرچاوە هەڵ دەگرێت و چەندین ئاوی دیکەی تێدەڕژێتەوە. پێش ئەوەی بگاتە ڕووباری کـارون، لە پشت پل مـەعـدەن، کـە کـەوتۆتە باشـووری گـوندی مـەعـدەن، لەو شـوێنەدا، پانـایی لوردگـان لە ڕێژگەکەیەوە ٤ مەتر دەبێت.

ڕڕووباری کـارون لـە ڕۆیشـتنـەکـەیدا بەرەو ڕۆژئـاوا، لەگـەڵ ڕووباری خـەرەسـان، کـە سـەرچاوە لـە ڕۆژهەڵاتی لوردگـانـەوە هەڵ دەگـرێت، تێکەڵ دەبێت، لە دوایدا لـەگـەڵ ئاب بازفتدا کە سەرچاوەکەی دەکەوێتە بەرزاییەکانی زەردەکوەوە یەک دەگرنەوە.

لقـەکانی دیکەی ڕووباری کارون لە خـاکی کـوردسـتـاندا، هەندێکیـان ئەمـانەن: ئاوی گەرم، ئاوی ڕەنگ، سەبزە کوە، سەرخون.

درێژایی تەواوەتی ڕووباری کـارون ٨٥٥ کیلۆمـەترە، کە دوو لەسەر سـێی ئەم ڕووبارە، بە نێو خاکی کوردستاندا دەڕوات. تێکڕای ئاو لەبەرڕۆشتنی ساڵانەی، لە دەوروبەری ٦٢٨ مەتری سێگۆشە لە چرکەیەک دایە. پانایی ئاوی کارون وەکوو یەک نییە.

ڕووباری کـارون لە سـەرچـاوەکـەیەوە، هەتاکـوو شـوشـتـەر، هـەمـوو خـەسـڵـەتەکـانی ڕووبارێکی چیـایی لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە، واتـە بە دۆڵی قوڵ و تەسکدا دەڕوات و بە تیـژیی و بە خێرایی هاژە دەکات. ئەم ڕووبارە لەبەر تواندنەوەی بەفر، لە سەرچاوەی لقـەکانیـادا، لە بەهار و سـەرەتای هاویندا، پڕ لە ئـاوە. بەڵام لە سـەرەتـای پایزدا، بە شێوەیەکی گشـتی کەم دەبێتەوە.

ڕووباری دز

ئەم ڕووبارە، لە چیای کینوەی باکووری ڕۆژهەڵاتی بەختیارییەوە، سەرچاوە هەڵ دەگرێت. دوای ئەوەی بە جێگای ناهەموار و دەرەی تەنگدا تێپەڕ دەبێت، دەڕوات هەتاکوو دەگاتە دورود. لە ڕۆژهەڵاتی دوردەوە، لەگەڵ .ڕووباری بروجەردا تێکەڵاو دەبن. لە دوایدا بە چیاکانی هارون، بیشە، سەفد دەشت، کشوەر، تەنگ هەفت تەنگ، تلە زەنگ، شەهباران، بالارودا تێدەپەڕێ و بەرەو گوندی چقاز بیل دەڕوات. دوای ئەم گوندەش بە چەند کیلۆمەترێک، لە خاکی کوردستاندا تەواو دەبێت. ئەم ڕووبارە چەند لقێکی هەیە، یەکێک لەوانە ئاب بالارودە.

ڕووباری جەڕاحی

ڕووباری جەڕاحی، کە لە یەکگرتنی هەردوو ڕووباری زاڵ و مارون پێک دێت، لە چیاکانی ڕۆژهەڵاتی دێزفولەوە، وەکوو کوەنیل، سەرچاوە هەڵ دەگرێت. ئەم ڕووبارە لە دوو لق پێک دێت: یەکەمیان ناوی شادگانە، کە دەڕژێتە نێو ڕووباری کارونەوە. دووەمیشیان، لە کەنداوی خورموسەوە دەڕژێتە زەریای فارسەوە. ئاوی ڕووباری جەڕاحی، لە مانگی ئەپرێلدا هەڵ دەستێ. تێکڕای ئاو لەبەرڕۆشتنی سالأنەی، نزیکەی ٦٠٠ مەتری سێگۆشەیە لە چرکەیەکدا.

ڕووباری زوهرە

ڕووباری فەهلیان Rud–e Fahliyan کە سرچاوەکەی لە بەرزاییەکانی ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی نورئابادەوە هەڵ دەگرێت و لە چەندین ئاو پێک هاتووە، بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات. لە دوایدا لە ژێر ناوی ڕووباری زوهرەدا، بەرەو باکووری ڕۆژئاوا دەچێت و لە ڕۆژئاوای شارۆکەی سەردەشت، ناوەکەی دەگۆڕێ و دەبێتە هەندیجان Rudhane -ey Hendigan، لە باکووری گوندی موللا بەرەو باشوور دەبێتەوە، هەتاکوو لە ڕۆژئاوای باغەل یۆلاند، لە کەنداو دەڕژێت و تەواو دەبێت.

ڕووباری زەرد

ئەم ڕووبارە، لە بناری چیاکانی منگشتەوە سەرچاوە هەڵ دەگرێت. لە ڕێڕۆشتنەکەیدا، تووشی چەندین کانی دەبێت، کە ئاوەکانیان لە تواندنەوەی بەفری لوتکەی چیاکانەوە دێن. ڕووباری زەرد لە دەرەی مال ئاقا گەورەوە ئاوا دەبێ و بەرەو شارۆکەی باغ مەلیک دەڕوات. لەوێشەوە بەرەو میداود و لە دوای میداودیش، ڕەنگی ئاوەکەی زەرد دەبێت، لەبەر ئەوەی بەسەر بەردی جۆراوجۆر و خوێی مەعدەنیدا دەڕوات. ئەم ڕووبارە بەرەو باشوور دەڕوات و لە خەڵەف ئابادەوە، بەرەو کەنداوی فارس دەبێتەوە و لەگەڵیدا تێکەڵ دەبێت.

**ب - ئەو ڕووبارانەی دەڕژێنە نێو کەنداوی ئەسکەندەرونەوە**

ئەسکەندەرون، یەکێ لە کەنداوەکانی زەریای ناوەڕاستە. ئەو زەریایە بە زەریایەکی نێوخۆی ئۆقیانووسی ئەتڵەنتیک دادەنرێت، دەکەوێتە نێوان کیشوەرەکانی ئەوروپا و ئاسیا و ئەفەریقاوە. لە ڕۆژئاواوە بە هۆی تەنگەی جەبەل تاریقەوە، لە ئۆقیانووسی ئەتڵەنتی دەڕژێ و لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە لە ڕێگەی تەنگەی دەردەنیل و مەرمەڕە و بسفۆڕەوە، دەگاتە زەریای ڕەش و لە باشووری ڕۆژهەلاتەوە، بە هۆی کەناڵی سویس لەگەڵ زەریای سور تێکەڵاو دەبنەوە. پانتایی زەریای ناوەڕاست، ٢٥٠٥ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەیە و بارستایی ئاوی ٣٧٥٤ هەزار کیلۆمەتری سێگۆشەیە و تێکڕای قوڵایی ١٤٩٨ مەترە.

کەنداوی ئەسکەندەرون، لە باکووری ڕۆژهەڵاتی زەریای ناوەڕاستدا هەڵ کەوتووە و دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای کوردستانەوە. درێژاییەکەی ٧٤ کیلۆمەترە و پانایییەکەی ٤٦ کیلۆمەترە و قوڵاییەکەیشی لە ڕۆژئاوادا، دەگاتە ٩٩ مەتر. کەناری ڕۆژهەڵاتی چیایە و کەناری ڕۆژئاواشی دەشتاییە. گرنگترین ڕووبارەکانی کوردستان، کە بە کەنداوی ئەسکەندەرون کۆتایی پێ دێت و دەڕژێتە نێو زەریای ناوەڕاستەوە، ئەمانەن:

ڕووباری جەیحان

سەرچاوەی ڕووباری جەیحان، دەکەوێتە چیاکانی ئیشق – Isik و حەزانلی – Hezanli و تاحتالی – Tahtali و قیزیل – Kizil و چیاکانی بینبۆغا – Binboga. بەشی سەرەوەی، کە لە چیای تاحتالییەوە دێتە خوارەوە، بە دەرەی شۆهێل – Suhul دەناسرێ. ئەو ئاوەش بە دەوری خۆی، لەگەڵ چەندین ئاوی دیکەدا تێکەڵ دەبێت، وەکوو چەمی گوکسون – Goksun دەرەی چاتەغان – Catagan D. و چەمی خورمان – Hurman C. و گەلێکی دیکەش. سەرچاوەی ئەو چەمانە، هەموویان دەکەونە نێو خاکی تورکیاوە. ڕووباری جەیحان، لە باکووری گوندی لزگین – Lzgin ە و دێتە نێو خاکی کوردستانەوە، سەمتی ئەو ئاوە. جارێک بەرەو ڕۆژئاوا و جارێکی دیکەش بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوات، لە دواییدا بەرەو باشوور دێتە خوارێ و لە ڕۆژهەڵاتی گوندی تۆمباک – Tombak، ناوەکەی دەگۆڕێ و دەبێتە ڕووباری جەیحان. لە دوای ئەو گوندە، بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات و دوایی باشووری ڕۆژئاوا، هەتاکوو لە باکوور دەڕژێتە عەماراوی مەنزەلەت – Menezelet Baraji، لە پاشان لە باشووری ئەو عەمارەوە بەرەو باشوور دێتە خوارەوە، بەڵام لە پاشان بەرە بەرە بەرەو باشووری ڕۆژئاوا پێچ دەکاتەوە، هەتا دەگاتە عەماراوی ئەسلانتاس – Aslantas Baraji، لەوێشەوە بەرەو باکوور دێتە خوارەوە و بەرەو ڕۆژهەڵاتی گوندی کە

سککەلی – Kesikkli، کـە دەکـەوێتـە سـەر هـێـڵـی درێژی ٣٦ی ڕۆژهەڵات و لە پاش ئەو گوندەش لە خاکی کوردستان دەچێتە دەرەوە.

ڕووباری جەیحان، چەند ئاوێکی لە لای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە تێدەڕژێت. گرنگترینیان ئەمانەن:

چەمی سـوغـوتلی – .Sögütli C: ئاوی چیـای نورهەق – Nurhak dag، سـەرچاوەی ئەو چەمـە پێک دەهێنێت، کـە لە باشـوورەوە بەرەو باکووری ڕۆژئاوا درێژ دەبێتـەوە، لە پاشـان بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات، دوای ئـەوەی بە باکـووری شـارۆچکەی ئەلبـیـسـتـاندا – Elbistan تێدەپەڕێت، هەتاکوو دەگاتە ڕووباری جەیحان.

چەمی گـوکسـون – .Göksun C: لەوانەیە ئـەم چەمـە، درێژترین و پڕئاوترین لقـەکـانی ڕووباری جـەیحـان بێت. سـەرچاوەکـەی دەکـەوێتـە باشـووری چیـاکـانی ئەنگزەکـەوە – Engizek Dagı. هـەر لە سـەرەتاوە لە دوو ئـاو پێـک هـاتووە، دوای ئـەوەی لـە ڕۆژهـەڵاتـی گـوندی جاکـارکـایا – Cakarkaya ، بە چەند کـیلۆمـەترێک تێک دەڕژێن، لە پاشـان بەرەو باشوور دەبێتـەوە و لە دوای دا باشووری ڕۆژئاوا و لە پاشان عەمبـاراوی قارتاکایا – kar-takaya Baroji، بە نـاوی چەمـی ئاق سـوو – .Aksu C ەوە دەناسـرێ، لە پـاشـان بەرەو باشـووری ڕۆژئاوا درێژە بە ڕۆشـتنەکـەی خـۆی دەدات، دوایی بـەرەو ڕۆژئاوا و دوای ئەو پێچکردنەوەیەش، ناوەکەی دەگـۆڕێ و دەبێتـە چەمی گوکسـون، کە لە ڕۆژئـاوای گـوندی جوجەل – Cucel، بە چەند کیلۆمەترێک، لە ڕووباری جەیحان دەڕژێت.

ئاقـار سـوو – Akar su : ئاوی چیـای نور – Nur dag، بە سـەرچاوەی ئاوی ئاقـار سـوو دادەنرێت. ئەو ئاوە، هەر لە سەرچاوەوە لە دوو ئاو پێک دێت، دوای ئەوەی تێکەڵاو دەبنەوە، بـەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات و لـە دوای بـاشـــووری ڕۆژئـاواش، جـــارێکی دیکـە بەرەو ڕۆژئـاوا دەڕوات، هەتاکوو بە ڕووباری جەیحان دەگات.

ڕووباری عەفرین

ڕووبـاری عـەفرین لە چیـاکـانی کـارتاڵەوە – Kartal dag، سـەرچاوە هـەڵ دەگرێت و لە تێکـەڵابوونی دوو ئاو پێک دێت، پاشـان بـەرەو باشـوور و دوای کـەمـێک بـەرەو باشـووری ڕۆژئاوا دەڕوات و پێـی دەگوترێ ئاوی ئاڵتـون – Altin suyu، لە دوایدا بەرەو ڕۆژهەڵات پێـچ دەکـاتەوە، ئینجـا بەرەو ڕۆژئـاوا، پاشـان بەرەو بـاشـوور دەڕوات و بە شـارۆچکەی عـەفـریندا تێـدەپەڕێت و لە دوایدا نـاوی عـەفـرێنـی بەسـەرا دەبڕێت و لـە باشـووری ئەو شـارۆچکەیـەوە، بە چەند کـیلـۆمـەترێک، بەرەو ڕۆژئـاوا دەبێـتـەوە و لـە ڕۆژئاوای گـوندی حەویجەوە بە چەند کیلۆمەترێک، لە خاکی کوردستان دەردەچێتە دەرەوە.

ڕووباری عەفرین چەند ئاوێکی تێدەڕژێت، لە هەموویان گرنگتر، ئاوی سابونە – Sabun suyu، کە سەرچاوەکەی دەکەوێتە چیای کارتاڵەوە، ڕووەکەشی لە باکوورەوە بۆ باشوورە، لە پاشاندا لە ڕۆژئاوای گوندی دێرسوان، دەڕژێتەوە نێو ئاوی ئاڵتونەوە.

### ج - ئەو ڕووبارانەی دەڕژێنە زەریای خەزەرەوە

زەریای خەزەر (قەزوین، کەسپی، مازندەران) گەورەترین گۆلی سووری سەر ڕووی زەوییە و هیچ ڕووبارێکی لەبەر ناڕوات. درێژایی زەریای خەزەر لە باکوورەوە هەتاکوو باشوور، ١٢٠٠ کیلۆمەترە. تێکڕای پانی لە دەوروبەری ٣٠٠ کیلۆمەتر دایە و دەکەوێتە ٢٨ مەتر ژێر ڕووی ئۆقیانووسەکانەوە و لە نێوان کیشوەرەکانی ئەوروپا و ئاسیادا هەڵ کەوتووە. بەشێکی سەر بە ڕووسیایە و بەشەکەی دیکەشی سەر بە ئێرانە. پانایی خەزەر لە چەند ساڵیکەوە بۆ چەند ساڵێکی دیکە، کەم دەبێتەوە (١٩٣٠ – ٤٢٤ هەزار مەتری چوارگۆشە، ١٩٥٢ – ٣٩٣ هەزار مەتری چوارگۆشە، ١٩٥٧ – ٣٧١ مەتری چوارگۆشە بوو.) چەند ڕووبارێک دەڕژێنە زەریای خەزەرەوە، هەرە گرنگەکانیان، ئەوانەی بە کوردستاندا تێدەپەڕن، ئەمانەن:

ڕووباری ئاراس ــ Aras N.

سەرچاوەی ڕووباری ئاراس، دەکەوێتە باشووری چیای کارگا بازاڕ – Karga pazare و چیاکانی شاهوالاتەوە – Sahvalet،.بە واتایەکی دیکە، مەڵبەندی ڕۆژهەلاتی شاری ئەرزەڕۆم، ڕووباری ئاراس، لە ئاوەڕۆی سەرروویەوە، لە دە ئاو زیاتر پێک هاتووە، هەمووشیان لە باشووری شارۆچکەی چۆباندەدەوە – Cobandede تێک دەڕژێن و بەرەو ڕۆژهەلات دەڕۆن هەتاکوو باشووری شارۆچکەی قاراکورت – Karakurt، لەوێشەوە بەرەو باشووری ڕۆژهەلات دەڕوات، هەتاکوو ڕۆژهەلاتی گوندی چایاراسی – Cayarasi. لە پاشان جارێکی دیکە بەرەو ڕۆژهەلات و باکووری ڕۆژهەلات دەبێتەوە و لە باکووری شارۆچکەی کاغیزمانەوە – Kagisman، بەرەو ڕۆژهەلات دەبێتەوە، لە دوایدا بەرەو باشووری ڕۆژهەلات دەڕوات، هەتاکوو دەگاتە زەریای خەزەر ڕووباری ئاراس لە دواییەوەی لەگەڵ ئاق چایدا تێکەڵ دەبێت، ئیدی خاکی کوردستان بەرەو ئێران، بەجێ دەهێڵێت.

درێژایی ڕووباری ئاراس، لە سەرچاوەکەیەوە هەتاکوو دەڕژێتە زەریای خەزەر، ١٠٧٢ کیلۆمەتر دەبێت، نێوەی ئەو درێژییە، لە خاکی کوردستان دایە. پانی ڕووباری ئاراس، لە

نێوچەی پلدشت لە نێوان ٩٠ – ١٠٠ مەتر دایە و قوڵاییەکەشی لە هەمان شوێندا، دەگاتە دوو مەتر. حەوزی ئاوی لە دەوروبەری ١٠٠ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە دایە و زۆربەشی دەکەوێتە نێو خاکی کوردستانەوە. گرنگترین لقەکانی ڕووباری ئاراس، لە نێو خاکی کوردستاندا ئەمانەن:

چەمی ئارپا – Arpa C.: لە تێکەڵاوبوونی چەمی کاس – kass Cayi و دەرەی قەرەخاناخ چارچی – Karahang carci D. پەیدا بووە، کە سەرچاوەکانیان دەکەوێتە نێو چیاکانی کسهەرەوە – Kishir و ئاق بابە – Akbaba،دوای ئەوە لە عەماراوی ئاریا دەڕژێت، پاشان لە باکوور سەر دەردەهێنێ و بەرەو باشوور دەڕوات، هەتاکوو دەگاتە ڕووباری ئاراس. چەمی دیگۆر – Digor C.، کە سەرچاوەکەی دەکەوێتە چیای دومانلەوە – Dumanli، یەکێ لە لقە گرنگەکانی ئاوی ئارپا پێک دەهێنێت.

دەرەی ئاساغ – Asag D. : ئەم دەرەیە لە ڕۆژهەڵاتی چیای ئاراس قۆینی – Arasqûneyi و چیای قزل چازیا ڕەت – Kızılcazıyarat پەیدا دەبێت و لە باشوورەوە بەرەو باکوور دەڕوات، هەتاکوو لە باکووری گوندی ییِنی کۆی – Yeniköy لە ڕووباری ئاراس دەڕژێت.

زنگمار: ئەم ئاوە لە تێکەڵاوبوونی ئاوی ساری و قزل پێک دێت. ئەو دوو ئاوە، لە دەوروبەری شارۆچکەی ماکۆ پێک دەگەن و بەرەو ڕۆژهەڵات بە ناوی زەنگمارەوە دەڕۆن و لە نزیک شارۆچکەی پلدەشتەوە لەگەڵ ئاراسدا، بە یەک دەگەنەوە.

چەمی ئاق: لقی ڕۆژهەڵاتی (زنور چای)، کە سەرچاوەکەی دەکەوێتە کێوەکانی قازان و عەلەمدارەوە، لەگەڵ لقی ڕۆژئاوای (ئاق چای) لە باشووری گوندی مارکات پێک دەگەن و بە ناوی ئاق چای لە .ڕووباری ئاراس دەڕژێن.

چەمی قوتور: ئاوی کوە محەمەد ئاق – ٣٣٤٥ مەتر و دەورویشتی، هەمووی لە دۆڵێکدا کۆ دەبێتەوە و بە ناوی ئاوی قوتور چای بەرەو باکوور دەڕوات و لە دەوروبەری گوندی ئاوئوغلی لە زنور چای دەڕژێت.

### د - ئەو ڕووبارانەی دەڕژێنە زەریاچەکانەوە

هەندێک لە ڕووبارەکان، ڕێڕەوەکەی خۆیان بە زەریاچەکانی وەکوو وان، ورمێ و هەندێکی دیکە کۆتایی پێ دێنن. ڕووبارەکان بە زۆری کورت و کەم ئاون و هەندێکیشیان لە هاویناندا، لەبەر وشککردنی سەرچاوەکانیان، دەبنە کەندی بێ ئاو.

١/ ئەو ڕووبارانەی دەچنەوە سەر گۆمی وان

زیاتر لە سی چای، دەرە و سوو قۆناخی دوای ڕێڕەوویان زەریاچەی وانە، کە گرنگەکانیانئەمانەن:

چەمی دەلی – Delı C.

ئەم چەمە سەرچاوە لە ئاوەکانی چیای ساری چیچکەوە – Sarıcicek dagı هەڵ دەگرێت و لە باکوورەوە بەرەو باشوور دێ. لە دوایدا لە ڕۆژئاوای گوندی چۆتوکلی – Cotuklu، سەمتەکەی دەگۆڕێ و بەرەو باشووری ڕۆژئاوا دەڕوات و چەندین جۆگە و سەرچاوەی تێدەڕژێنەوە. لە پاشان لە ڕۆژئاوای شارۆکەی دەلی چایەوە، لە زەریاچەی وان دەرژێن.

دەرە ئۆروچ – Oruc Dere

باشووری چیای ئالا – Ala dagı، ڕۆژئاوای چیای ساری چیچک – Sarıcıcek dagı، مەڵبەندی هەڵقوڵینی ئەم دەرەیەن. دەرە ئۆروچ لە چەند ئاوێک پێک دێت، کە هەموویان لە باکوورەوە بەرەو باشوور دێن و لە ڕێگایاندا، چەند ئاوێکی دیکەیان بەسەردا دادەبڕێت، هەتاکوو هەموویان پێکەوە، لە لای باکوور و ڕۆژهەڵاتی چەلەبی باغی – Celebe Bagı، لە زەریاچەی وان دەرژێن.

چەمی یەنیکو پرو – Yeniköpıu Cay

ئاوەکانی ڕۆژهەڵاتی چیاکانی بیلیجان – Bilican Dag و دەوروپشتی، لە دوو ئاوی جیاوازدا کۆ دەبنەوە، پاشان بە یەک دەگەن و ئەم چەمە پێک دەهێنن. چەمی بەنیکوپرو لە باشووری ڕۆژهەڵاتی گوندی پەنیکوپرو، لە زەریاچەی وان دەرژێتەوە.

ئاوی گوزال – Güzel sü

ئاوی باران و بەفراوی باشووری چیای ئەرەک – Erek Dagı ، لە ڕێی ئەم ڕووبارەوە، کە لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات، دەگەنە زەریاچەی وان.

چەمی مەرمیت – Mermit Cay

یەکێ لە ڕووبارە هەرە گەورەکانی زەریاچەی وانە. سەرچاوەکەی دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ئەو زەریاچەوە. لە سەرەوە لە چەند ئاوێک پێک هاتووە، کە هەموویان لە باکووری گوندی ئاکسۆرگوچەوە – Aksorgus تێک دەرژێن، پاشان لە ژێر ناوی مەرمیت چایدا، بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات، دوایی بەرەو ڕۆژهەڵات و بە زەریاچەی وان کۆتایی پێ دێت.

چەمی بەندماها – Bendmaha Cay

لە ڕۆژئاوای چیای ئەسەنجەل – Esengel، ڕۆژهەڵاتی چیای ساری چیچک –

Sarıcicek و باشـــووری چیـــای تەندیورەک – Tandürek، ســـەرچاوە هەڵ دەگـــرێت و لە ڕۆژئاوای شـــارۆچکەی مـــورادیە – Murediye، بە چەند کـیـلۆمــەترێک، لە زەریاچەی وان دەڕژێت.

٢/ ئەو ڕووبارانەی دەچنەوە سەر گۆمی ورمێ

زیاتر لە پانزە ڕووبار لە ڕووبارەکـانی کــوردســتــان و ژمــارەیەک لە ڕووبارەکــانی ئازەربایجان، ئاو بۆ زەریاچەی ورمێ دەبەن. گرنگترین ڕووبارەکانی کوردستان، ئەمانەن:

چەغەتوو

ئاوی چیـاکـانی قـادرکـڕیا و دوبرا و سـوڵتـان ئاغـزتو و شـاخـەڕەشـە و بـازاین و قەرەئەلیاس و چاڵە ڕەشـە و هەندێکی دیکەش، سەرچاوەی ڕووباری چەغەتوو (زێڕن چۆم) پێک دەهێـنن، دوای ئەوەی ئەو ئاوانە تێکەڵاو دەبن، ئاوی چەغەتو ڕوو لـە ڕۆژئاوا دەکات و دوایی بەرەو باکوور دەڕوا و بە ڕۆژئاوای چیای بەردرخناویدا تێپەڕ دەبێت و پاشان بەرەو ڕۆژئاوای گوندی کانعمت دەکشێ، لە دوای ئەم گوندەوە، ناوەکەی دەبێتە چەغەتوو. پاشان ئەو ئـاوە بەرەو باکـووری ڕۆژئـاوا دەڕوا و لە نزیـک ڕۆژئاوای گـوندی ڕێزان، ڕووی خـۆی دەگۆڕێ و بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات دەڕوات، ئینجا ڕۆژئاوای شارۆچکەی سائین قەڵا و لە دوایدا شـــارۆچکەی مـیـانـدواو دەبڕێ و لەوێشـــەوە بەرەو زەریاچـەی ورمێ دەڕوات، دوای ئەوەی بە زەلکاوەکانی باشـووری ئەو زەریاچەیـەدا تێدەپەڕێ. درێژایی چەغـەتوو نزیکەی ٢٤٠ کیلۆمەتر دەبێت.

ژمـارەیەکی زۆر لە ئـاوی جیـاواز، لە لای چەپ و لە لای ڕاسـتـەوە، دەڕژێنە نێـو ئاوی چەغەتووەوە، ڕەنگە هەرە گرنگەکانیان، ئەمانەی لای خوارەوە بن:

ا – خوڕخوڕە

ڕووباری خـوڕخوڕە، لە تێکەڵاوبوونی ئاوەکـانی دەرە سلێمان ئاباد و کـانی خەسرەو و ڕووباری هـەنگـانە و چەمـی نێــرگــسلـە و گـــوڵ بـەگ و ڕووباری کلـە ئاباد پێک دێت، کــە ســەرچاوە لە کێوەکانی بەردوش و ســەنگ سـەفید و قـەڵەم دەروێش و مـەسـجـید مـیـرزا و ســوڵتــان ئـاغـزتو و دوبرا و قــادرکـڕیا و کــانـی مــیــران ... تاد هەڵ دەگــرن. ئەو ئـاوانە هەمـوویان، لە باشووری گوندی توکەلان بە چەند کیلۆمـەترێک لەگەڵ یەکدیدا تێکەڵاو دەبن و پاشان بە ناوی چۆمی خوڕخوڕەوە ناو دەبرێت.

چۆمی خـوڕخـوڕەش، دوای ئـەوەی پێک دێت، لە بـاشـوورەوە بـەرەو باکـوور دەبێـتـەوە،

هەتاکوو دەوروبەری ڕۆژهەڵاتی گوندی عەزیز ئاباد دەڕوات، ئینجا بەرەو ڕۆژئاوا پێچ دەکاتەوە، هەتاکوو نزیک گوندی مەولان ئاباد دەبێتەوە. لەوێشەوە بەرەو باکوور دەڕوات، دوایی بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات دەبێتەوە، هەتاکوو دەگاتە دەوروپشتی گوندی دالو، لەوێشەوە جارێکی دیکە، بەرەو باکووری ڕۆژئاوا دەبێتەوە، هەتاکوو لە نزیک گوندی قیشلاق ڕەزا، لە چەغەتوو دەڕژێت. لقەکانی خوڕخوڕە ئەمانەن:

چەمی پیر سلێمان – سەرچاوەکەی دەکەوێتە کێوەکانی چارکە و دەروێش. ئەو ئاوە بەرەو باکووری ڕۆژئاوا دەڕوات و لە ڕۆژهەڵاتی گوندی ڕوستەمان، بە چەند کیلۆمەترێک لە چۆمی خوڕخوڕە دەڕژێت.

ئاوی ئیراب – لە سەرەتاوە ژمارەیەکی زۆر لە ئاو، کە سەرچاوەکانیان دەکەوێتە کێوەکانی حاجی سەید و کونە کشک و قەڵا سوڵتان و هەندێکی دیکەوە، بە جیا جیا دەڕۆن، پاشان تێکەڵاو دەبن. دوای ئەوەی ئەو ئاوانە، لە ڕۆژئاوای گوندی تیمان قەڵا تێکەڵاو دەبن، ناوەکەی دەبێتە ئیراب. پاشان ئاوی ئیراب بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات، هەتاکوو لە ڕۆژئاوای گوندی چنارەوە، پاش چەند کیلۆمەترێک، دەڕژێتە چەمی خوڕخوڕەوە.

ڕووباری زایدە – ئەم ڕووبارە، لە ڕۆژهەڵاتی گوندی قەرەگۆل، دەڕژێتە نێو ئاوی خوڕخوڕەوە. لە سەرەتاوە لە ژمارەیەکی زۆر لە ئاو پێک دێت، کە هەموویان لە ڕۆژهەڵاتی گوندی سپەورەتیک دەڕژێنەوە و بە ڕووباری زایدە دەناسرێن.

ڕووباری خانە شورتی – لە کێوی بەردەر خەناوییەوە هەڵ دەقوڵێت و لە باشوورەوە بەرەو باکوور دەڕوات، هەتاکوو لە باشووری گوندی هەولان ئاباد، دوای چەند کیلۆمەترێک، دەڕژێتە چەمی خوڕخوڕەوە. ڕووباری خانە شورتی، لە لای چەپ و لە لای ڕاستەوە، ژمارەیەکی ئاوی تێدەڕژێت.

ئاوی ڕەغجەر – سەرچاوەکەی دەکەوێتە کێوی نینەوە. لە باشووری ڕۆژئاواوە بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات دەڕوات، هەتاکوو لە نزیک گوندی خوڕخوڕەوە، پاش چەند کیلۆمەترێک، دەڕژێتە چەمی خوڕخوڕەوە.

ب – کورە قەڵا

ئەم ئاوە، لقێکی دیکەی چەمی چەغەتووە و لە ئاوەکانی چەمی کەسنەزان و چەمی سماقلو و چەمی دەرەئاب و چەمی جەوشن پێک دێت و پاشان بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوات، هەتاکوو لە باشووری گوندی قیشلاق پول دەڕژێتە نێو ئاوی چەغەتووەوە.

ج – چەمی سەقز

ئەم چەمە، بە گرنگترین لقی لای چەپی ئاوی چەغەتوو دادەنرێت. سەرچاوەکەی

دەکەوێتە کێوی هەوارە بەرزن (٢٢٦٠ مەتر) و دووسەرە و بەردەسیر، پاش ئەوەی ئاوی ئەو کێوانە کۆ دەبنەوە و دەبنە یەک ئاو، بە ناوی چەمی میرگە نەخشینەوە، لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوات. لە دوایدا بەرەو باکووری ڕۆژئاوا پێچ دەکاتەوە و ئینجا بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە، هەتاکوو دەگاتە باکووری ڕۆژهەڵاتی گوندی مێرگە نەخشینە. دوای ئەم گوندە، بە ناوی چۆمی شێخ چۆپان دەناسرێ و لە باکوورەوە بەرەو باشوور دەڕوات، هەتاکوو دەگاتە گوندی شێخ چۆپان و لە باشووری ئەم گوندەشەوە، ئاوەکە سەمتی خۆی دەگۆڕێت و بەرەو ڕۆژهەڵات و لە پاشان بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات دەڕوات. لەو ماوەیەدا چەند جارێک پێچ دەکاتەوە، هەتاکوو بەرەو باکووری گوندی کویرە کویز دەبێتەوە، لە دوایدا ناوەکەی دەبێتە چەمی سەقز. پاشان بە ڕۆژهەڵاتی کێوی وەرزمەدا، بەرەو باشوور دەڕوات، ئینجا بەرەو ڕۆژهەڵات، هەتاکوو نزیک گوندی خدر دەبێتەوە، لەوێشەوە بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات و دوایی بەرەو باشووری ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی سەقز و گوندی ئاق تەپە درێژەی پێ دەدات، هەتاکوو لە ڕۆژهەڵاتی گوندی داش ئالوجە، دەڕژێتە چەمی چەغەتووەوە. لقە گرنگەکانی چەمی سەقز، ئەمانەی لای خورەوەون:

١. چەمی خان – لە کێوەکانی گردە (٢٦٣٠ مەتر) و نەکرزە (٢٦٤٠ مەتر) و غەزەب (٢١٦٠ مەتر) و نێگروز و هەندێکی دیکەش پێک دێت. ئەم ئاوە، ڕێڕەوەکەی لە باشوورەوە بەرەو باکوورە. لە بەشی سەرەوەی بە ناوی چەمی قەبغلوچەوە دێتە خوارەوە و پاش چەند کیلۆمەترێک ناوەکەی دەگۆڕێو پێی دەوترێ چەمی تەموتە. دوای ئەم گوندە، بەرەو ڕۆژهەڵات قەفێکی گەورە دەخوا و دوایی ڕوو لە ڕۆژئاوا دەکات و جارێکی دیکەش بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە. پاشان لە دەوروبەری ڕۆژئاوای گوندی مازوجدار، بە چەمی خان دەناسرێ و بەرەو چەمی سەقز دەڕوا و لەوێ یەک دەگرنەوە. چەمی خان، چەند لقێکی هەیە، لەوانە چەمی مێردە، کە سەرچاوەکەی دەکەوێتە کێوی کزارە (٢٢٢٧ مەتر) و سەرتون (٢٦٢٢ مەتر) و قەڵا گاە ... هتد.

٢. چەمی ئاڵتون – لە ئاوەڕۆی سەرەوەی، لە ئاوەکانی چەمی مەرخوز، کە سەرچاوەکەی دەکەوێتە کێوی ئەستاد مستەفا (٢٢٥١ مەتر) و چەمی ئاخ کەند و چەند ئاوێکی دیکە پێک دێت. هەموو ئەو ئاوانە، لە دەوروبەری گوندی ئاخ کەند تێکەڵاو دەبنەوە و ناوەکەی دەبێتە چەمی ئاڵتون و پاشان بەرەو باشووری گوندی ئاڵتونی ژیری دەڕوات، هەتاکوو دەڕژێتە چەمی سەقزەوە.

تەتەهوو

لە کێوەکانی کابری (٢٤١٧ مەتر) و خەسرەو و قالات و دووسەرە (٢١٥٦ مەتر) و هەندێکی دیکەوە سەرچاوە هەڵ دەگرێت. ئاوەڕۆی سەرەوەی لە کۆمەڵە ئاوێک پێک هاتووە، دوای ئەوەی ئەو ئاوانە، لە باشووری گوندی زاوەکوە تێکەڵاو دەبن، ناوەکەی دەبێتە چەمی زاوەکوە. پاشان ئەو ئاوە لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوات، هەتاکوو دەگاتە باشووری گوندی پیر بەهادین، دوایی بەرەو باکوور دەبێتەوە وناوەکەشی دەگۆڕێ و پێی دەوترێ ڕووباری گلولان، هەروەها درێژە بە ڕۆشتنەکەی خۆی دەدات، هەتاکوو باشووری گوندی قازانتا، لە دوای ئەم گوندە، بە ناوی تەتەهوو دەناسرێ و بەرەو زەریاچەی ورمێ دەڕوات.

لە لای ڕاست و چەپەوە، ژمارەیەک ئاو لە تەتەهوو (سمینەرود) دەڕژێت، کە قروچایە لە هەموویان ئاوی زیاترە و سەرچاوەکەشی دەکەوێتە باشووری کێوی خەلو (٢١٦٦ مەتر)، لە ئاوەڕۆی سەرەوەی بە چەمی ئاچوتان دەناسرێ و بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوات، هەتاکوو لە باشووری گوندی قروچای ژێری، دەڕژێتە نێو ئاوی تەتەهووەوە.

سەرەڕای ڕووبارەکانی چەغەتوو، تەتەهوو و لقەکانیان، کە لەسەرەوە باسمان کردن، چەند ڕووبارێکی دیکەش هەن، کە دەڕژێنە زەریاچەی ورمێوە، بەڵام بایەخیان لەوانەی پێشوو کەمترە، وەکوو زولاچای و نازلوچای و شەهر چای و باراندوز و گدار چای و جان درە و گەلێکی دیکەش.

## زەریاچەکان

لە ئەنجامی ڕۆچوون و جموجۆڵی تەکتۆنی چینەکانی ژێر زەوی و جوڵانەوەکانی سەر ڕووی زەوی و تا ڕادەیەکیش ڕووتاندنەوەی زەوی، کۆمەڵە زەریاچەیێ لە کوردستاندا دروست بوون.

خەسڵەتە گرنگەکانی ئەم زەریاچانە لەوە دایە، کە ئاویان لەبەر ناڕوات، واتا زەریاچەی داخراون، لەبەر ئەوە زۆربەیان ئاوەکانیان سوێرە و بۆ کشتوکاڵ و پێویستییەکانی ڕۆژانە، بەکار ناهێنرێن، بەڵام ئەوەی هەیە، لە هاویناندا وشک ناکەن، چونکە ئەو ڕووبارانەی دەڕژێنە نێو ئەو زەریاچانەوە، سەرچاوەکانیان یا لەو شوێنانە هەڵ کەوتوون، کە ساڵ دوازدەی مانگ بەفریان لێ ناچێتەوە، یاخود لە کانێک سەرچاوە هەڵ دەگرن، لە هەندێکیاندا پاپۆڕ هاتوچۆی پێدا دەکات، کە ساڵانە بە سەدان کەس و بە سەدان تەن شتومەک دێنن و دەبەن. دەسکەوتی ساڵانە لە سامانی ئاو بە تایبەتی ماسی، دەگاتە

چەندین تەن، بەڵام گۆشتی ماسییەکان کەمێ سوورە، ئەویش لەبەر سووری ئاوەکانە. ڕۆخی زەریاچەکان بە ئاوەدانییەکانی شار و گوند چواردەورە دراوە. لەو نێوچانەدا، لەبەر نەبوونی هۆیەکانی هاتوچۆ و خراپی خزمەتگوزاریی و نەبوونی ئوتێل، جوڵانەوەی توریستی تێدا کەمە. زەریاچەکان لە زستاندا، بە مەڵبەندی دەیان جۆر باڵندەی نێوچە ساردەکانی سەر ڕووی زەوی دادەنرێن.

**زەریاچەی وان**

بە گەورەترین زەریاچەی کوردستان دادەنرێت. بەرزاییەکەی لە سەر ڕووی زەریاوە، ١٦٤٦ مەترە. پانتاییەکەی ٣٧١٣ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە. بەشی هەرە فراوانی کەوتۆتە نێوچەی شارۆچکەی تاتوانەوە. جێگا هەرە قوڵەکانی لە سەد مەتر زیاترە دەبێت. زەریاچەی وان لە هەموو لایەکەوە ئاوی تێدەڕژێت، لە هەموویان گرنگتر، لە ڕووی زۆری ئاوەوە، چەمی قەرەسوو و خۆشابە و بەندی ماهییە. ئاوی زەریاچەی وان سوورە، چونکە ئاوی لەبەر ناڕوات. ڕووی ئاوەکەی لە بەهار و هاویندا، پان دەبێت، چونکە لەو دوو کەژەدا، ئاوی زۆری تێدەڕژێت. بەڵام لە پایزدا، ئەم ئاوە پانابیەکەی لە ٣٠ - ٥٠ مەتر کەمتر دەبێتەوە. شەپۆلەکانی زەریاچەی وان، لە نێوان دوو تاکوو سێ مەتر دایە. شەپۆلەکان، بە تایبەتی لە کاتی زیادبوونی ئاودا، گەلێک بڵند دەبنەوە.

دیارە زەریاچەی وان، بە هۆی بزووتنەوەی تەکتۆنییەوە، لە شوێنی دەشتی موش و چیای نەمرودی ئێستاکە، لە نیوەی دووەمی چەرخی سێیەمدا پەیدا بووە و سەرەتا چاڵێکی گەورە دروست بووە و پاشان ئەو چاڵە، وردە وردە پڕ بووە لە ئاو و لە ڕێگەی دۆڵی مورادەوە، ئاوەکەی لەبەر ڕۆشتووە. لە سەدەی چوارەمدا، لەنێو جەرگەی زەویدا بومەلەرزەیەک ڕووی داوە، بە شێوەیەک بووە، کە چیای نەمرود بەرز بۆتەوە، کە بە دەوری خۆی کاری لە ڕۆشتنی ئاوەکەی دۆڵی موراد کردووە و ڕێی لە ڕۆشتنی ئاوەکەی گرتووە، پاشان ئەوەکە لەو چاڵەدا، لە شوێنە هەرە قوڵەکانیدا کۆ بۆتەوە، کە ئەورۆ زەریاچەی وانی پێ دەڵێن. ئەو جێگایانەشی کەمتر قوڵ بوون، دەشتی موشیان لێ دروست بووە.

ئاوی زەریاچەی وان، کلۆریدی کاربۆن و سولفاتی تێدایە. هەروەها ئاوەکەی زۆر سوورە و سۆدەشی تێدایە. ڕێژەی مەتیریا کیمیاوییەکان، لە ئاوی واندا بەم شێوەیەیە: کاربۆناتی سۆدیۆم - ٥,٩٪، کلۆریدی سۆدیۆم - ٣,٨٪، کلۆریدی مەنغەنیز - ٠,٤٪، سولفاتی مەنغەنیز - ٠,٣٪، سولفاتی کالیسیۆم - ٠,١٪ و گەلێ مەتیریای کیمیاوی

دیکەشی تێدایە.

ڕۆخەکانی زەریاچەکە پێچاوپێچە، ئەمەش لە ئەنجامی هەڵکشان و داکشانی ئاوەکەدا دروست بووە. کە ئاوی زەریاچەکە زیاد دەکات، دەگاتە شوێنە نزمەکانی دەوروپشتی زەریاچەکە، لە پاشان کە ئاو دەنیشێتەوە و کەم دەکات، ئاوەکە بۆ شێوەی پێشووی خۆی دەگەڕێتەوە. لە ئەنجامی ئەو هەموو هەڵکشان و داکشانەدا، کاری ڕنین لە ڕۆخەکان پەیدا بووە، بە دووبارەکردنەوەی ئەو کارە، شوێنە نەرمەکان لە شوێنە ڕەقەکان، زیاتر دەخورێن و ئاو شوێنەکانیان پڕ دەکاتەوە و شوێنە ڕەقەکانیش وەکوو خۆیان دەمێننەوە، لە ئەنجامی ئەم پرۆسێسە بەردەوامەدا، ئەو پێچانە لە کەناری زەریاچەکەدا پەیدا بوون. هەروەها لە ئەنجامی نیشتنی ئەو قوڕ و لیتانەی، کە ڕووبارەکان لە ڕێژگەکانیانەوە، لەگەڵ خۆیان بۆ نێو زەریاچەکە دەیانهێنن، زەوییەکە زیاد دەکات، بەڵام لە شوێنەکانی دیکە، ئەم زیادبوونە نییە.

لە نێو زەریاچەی واندا، ئەم دوورگانە هەن: ئاقدامار، چارپاناک، گادیر. ئەوانە لە کاتی خۆیدا، هەموو نیمچە دوورگە بوون، بەڵام لەبەر پرۆسێسی هەڵکشان و داکشانی ئاوی زەریاچەکە، پەیوەندییان لەگەڵ ڕۆخەکان بڕاوە و بوونەتە دوورگەی تەواو.

لە زەریاچەی واندا، ساڵانە لە نێوان ١٠٠ – ١٥٠ تەن ماسی ڕاو دەکرێت. لە مانگی ئەپرێل و مایدا، ماسییەکان بۆ گەرا دانان، پەنا بۆ بەر ڕێژگەکان دەبەن، چونکە ئاوی ئەو جێگایانە، لە ئاوی ناوەڕاستی زەریاچەکە شیرینترە. بە نێو زەریاچەی واندا، بۆ گواستنەوەی خەڵک و کەلوپەل، پاپۆڕ هاتوچۆ دەکا.

**زەریاچەی ورمێ**

پەیدابوونی زەریاچەی ورمێ، بۆ جوڵانەوەیەکی تەکتۆنی دەگەڕێتەوە، کە لە ژێر سنکلینال ڕووی داوە. ڕووبەری زەریاچەکە ٤٨٦٨ کچگە (لەو شوێنانەدا کە ئاوی زۆرە دەگاتە شەش هەزار کچگ، لەو شوێنانەشدا کە ئاوی کەمە چوار کچگ دەبێت). نزیکەی دوازدە ملیار مەتری سێگۆشە، ئاو دەگرێت.

زەریاچەی ورمێ دەکەوێتە، نێوان ٣٧,١٠ پلە هەتاکوو ٣٨,٢٠ پلەی درێژی ڕۆژهەڵات و نێوان ١٠,٤٠ پلە هەتاکوو ٤٦,٠٠ پلەی پانایی باکوورەوە. بەرزایی لە ڕووی زەریاوە ١٢٧٥ مەترە. تێکڕای قوڵایی لە نێوان ٥ – ٦ مەتر دایە. قوڵترین شوێن لە زەریاچەی ورمێدا دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاواوە و نزیکەی دوازدە مەترێک دەبێت (لە شوێنە کەم ئاوەکاندا، ١٢ مەتر دەبێت، لە شوێنە پڕ ئاوەکاندا، دەگاتە بیست مەتر).بەشی سەرەوەی

ئاوەکـە، بە شـێـوەیەکی بەردەوام لە جـوڵە دایە. بەرزایی شـەپۆلەکـانی لـە کـاتـی بەفـر تواندنەوەدا، یاخـود لە کـاتـی زیادبوونی ئاوی زەریاچەکـەوە، کـە ئاوی ڕووبارەکـانی تێدەڕژێت، دەگـاتە دوو مـەتر و زیاتر. بەڵام لە وەرزەکـانی دیکەدا، واتا ئـەو وەرزانەی، نە بەفـریان تێدا دەتوێتـەوە و نە بارانیـان تێـدا دەبارێت، ئاوی سـەر ڕووی زەریاچەکـە، زۆر هێمنە و بێ شەپۆلە.

بارستـایی بارانی سـاڵانەی، نزیکەی ٥٥٠ ملیـمـەترە، زۆربەی لە نێوان مـانگەکانی مـارس و ئەپرێلدا دەبارێ. دوای ئەوەی باران دەبڕێت و پلەی گـەرمـا بـەرز دەبێـتـەوە و وەرزی وشکی دەست پێ دەکات، ڕووبەری زەریاچەکە پچووک دەبێتەوە، لـە دەوروبەرەکەی زەلکاو پەیدا دەبێت، لەو زەلکاوانە، خەڵکی بۆ دەرمان کەڵکی لێ وەردەگرن.

ئاوی زەریاچـەی ورمـێ سـووره و ڕێژەی خـوێ لە دەوروبـەری ٢٣٪ دایە، زۆربەی زۆری خـوێیـەکـە، بریتـیـیـە لە کلۆریدی سـۆدیـۆم، ئەمـەش بۆتە هۆی ئـەوەی، زیندەوەری گـەورە نەتوانێ لەو ئاوەدا بژی، وەکوو مـاسی. بـەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا، هەندێ زیندەوەری پچووک، لە نێو ئاوەکەدا دەژین. پلەی سوێریی لە وەرزی تەقینەوەی ئاودا، دەگاتە ٢٦٠ گرام لە یەک لیتر ئاودا، لە وەرزی کـەم ئاو و هاویناندا زیاد دەکات و دەگاتە ٢٨٠ گرام لە یەک لیتردا. ئاوی زەریاچەی ورمێ لە زستاناندا نایبەستێ.

زەریاچەی ورمێ، نزیکەی ٥٦ دوورگەی گـەورە و گچکەی تێدایە، لە هەمـوویان گەورەتر شاهییە، کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە، لە دەوروپشتەکەی دەشتایی و گردۆڵکە هەیە، کـە لە هـەندێ کـاتـی سـاڵدا، کـشـتـوکـاڵی لێ دەکرێت. هـەروەهـا ژمـارەیەک لە کـانیـاو و دەرماناوی تێدایە.

**زەریاچەی زرێبار**

ئەم زەریاچەیە دەکەوێتە باکووری دەشـتی مەریوانەوە و لە شارۆچکەی مەریوانەوە سێ کـیلۆمـەتر دوورە. هـەروەهـا دەکـەوێتـە بـاکـووری ڕۆژئاوای شـاری سنەوە بـە ١٢٨ کـیلۆمـەتر.ڕووبەرەکـەی بـەپێی زۆر و کـەمـی ئـاوەکـەی دەگـۆڕێ. لـە کـاتـی ئـاو زۆریدا، ڕووبەرەکـەی دەگـاتە بیـست کـچگ و لە کـاتی کـەم ئاویشـدا، ڕووبـەرەکەی تـەنیـا هـەشت کـچگە. درێژایی زەریـاچەی زرێبـار، لە دەوروبەری شـەش کیلۆمـەتر دایە. پـانایـیـەکـەی نزیکەی سێ کـچگە. ئەو درێژیێ و پانیـیـە، بە شێوەیەکی بەردەوام، لـە زیاد و کـەمی دایە، بەپێێ زیاد و کـەمکردنی ئاوەکە.. قـوڵایی زەریاچەی زرێبـار، لە نێوان دوو هـەتاکوو شـەش مـەتردا دەبێت. قـەوارەی ئاوەکەی لە نێوان ٣٢ – ٤٧ ملیـۆن مـەتری سێگۆشـە دایە. زەوی

دەوروپشتەکەی لە زەلکاو پێک هاتووە و لە ژێریشەوە، پەیوەندییان بە زەریاچەکەوە هەیە.

زەریاچەی زرێبار لە ڕووی زەریاوە، دەکەوێتە بەرزایی ۱۲۸۳ مەتر. لە نێوان ٤٦,٧ – ۳۵,۳۲ پلەی پاناییدا هەڵ کەوتووە. ڕووبەری حەوزەکەی لە دەوروبەری ۱۳۸ کچگ دایە. تێکرای بارانبارینی ساڵانەی، خۆی لە ۱۲۲ ملیۆن مەتری سێگۆشە دەدات. لەو قەوارەیە نزیکەی ٦۳ ملیۆن مەتری سێگۆشەی دەبێتە هەڵم، ئەوەشی دەمێنێتەوە بریتییە لە ۵۹ ملیۆن مەتری سێگۆشە، بەشێکی بە عەرزەوە وەردە بێ و ناگاتە زەریاچەکە، بەشەکەی دیکەی لە ڕێگەی ڕووبارەکانەوە دەرژێتەوە نێو زەریاچەکەوە.

دەوروبەری زەریاچەی زرێبار بە دار و سەوزایی داپۆشراوە، ئەمەش بۆتە هۆی نزمبوونەوەی پلەی گەرما لەو نێوچەیەدا، کە لە ئەنجامدا، پرۆسێسی بوون بە هەڵم کەم دەکاتەوە. ئاوی زەریاچەی زرێبار، لە زستاناندا بۆ ماوەی پەنجا ڕۆژ بە تەواویی دەیبەستێ. ئەستوورایی شەختەکەی دەگاتە یەک مەتر ئاوی زەریاچەی زرێبار شیرینە. لە ڕووی کیمیاوییەوە بۆ خواردنەوە دەست دەدات. هەروەها ماسی و باڵندەی زۆرە.

**زەریاچەی تەنگە سوور**

ئەم زەریاچەیە دەکەوێتە نێوان جادەی شوش و ئەردیگان، کە بۆ یاسوچ دەچێت. ۲۵ کیلۆمەتر لە شارۆچکەی ئەردیگانەوە دوورە. نێوچەی تەنگە سوور لە شێوەی سێگۆشە دایە. لە باکورەوە کێوی (تۆپ عەبدوڵڵا) و لە باشوورەوە کێوی (گەنجگون) و لە باکووری ڕۆژئاواوە کێوی سوور هەڵ کەوتووە.

بەرزایی تەنگە سوور لە ڕووی زەریاوە، سێ هەزار مەترە و ڕووبەرەکەی لە دەوروبەری نیو کچگ دایە. قوڵایی ئاوەکەی لە نێوان دوو هەتاکوو سێ مەتر دایە. قەوارەی ئاوەکەی دەگاتە بیست ملیۆن مەتری سێگۆشە.

**زەریاچەی مورزەرد**

ئەم زەریاچەیە، لە لای خەڵکی بە (بەرم) ناوی دەرکردووە. سێ کیلۆمەتر لە ڕۆژهەڵاتی دلی رون و یەک کیلۆمەتر لە کوە شورم یا شورانەوە دوورە. درێژایی یەک کیلۆمەترە و پانایییەکەی دوو کیلۆمەترە. لە نێو ئاوی ئەم زەریاچەیەدا، ماسی، بۆق، ماری ئاوی، مارماسی و باڵندەی ئاوی وەکوو مریشکی ماسیخۆر دەژین.

**زەریاچەی هەپر**

ئەم زەریاچەیە، دەکەوێتە بەشی ڕۆژئاوای زەریاچەی موورزەردەوە و لەویش گچکەترە. ئاوی ئەم زەریاچەیە، لە ڕێگەی تەنگەی زەریاچەکەوە دەگاتەوە بە رووباری ریش، کە کەوتۆتە نێوچەی سادات شا غالبییەوە، لە نێوچەی کوهگیلویە. لە دوایدا بەرەو ڕووباری کارون درێژ دەبێتەوە و دەڕژێتە نێوی.

**زەریاچەی ئالمان**

ئەم زەریاچەیە دوو کیلۆمەتر، لە ڕۆژهەڵاتی گوندی شیلابە و سێ کیلۆمەتریش لە باشووری ڕۆژئاوای گوندی سەر ئاسیابەوە دوورە. پانایییەکەی ١٥ مەتر و درێژایییەکەشی دوو هەزار مەتر دەبێت. گیانداری ئاوی و باڵندە و گیانلەبەری خشۆکەکانی ئەم زەریاچەیە، هەمان ئەو چەشنانەی زەریاچەی موورزەردن. لەبەر ئەوەی دەوروبەرەکەی لە بەردە گەچ پێک هاتووە، ئاوی زەریاچەکە لێڵ و شۆرە.

**زەریاچەی مان گشت**

ئەم زەریاچەیە دەکەوێتە نزیکی کوەمان گشت و سێ کیلۆمەتر لە گوندی واجل سەردەرەوە دوورە. ئاوەکەی شیرینە. پانایییەکەی نزیکەی ٥ , ١ کیلۆمەتر دەبێت.

**زەریاچەی بەرم شوور**

ئاوی ئەم زەریاچەیە، لە چیاکانی کە لە گەچ پێک هاتوون دێت، لەبەر ئەوە ئاوەکەی شۆر و لێڵە، هەر بۆیە ناویشیان لێ ناوە، گۆمی شوور. ئەم گۆمە ٣٥ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژئاوای بابامونیرەوە دوورە. درێژایییەکەی یەک کیلۆمەتر دەبێت، پانایییەکەی ٥٠٠ مەترە.

زەریاچەکانی دیکەی کوردستان ئەمانەن:ئەرجەک، هەزار، نازک، بالیک، هاجلی، ئارین، نەمروت، ئاقدۆغان، ئاکتاش، گیلدیر، کویو چوک، میشک، حەسەن تەیموور، سوبحان، توز، ساز، گۆل یوزو، ئاخ، سەکی، باتمس، ئاق گۆل، تورنا، ئاوگیر. ئەم گۆمانە هەموویان کەوتوونەتە باکووری کوردستانەوە. لە زەریاچەکانی دیکە ئەمانەن: هەفت بەرم (نێوچەی مەمسەنی). گۆمی کرمە سوور (پارێزگای سلێمانی) ئەم گۆمانە گچکە و کەم ئاون و بایەخی ئابووریشیان زۆر نییە.

## ٢. ئاوی ژێر زەوی

بەفـر و باران، کـە دوو سـەرچاوەی ئاوی ژێر زەوی پێک دەهێنن، دوو لەسـەر سـێی دەبێتـە هەڵم و بە ئاسمـاندا دەچێ. بەشەکەی دیکەشی، هەندێکی لەسر زەوی دەڕوات و لە دواییـدا لە ڕێگەی ڕووبارەکـانەوە دەڕژێنە نێـو زەریاکـانەوە. هەندێکی دیکەشی زەوی هەڵیـان دەمـژێ و ئـاوی ژێر زەوی پێک دەهێنن و لە دواییـشـدا، لە شـێـوەی کـانی و سـەرچاوەدا، لە بناری چیاکـانەوە یا دەشـتـاییەکـانەوە، جارێکی دیکە دەگەڕێنەوە سەر زەوی. یاخـود بە شـێوەیەکی مـیکانیکی، واتە بە لێدانی ناعـور و بیـر لە لایەن خـەڵکەوە، ئاوەکە دەردەهێنرێ و بەکار دەهێنرێت.

بارسـتـایی ئاوی ژێر زەوی، بە پلەی شـاشـە بەردەکـانی ژێر زەوییـەوە بەسـراوە. هەرچـەندە بەردەکـان شـاش بن، ئـەوەندە زیاتر ئاو لە قـوڵایی زەویدا کـۆ دەبێـتـەوە، بە پێـچـەوانەشـەوە، چەند چڕ بن، ئەوەندە کـەمـتـر ئاو دەگـاتە ژێر زەوی. وەکـوو زانراوە، کوردستان لە ڕووی سامانی ئاوی ژێر زەوییەوە دەوڵەمەندە، چونکە زۆربەی بەردەکانی لەو بەردانەن، کە ڕێگە بە ئاو دەدەن، بۆ چینەکانی ژێر زەوی بڕۆن و لە بنەوە حەوزی ئاو پەیدا بکەن. هەرچەندە تاکوو ئێستا، زانیارییـەکی تەواو مان لەسـەر ئاوی ژێر زەوی کوردسـتان و بارسـتـایی و شـوێنـی حـەوزەکانی نییـە، بەڵام وا لـە خـوارەوە، باسی هەنـدێ لەو حـەوزە ئاوانەی ژێر زەوی دەکەین، بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی لەبەر دەستمان د ان:

**ئاوی ژێر زەوی دەشتەکانی میهران، موحسن ئاباد و حوسێن ئاباد**

بارسـتـایی ئـاوی ئەو نێوچانـە، لە دەشـتـاییـەکانی سـەرەوە لە دەورووبەری سی ملیـۆن مـەتری سێگۆشـە دایە لە سـاڵێکدا. ئەو ئاوە بە هۆی چۆڕانەوە و ئاوڕۆیشـتنی سـاڵانەیەوە، بە شێوەیەکی بەردەوام لە زیادبوون دایە.ساڵانە نزیکەی پێنج ملیۆن مەتری سـێگۆشـە، لەو ئاوە بۆ ئاودانی زەوی کشتوکاڵی و دابینکردنی ئاو بۆ شارۆچکەی میـهران سەرف دەبێت. ئەوەشـی دەمـێنێـتـەوە، دەتوانرێ لە ڕێگەی بیـری ئـیـرتیـوازییـەوە دەربـهـێندرێ و بۆ فراوانکردنی زەوییە کشتوکاڵییەکان بەکار بهێندرێ (٣٥، لاپەڕەی ٥٩).

**ئاوی ژێر زەمینی درەشەهر**

کاربەدەستانی ئاو، لەم ساڵانەی دواییدا، چەندین بیریان بۆ تاقیکردنەوە لێ داوە، تا بتوانن بارستایی ئاو لەو دەشتەدا دیاری بکەن. پاشان گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە ئاوی ژێر زەوی، نزیکەی سەد ملیۆن مەتر سێگۆشە دەبێ، کە لە داهاتوودا دەبێتە هۆی فراوانکردنی زەوی کشتوکاڵ و زیادبوونی بەرهەم (٣٥، لاپەڕەی ٦١).

## ١/ هەڵقوڵینی ئاوی ژێر زەوی بە شێوەیەکی سروشت

### أ - کانی

کانی یاخود ئەو ئاوە ژێر زەمینییەیە کە لە بناری چیاکان و گردەکان و دەشتاییەکانەوە هەڵ دەقوڵێ و دێتە دەرەوە، زۆربەیان هەر لە شوێنی خۆیاندا گۆمێک دروست دەکەن.

ژمارەی کانییەکانی کوردستان، خۆیان لە چەند هەزار کانییەک دەدەن. بۆ نموونە، تەنیا لە ئوستانی بەختیاری (ساڵی ١٩٨٨ ز – ١٠٩٣ کانی)، لە ئوستانی ئیلام (ساڵی ١٩٨٢ ز – ٦٧ کانی)، لە ئوستانی کوهگیلویە (ساڵی ١٩٩٢ز – ١٢٨ کانی) هەیە. بەڵام بە داخەوە، لەبەر هەندێ هۆ، لەوانە وشکبوونی کانییەکان لە ئەنجامی کەم بارانی و نەبارینی بەفر لە هەندێ نێوچەدا، یاخود وێرانکردن و داپۆشینی ژمارەیەکی زۆر لە کانییەکان ئەو ژمارەیە نەوەکوو هەر زیاد ناکات، بەڵکوو ساڵ لە دوای ساڵ کەم دەکات.

تێکڕای لەبەرڕۆشتنی ئاوی کانییەکان، بە سەدان ملیۆن مەتری سێگۆشە دەبێت. بۆ نموونە، ئەو پرۆسێسە لە ئوستانی بەختیاری لە ساڵی ١٩٨٨ی زایینیدا، ٥٨٥ ملیۆن مەتری سێگۆشە بوو. لە ئوستانی ئیلام لە ساڵی ١٩٨٩ی زایینیدا، ٢٠ ملیۆن بوو.

کانییەکان لە ڕووی سازگاریی و تامی ئاوەکانییان، بەسەر دوو دەستەدا دابەش دەکرێن:

١. کانی شیرناو

ئەو کانیانەی ئاوەکانیان سازگار و سوک و شیرینە، لە زۆر شوێنی کوردستان هەن. هەندێ لەو کانیانە ئاوەکانیان زۆرە و لە شوێنێکی وادا هەڵ کەوتوون، کە بە ئاسانی مرۆڤ دەتوانێ، لێیان بژی. بۆیە خەڵکی ئەو توانایایان قۆزتۆتەوە و خانوبەرەیان لە دەوروبەری ئەو جۆرە کانیانە دروست کردووە و ئاوەدانیان کردۆتەوە و لێی نیشتەجێ بوون.

٠٢ كانی گۆگردی

ئاوی هەندێ لە کانییەکانی کوردستان، شۆر و لێڵە و گۆگردی تێدایە، لەبەر ئەوەی لە کاتی هاتنییاندا لە سەرچاوەکانیانەوە، بەسەر هەندێ جۆر لە بەرد و خۆڵی وادا تێپەڕ بوون، کە مەتیریاڵی کیمیاوی جۆراوجۆریان تێدا بووە و تام و ڕەنگی ئاوەکەیان گۆڕیوە. ئاوی ئەو جۆرە کانیانە، لە لایەن خەڵکەوە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی پێست و باداری (ڕۆماتیزم) بەکار دەهێنرێن. هەندێ لەو کانیانە ئەمانەن:

کانی ڕیزە – ئەم کانییە کەوتۆتە بەرزاییەکانی ڕیزە و سارەوەن، لە نێوان جوانرۆ و باباجان.

کانی با – ئەم کانیە کەوتۆتە بەرزاییەکانی کوەتاتەشگاه لە سەنتەری ناحیەی شارستانی پاوە و چوار کیلۆمەتریش لە شارۆچکەی پاوەوە دوورە.

کانی گول هویج – ئەم کانییە ٢٥ کیلۆمەتر لە شارۆچکەی سونقورەوە دوورە و کەوتۆتە بناری چیای نزیک گوندی گول هویجەوە. ئەم کانییە لە نێوچەکەدا، بە ئاوی (گولی) یەوە بە ناوبانگە.

کانی ئایس سوو – ئەم کانییە کەوتۆتە نێوان ورمێ و سەلماسەوە لە نزیک گوندی ئایس سوو. گەرمایی ئاوەکەی لە دەوروبەری ١٧ سانتیگراد دایە. قەوارەی لەبەرڕۆشتنی ئاوی لە یەک چرکەدا، ١٧ , ٠ لیترە. لە شوێنێکدا هەڵ کەوتووە، کە بەرزاییەکەی ١٣٥٠ مەتر دەبێت. مەتیریاڵەکانی ئۆکسید و کالیسیۆم و کلۆر و سولفاتی تێدایە.

کانی مەحالی باراندوز – ئەم کانیە کەوتۆتە نزیک گوندی هەفت ئاباد و کەناری ڕووباری باراندوز چای پڕ ئاوە. ئاوەکەی لە نێوچەی دل ئاب زال دەکوڵێ.

کانی کوە زەنبیل – ئاوەکەی پڕە لە فۆسفاتی جۆراوجۆر. چوار فەرسەخ لە شاری ورمێوە دوورە و لە کەناری زەریاچەی ورمێ هەڵ کەوتووە.

**ب - سەرچاوە**

سەرچاوەش وەکوو ئاوی کانییەکان، لە بناری چیاکان و گردەکان و دەشتاییەکانەوە هەڵ دەقوڵێ و دێتە دەرەوە. ئاوی هەندێکیان سازگار و بە تام و خۆشن و هەندێکی دیکەشیان ئاوەکانیان ناخۆشن. جیاوازیان لەگەڵ کانیەکاندا، لە قەوارەی ئاو لەبەرڕۆشتنی سالانەیان دایە. سەرچاوە هەمیشە ئاوی لە ئاوی کانییەکان زیاترە و بە بەردەوامیش لەبەریان دەڕوات.

سەرچاوە لە کوردستاندا زۆرن، بۆ نموونە: لە ئوستانی کرماشان (ساڵی ١٩٨٨ ز – ٣٢ سەرچاوە) هەبوو. بە ئاوەکانیان دەتوانرێ، بەرهەمی کشتوکاڵی جۆراوجۆریان پێ ئاو بدرێ. هەروەها هەندێ لەو سەرچاوانە، بۆ دابینکردنی ئاوی ڕۆژانەی دانیشتووانی، هەندێ لە ئاوەدانییەکان، بە سەرچاوەیەکی سەرەکی دادەنرێن. لە سەرچاوە گرنگەکان، ئەمانەی لای خوارەوەن:

قەنبەر – ئەم سەرچاوەیە، دەکەوێتە باشووری شاری کرماشان و بناری کوە سەفید. بە سەرچاوەیەکی گرنگی بەشێک لە ئاوی خواردنەوەی شاری کرماشان دەژمێردرێت.

خدری زیندە و خدری ئەلیاس – ئەم سەرچاوەیە، ٢٢ کیلۆمەتر لە باکووری شاری کرماشانەوە دوورە و دەکەوێتە نێوان جادەی کرماشان و شاری سنەوە.

ڕەوانسەر – سەرچاوەی ڕووباری قەرە سوو کە٩٠ کیلۆمەتری بە نێو خاکی ئوستانی کرماشاندا تێدەپەڕێت.

ڕیجاب – سەرچاوەی ڕووباری ئەڵوەندەوە کە بە خاکی سەرپۆڵی زەهاب و قەسری شیریندا تێدەپەڕێت و لە نێوچەی خانەقین تەواو دەبێت. هەندێ ڕووباری دیکە لەو سەرچاوەیەوە دێنە دەرێ، بۆ نموونە: وەلاش، زرین جوب، قۆرەتوو.

هەندێ لە سەرچاوەکانی دیکەی کوردستان، ئەمانەن: بێخاڵ، سەرسەنگ، دەرماناوا، ئاوی بن بەردی و ئەحمەدئاوا ...

## ٢/ دەرهێنانی ئاوی ژێر زەوی بە شێوەیەکی میکانیکی

**کارێز**

دانیشتووانی نێوچە بێئاوەکانی سەر ڕووی زەوی، لە سەردەمی کۆن و ئێستاشدا، لە ڕێگەی کارێز لێدانەوە، ئاویان لە شوێنە بە ئاوەکانی ژێر زەمینەوە، بۆ شوێنە بێئاوەکانی سەر ڕووی زەوی ڕاکێشاوە، ئەمەش بۆ ئەوەی، ئاو بۆ پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ و ئاژەڵ و بۆ ئاودانی بەروبوومەکانی کێڵگەی کشتوکاڵی مسۆگەر بکەن.

کارێز بریتییە لە کۆمەڵە بیرێک، کە یەک لە دوای یەک لێ دەدرێن، قوڵایی هەر یەکەیان لەوەی پێشوتر کەمترە. بیرەکان لە بنەوە، لە ڕێگەی تونێلێکەوە بە یەک دەگەیەندرێن. بیری یەکەم لە سەرچاوەی ئاوی ژێر زەمینەوە لێ دراوە، شوێنی ئەم بیرە، بە زۆری لە بناری چیاکاندا هەڵ دەکەوێت. قوڵاییەکەی لە نێوان ١٥٠ – ٢٠٠ مەتر و پانایییەکەشی لە نێوان

١– ٢ مەتر دایە. لە دوای ئەم بیرە، بیری دووەم بە ماوەی سەد مەتر لە بیری یەکەمەوە لێ دەدرێ. قوڵایی بیری دووەم لە قوڵایی بیری یەکەم کەمتر دەبێت. پاشان بە هەمان شێوە، بیری سێیەم و چوارەم و پێنجەم، هەتا دوا بیر لێ دەدرێت، بە شێوەیە وای لێ دێت، کە ئاوی بیری یەکەم، بە شێوەیەکی سەربەخۆ دەکەوێتە سەر زەوی. بیرەکان سەریان دەگیرێن، بۆ ئەوەی بە تۆز و خۆڵ پیس نەبن و مرۆڤ و ئاژەڵیش نەکەونە ناوی.

کارێزەکان لە ڕووی درێژاییانەوە، لە نێوچەیەکەوە بۆ نێوچەیەکی دیکە جیاوازن. لەو نێوچانەی کە ئاوی ژێر زەوی، لەسەر ڕووی زەوییەوە نزیکە، ئەوا درێژایی کارێزەکان لە چەند کیلۆمەترێک زیاتر تێپەڕ ناکەن و ژمارەی بیرەکانیش کەم دەبن. بەڵام لەو نێوچانەی کە ئاوی ژێر زەوی لە سەر ڕووی زەوییەوە دوورە، ئەوا کارێزەکان درێژتر دەبن و ژمارەی بیرەکانیش زیاد دەکات، بە شێوەیە لە هەندێ نێوچە، درێژایی کارێزەکان خۆی لە سەد کیلۆمەتر دەدات.

تێکڕای لەبەرڕۆشتنی ئاوی ساڵانەی کارێزەکانی کوردستان، چەندی ملیۆن مەتری سێگۆشە دەبێت. بۆ نموونە، لە کارێزەکانی ئوستانی بەختیاری (ساڵی ١٩٨٨ ز – ٢٣٢ مەتری سێگۆشە)، لە ئوستانی کرماشان (ساڵی ١٩٨٣ ز – ١٢٠ ملیۆن مەتری سێگۆشە)، لە ئوستانی ئیلام (ساڵی ١٩٨٨ ز – ٨ ملیۆن مەتری سێگۆشە ٨، لە شارستانی بروجەرد و ئەلیگودەرز (ساڵی ١٩٨٣ ز – ١٢٠ ملیۆن مەتری سێگۆشە) بوو.

تاکوو ئێستا ژمارەی تەواوی گشت کارێزەکانی کوردستانمان لەبەر دەستدا نییە. بەڵام دەتوانین، ژمارەی کارێزەکانی هەندێک نێوچە بخەینە ڕوو. بۆ نموونە:

ئوستانی کرماشان (ساڵی ١٩٨٨ ز – ٢٥٠ کارێز)، ئوستانی بەختیاری (ساڵی ١٩٨٨ ز – ٥٠٢ کارێز)، ئوستانی ئیلام (ساڵی ١٩٨٨ ز – ١١ کارێز)، شارستانی بروجەرد و ئەلیگودەرز (ساڵی ١٩٨٣ ز – ٤٩٠ کارێز) بوو. بەڵام بە داخەوە، ژمارەی کارێزەکان نەوەک هەر وەکوو خۆیان نەماونەتەوە، بەڵکوو ساڵ لە دوای ساڵیش کەمیان کردووە. ئەمەش بۆ چەند هۆیەک دەگەڕێتەوە، لەوانە: لێنەدانی کارێزی نوێ، دوا کارێز لە پارێزگای هەولێر، ٧٠ ساڵ لەمەو پێش بوو، لە ئوستانی ئیلام، ٣٠ ساڵ لەمەوبەر دوا کارێز لێ دراوە. دیارە پەیدابوونی ڕێگەی هاتوچۆی تازە و دۆزینەوەی ڕێگای نوێ بۆ هەڵکەندنی بیری ئیرتوازی و دەرهێنانی ئاوی ژێر زەوی، بە شێوەیەکی ئاسان، کارێکی زۆری لەسەر ژمارەی کەمبوونی کارێزەکانی کوردستان کردووە. هەروەها کارێز لێدان، لە چاو هەڵکەندنی بیری ئیرتوازیدا، پارەیەکی زۆری تێدەچێت، کە لە توانای تاکە کەسێکدا نییە. جگە لە خاوێن نەکردنەوەی بیرەکان و تونێلەکانیان لە لم و قوڕی ساڵانە، لەبەر

گرانی و ماندووبوون و وشکبوونیان بە هۆی گۆڕانی ئاووهەواوە، بە تایبەتی کەمی باران و بەفر نەبارین، داپۆشین و وێرانکردنی هەندێکی دیکەیان

**ناعور**

یەکێ لەو شێوە کۆنانەیە، کە دانیشتووانی نێوچە جیاجیاکانی جیهان، بە هۆیەوە کەڵکیان لە سامانی ئاوی ژێر زەوی وەرگرتووە، چ بۆ بەکارهێنانی ڕۆژانەی خۆیان، چ بۆ ئاژەڵ بەخێوکردن و ئاودانی بەروبوومە کشتوکاڵییەکانیان بوو بێ. ناعور بریتییە لە بیرێک، کە لە بیری ئاسایی گەورەترە و کەمەرەکەی دوو مەتر و قوڵاییەکەی پێنج مەتر زیاتر دەبێت. ئاوی ناعور بەم شێوانە هەڵ دەهێنجرێت ؛

١٠ دەولک – کوندەیەک دوو تا سێ تەنەکە ئاو دەگرێ، بە پەت بۆ نێو ناعورەکە شۆڕ دەکرێتەوە. پەتەکە لەسەر بەکرەیەک هاتوچۆ دەکات، کە بە دارێکی دوو سێ مەترییەوە بەسراوە.ئەم سەر و ئەو سەری دارەکە، لەسەر ئەم بەر و ئە بەری دوو دیوار دانراوە، کە بەرزاییەکەی لە دوو مەتر زیاتر دەبێت و لە دەوروبەری ناعورەکە بانراوە. ئاژەڵیش پەتی ناعورەکە ڕادەکێشێت. مرۆڤێکیش لە بەردەم ناعورەکەدا وەستاوە، هەر کە دەولکەکە دەگاتە دەرەوە، وەری دەگرێ و بە تاڵی دەکات، بەم شێوەیە کارەکە دووبارە دەبێتەوە، هەتا ئەو ئاوەی پێویستە دەری دەهێنن.

٢٠ چەرخ – بریتییە لە چەرخێک، کە کەمەرەکەی سێ مەتر دەبێت. چەرخەکە دەولکی چینکۆیی پێوە کراوە و ئاژەڵیش چەرخەکە دەسوڕێنێتەوە. بە دووبارەکردنەوەی پرۆسێسی سوڕاندنەوەکە، دەولکەکان یەک لە دوای یەک پڕ دەبن لە ئاو. دوای ئەوەی دەولکەکان دەگەنە سەرەوە، خوار دەبنەوە و ئاوی نێو دەولکەکان دەڕژێن و دەچنە نێو جۆگەیەکەوە، لەوێشەوە بۆ شوێنی مەبەست دەڕوات.

**پەمپی ئاو**

لەو سالانەی دوایدا، خەڵک لە جیاتی دەولکە و چەرخ، بۆ بەرزکردنەوەی ئاو لە ناعورەکاندا، پەمپی ئاو بەکار دەهێنن. پەمپی ئاو، لەچاو ڕێگاکانی دیکەی ئاو دەرهێناندا، گەلێ ئاسانترو خۆشتر و بێ عەزێتترە.

**بیر**

لە نێوچە بێئاوەکانی سەر ڕووی زەویدا، هەروەها لەو نێوچانەی بۆری ئاویان بۆ ڕانەکێشراوە، دانیشتووانی ئەو نێوچانە هەر لە کۆنەوە، بە هەڵکەندنی بیر، پێویستییەکانی ڕۆژانەی خۆیان لە ئاو، دابین دەکەن. بیر چاڵێکە، کە قولاییەکەی لە هەندێ نێوچەدا، پێنج مەتر دەبێت و لە هەندێکی دیکەشدا، خۆی لە پانزە مەتر دەدات، کەمەرەکەشی لە دوو مەتر کەمتر نابێت. دوو جۆرە بیر هەیە:

١. بیری ئاسایی – ئەم جۆرە بیرانە، لە لایەن خەڵکییەوە لێ دەدرێن. قولاییەکەیان لە نێوان ٥ – ٥٠ مەتردا دەبێت. کەمەرەکەیان لە یەک مەتر زیاترە. دەولکەیەک کە بە پەت بەسراوە، بۆ نێو بیرەکە شۆڕ دەکرێتەوە، پاشان بە دەست ڕادەکێشرێتە دەرەوە. لە کوردستاندا، بە دەیان هەزار بیر هەیە.

٢. بیری ئیرتوازی – دەوڵەت لە کۆتایی پەنجاکانەوە، دەستی بە هەڵکەندنی بیر بە مەکینەی تایبەتی بیرهەڵکەندن کردووە. قولایی ئەم جۆرە بیرانە، لە هەشتا مەتر و بەرەو ژوورترە. ئاوی ئەم بیرانە، بە پەمپی ئاو بەرز دەکرێنەوە و لە حەوزێکی تایبەتی دەکرێن، کە لە تەنیشت بیرەکانەوە دروست کراون. ئەم حەوزانەش سەریان گیراوە و لە بۆرییەکی تایبەتییەوە، ئاوەکانیان لە کاتی پێویستدا، بەهۆی بەلوعەیکەوە بەردەدرێتەوە و بەکار دەهێندرێ.

## ٠٣ پرۆژەکانی ئاو

لەسەر ڕووبارەکانی کوردستان، بە مەبەستی ئاودانی زەوییە کشتوکاڵییەکان لە کاتی پێویستدا، بە دەیان پرۆژەی ئاو دروست کراون. قەوارەی ئاوی داکراو لە ساڵێکدا، بە ٤٥ ملیار مەتری سێگۆشە دەخەمڵێندرێ. کەڵکی ئەم پرۆژە ئاوییانە، زیاتر لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

– بەرهەمهێنانی دەیان ملیۆن کیلۆوات لە کارەبا، بە نرخێکی هەرزان.

– زیادکردنی چەندایەتی سامانەکانی ئاو، بە تایبەتی ماسی.

– دروسکردنی ڕێگەی ئاویی لە نێوان نێوچە جیاوازەکانی وڵاتدا.

– پاراستنی ئاوەدانی و زەوییە چاندراوەکان، لە مەترسییەکانی لافاو و هەڵچوونی ڕووبارەکان.

– دابڕینی نێوچەکانی جیاجیاکانی کوردستان، بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنیان.

### عەماراوەکان

ئەورۆ لە کوردستاندا، چەند عەماراوی گەورەی جیاوز بۆ ئاو هەڵگرتن هەیە. لە بارەی درێژی و پانی و بەرزی و کەرەسەی دروسکردن و نەخشەکێشان و بەرنامە و چارەسەری گیروگرفتەکان و شوێنگەی جوگرافییانەوە، جودان.

### عەماراوی دوکان:

ئەم عەماراوە، لە دەربەندی دوکان لەسەر رووباری زێی گچکە دروست کراوە و دەکەوێتە رۆژئاوای دەشتی رانیەوە و لە رۆژئاوای شاری سلێمانییەوە ٦٠ کیلۆمەتر دوورە. عەماراوی دوکان بریتییە لە عەماراوێکی کۆنکرێتی کەوانەیی، درێژاییەکەی لە رۆخی لای راستەوە، بۆ رۆخی لای چەپ، ٣٦٠ کیلۆمەتر دەبێت، بەرزاییەکەی ١١٦,٥ مەترە. لە لای راستی عەماراوەکە، تونێلێک بە قولایی ١٢,٥ مەتر هەڵ کەندراوە، دەرگایەکی ئاسنیان تێخستووە، بۆ ئاو بەردان و ئاو گرتنەوە بەکاری دەهێنن. هەروەها پێنج کونیشی تێدایە،کەمەرەکانیان ٣,٦٥ مەترە و لە پێش هەر کونێکدا، تۆڕبینێکی گەورە دانراوە، بۆ دروسکردنی کارەبا. مەبەستی هەرە گەورە لە دروسکردنی عەماراوی دوکان، کۆ کردنەوەی ئاوی رووباری زێی گچکەیە، بە تایبەتی لە کاتی بوژاندنەوە و زیادبوونی ئاودا، بۆ ئەوەی بەشەکانی دیکەی کوردستان ژێر ئاو نەکەون. بۆ جێبەجێکردنی ئەو کارەش، چاڵێکی یەکجار زۆر گەورە، لە پشت دیواری عەماراوەکە دروست کراوە، کە پانتاییەکەی ٢٦٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە و ٦,٨ – ٨,١ ملیار مەتری سێگۆشە ئاو دەگرێت.

### عەماراوی دەربەندیخان

لەسەر ئاوی سیروان هەڵ کەوتووە، لەو شوێنەدا کە رووباری تانجەرۆ لەو رووبارە دەرژێتەو لە نێوچەی دواوان. ئەم عەماراوە لە دیوارێکی کۆنکرێتی پێک هاتووە، کە درێژاییەکەی لەم بەرەوە بۆ ئەو بەرەکەی دیکەی، ٤٧٥ مەتر دەبێت و بەرزاییەکەی ١٣٥ مەترە. لە پێش عەماراوەکەدا چاڵێکی گەورە دروست کراوە، کە جێگەی زیاتر لە سێ ملیار مەتری سێگۆشە، ئاوی تێدا دەبێتەوە. ئامانجی سەرەکی لە دروسکردنی عەماراوی دەربەندیخان، کۆ کردنەوەی ئاوی نێوچەکەیە، بە تایبەتی لە کاتی بوژاندنەوەی ئاو و زۆربوونیدا، تا خاک، لە مەترسی و زیانی لافاو و ژێرکەوتنی گوندەکان رزگار بکات و

هەروەها بەروبوومە کشتوکاڵییەکانی ئەو نێوچەیەش، لە هاویندا بە چاکی ئاو بدات و بۆ پەیداکردنی وزەی کارەباش بەکار بهێندرێت.

**عەماراوی بێخمە**

چەند ساڵێ لەمەوبەر، دەست بە دروسکردنی ئەو پڕۆژە ئاویە کراوە. ئەم عەماراوە دەکەوێتە سەر ڕووباری زێی گەورە (بادینان) بەڵام هەتاکوو ئەوڕۆکە هێشتا تەواو نەبووە و لە دوای ساڵی ١٩٩١ەوە، ئەوەشی هەبوو تێک درایەوە، چونکە ئامانجی سەرەکی ئەم پڕۆژەیە، نەک هەر ئاوەدانکردنەوەی نێوچەکە و پەیداکردنی سەرچاوەیەک بۆ وزەی کارەبا، یا بنەبڕکردنی مەترسییەکانی لافاو نەبوو، بەڵکوو زیاتر پڕۆژەیەکی سەربازی دەوڵەتی داگیرکەری عێراق بوو، تا بە تەواوی نیوچەی بادینان لە نێوچەی سۆران، لە باشووری کوردستان دابپچڕێ. بۆیە پێویستە بە تەواویی دەست لە دروسکردنی هەڵ بگیرێت.

**عەماراوی مهاباد**

دەکەوێتە سەر ڕووباری مهاباد. لە ساڵی ١٩٧٠دا دروست کراوە. بارزایی دیواری عەماراوەکە ٤٦,٥ مەتر دەبێت. درێژاییەکەشی خۆی لە ٧٠٠ مەتر دەدات. لەو چاڵەی لە پشت دیواری عەماراوەکە هەڵ کەندراوە، جێگەی ٢٣٠ ملیۆن مەتری سێگۆشە ئاوی تێدا دەبێتەوە. عەماراوی مەهاباد بۆ دابینکردنی ئاوی خواردنەوە بۆ دانیشتوانی شاری مهاباد و بۆ ئاودانی زەوییە کشتوکاڵییەکان و پەیداکردنی سەرچاوەیەک بۆ وزەی کارەبا دروست کراوە.

**عەماراوی ئاراس**

دەکەوێتە باکوری شارۆچکەی قەرەزیائەدین و لەسەر ڕووباری ئاراس دروست کراوە. بەرزایی عەماراوەکە ٣٨ مەتر و درێژاییەکەشی ٩٤٥ مەتر دەبێت. چاڵەکەی پشت عەماراوەکە، جێگای ١٣٥٠ ملیۆن مەتری سێگۆشە ئاوی تێدا دەبێتەوە. هۆی دروسکردنی ئەم عەماراوە، زیاتر بۆ ئاودانی زەوییە کشتوکاڵییەکانی ئەو نێوچەیە و بەدەسهێنانی وزەی کارەبایە.

**عەماراوی زێڕن چەم** (جەغەتوو یا زرینەرود)

ئەم عەماراوە لەسەر ڕووباری زێڕن چەم دروست کراوە. مەبەستی سەرەکی لە

دروسکردنی ئەم عەماراوە، بۆ ئاودانی هەموو ئەو زەوییە کشتوکاڵییانەیە، کە دەکەوێتە نێوچەکانیمیاندواو و لە باشووری ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی بۆکاندا هەڵ کەوتووە. بەرزایی دیواری عەماراوەکە، پەنجا مەترە و درێژاییەکەشی ٧٢٠ مەتر دەبێت. توانای کۆکردنەوەی ئاوی ٦٥٠ ملیۆن مەتری سێگۆشەیە. ئەم عەماراوە لە ساڵی ١٩٧١ دا تەواو بووە.

**ئاوبەند**

ئاوبەندەکان، نە ئەوەندەی عەماراوەکان بەرزن و نە ئەوەندەی ئەوانیش ئاو دەگرن. ئامانجی هەرە گەورە لە دروسکردنیان، بەرزکردنەوەی ئاستی ئاوی ڕووبارەکانە، تا بە شێوەیەکی ئاسان، لە هەردوو بەری ڕووبارەکانەوە، ئاوی زەوییە کشتوکاڵییەکان بدرێت. لە ئاوبەندە گرنگەکانی کوردستان، هەتاکوو ساڵی ١٩٩٥، ئەمانەن:

**ئاوبەندی چەغلەوەندی**

نێوچەی چەغلەوەندی لە لوڕستان، بە نێوچەیەکی بەپیت و بڕشت دەژمێردرێت لە کوردستاندا. ئەم نێوچەیە زەوی کشتوکاڵی زۆرە و لە هەمان کاتدا ڕووباری هەرودی پێدا تێپەڕ دەبێت، بۆ ئەوەی ئاوەکەی بە خۆڕایی نەڕوات و بەرهەمی ساڵانەی کشتوکاڵ زیاد بکات، ئەو ئاوبەندیان لەسەر ئەو ڕووبارە دروست کردووە. ئەم ئاوبەندە لە ساڵی ١٩٥٥دا تەواو بووە. بەرزایی دیواری ئاوبەندەکە ٣,٢ مەترە.

**ئاوبەندی ئەسەد خان** (میسیوەندی)

کشتوکاڵ لە نێوچەی ئەسەد خان پێش ساڵی ١٩٥١، بە زۆری لەبەر باران دەکرا. لەم نێوچەیەدا کانییەک بە هەمان ناوەوە هەیە، کە ئاوەکەی هەمووی بە خۆڕایی دەڕۆیشتە ڕووباری (هەرود) ەوە. بۆ ئەوەی بە تەواوی کەڵک لەو ئاوە وەربگیرێ و ئاوی زەوییە کشتوکاڵییەکانی نێوچەکە بدات، لە لایەن دەزگای کشتوکاڵییەوە، ئاوبەندی ئەسەد خانیان دروست کرد. ئەوڕۆکە ئەو ئاوبەندە، نزیکەی ١٢٠ هەزار هێکتار لە زەوی کشتوکاڵی هاوینە ئاو دەدات.

**ئاوبەندی دز**

ئەم ئاوبەندە، لەسەر ڕووباری دز Rud-e Dez دروست کراوە. ئاوبەندەکە بە شێوەیەکی کەوانەیی دروست کراوە و چوار تۆربین گەورەیان لەسەر داناوە. لە ساڵی

١٩٦٢ دا، دەست بە دروسکردنی کراوە و لە ساڵی ١٩٦٩ دا تەواو بووە. ئاوبەندەکە لە بەرد دروست کراوە و دوو کەوانەییە، شوێنەکەی لە تەنگەی کێوان، لە شاری دێزفولەوە٢٥ کیلۆمەتر دوورە. بەرزایی ئاوبەندەکە ٢٠٣ مەترە و درێژییەکەشی ٢١٢ مەتر دەبێت. چاڵی پشت دیواری ئاوبەندەکە، ٣,٣٨ ملیار مەتری سێگۆشە ئاو دەگرێ و توانای ئاودانی ١٢٨ هەزار هێکتار زەوی چاندراوی هەیە. بەرهەمی وزەی کارەبای ٥٢٠ هەزار کیلۆواتە. ئاوبەندی دز، دوو ئاوبەندی خواربووەوەی گچکەی هەیە، کە درێژاییەکەی ٣٠٤ مەتر و بەرزاییەکەی چوار مەتر دەبێت. هەروەها ئاوبەندێکی ڕێکوپێکی هەیە، کە درێژاییەکەی ١٣٦ مەتر و بەرزاییەکەی بیست مەتر دەبێت. تۆڕی ئاودانی ئاوبەندی دز، لە ٣٠٥ کیلۆمەتری سەرەکی و لقەکانی و ١٨١ کیلۆمەتر جادە و ١٦١ کیلۆمەتر با و لە ٢٠٢٥ کیلۆمەتر ساختمان ئاودان، پێک هاتووە.

### ئاوبەندی کارون

ئەم ئاوبەندە لەسەر ڕووباری کارون، لە شوێنێکدا بە ناوی گدار بردقمچییەوە دروست کراوە، کە سی کیلۆمەتر لە شارستانی ئیزەوە دوورە. لە ساڵی ١٩٧٧دا تەواو بووە. ئاوبەندەکە لە بەرد دروست کراوە و شێوەکەی کەوانەییە. درێژاییەکەی ٣٨٠ مەتر و بەرزاییەکەشی ٢٠٣ مەتر دەبێت. عەماراوەکە ٣,٣ ملیارد مەتری سێگۆشە ئاو دەگرێت و توانای بەرهەمهێنانی وزەی کارەباشی، یەک ملیۆن کیلۆواتە.

ئاوبەندی کارون ٣٨٠ هەزار هێکتار زەوی کشتوکاڵی نێوچەی گۆتوەند و عەبباسی ئاو دەدات و ئاوبەندێکی خاکی بۆ ئاودانی زەوییەکانی گۆتوەند دروست کراوە، کە درێژاییەکەی ٢١٠ مەتر و بەرزاییەکەشی ٢٣ مەترە و کەوتۆتە باکووری گۆتوەندەوە بە ٣,٥ کیلۆمەتر. درێژایی کەناڵی ئاودانی ١٠٠٤ کیلۆمەترە.

### ئاوبەندی کەرخە

لەسەر ڕووباری کەرخە دروست کراوە. لە ئاوبەندێکی نزم پێک هاتووە. بەرزاییەکەی تەنیا ٥,٥ مەتر و درێژاییەکەشی ١٩٢ مەتر دەبێت. ئەو ئاوبەندە دوو کەناڵی لە لای ڕاست و لە لای چەپەوە هەیە. لەبەرڕۆشتنی ئاوی کەناڵی لای ڕاست، کە درێژاییەکەی سی کیلۆمەترە، هەشت مەتری سێگۆشە دەبێت. ئەوی لای چەپیشی کە درێژاییەکەی یانزە کیلۆمەترە، نزیکەی پەنجا مەتری سێگۆشە دەبێت. ئەو ئاوبەندە لە ساڵی ١٩٥٥دا تەواو بووە و توانای دابینکردنی ئاودانی نزیکەی ٣٦ هەزار هێکتار زەوی کشتوکاڵی هەیە.

**ئاوبەندی ئەڵوەند**

ئەو ئاوبەندە، بەرزاییەکەی هەشت مەترە و لەسەر یەکێ لە ڕووبارەکانی نێوچەی قەسری شیرین ، بە ناوی ئەڵوەندەوە دروست کراوە. مەبەست لە دروسکردنی ئەم ئاوبەندەش، بۆ دابینکردنی ئاوە، کە نزیکەی ٤٦٠ هەزار هێکتار زەوی چاندراوی ئەو نێوچەیە ئاو دەدات.

**ئاوبەندی گەنجانەجم**

ڕووباری گەنجانەجم، ساڵی ١٧٣ ملیۆن مەتری سێگۆشە ئاوی لەبەر دەڕوات. ئەم ڕووبارە، بە یەکێ لە هەرە گرنگترین ڕووبارەکانی نێوچەی کرماشان دەژمێردرێت. بۆ ئەوەی کەڵک لە ئاوەکەی وەربگیرێت، دەزگای کاروباری ئاو، لە ساڵی ١٩٤٩دا، دەستیان بە دروسکردنی ئەو ئاوبەندە کرد و لەم ساڵانەی دوایدا تەواو بوو. لە ئەنجامدا، ڕووبەری زەوی چێندراو، لە ٨٠٠ هێکتارەوە بۆ ٦٠٠٠ هێکتار زیادی کرد.

**ئاوبەندی دەرکە ئاسن** (بابی حەدیەد یا دەمیر قەبۆ)

لە تەنیشت گوندی دەرکە ئاسنی ناحیەی جەوادییەوە هەڵ کەوتووە. توانای کۆ کردنەوەی ئاوی، لە دەوروبەری ٢٣ ملیۆن مەتری سێگۆشە دایە و ئاو بۆ ٢٢٥٠ هێکتار زەوی چاندراو دابین دەکات. ئەم ئاوبەندە لە دوو کەناڵی جیاواز پێک دێت، یەکەمیان درێژاییەکەی ٤٦٩ ١٢ مەترە و دووەمیشیان ٢٦٩ مەتر دەبێت. ئەو ئاوبەندە، لە ساڵی ١٩٨٠دا تەواو بووە.

**ئاوبەندی جەوادیە**

ئەم ئاوبەندە دەکەوێتە باکووری جەوادییەوە، لە نزیک ئاوبەندی دەرکە ئاسن هەڵ کەوتووە. توانای کۆکردنەوەی ئاوی هەشت ملیۆن مەتری سێگۆشە ئاوی هەیە و ٨٠٠ هێکتار زەوی چێندراو ئاو دەدات. لە ساڵی ١٩٨٠دا تەواو بووە و کار دەکات.

**ئاوبەندی جەراحی**

توانای کۆکردنەوەی ٥ ,٢١ ملیۆن مەتری سێگۆشە ئاوی هەیە. لە دوو کەناڵ پێک هاتووە. یەکەمیان درێژاییەکەی ٣٦٤ ٢٠ مەترە و ئەوی دیکەشیان ١٨٥ ٢٢ مەتر دەبێت. لە

ساڵی ١٩٨٣ دا تەواو بووە و ئاو بۆ ١٩٠٠ هێکتار زەوی دابین دەکات. ئاوبەندی جەراحی دەکەوێتە سەر ڕووبارێک، کە هەمان ناوی هەیە و لە ناحیەی (قەحتانیە) هەڵ کەوتووە.

### پرۆژەی ئاودێری

دەوڵەت لەو ساڵانەی دواییدا بایەخی بە دروستکردنی پرۆژەی ئاودێری داوە، بە مەبەستی داکردنی ئاو، ئاودێری و بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا و زیاد کردنی سامانی نێو ئاو وەک ماسی. لە نموونە ئەو جۆرە پرۆژانە:

### ئاوبەندی موسڵ

دەکەوێتە نزیک شاری موسڵەوە. بەرزاییەکەی ١٣٥ مترە و درێژاییەکەشی ٣٥٠٠ مەتر دەبێت و توانای کۆکردنەوەی ١٠,٧٣ ملیار مەتری سێگۆشە ئاوی هەیە و شەش کونی تێدایە، کە کەمەرەی هەر یەکەیان ١٨ مەتر دەبێت.

مەبەست لە دروسکردنی پرۆژەی موسڵ ئەوەیە، کە مەترسی پەنگخواردنەوە و زیادکردنی ئاوەکە نەهێڵێ و شارەکان و کێڵگە کشتوکاڵییەکان لە مەترسی لافا و زیانەکانی ڕزگار بکات. هەردوو ڕۆخی کەناری دیجلە لە نێوچەی موسڵدا ئاو بدات. هەروەها کۆکردنەوەی ئاوی ئەو نێوچەیە و پارێزگاریکردنی و کەڵک لێ وەرگرتنی لە کاتی بێئاویدا لە وەرزی هاویندا، تا زەوییە کشتوکاڵییەکانی نێوچەکەی پێ ئاو بدرێت. هەروەها بۆ ڕێکخستنی ڕێگای ئاویی و هاتوچۆکردن لە نێوان کوردستان و عێراقدا و بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا و بەخێوکردنی ماسی ... هتد.

### ئاوبەندی کەرکووک

ئەم ئاوبەندە، دەکەوێتە سەر ڕووباری زێی گچکە، لە نزیک شاری کەرکووکەوە، ئاوەکەی بە کەناڵێکی گەورە، دەگاتە زەوییەکانی نێوان زێی گچکە و عوزێم. پرۆژەی کەرکووک، بۆ دابینکردنی ئاودانی ١٩١ هەزار هێکتار، لە زەوی چاندراو لە نێوچەی کەرکووک دروست کراوە، بۆ ئەوەی ڕێژەی کشتوکاڵ بە ڕێگای بەراو، لەسەر حیسابی کشتوکاڵ بە شێوەی دێم، زیاد بکرێت.

### ئاوبەندی سەنگەسەر

لەسەر ڕووباری گافرێن، یەکی لە لقەکانی زێی گچکە هەڵ کەوتووە و لە شارۆچکەی

سەنگەسەرەوە نزیکە. مەبەستی سەرەکی لە دروسکردنی ئەم پرۆژەیە، ئاودانی نزیکەی بیست هەزار هێکتار زەوی چێندراوە، کە وەرزێرەکانی ئەو دەوروبەرە و لەگەڵ ئەو وەرزێرانەشدا، کە زەوییان وەرگرت، لە دوای دروسکردنی ئاوبەندی دوکان، کاروباری کشتوکاڵی تێدا دەکەن.

**ئاوبەندی دوبز**

ئەم ئاوبەندی، لە باشووری شارۆچکەی پردێوە هەشت کیلۆمەتر و ٣٥ کیلۆمەتر لە باکووری رۆژئاوای شاری کەرکووکەوە دوورە. ئەو پرۆژەیە بۆ گەیاندنی ئاو لە زێی گەورەوە، لە کاتی هەڵسان و پەنگخواردنەوەیدا، بۆ پرۆژەی ئاوی کەرکووک دروست کراوە. بۆ ئەو مەبەستەش، چاڵێکی گەورە هەڵکەندراوە، کە جێگەی هەشت تاکوو سی ملیۆن مەتری سێگۆشە ئاوی تێدا دەبێتەوە. هەروەها بۆ دابینکردنی وزەی کارەبا، بۆ شاری کەرکووک و دەوروپشتەکەی کەڵکی لێ وەردەگیرێت.

**پرۆژەی خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ** GAP

ئەم پرۆژەیە، بە یەکێک لە پرۆژە هەرە گەورە و گرنگەکانی کوردستان دەژمێردرێت. لەسەر ئاوەڕۆی ژووروی هەردوو رووبارە گەورەکەی کوردستان (دیجلە و فورات) دروست کراوە. رووبەرەکەی ٧٣ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە دەبێت. زۆربەی زەوییە کشتوکاڵییەکانی پارێزگاکانی ئورفە و ماردین و گازی ئانتەب و ئادیەمان و دیاربەکر و سیرت ئاو دەدات و کەڵک لەم پرۆژەیە دەبینن. پرۆژەی خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ، لە دوانزە پرۆژە و سیازدە ئاوبەند و ئێسگەی وزەی کارەبا و سی دامودەزگای ئاو پێک هاتووە.

توانای ئاودانی پرۆژەی ناوبراو، ٩ ملیۆن و ٧٦٥ هەزار دۆنم زەوی چاندراوە. بەرهەمی وزەی کارەبایشی، ٢٤ ملیار و ٤٠٢ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێرە.

١. پرۆژەی ئاوەڕۆی ژووروی فورات

- ئاوبەند و سەنتەری هایدرۆئێلێکتریکی قاراکایا، کە بەرهەمی ٧,٥ ملیار کیلۆوات کاتژمێرە.
- ئاوبەند و سەنتەری هایدرۆئێلێکتریکی ئەتاتورک، کە بەرهەمی ٨,١ ملیار کیلۆوات کاتژمێرە.

ئاودانی دەشتاییەکانی ئورفە – حەڕان، ماردین – جەیلان پینار، سیڤەرەک – حیلڤان، کە ڕووبەرەکەی ٧,٣ ملیۆن دۆنم دەبێت.

٠٢ پرۆژەی تخوبی فورات

– ئاوبەند و سەنتەری هایدرۆئێلێکتریکی بیرەجیک (فینکلی)، کە بەرهەمی ٢,٣ ملیار کیلۆوات کاتژمێرە.

– ئاوبەند و سەنتەری هایدرۆئێلێکتریکی قارکامیش، کە بەرهەمی ٨٠٠ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێرە.

٠٣ پرۆژەی سوروچ – بازیکی، کە ١ ملیۆن و ٤٦٥ هەزار دۆنم زەوی ئاو دەدات.

٠٤ پرۆژەی ئادیەمان – کەحاتە.

– ئاوبەند و سەنتەری هایدرۆئێلێکتریکی ئادیەمان، کە بەرهەمەکەی ٤٠٠ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێرە.

– ئاوبەندی کەحاتە.

– یەک ملیۆن و ٦٠٠ هەزار دۆنم، لە زەوی دەشتی ئادیەمان و کەحاتە ئاو دەدات.

٠٥ پرۆژەی گازی ئانتەب – عارەبان: ٢٣٣ هەزار دۆنم لە زەوییەکانیان ئاو دەدات.

٠٦ پرۆژەی گازی ئانتەب: ٨٩٠ هەزار دۆنم لە زەوییەکانیان ئاو دەدات.

٠٧ پرۆژەی دیجلە – قیرا لکیزی.

– ئاوبەند و سەنتەری هایدرۆئێلێکتریکی قیرالکیزی، کە بەرهەمی ١٤٥ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێرە.

– ئاوبەند و سەنتەری هایدرۆئێلێکتریکی دیجلە، کە بەرهەمی ٢٢١ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێرە.

– یەک ملیۆن و ٢٦٠ هەزار دۆنم، لە زەوییەکانی دیجلە و دەوروبەرەکەی ئاو دەدات.

٠٨ پرۆژەی باتمان

– ئاوبەند و سەنتەری هایدرۆئێلێکتریکی باتمان، کە بەرهەمی ٤٦٠ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێرە.

– ٣٧٧ هەزار دۆنم لە دەشتی باتمان و دەوروبەرەکەی ئاو دەدات.

٠٩ پڕۆژەی باتمان - سیلڤان
- ئاوبەند و سەنتەری هایدرۆئێلێکتریکی سیلڤان، کە بەرهەمی ١,٥ ملیار کیلۆوات کاتژمێرە.
- دوو ملیۆن و ١٣٠ هەزار دۆنم، لە دەشتی دیجلە و دەوروبەرەکەی ئاو دەدات.

٠١٠ پڕۆژەی گازی ئانتەب
- ئاوبەند و سەنتەری هایدرۆئێلێکتریکی گارزان، کە بەرهەمی ٣١٥ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێرە.
- دوو ملیۆن و ١٣٠ هەزار دونم، لە دەشتی دیجلە و دەوروبەرەکەی ئاو دەدات.

٠١١ پڕۆژەی یلیسوو
- ئاوبەند و سەنتەری هایدرۆئێلێکتریکی یلیسوو، کە بەرهەمی ٣,٧ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێرە.

٠١٢ پڕۆژەی جیزرە
- ئاوبەند و سەنتەری هایدرۆئێلێکتریکی جیزرە، کە بەرهەمی ١,٣ ملیۆن کیلۆوات کاتژمێرە.
- یەک ملیۆن و ٢١٠ هەزار دۆنم، لە دەشتی نوسەیبین - جیزرە و سلۆپی ئاو دەدات.

## بەشی شەشەم: گڵ

گڵ چینی یەکەمی سەر ڕووی زەوییە و لە ئاکامی کارتێکردنی بیۆسفێر و ئەتمۆسفێر، لە لیتۆسفێر دروست دەبێت.مەرجەکانی دروسبوونی گڵ زۆرن، هەندێ لەوانە، ئەمانەن: ئاووهەوا، وردوخاشبوونی بەردی چیاکان، ڕزاندنی پۆشەکی ڕووەکی و میکرۆئۆرگانیزم ... هتد.

ئەرکی سەرەکی گڵ، لە هەڵمژینی ئاو و ئاودانی ڕووەکەکانی سەر ڕووی زەوی پێک هاتووە. پلەی بەپیتی و بێپیتی هەر خاکێک، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە چەشنی ئەو مەتیریا کیمیاوییەکانەوە هەیە، کە لە خاکەکەدا لەگەڵ گردیلەکانی خۆڵەکەدا تێکەڵ بوون. گڵ بنەمای سەرەکی بەرهەمهێنانی هەموو جۆرە بەروبوومێکی کشتوکاڵییە.

### ١- خەسڵەتەکانی گڵ

گڵ لە هەر نێوچەیەکی سەر ڕوی زەویدا، خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەیە، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆشی بەو فاکتەرانەوە هەیە، کە بونەتە هۆی دروسبوونی، بە تایبەتی ئاووهەوا، جۆری بەردەکان. جا لەبەر ئەوەی ئاووهەوا و بەرد لە کوردستاندا جۆراوجۆرن، هەر وەکوو لە بەشەکانی پێشوشدا باسمان کردن، بۆیە گومان لەوەدا نییە، کە خەسڵەتەکانی گڵ، هەر جۆراوجۆرن. وا لە خوارەوە باسی هەندێکیان دەکەین:

٠١ گڵی نێوچە شاخاوییەکان، لەچاو گڵی نێوچە دەشتاییەکاندا، قەبارەکانیان درشتترە، هۆکەشی بۆ چۆنێتی مەتیریاڵە نیشتووەکانی نێو ئاوی چەمەکان و ڕووبارەکان دەگەڕێتەوە. ئەو مەتیریالانەی کە قەبارەکانیان گەورەیە و لە ئاوەڕۆکەکانی سەرووی ڕووبارەکان دان، بە زۆری لە نێوچە شاخاوییەکاندا دەنیشن. ئەو مەتیریالانەی کە قەبارەکانیان ناونجین و لە ئاوەڕۆکانی ناوەندی ڕووبارەکان دان، لە خاکی نێوان نێوچە شاخاوییەکان و دەشتاییەکاندا دەنیشن. بە پێچەوانەشەوە، ئەو مەتیریالانەی کە قەبارەکانیان وردن و لە ئاوەڕۆکانی خوارووی ڕووبارەکان دان، لە دەشتاییەکاندا دەنیشن. ئەم سیستەمەی نیشتنی مەتیریاڵەکان، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە توانا و هێزی ئاوەکانەوە هەیە.

٠٢ گڵی کوردستان بە زۆری لە سەدەی چوارەمی جیولۆجیدا دروست بووە، واتا تەمەنیان کەمە. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، کە گڵ لە سەدەکانی پێشوودا، بە تایبەتی

سەدەی سێیەم لە کوردستاندا نەبووە، هۆی دەرنەکەوتنیشیان، زیاتر بۆ داپۆشینیان بە گڵی سەدەی چوارەم دەگەڕێتەوە.

٠٣ چینەکانی گڵ لە نێوچە شاخاوییەکاندا تەنکە، بە تایبەتی لە قەدپاڵی چیاکاندا، چونکە گڵی ورد ناتوانێ، لەو نێوچانەدا خۆی بەرانبەر هێزی ئاو ڕابگرێ. بە پێچەوانەشەوە، لە نێوچە دەشتاییەکاندا، چینەکانی گڵ ئەستوورە، لەبەر ئەوەی لە هەندێ گردیلەی ورد ورد پێک هاتووە و ڕووبارەکانیش ئەو هێزەیان نەماوە، تا ڕایان بدەن.

٠٤ زۆربەی هەرە زۆری مەتیریاڵە کیمیاوییەکان، لە گڵەکانی کوردستاندا هەن، وەکوو کلس، زیخ، قوڕ، لیتە، فۆسفات، مەتیریاڵی ئۆرگانیکی و قیر ... هتد. بەڵام ڕێژەی مەتیریاڵی کلس لە هەموویان زیاترە، لەبەر ئەوەی بنەمای سەرەکی گڵی کوردستان، لە بەردی کلس پێک هاتووە. بۆ نموونە، ڕێژەی ئەو مەتیریاڵە کیمیاوییە لە گڵی نێوچەی سەنگەسەردا – ٨٪، لە گڵی نێوچەی دوکاندا – ١١٪ و لە گڵی دەشتەکانی شارەزوور و ڕانیە و سندیدا – ٩٪ یە.

## ٢- پۆلێنکردنی گڵ

دابەشکردنی گڵ، لەبەر ڕۆشنایی چەند خەسڵەتێکی تایبەتیدا دەبێت، وەکوو مەتیریاڵی کیمیاوی، چەشنی ئاووهەوا، جۆرەکانی ڕووەک. جا ئەوەی لێرەدا سەرنج ڕادەکێشێت، ئەوەیە کە یەک شێوازی یەکگرتووی تایبەتی، بۆ دابەشکردنی گڵ لە کوردستاندا نییە. لە نێوچەی باکوور شێوازی تێکەڵاو لە ئینگلیزی و فەرەنسی ئەڵەمانی، لە ڕۆژهەڵات – فەرەنسی، لە باشوور – ئینگلیزی و لە ڕۆژئاواش – فەرەنسی و ڕووسی پەیڕەو دەکرێت. ئەمە بە یەکەم گیروگرفتی پۆلینکردنی گڵی کوردستان دادەنرێت.

چەشنەکانی گڵ لە کوردستاندا – هەندێکیان لە مانەی خوارەوە پێک هاتوون:

قەسپۆک، ڕەشۆک، زەردە، سوور. بە داخەوە لەبەر ئەوەی، زانیاری تەواومان نییە، ناتوانین شوێنەکانیان لەسەر نەخشە دەسنیشان بکەین، یاخود ناوی شوێنەکانیان بخەینە ڕوو.

## ٣- گیروگرفتی گڵ

گڵ تووشی چەند گیروگرفتێک دەبێت، هەندێکیان بە تەواوی دەبنە هۆی لەنێوبردنی، هەندێکی دیکەشیان، کەڵکیان لێ دەبڕێ و بۆ کشتوکاڵ بێسوود دەبن. گرنگترین گیروگرفتەکانی گڵ ئەمانەن:

ڕووتاندنەوە: گیروگرفتی ڕووتاندنەوە، زیاتر لە نێوچە شاخاوییەکاندا ڕوو دەدات. هەندێ لەو هۆیانەش دەگەڕێنەوە بۆ:

– کێلانی چەوت: کێلانی زەوی لە نێوچە شاخاوییەکاندا، پێویستە تیواوتیو (لە باری پانی) بێت، نەوەکوو شاقولی بێت. بەڵام جوتیارەکان، بە زۆری ئەو یاسایە ڕەچاو ناکەن، زەوییەکە چۆن بوو، وای دەکێڵن.

– وێرانکردنی دارستان: بڕینی داری قەدپاڵی چیاکان و دەرهێنانی ڕەگەکانیان، سوتاندنی دارستانەکان، بە دوو هۆی سەرەکی دادەنرێن، بۆ ئەوەی گردیلەکانی گڵ یەک نەگرن، کە زۆر بە ئاسانی بە هۆی ئاوی بارانەوە، پرۆسێسی ڕووتاندنەوە ڕوو دەدات.

– شێوازی لەوەڕاندن: شوانەکان، بە شێوەیە مێگەلەکانیان لە لەوەڕگاکاندا دەلەوەڕێنن، هەتاکوو بە تەواوی لە بنی دێنن. پۆشەکە ڕووەکیەکان ماوەیان پێ نادرێ، سەرلەنوێ سەوز ببنەوە، لەبەر ئەوەی هەر بە ساوایی دەخورێن. لە ئاکامی ئەم لەوەڕاندنە نارێکەدا، ڕێگە بۆ ڕووتاندنەوە خۆش دەکات.

گڵ خزاندن: چینەکانی گڵی سەر بەردەکان، لە جێگا سەرەوە لێژەکان و لە دەوکەندکاندا، بە ئاسانی دەخزێن، ئەگەر هاتوو باران بە گوڕ ببارێ و زەوییەکە بە پۆشەکی ڕووەکی دانەپۆشرا بێت. ئەم دیاردەیە لە زۆربەی نێوچەکانی کوردستاندا، ڕوو دەدات.

نەبوونی زەوی کشتوکاڵی: زەوی کشتوکاڵ لە نێوچە شاخاوییەکاندا کەمە. جوتیارەکان بۆ دابینکردنی پارچە زەوییەک بۆ کشتوکاڵ، دەست بە بڕینەوەی داری جێگایەکی دیاریکراو دەکەن و لە جێگەکەیدا دەغڵودان دەچێنن. بەڵام داهاتی ئەو جۆرە زەوییانە، دوای یەک دوو ساڵ، ئەوەندە کەم دەبێتەوە، کە بایی ماندووبوونەکەی ناکات. لەبەر ئەوە جوتیارەکان واز لەو زەوییە دەهێنن و لە شوێنێکی دیکە، زەوی بۆ چاندن ئامادە دەکەن، تا لە ئاکامدا، ڕێگە بۆ نەهێشتنی دارستانەکان و ڕووتاندنەوە، خۆش دەکەن.

## بەشی حەوتەم: پۆشەکی ڕووەکی

پۆشەکی ڕووەکی (ڕووەکی سروشتی). بەو ڕووەکانە دەوترێ، کە بە شێوەیەکی سروشتی لەسەر ڕووی زەوی دەڕوێن. ئەگەرچی ڕووەکی سروشتی بەرهەمی ئاووهەوا و ڕووی زەوی و خۆڵە، بەڵام وا دیارە کاریگەری فاکتەری یەکەمیان، لە دوو فاکتەرەکەی دیکە زیاترە.

خەسڵەتی پۆشەکی ڕووەکی کوردستان لەوە دایە، کە خۆیان لەبەر بەرزی پلەی گەرما و وشکیدا ڕادەگرن. هەتا لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە، بەرەو باکووری ڕۆژئاوا بڕۆین، چڕیی پۆشەکی ڕووەکی زیاد دەکات، هۆکەشی بۆ جیاوازی قەوارەی بارانبارین دەگەڕێتەوە. پۆشەکی ڕووەکی لەمانەی خوارەوە پێک هاتووە:

### ١· دارستان

دارستان و دار و دەوەن، نزیکەی پانزە ملیۆن هێکتاریان (١٥٠ هەزار کچگ) لە زەوی کوردستان داگیر کردووە. لەوانە دارستانە دەست لێ نەدراو و باشەکان – سێ ملیۆن هێکتار، دارستانی تەنک – حەوت ملیۆن هێکتار، دارستانی وێرانکراو و خراپ – پێنج ملیۆن هێکتار. زۆربەی دارستانەکان، لە سەرەتای شەستەکانەوە تاکوو ئەوڕۆ، لەبەر ئاگر تێبەردان و بڕینەوەی بێئەندازەیان، حاڵیان بە تەواویی شڕ بووە، چونکە پێ ڕاناگەن جارێکی دیکە چرۆ بکەن و گەورەبن و کە لە ئەنجامدا سەدان هێکتار دارستان لە ساڵێکدا تێدا دەچێت. بۆیە بۆ چارەسەرکردنی ئەم زیانە گەوریە، دەوڵەت لە هەندێ شوێن، یاسای پاراستنی دارستانەکانی دەرکردووە. هەرچەندە ئەو یاسایانە، بە تایبەتی لەو شوێنانەدا دەستی دەوڵەتی ناگاتێ، بە هیچ شێوەیەک جێبەجێ ناکرێ. ئەو هۆیانەی کە ئەو گیروگرفتانەشی دروست کردووە، زیاتر خۆیان لە جەنگ و نەبوونی کەرەسەی دیکە بۆ سوتاندن و خۆگەرمکردنەوە و نەبوونی ئالیکی تەواو بۆ ئاژەڵەکاندا دەنوێنێ، کە دیارە ئەو گیروگرفتانە، تاکوو ئەوڕووۆش، بێ چارەسەر ماونەتەوە.

#### چەشنەکانی دار

دارەکانی دارستانەکانی کوردستان، لە ٦٥٪ یان لە خێزانی داربەڕوون، لە ٢٠٪ یان لە خیزانی بنە (پوستی و حشی. ف )(پیتی ف: – لێرە بەدواوە، واتا ناوەکە فارسییە، چونکە کوردییەکەیمان نەزانییەوە) و لە ٥٪ەکەی دیکەشی لە خێزانی بادامی کێوین (ئەرژن ف).

ئەوەی کە دەشمێنێتەوە، لە پۆشەکی دارستانی جۆراوجۆر پێک هاتووە. لە کوردستاندا نزیکەی حەفتا جۆرە داری بەردار و بێبەر هەیە. لێرەدا باسی هەندێکیان دەکەین:

١٠ بەلاڵوک: دیمەنی بەلاڵوک، لە داری ئاڵوباڵو و گێلاس دەچێت. بەرەکەی زۆر خۆش و مزرە. ڕەنگەکەی سوورێکی تۆخە. دەنکەکانی لە دەنکەکانی ئاڵوباڵو پچووکترە. باڵا و لقەکانی گەورە و بەرینن. ڕەنگی دارەکەی سوورێکی بریقەدارە.

٢٠ هەنجیر: دار هەنجیر زۆر جۆری هەیە. قەدەکەی ٣ – ١٠ مەتر بەرزە و لقەکانیشی بڵاوە. گەڵاکانی پان و کەمێک ئەستوور و درە. لە بنەڕەتدا میدیترانییە، بەڵام ئەورۆکە لە زۆربەی نێوچەکانی کوردستاندا دەڕوێت.

٣٠ ئوجـــا (ف): داری ئوجـــا، گل پردار (ف)، ســـمـــد (ف)، وج ولی (ف) دارێکە توێکڵەکەی ڕەق و ئەستوورە. ئەم دارە لە دامێنی دارستانەکانی نێوچە کوێستانییەکان و قەراغ جادەکان دەڕوێت. بەرزایی قەدەکەی لە نێوان ٢ – ٢٠ مەتردا دەبێت. لە کۆتایی مانگی ئەپرێلەوە، هەتاکوو سەرەتای مانگی مای بەر دەدات. درێژایی بەرەکە سێ سم و پانایییەکەی ٥,١سم.

٤٠ بادام وەحشی (ف): داری بادام وەحشی، یاخود ئەرژن (ف) لە نێوچە ناوەندی و ساردەکانی کوردستان دەڕوێت. بەرەکەی ڕوون نییە و کەمی تەڵخە، بەڵام ناوکەکەی شیرینە و بۆ خواردن بەکار دەهێنرێت.

٥٠ بەڕوو: دار بەڕوو یاخود مازوو یاخود بەلوانە، بە شای دارستان ناسراوە. لە نێوچە ناوەندییەکاندا دەڕوێت. دارێکی بە شکۆ و بڵندە. بەرزاییەکەی ٣٥ – ٤٠ مەتر دەبێت. ماوەی ٥٠٠ – ٢٠٠٠ ساڵ دەژی. گەڵاکانی سەوز و بە ڕەونەقن. لە مانگەکانی ئەپرێل و مایدا گوڵ دەکات. بەرەکەی هێلکەییە و لە نێو گەڵایەکی نیمچە ڕەق دایە، کە وەکوو کڵاو وایە. لە کوردستاندا چەند جۆرە داربەڕوویەک هەیە، کە باشترینیان بەڕووی خاسەیە. دار بەڕوو سوودی زۆرە،. گەڵاکەی بۆ خواردنی مەڕ و ماڵات بەکار دەهێندرێ، بەرەکەی کە بە برا مازوو (گەلوان) ناسراوە، بۆ پیشەسازی پێستە خۆشکردن بەکار دەهێندرێت، داربەڕوو هەروەها بۆ سوتاندن و کەرەسەی خانوو و بەڕە و کەلوپەلی نێوماڵ بەکار دەهێنرێت.

٦٠ دار توو: ئەم دارە لە زۆربەی نێوچەکانی کوردستاندا دەڕوێت. بەرەکەی شیرین و خۆشە و بە تەڕی و وشکی دەخورێت. گەڵاکەی بۆ خواردنی مەڕ و ومالات بەکار دەهێندرێت. داری توو، لەو شوێنانەدا کە ئاویان زۆرە، هەتا بیست مەتر بەرز دەبێتەوە و ئەستورایییەکەشی دەگاتە یەک مەتر.

٠٧ دار هەنار: دارێکی زۆر جوانە. گەڵاکانی شیلانی و مەیلەو سەوزە. بەرەکەی لە قوڵایی دەست گەورەترە. هەندێکیان توێکڵیان تەنکە و هەندێکی دیکەیان توێکڵەکانیان ئەستوورن. دەنکەکانی کە لە نێو ئەو توێکڵانە دان، سوورێکی تاریکن و بە پێستێکی تەنک داپۆشراون.

٠٨ دار چنار: داری چنار قەدەکەی باریک و بڵند و جوانە و گەڵایەکی زۆری هەیە، لەبەر ئەوە دانیشتن لە بن سێبەرەکەیدا خۆشە. بەرەکەی خڕە و کەمەرەکەی ٣ – ٤ سم دەبێت. ئەم دارە، لە نێوان بەرزایی ١٥٠٠ – ٢٥٠٠ مەتردا دەڕوێت.

٠٩ دارسماق (دارترش) : یەکێکە لەو دارانەی، کە لە هەرێمە بە ئاووهەواکانی زەریای ناوەڕاستدا دەڕوێت. دار ترش لە زۆر شوێنی کوردستاندا دەڕوێت، بە تایبەتی لە نێوچە شاخاوییەکاندا بە باشی گەورە دەبێت. بەرەکەی هێشوویی یە و دەنکە دەنکەیە. پێستی دەرەوەی سەوزە و تامەکەشی مزرە. لەگەڵ خواردن و هەندێ لە سەوزەواتدا دەخورێ و تامێکی ترش بە خواردنەکە دەبەخشێ. گەڵاکەشی پێستەی پێ خۆش دەکرێت.

٠١٠ سنەوبەر: سنەوبەر دارێکی بەرزە و زۆر خێرا گەورە دەبێت و ٣٠ – ٤٠ جۆر سنەوبەر هەیە.

هەندێ لە دارەکانی دیکەی کوردستان، ئەمانەن: شەهن، سپون، گزک، سربنچک (سیجک، سرنجک،) سنجو(سەنجینە)، هول (یوول)، وێوڵ، دمکانا، بناوچ، تەلووک، شیلان (عەناب) ئەرخەوان، گۆیژە زەردە (بلچی زەرد)، گویژە سوورە (بلچی سوور)، گلاسگانە (گوڵەباخن ، گوڵباخی، گوڵە شارەزووری، گوڵە سەگانە)، تەمشک (توورک، توودزیە، تووترک، تووڕک)، گەڵە زەردە، گۆیژە ڕەشە، سورەچی، پەرەک، تەورێزی، پەلەبی (بی)، بیمشک، ڕەشەبی، یترو (تەردانە)، توی، گەز، تایلە (تاووت)، مەو (ڕەز) ... هتد.

## هەرێمەکانی ڕووەکە سروشتییەکان

کوردستـان لە پێنج هەرێمی ڕووەکی جـۆراجـۆر پێک هاتووە. وا لـە خـوارەوە، بـەپێی توانا باسی هەر یەکێکیان دەکەین:

### هەرێمی کوێستان (ئالبی)

ئەم هەرێمە لە شوێنە هەرە بەرزەکانی چیاکاندا هەڵ کەوتووە، لەو شوێنانەی کە پلەی گەرما، نەوەکوو هەر لە زستانانـدا، بەڵکوو لە هاوینانیشدا، زۆر نزمـە و بەفرێکی زۆریشی لێ دەبارێت، بە شـێـوەیەک پـێ ڕاناگـات بە تەواویی بتـوێتـەوە، هەتاکـوو سـاڵێکی دیکە، سەرلەنوێ بەفر دەبارێتەوە، واتا لەو نێوچانەدا، شوێنی بەفری هەمیشەیی پەیدا دەبێت.

ڕووەکەکانی ئەم هەرێمە، لە هەندێ گیا و دەوەنی قەد باریک پێک هاتوون، لەبەر نزمی پلەی گـەرمـی ، داری لێ ناڕوێت. لەبـەر ئەوەی هەرێمـە کـوێستـانـیـیـەکـان، بە لەوەڕگـای جۆراوجۆر دەوڵەمـەندن، ئەو گوندنشـینانەی مـەڕ و ماڵات بەخێو دەکەن، دوای تەواوبوونی لەوەڕ لە نێوچە دەشتاییـەکاندا، لە وەرزی بەهار و سەرەتای هاویندا، بۆ لەوەڕاندنی مەڕ و ماڵاتەکانیان، ڕوو لەو شوێنانە دەکەن و نزیکەی سێ مانگ و پێش ئەوەی پلەی گەرما، بە تەواویی نزم بێتەوە چۆڵی دەکەن و بەرەو گەرمیانەکان دەگەڕێنەوە.

### هەرێمی دارستان

ئەم هەرێمـە لە باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستـان دایە و دەکەوێتە چوارچێوەی نێوچەی ئاووهەوای زەریای ناوەڕاست. بارستـایی بارانی سـاڵانەی، خـۆی لـە سـەد ملم دەدات. لەو هەرێمـەدا داری جۆراوجۆر دەڕوێت، بەڵام پلەی چڕییان، لە شـوێنێکەوە بۆ شـوێنێکی دیکە جیـاوازە. ئەو جـێگایانەی کـە کـەوتوونەتە سـەر ڕێگای بای زەریای ناوەڕاست، واتە ئەو شوێنانەی ڕووبەڕووی باکانن، لەچاو شوێنەکانی دیکەدا، ئەوا داریان زیاتر لێ دەڕوێت.

### هەرێمی دەوئاوان

دەوئاوان جـێگای ڕوانـدن و سـەوزبوون و گـەورەبوونی داری سـوورە چنار و چنار و ئەسـپـیندار و دەردار و دەلفـە و گـوێزە... تاد. سـوودی ئەم جـۆرە دارانە، لە لایەکـەوە لە بەرەکانیـان دایە و لە لایەکی دیکەشـەوە لە بەکارهێنـانیـان دایە، بۆ دروسکردنـی خـانوو و سـووتەمەنی و ئەوانەی لەسـەر ڕێگاکانیشـدا دەڕوێن، بۆ پشـوودان و حەواندنەوەی خـەڵکی لە هاویناندا، کەڵکیان لێ وەردەگیرێت.

### هەرێمی ئیستێبس

ئەم هەرێمە بە شێوەیەکی گشتی، لە باشووری ڕۆژئاوا و ڕۆژئاوای کوردستاندا هەڵ کەوتووە. ڕووەکەکانی بە زۆری لە هەندێ گیاوگۆڵ و ڕووەکی پیازی و حوشترخۆر پێک هەتوون.

ڕووەکەکانی هەرێمی ئیستێبس، لەبەر جیاوازی گڵ و ئاووهەوا، بە تایبەتی بارستایی بارانی ساڵانە و پلەی لەوەڕاندن و چەشنی کشتوکاڵ، هەمەچەشنەن. ڕووەکەکانی ڕۆژئاوای تەنک و کورتە باڵا و کەم تەمەنن و لەو جۆرە ڕووەکانەن کە لە بیابانەکان دەڕوێن، واتا توانای خۆڕاگرتنیان، بەرانبەر پلەی بەرزیی گەرما و بێئاویی و وشکی زۆرە. بەڵام ڕووەکەکانی لای ڕۆژهەڵاتی، لەو جۆرە ڕووەکانەن، کە لە هەرێمی دارستانەکاندا دەڕوێن و پرتریشن.

### هەرێمی بیابانەکان

ئەم هەرێمە لە نێوچەیەکی تەسکدا .و لە باشووری کوردستان هەڵ کەوتووە، ڕووەکەکانی لەوانەن کە لە هەرێمی بیابانەکاندا دەڕوێن. لەو هەرێمەدا، پلەی گەرما بەرزە و بارانی کەم لێ دەبارێت. بۆ ئەوەی ڕووەکێکی دیاریکراو بتوانێ، بە تەواویی بڕوێ و داکۆکی لە مان و بوونی خۆی بکات، پێویستە خاوەنی کۆمەڵە ڕەگێکی درێژ بێت، تا بە ناخی زەویدا قوڵ دابچێت و بە ئاسانی لە چینەکانی خوارەوەی ژێر زەوییەوە، ئاو هەڵ بمژێت. هەروەها دەبێت گەڵاکانی پان نەبن و تیژ بن، تاکوو پرۆسێسی ئاودەردان کەمتر ببێتەوە.

بە شێوەیەکی گشتی، دابەشبوونی ڕووەکەکان لەسەر ڕووی زەوی هەرێمەکاندا، پەیوەندییەکی توند و تۆڵی بە فاکتەرەکانی دابەشبوونی ئاوی ژێر زەوی و ئاستی قوڵاییان و بارستایی باران و جۆری گڵەوە هەیە.

## ٠٢ گیاوگوڵی سروشتی

گیا و گوڵی سروشتی لە کوردستاندا زۆرن، وەکوو ئەوانەی بۆ ڕەنگ و کاری پزیشکی و سەمغ و بۆن و خۆراک، بەکار دەهێندرێن.

گیا و گوڵی ڕەنگ: گیا و گوڵی ڕەنگ، وەکوو نیل (ف)، رووناس (ف)، خەنە، مازی، کافشە (ف) و سیاچەهرە (ف)، کە لە زۆربەی نێوچەکانی کوردستاندا دەڕوێن.

گیا و گوڵی دەرمان: بە دەیان گیا و گوڵی دەرمان، لە نێوچە جیاجیاکانی کوردستاندا دەڕوێن. هەندێ لەوانە بریتین لەمانەی لای خوارەوە:

ئانچوچک (ف)، کلڵ، سماق (ف)، ئەسپند (ف). ئاب ئەندول (ف)، سهلب، گوش برە (ف)، قنترون (ف)، مرورش (ف)، تغنە یامج کورە (ف)، دلونی (ف)، شای کوهی (ف)، شاهترە (ف)، گوڵە وەنەوشە، خاراشتر (ف) گل گاوزیان (ف)، باد ئاورد(ف)، پیازی گورستانی، گیاە تریاق (ف)، ئاونیشن (ف)، ئەفسنتین (ف)، بابائادم (ف)، بو مادران (ف)، گەچەنەک، گل پنیرک (ف)، ڕێواس، پونگی دەشتایی، ترەکوهی (ف)، شاترە (ف).

گیا و گوڵی سەمغ: گرنگترین گیا و گوڵی سەمغ، بریتییە لە سەمغی زەرد، مازوچ وزدو (ف)، سقز (ف)، سرێش (ف). لێرەدا هەندێکیان باس دەکەین:

کەتیرە – گیایەکی سەمغییە و سەربەخۆشین دەبێت. لەو نێوچانەی کە ئاووهەوایان وشک و نیمچە وشکە و کوێستانین دەڕوێت. فاکتەری ئاووهەوا، کارێکی زۆر گەورە لە ئەندازەی دروسبوون و جۆری بەرهەمەکە دەکەن. گەون لە کاتی گەورەبوونیدا، پێویستی بە بارانی بەهار و تواندنەوەی بەفری زستان هەیە، لە کاتی بەردانیشدا، پێویستی بە ئاووهەوای وشک و تیشکی خۆر هەیە.کەتیرە لە زۆر پیشەسازیدا بەکار دەهێندرێت و یەکێ لەو کەرەسە خاوانەیە، کە ساڵانە کوردستان، بۆ دەرەوەی دەنێرێت.

سەمغی زەرد – لە چیاکانی کوردستان دەڕوێت. دوای ئەوەی خۆش دەکرێ، لە هەندێ پیشەسازی جۆراوجۆردا بەکار دەهێندرێت.

مازوج (ف) – لە کۆمەڵێ گیا و گوڵی سەمغی پێک دێت، کە لە پیشەسازی پێستە خۆشکردندا بەکار دەهێندرێت. مازوج هەر لە کۆنەوە، لە زۆربەی نێوچەکانی کوردستاندا ناسراوە.

سقز – گیایەکی سەمغییە، لە دارستانەکانی کوردستان، بە شێوەیەکی سروشتی دەڕوێت و سێ جۆری هەیە: سپی، زەرد و ڕەش.

سرێش – گیایەکی ڕەگدارە و لە زۆربەی چیاکانی کوردستان دەڕوێت. کەرەسەیەکی

خاوی سەرەکییە بۆ دروسکردنی چەسپ.

گیا و گوڵی بۆندار: هەندێ گیا و گوڵ، بە شێوەیەکی سروشتی بۆنێکی خۆشیان لێ دێت. هەندێکی دیکەشیان دوای وشککردنەوە و تێکەڵکردنیان لەگەڵ هەندێ گیا و گوڵی دیکەدا، یاخود تێکەڵاوکردنیان لەگەڵ هەندێ مەتیریاڵی کیمیاویدا، بۆ دروسکردنی گوڵاو بەکار دەهێندرین. لە گیا و گوڵە بۆندارەکان، ئەمانەن: گوڵی شەوبۆی کێوی ...هتد.

گیاوگوڵی خۆراک: ئەم جۆرە گیاوگوڵە، لە بەهاراندا زۆرن. هەندێکیان وەکوو خواردنی ڕۆژانەی خەڵکی بەکار دەهێنرێن، وەکوو کنگر، تۆڵەکە، کاردو، گندم گینە (ف)، دومەڵان، کوارگ، سینەکبکی (ف)، زول (ف)، پونگە، ڕێواس، پیفۆک، شیلمشاق، زارگەزەوی، گندل (ف)، تورۆکە و ترشۆکە.

## ٠٣ لەوەڕگە

کوردستان بە لەوەڕگەی سروشتی دەوڵەمەندە. ڕووبەرەکەی تاکوو ئێستا نازاندرێ. بەڵام بە دەوروبەری ٣٦ ملیۆن هێکتار دەخەمڵێندرێت. کوردستان لەبەر ئەوەی شوێنگەیەکی جوگرافی تایبەتی هەیە و دوو چەشنە ئاووهەوای جیاواز لە یەکتر، گەرم و ساردی هەیە، خاوەنی لەوەڕگەیەکی جۆراجۆرە، وەکوو:

### لەوەڕگە کوێستانییەکان

ئەم لەوەڕگایانە، لە نێوچە شاخاوییە بەرزەکاندا هەڵ کەوتووە. پۆشەکی ڕووەکی ئەم نێوچەیە، بە زۆری لە پۆشەکی هەرێمی ئەلبی دەچێت، لەبەر ئەوەی لەو نێوچانەدا، گەلێ چیای بەرز هەن و بارستایی بارانی ساڵانەی ٣٥٠ – ٥٥٠ ملم. پۆشەکی ڕووەکی هەمەچەشنەی هەیە. زۆربەی ئەم نێوچانە، ئاویان زۆرە، لەبەر ئەمە فشاری لەوەڕاندن، دیار نییە..

ڕووەکەکانی لەوەڕگە کوێستانییەکان، لە خێزانی گرامینە و لیگیۆمینۆزە، کە بە زۆری لە مەتیریای پرۆتین پتک هاتوون. هەندێکیان قەدەکانیان زۆر گەورەیە، کە مەڕ و ماڵات لە توانایاندا نییە، بۆ خواردن بە کاریان بهێنێت، لەبەر ئەوە خاوەن مەڕ و ماڵاتەکان، دەیان بڕنەوە و وشکیان دەکەنەوە و ئالیکێکی تایبەتییان لێ دروست دەکەن، کە زستانان دەرخواردی ئاژەڵەکانیان دەدەن. هەندێ لە ڕووەکە جۆربەجۆرەکانی ئەم نێوچەیە، ئەمانەن: لالە داغدار (ف)، کبر خاردار (ف)، قەنتریون (ف)، پونگە، گەون، ئەسپرس.

### لەوەڕگەی گەرمیانەکان

ئەم لەوەڕگـایانە، لەو نێـوچانە هەڵ کەوتـوون، کە بەرزاییـان لە ڕووی زەریاوە، لە ٣٠٠ مــەتر کـەمــتـر نابێ. بارسـتـایی بارانی سـالآنە لـەم نێـوچـەیەدا، لە نێـوان ٢٥٠ – ٤٠٠ ملیمەترە. خاکەکەی بە زۆری لیتوسل و تا ڕادەیەک شاشە.

پۆشــەکی ڕووەکی ئەم نێـوچـەیە، بە زۆری وەرزییــە و قــەدیشــیـان کـورتـە و ڕووەکی هەمیـشـەییشـی بە دەگمـەن لێ دەڕوێت.هەندێ لەو ڕووەکانەی لـەو لەوەڕگایانەدا دەڕوێن، ئەمـانەن: شـیـدر و حـەسـەن (ف)، گـەون، ئەسـپـرس، کعب ئەلغـەزالی (ف)، بومـادرن (ف)، گـاوزیـان (ف)، پێنج ئەنگوست، بارهنگ نیـزەئای (ف)، بارهنگ، شـورک، فرفـیـون (ف)، جودروغین (ف)، شنبلیله (ف)، کنگر و گاسن (ف).

### پۆلێنکردنی لەوەڕگاکان

لەوەڕگـاکـانی کـوردسـتـان بـەپێی بایەخـیـان، بەسـەر ئەم بەشـانەی خـوارەوەدا دابەش دەکرێن:

٠١ ئەو لەوەڕگایانەی بەرزاییەکانیان ١٨٠٠ مەتر و زیاترە

بەرهـەمی ئالیکی وشکی لە یەک هـێکتـاردا، لە دەوروبـەری ٥٥٠ کـیلۆگـرام دایـە. ئەو ڕووەکانەی لەم لەوەڕگـایانەدا دەڕوێن، زۆربەیان لە خێزانی گرامینە و لیگیۆمـینۆز..قەد و گەڵاکـانیان پڕن لە پـڕۆتین. بە درێژایی ماوەی ژیانیـان، ئالیکی سێ سەر ئاژەڵی گچکە، بۆ سەد ڕۆژ دابین دەکەن.

٠٢ ئەو لەوەڕگایانەی بەرزاییەکانیان ١٦٠٠ مەتر و زیاترە

ئەم جـۆرە لەوەڕگـایە، بە یەکێ لە لـەوەڕگا بـاشـەکان دەژمـێردرێت. بەرهـەمـی ئالیکی لە هێکتـارێکدا، ٤٠٠ کیلۆگرام دەبێت. ڕووەکـەکـانی لە خـێزانی گرامـینە و لیگیـۆمـینۆز. ئەم لەوەڕگـایانە هـەمیـشـەیی نین و دەدورێنـەوە. بە درێژایی مـاوەی ژیانیـان، ئـالیکی دوو سـەر ئاژەڵی گچکە بۆ سەد ڕۆژ دابین دەکەن.

٠٣ ئەو لەوەڕگایانەی بەرزاییەکانیان ٥٠٠ مەتر و زیاترە

لەووڕگایەکی مـام ناوەندین و بەرهـەمی ئالیکی وشکی لە هێکتارێکدا، ٢٠٠ کیلـۆگرامە. لە ڕووەکی هـەمـیـشــەیی و یەک سـاڵی تێـدا دەڕوێت. ئالیکی یەک سـەر ئـاژەڵی گـچـکـە، بۆ ماوەی سەد ڕۆژ دابین دەکات.

٠٤ ئەو لەوەڕگایانەی بەرزاییەکانیان لە خوار پێنج سەد مەترەوەیە

ئەم جۆرە لەوەڕگـايانە هـەژارن. بەرهـەمی ئاليـكی لە یەک هێکتـاردا، ۱۰۰ کیـلۆگرامـە. زۆربەی ڕووەکەکانی تەنیا ساڵێک دەژین. هەر لە دوو هێکتاردا، یەک سەر ئاژەڵی گچکە، بۆ ماوەی سەد ڕۆژ دابین دەکات.

٥٠ لەوەڕگا زۆر هـەژارەکان

بەرهەمی ئالیکی لە یەک هێکتاردا، پەنجا کیلۆگرامە. پۆشەکی ڕووەکی تەنیا یەک وەرز دەژی. هەر لە چوار هێکتاردا، ئالیک بۆ یەک سەر ئاژەڵی گچکە، بۆ ماوەی سەد ڕۆژ دابین دەکات.

## بەشی هەشتەم: ژیانی زیندەوەران

### ٠١ خشۆکەکان

دەربارەی پەیدابوونی خشۆکەکان، بۆچوون و بیروڕای جۆراوجۆر هەیە. بەپێی ئەو لێکۆڵینەوە و توێژینەوانەی، تاکوو ئێستا کراون، ئەم گیانلەبەرانە بە سەد ملیۆن ساڵ، پێش دەرکەوتنی گیانلەبەرە شیردەرەکان، لەسەر ڕووی زەوی هەبوون. بەڵام شوێن و شێوەی پەیدابوونیان، بە تەواویی ڕوون نییە..

کوردستان لە ڕووی بوونی خشۆکەکانەوە، لەبەر سروشتی هەرێمایەتی لە کەرتی ئاسیا و باری جوگرافی و ئاووهەوا و پۆشەکی ڕووەکی و تۆپۆگرافیای جۆراوجۆر، وولاتێکی تا ڕەدەیەک دەوڵەمەندە.

هەندێ لە خشۆکەکانی کوردستان ئەمانەن: مارمووزک، مارمێلکە، بزن مژە (سپی، زەرد و ڕەش)، کیسەڵ، مار، مارکتکی (ماری زەنگی)، ماری سوچەی سوور، ماری شینی گائەنگێو، ماری ئاوی، تیژەمار، ماری ڕەش، توولەمار.

### ٠٢ باڵندەکان

ژمارەیەکی زۆر لە باڵندەکان، لە دارستان و چیاکانی کوردستان دەژین. ئەو باڵندانە، بە شێوە و ڕوخسار و گەورە و گچکەیی و ڕەنگ و دەنگ و ڕەچەڵەک، لە یەکدی جیا دەکرێنەوە. هەندێکیان لەبەر ئەوەی لە لایەن مرۆڤەوە ڕاو دەکرێن، بەرە بەرە بەرەو نەمان دەچن. باڵندەکان بەگوێرەی شوێنی ژیان و نیشتەجێبوونیان، دوو بەشن: یەکەمیان – باڵندە نیشتەجێبووە هەمیشەییەکان، وەکوو بولبول، پۆپنەکی، پۆڕ، چرگ، جوڕە، گەڵوازە، چۆلەکە، دارکونکەرە، دالاش، زیقاوە، سرورە ڤانگ، ڕیشۆڵە، قاژوو، قەشقەڕە، قەلەباچکە، کاسەڵە، شینکە، کلک هەڵتەکێنە، کۆتر، کورکوڕە، هەوێردە، هەڵۆ. دووەمیشیان – باڵندە کۆچەرەکانن، وەکوو پەڕەسێلکە، لەقلەق، پێ بە قونەی سەر بە کلاو، دەنوک بێڵە، ڕەش بەشە، ڕەوڕەوە، قورینگ، قوڵە شینکە، قەل مراوی، کەڵک، ماسی خۆرکە، ماسی گرە.

### ٠٣ شیردەرەکا

زیندەوەرە شیردەرەکان، لە هەموو شوێنە وشکەکانی سەر ڕووی زەوی هەیە، جگە لە هەندێ نێوچەی هەردوو تەورگە، کە لە ژێر مەرجی ژیانی جۆراوجۆردا دەژین، وەکوو ئاو،

وشكانی، ژێر زەوی، لەسەر دار، چیا بەرزەكان، نێوچە سارد و بەفراوییەكان، بیابانە گەرم و وشكەكان. ئەم زیندەوەرانە لەهەر شوێنێک بن، بە خێرایی زاووزێ دەكەن.

هەندێ لە زیندەوەرە شیردەرەكانی كوردستان ئەمانەن: سنجابی، زەمبینی، مشكی دوو پای پێنج پەنجەی گچكە، مشكی دوو پای پێنج پەنجەی گەورە، كەروێشكی دەشتی، كەروێشكە مشک، مشكە كوێرە، مشكی ئاوی، مشكی موغان، گوزنی زەرد (ف)، ئاسک، ئاهو، بزنەكێوی.

## ٠٤ گۆشتخۆرەكان

گۆشتخۆرە شیردەرەكان دڕەندەن و خواردنی خۆیان لە ڕێگەی ڕاوكردن گیانداری زیندووی كێوی دیكەوە دابین دەكەن. هەندێ لەو گۆشتخۆرانەی كوردستان ئەمانەن: گورگ، چەقەڵ، ڕێوی ئاسایی، ورچی قاوەیی، قەبر هەڵكەنە، پڵنگ، بەراز، كەمتیار، سەگاو ... هتد.

## ٠٥ ماسی

لە كوردستاندا بە سەدان سەرچاوە و ڕووبار هەن. لە نێو ئەو ئاوانەدا، بە دەیان جۆر ماسی دەژین. بەڵام بە داخەوە لەبەر چاودێری نەكردنی یاسای ڕاوكردن، بەشێكیان بەرەو نەمان دەڕۆن و هەندێكی دیكەشیان، بە تەواوی لەنێوبراون.

ڕاوە ماسی بە قولاپ و تۆڕ و ژەهر و بۆمبا، هەروەها بەستنی ڕێگەی گەڕانەوە لە ماسییەكان بۆ نێو ئاوە قوڵەكان، دوای ئەوەی ماسییەكان گەراكانیان لە ئاوە تەنكەكاندا دادەنێن. ڕاوكەری ماسی و ئەوانەی هیوایەتی ماسی گرتنیان هەیە، ساڵانە بە سەدان تەن ماسی ڕاو دەكەن. لە ئوستانی كرماشان، ڕۆژانە بە ڕێگەی یاسایی، پێنج تەن ماسی ڕاو دەكرێت. بەڵام لە لایەن ئەو كەسانەوە كە بەبێ پرس و بە قاچاغی ڕاوە ماسی دەكەن، ئەم ژمارەیە دوو ئەوەندەی دیكە زیاد دەكات. هەندێ لەو جۆرانەی لە كوردستاندا هەن، ئەمانەن: ماسی قەرەجی، ماسی ڕەش، سس ماهی (ف)، ماسی زێڕی (كەپور)، پشیلە ماسی ... هتد.

## بەشی یەکەم: ژمارە و دینامیک و ڕەوتی سروشتی دانیشتووان

### ٠١ ژمارە و دینامیکی دانیشتووان

دیاریکردنی ژمارەی دانیشتووانی کوردستان، لە پێش کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم، بە شێوەیەکی ڕەسمی هیچ جۆرە ژمارەیەکمان لەبەر دەستدا نییە. ناتوانین بە تەواوییش ئەو ژمارەیە بخەمڵێنین، چونکە لە لایەکەوە زانیارییەکی تەواویی ستاتیستیکیمان لەبەر دەستدا نییە، لە لایەکی دیکەشەوە بە کارێکی ناڕاست دادەنرێ، لەبەر ئەوەی ئەو ژمارەیەی پێش چاو دەخرێ، مەودای هەڵەکردنی زۆر تێدا دەبێ. بەڵام هەرچی چۆنێ بێ، ژمارەی دانیشتووانی کوردستان، پێش ساڵی ١٨٣١ی زایینی، لە چەند هەزار کەسێ زیاتر نەبووە، تا بەرەو دواوەش بگەڕێینەوە، ژمارەکە کەمتر دەبێتەوە.

#### سەرژمێری دانیشتووان

سەرەتای دەسپێکردنی پرۆسێسی سەرژمێری دانیشتووانی کوردستان، بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم دەگەڕێتەوە. یەکەم سەرژمێر، لە ساڵی ١٨٣١دا لە لایەن فەرمانبەرانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییەوە کرا. ئەم سەرژمێرییەش بۆ دوو مەبەست بەجێ گەیەنرا، یەکەم، لەسەر داخوازی دەوڵەتەکانی ئەوروپا، چونکە تاکوو ئەو کاتە، هیچ جۆرە زانیارییەکیان بە ڕەسمی لەسەر دانیشتووانی ئەم ئیمپراتۆرییەتە نەبوو. دووەم، عوسمانییەکان خۆشیان پێویستیان بە هەندێ زانیاری هەبوو، تا بزانن ژمارەی ئەو کەسانەی دەتوانن، چەک هەڵ بگرن، چەند کەس دەبن. هەروەها دەیانویست ژمارەی هەموو ئەو خاوەن زەویی و زارانە بزانن، کە پێویست بوو، باج بدەن بە دەوڵەت، تا کۆی گشتی ساڵانەی باجی دەوڵەت بزانن. یەکێ لە کەموکوڕییەکانی ئەم سەرژمێرییە ئەوە بوو، سەرژمێرەکە بۆ هەموو کوردستان گشتیی نەبوو، چونکە بەشەکەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، کە لە ژێردەستی فارسە سەفەوییەکاندا بوو، سەرژمێری نەکرا، بۆیە دیاریکردنی ژمارەی گشتیی دانیشتووانی کوردستان، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک ناکرێ، بەڵام بە خەمڵاندن، ژمارەکە لەو سەردەمەدا، لە دەوروبەری یەک ملیۆن کەسدا بووە.

دوای ئەوەی دە ساڵ بەسەر سەرژمێری یەکەمدا تێپەڕ بوو، ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی سەرژمێری دووەمیان، لە ساڵی ١٨٤١دا، بۆ گشت دانیشتووانی ئیمپراتۆرییەتەکە بەجێ گەیاند. لە ئەنجامی سەرژمێرییەکەدا دەرکەوت، کە ژمارەی دانیشتووانی ڕۆژئاوای

کوردستان، چەند هەزار کەسێکیان زیاد کردووە. ژمارەی دانیشتووانی کوردستان لەو ساڵەدا، زیادی کرد بوو، بە نزیکەی ١,٥ ملیۆن کەس دادەنرا.

دوای ئەوەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، لە ئەنجامی کۆتایی پێ هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٩١٤ – ١٩١٨) ڕوخا، نەخشەی ڕامیاری نێوچەکە بە تەواویی گۆڕا، میراتی ئیمپراتۆرییەتەکە لە نێوان دەوڵەتە سەرکەوتووەکانی جەنگدا دابەش کرا، بەو پێیەش ڕۆژئاوای کوردستان، جارێکی دیکە دابەش کرایەوە، کۆمەڵێ دەوڵەتی نوێ لە نێوچەکەدا دروست بوو، وەکوو تورکیای نوێدا، عێراق، سووریا. پاشان لە هەر یەکێ لەو وولاتانەدا و لە سەردەمی جیاجیادا، دەستیان بە سەرژمێری گشتی دانیشتووان کرد.

یەکەم سەرژمێری دانیشتووان، دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، لە باکوور و باشووریی کوردستاندا، لە ساڵی ١٩٢٧ دا بوو. لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا لە ساڵی ١٩٥٦ و لە ڕۆژئاوا لە ١٩٦٠ دا کران. ئیدی لە دواییدا، درێژە بەو کارە درا، بە شێوەیە لەو ڕۆژەوە تاکوو ئەوڕۆ (ساڵی ١٩٩٠)، ٢٧ سەرژمێری بە ئەنجام گەیەندراوە، واتە هەر دوو سێ ساڵێ جارێ، سەرژمێری لەو وولاتەدا کراوە. ئەمە خۆی لە خۆیدا، بە کارێکی ناتەواو و بە دەرکەوتەیەکی نائاسایی دادەنرێ، چونکە هیچ دەوڵەتێ نییە، لەو ماوە کەمەدا یەک لە دوای یەک سەرژمێری دانیشتوان بکات. لەبەر ئەوەی لە لایەکەوە پێویست ناکا، لە لایەکی دیکەشەوە پارەیەکی زۆری تێدەچێ. لەبەر ئەوە دەوڵەتەکان وا ڕاهاتوون، هەر ٥ تا ١٠ ساڵ جارێ بەم کارە هەستن، دیارە هۆکەشی بۆ لەدەسدانی سەربەخۆیی کوردستان دەگەڕێتەوە.

ئەنجامی سەرژمێرەکان: لەگەڵ ئەو هەموو سەرژمێرانەشدا، بۆ دیاریکردنی ژمارەی گشتیی دانیشتووان و دیاردەکانی دیکەی دیمۆگرافی، بەکەڵک نایەن، چونکە هەریەکەیان، یەک دوو ساڵ لەگەڵ ئەوی دیکەیان پێش و پاش کەوتووە. لەبەر ئەوە ناچار دەبین، بۆ دیاریکردنی ژمارەی دانیشتووانی کوردستان، پەنا بۆ بەر دانان و خەمڵاندن بەرین. بۆ ئەم مەبەستەش، فۆرمولەی ئاماری دانیشتوان، کە لە لایەن دامودەزگای دانیشتووانی سەر بە ڕێکخراوی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە کراوە، تێکڕای زیادەی ساڵانەی سروشتیی دانیشتووانی وولاتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا لەبەرچاو گیراوە، هەروەها باری ئابووریی، کۆمەلایەتیی، ڕامیارییش لێک دراوەتەوە. تەماشای خشتەی ژمارە (١١) و گرافی ژمارە (٣) بکە.

**خشتەی ١١** **ژمارەی دانیشتووانی کوردستان و هەرێمەکانی (هەزار) ١٩٢٥-٢٠٠٠ (خامڵاندن)**

| ساڵ | کوردستان | هەرێم | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | باکوور | باشوور | ڕۆژهەڵات | ڕۆژاوا |
| ١٩٢٥ | ٤٣٨٦ | ١٩٦٥ | ٧٧٢ | ١٥٨٦ | ٦٣ |
| ١٩٣٠ | ٥٥١٠ | ٢٧٤١ | ٨٨١ | ١٨٠٧ | ٨١ |
| ١٩٣٥ | ٦٢٠١ | ٣٠٣٥* | ١٠٠٥ | ٢٠٥٩ | ١٠٢ |
| ١٩٤٠ | ٦٨٢٣ | ٣٢٠١* | ١١٤٧ | ٢٣٤٦ | ١٢٩ |
| ١٩٤٥ | ٧٤٤٥ | ٣٣٠٠* | ١٣٠٩ | ٢٦٧٣ | ١٦٣ |
| ١٩٥٠ | ٨٥٠٤ | ٣٧٦٠ | ١٤٩٣ | ٣٠٤٦ | ٢٠٥ |
| ١٩٥٥ | ٩٧٥٠ | ٤٤١٢* | ١٧٠٣ | ٣٣٧٦ | ٢٥٩ |
| ١٩٦٠ | ١١٤٣٣ | ٥٠٨٠* | ١٩٤٣ | ٣٩٨٧ | ٤٢٣* |
| ١٩٦٥ | ١٢٩٨٦ | ٥٨٢٤* | ٢٢١٧* | ٤٤٨٨ | ٤٥٧ |
| ١٩٧٠ | ١٥١١١ | ٦٧٨٦* | ٢٦١٢ | ٥٢٢٠ | ٤٩٣* |
| ١٩٧٥ | ١٧٥٠٥ | ٧٧٧٩ | ٣٠٧٧ | ٦٠٧٢ | ٥٧٧ |
| ١٩٨٠ | ٢٠١٨٦ | ٨٦١٩* | ٣٥٨٣ | ٧٣٥٢ | ٦٣٢ |
| ١٩٨٥ | ٢٣٥١٩ | ٩٨٦٤* | ٤١٤٠ | ٨٨٥٦ | ٦٥٩ |
| ١٩٩٠ | ٢٦٧٩١ | ١٠٩٦٠* | ٤٧٨٥ | ١٠٣٦٠ | ٦٨٦ |
| ١٩٩٥ | ٣١٠١٥ | ١٢٩٠٩ | ٥٥٢٩ | ١١٨٦٤ | ٧١٣ |
| ٢٠٠٠ | ٣٥٢٤٧ | ١٤٧٤٨ | ٦٣٩٠ | ١٣٣٦٨ | ٧٤١ |

* سەرژمێر.

**گرافی ژمارە ٣**



ژمارەی دانیشتووانی کوردستان، لە ٧٥ ساڵی ڕابردوودا، نزیکەی ٢٧ ملیۆن کەسیان زیاد کردووە، دوو لەسەر سێی ئەم زیادکردنە، لە ئەنجامی زیادکردنێکی سروشتیدا بووە، کە لە ساڵی ١٩٨٥دا، ٠,٠٢٧ (٢٧ لە ١٠٠٠ کەس) بووە. بەشێکی دیکەشی لە دەرەوە بۆ کوردستان کۆچیان کردووە.

تێکڕای زیادبوونی سەدیی ساڵانەی دانیشتووانی کوردستان، لە نێوان ساڵەکانی ١٩٢٥ – ١٩٧٥ دا، ٢,٦ بوو. ئەم ژمارەیە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٧٥ – ١٩٩٥ بۆ ٢,٩ بەرز بۆتەوە. ئەگەر زیادبوونەکە بەو شێوەیە بمێنێتەوە، ئەوا ژمارەی دانیشتووانی کوردسان، دوای پێنج ساڵی دیکە، واتا لە ساڵی ٢٠٠٠ هەزاردا، دەبێتە ٣٥ ملیۆن کەس.

ژمارەی دانیشتووانی هەرێمەکانی کوردستان لە سییەکانی سەدەی بیستەمەوە، هەتا کۆتایی نەوەدەکان، دەتوانین لەبەر ڕۆشنایی سەرژمێرە گشتییەکاندا دیاری بکەین. بەڵام ئەو ژمارانە بە شێوەیەکی گشتی، هەندێ ناتەواویی تێدایە. هەموو ئەو کەموکوڕییانەش، لە ئەنجامی ئەم چەند هۆیانەی خوارەوە دروست بوون:

١. ژمارەی دانیشتووان لە هەندێ نێوچەی وولاتدا، لەبری ئەوەی بە کردەوەسەرژمێری گشتیی تێدا بکرێ، بە خەمڵاندن کراوە، چونکە لە هەندێ لەو نێوچانەدا، دەسەڵاتی دەوڵەتیی تێدا نەمابوو. بۆ نموونە، سەرژمێری ساڵی ١٩٦٥ لە باشووری کوردستان.

٢. خەڵکێکی زۆر لە دانشتووانی کوردستان، بە دەستی ئانقەست خۆیان ناونووس نەکردووە، بۆ ئەوەی لە سوپادا نەبن بە سەرباز. یاخود بۆ ئەوەی لەسەر نەتەوەی سەردەست حسێب نەکرێن، هەروەکوو لە باکووری کوردستاندا ڕووی داوە. لەم هەرێمەدا ئەوەی ناوی تۆمار بکرێ، تەنیا بە تورک دەنووسرێ.

٣. لە هەندێ نێوچەی کوردستاندا، بە بیانووی ئەوەی هەندێ کەس، دەکومێنتی تایبەتییان نییە، دەزگاکانی سەرژمێرکردنی دەوڵەت، ڕێگە بەو کەسانە نادەن، تا ناوی خۆیان تۆمار بکەن. وەکوو لە هەرێمی ڕۆژئاوای کوردستاندا ڕووی داوە.

٤. تۆمار نەکردنی دانیشتووانی ئەو نێوچانەی کە لەژێر کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندیدا نەماون. هەروەها تۆمار نەکردنی هەموو ئەو کەسانەی چەکیان هەڵ گرتووە و لە پێناوی ئامانجێکی دیاریکراودا دەجەنگن.

٥. بە شێکی زۆر لە کۆچەرەکان ناونووس ناکرێن، لەبەر ئەوەی لە کاتی سەرژمیرکردندا، جێگایەکی دیاریکراوی تایبەتیی و نەگۆڕیان نییە، هەمیشە لە گەرمیان و کوێستان کردندان و دەستی لیژنەکانی سەرژمێری گشتییان، پێدا ناگات.

٠٦ دانیشتووانی هەندێ گوندی نێوچە جیاجیاکانی کوردستان، لەبەر ئەوەی لای دەوڵەت نەزاندراون، بە هۆی فاکتەری تایبەتی شوێنی ژیانیانەوە، یا لەبەر هەر هۆیەکی دیکە بوو بێ، تۆمار نەکراون.

٠٧ ژمارەیەک لە کاربەدەستانی سەرژمێری گشتی (ژمێردەرەکان)، شارەزایی تەواویان لە پڕکردنەوەی لیستی (بلانکێت) سەرژمێرییەکەدا نییە، دانیشتووانی ئەو شوێنانەی تۆماریان دەکەن، بە تایبەتی لە گوندەکان، بێ ئەوەی بیانبینن و لە بوونیان یاخود نەبوونیان دڵنیا بن، بە پرسیارکردن لە خەڵکی دیکە، ناویان دەنووسن.

**هەرێمی باکوور**

سەرەتای سەرژمێری گشتی دانیشتووان لە هەرێمی باکووردا، بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم دەگەڕێتەوە. لەم هەرێمەدا، لەسەردەمی عوسمانییەکاندا، دوو سەرژمێری کراوە، یەکەمیان لە ساڵی ١٨٣١ و دووەمیشیان لە ساڵی١٨٧٦ دا بووە، لە دواییشدا درێژە بەو کارە دراوە. یەکەم سەرژمێری گشتیی لە چوارچێوەی کۆماری تورکیای نوێدا، لە ساڵی ١٩٢٧ دا کرا. لە پاشان هەر پێنج ساڵ جارێ، ئەم کارە لە لایەن دامودەزگاکانی ئامارییەوە دووبارە کراوەتەوە. ژمارەی سەرژمێرییەکان تا ساڵی ١٩٩٠، گەیشتە ١٣ سەرژمێری گشتیی، کە لە خشتەی ژمارە (١٢) دا نیشان دراوە.

دانیشتووان لە هەرێمی باکووری کوردستاندا، لە نێوان ساڵەکانی ١٩٢٧ – ١٩٩٠دا، ٨ ملیۆن و ٨٤٥ هەزار کەسیان زیاد کردووە، واتا، ١١٦٪ یاخود پێنج کەڕەتیان زیاد کردووە. تێکڕای زیادبوونی ساڵانە لەم هەرێمەدا، بە ڕێژەی ٢,٦٪ بووە، کە وەکوو تێکڕای زیادبوونی ساڵانەی سەرەتایی کوردستان. زیادەکەش بە پلەی یەکەم، بۆ زیادبوونی سروشتیی دەگەڕێتەوە.

زیادبوونی ڕووت و ڕێژەیی لە پارێزگاکانی هەرێمی باکووردا، جگە لە دەرسیم (تونجەلی) ئەنجامێکی باشی هەبوو، بەڵام زیادبوونەکە لە هەموو پارێزگاکاندا وەکوو یەک نەبوو. بەرزترین ڕێژەی زیادبوون، لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٠ – ١٩٨٥ دا، بەر پارێزگاکانی ئورفە (١٩٢ هەزار کەس) و گازی ئانتەب (١٥٨ هەزار کەس) و دیاربەکر (١٥٦ هەزار کەس) کەوت. هۆکەشی بۆ چەند فاکتەرێ دەگەڕێتەوە، لەوانە: زیادکردنی بەرهەمی ساڵانەی بەروبوومی کشتوکاڵ لە یەک هێکتار زەویدا، بەهێزبوونی توانای چاندن، گۆڕینی سروشت و شێوەی چاندن لە کشتوکاڵکردن بە شێوەیەکی فراوان، بۆ

**خشتەی ١٢ ژمارەی دانیشتووانی هەرێمی باکوور**
**١٩٩٠-١٩٢٧**

| سەرژمێر | دانیشتووان هەزار | زیادبوون | |
|---|---|---|---|
| | | هەزار | ٪ |
| ١٩٢٧ | ٢١٤٤ | – | – |
| ١٩٣٥ | ٣٠٣٥ | ٨٩١ | ٤,٤ |
| ١٩٤٠ | ٣٢٠١ | ١٦٦ | ١,١ |
| ١٩٤٥ | ٣٣٠٠ | ٩٩ | ٠,٦ |
| ١٩٥٠ | ٣٧٦٠ | ٤٦٠ | ٣,٢ |
| ١٩٥٥ | ٤٤١٢ | ٦٥٢ | ٢,٧ |
| ١٩٦٠ | ٥٠٨٠ | ٦٦٨ | ٢,٩ |
| ١٩٦٥ | ٥٨٢٤ | ٧٤٤ | ٢,٨ |
| ١٩٧٠ | ٦٧٨٦ | ٩٦٢ | ٣,٤ |
| ١٩٧٥ | ٧٧٧٩ | ٩٩٣ | ٢,٦ |
| ١٩٨٠ | ٨٦١٩ | ٨٤٠ | ٢,٣ |
| ١٩٨٥ | ٩٨٦٤ | ١٢٤٥ | ٢,٧ |
| ١٩٩٠ | ١٠٩٦٠ | ١٠٩٦ | ٢,١ |

کشتوکاڵکردن بە شێوەیەکی چڕتر، واتا چاندنی بەرهەمی پیشەسازیی و ئالیکی بۆ ئاژەڵ، لە جیاتی گەنم و جۆ، کۆچکردن لە هەندێ پارێزگای دیکەوە، بۆ ئەم یەکە ئیدارییانە.

دەرسیم تاکە پارێزگایەکە لەم هەرێمەدا، کە ژمارەی دانیشتووانی نەک هەر زیاد ناکا، بەڵکوو بەردەوام لە کەمبوونیش دایە. لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٠ – ١٩٨٥ دا، لە ١٥٨ هەزار کەسەوە بوون بە ١٥٢ هەزار کەس، واتا، شەش هەزار کەسیان کەم کردووە. هۆکەشی لە لایەکەوە بۆ تۆمارنەکردنی ئانقەستی هەندێ لە دانیشتووان لە سەرژمێرەکاندا دەگەڕێتەوە، لە لایەکی دیکەشەوە بۆ ئەوەی نە بە تورک و نە بە هاونیشتمانییانی تورکیا لەقەڵەم بدرێن. هەروەها هەندێ لە دانیشتووانی ئەو شارە، لەگەڵ هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستاندا تێکەڵ بوون، کە ناکرێ ناونووس بکرێن.

دیارە ئەم ژمارەیە گەلێ زیاتر دەبوو، ئەگەر ئاشتێی و ئاسایش و هێمنی لە وڵاتدا هەبووایە و خەڵکی ئەو نێوچەیەیان لە ئەنجامی جەنگی نێوان هێزەکانی تورکیا و کوردستاندا، دەربەدەر و دوور نەخستایایەتەوە و نە کوژرانایە. بۆ نموونە، لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٤ – ١٩٩٥دا، بەپێی هەواڵی هۆیەکانی ڕاگەیاندنی نێودەوڵەتی، ١٧ هەزار کەس کوژراوە.

**هەرێمی ڕۆژهەلات**

یەکەم سەرژمێری گشتیی لە هەرێمی ڕۆژهەلاتدا، لە ساڵی ١٩٥٦دا کرا. لە دواییدا هەر دە ساڵ جارێ ئەم کارە ئامارییە دووبارە کراوەتەوە. لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٦دا، ژمارەی سەرژمێرییەکان گەیشتۆتە چوار سەرژمێری. دەربارەی ئاکامەکانیان، سەیری خشتەی ژمارە (١٣) بکە.

**خشتەی ١٣ ژمارەی دانیشتووانی هەرێمی ڕۆژهەلات، ١٩٥٦-١٩٨٦**

| سەرژمێر | دانیشتووان هەزار | زیادبوون | |
|---|---|---|---|
| | | هەزار | ٪ |
| ١٩٥٦ | ٣٥٦٣ | – | – |
| ١٩٦٦ | ٤٦٢٦ | ١٠٦٣ | ٢,٦ |
| ١٩٧٦ | ٦٢٥٨ | ١٦٣٢ | ٣,١ |
| ١٩٨٦ | ٩٢٠٠ | ٢٩٤٢ | ٣,٩ |

ئاکامی سەرژمێرەکان لە هەرێمی ڕۆژهەلاتدا، پیشانی دەدەن، کە زیادبوونی دانیشتووان لە نێوان ساڵەکانی ١٩٥٦ – ١٩٨٥ دا، ٥ ملیۆن و ٦٣٧ هەزار کەس زیادی کردووە، تێکڕای زیادبوونی ساڵانە، ٣,٢٪ بووە. ئەم ژمارەیەش ٠,٦٪ لە تێکڕای زیادبوونی سەرەتایی کوردستان زیاترە. هۆکەشی وەکوو ئەوەی دەردەکەوێ، بۆ بەرزی زیادبوونی سروشتی (٣,١٪) و هەروەها بۆ گەشەکردنی هۆکانی تۆمارکردنی دانیشتووان دەگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی لە کۆپۆنی دەوڵەت بێبەش نەبن، هەروەها ئەو کەسانەش تۆمار دەکران، کە لە سەردەمی خۆیدا لەبەر دووریی و کۆچکردن ناونووس نەدەکران.

ژمارەی ڕووت لە هەموو پارێزگاکانی هەرێمی ڕۆژهەلات، لە نێوان ٥٦٤ هەزار کەس(ئازەربایجانی غەربی) و ١٣٦ هەزار کەس (ئیلام) بوو. واتە ڕێژەی زیادبوونەکە، هەموو پارێزگاکانی گرتۆتەوە، هەروەها بەسراوەتەوە بە بپێشکەوتنی کەرتی پیشەسازیی و سافی ڕەوکردنی دەرەوە و زیادکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی لە یەک یەکەی ڕووبەری زەویدا.

### هەرێمی باشوور

سـەرەتای ناونـووسکردنی دانیـشـتـووانی ئەم هەرێمـە، بۆ سـەردەمـی فـەرمـانڕەوایی عوسمانییەکان دەگەڕێتەوە. یەکەم سەرژمێر لە ساڵی ١٨٣١دا کرا. بەپێی ئاکامەکانی ئەم سەرژمێرییە، ژمارەی دانیشتووان چەند سەد هەزار کەسێ دەبوون. سەرژمێری دووەم لە سـاڵی ١٨٧٦دا بە ئەنجام گەیەندرا. سـەرئەنجـامـەکـەی وای نیـشـان دەدا، کـە ژمـارەی دانیشتووان دوو تا سێ هەزار کەسێکی زیاد کردووە.

یەکـەم سـەرژمـێـر لە هەرێمـی باشـووردا، لە سـاڵی ١٩٢٧ی زایینیـدا بوو. لەو کـاتەوە تاکوو ئەوڕۆ، شەش جاری دیکە سەرژمێری گشتی کراوە. بڕیاریش دراوە کە هەر دە ساڵ جـارێ، دووبارە بکرێتـەوە، بڕیارەکـەش بە شـێـوەیەکی گـشـتـیی پەیڕەو کـراوە، جگە لە سـەرژمـێـری گشـتی پێنجـەم نەبێ، کە دەبوایە لـە سـاڵی ١٩٦٧دا بە ئەنجام بگەیەندرایە. بەڵام لەبەر هەندێ هۆی ڕامـیـاریی، سـەربازیی، بە تـایبـەتی بە هۆی هەڵگیـرسـانـدنی شـۆڕشی ١١ سەپتەمبەر سـاڵی ١٩٦١ و دامەزراندنی هێزی پێشمـەرگەی کوردستانەوە، نەتوانراوە بە تەواویی ژمارەی دانیشـتووانی هەرێمـەکە دیاری بکرێ، پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتووان دەسنیشـان بکرێ، لەبەر ئەوەی سەرژمێرییەکەیان دوو ساڵ پێش خست، واتا لە ساڵی ١٩٦٥دا ئەنجامیان دا. تەماشای خشتەی ژمارە (١٤) بکە.

**خشتەی ١٤ ژمارەی دانیشتووانی هەرێمی باشوور، ١٩٢٧-١٩٨٧**

| سەرژمێر | دانیشتووان هەزار | زیادبوون | |
|---|---|---|---|
| | | هەزار | ٪ |
| ١٩٢٧* | ٨١٤ | – | – |
| ١٩٣٥* | ١٠٠٥ | ١٩١ | ٢,٧ |
| ١٩٤٧ | ١٣٨٣ | ٣٧٨ | ٢,٧ |
| ١٩٥٧ | ١٨٢٢ | ٤٣٩ | ٢,٨ |
| ١٩٦٥ | ٢٢١٧ | ٣٩٥ | ٢,٥ |
| ١٩٧٧ | ٣٣٠٣ | ١٠٨٦ | ٣,٤ |
| ١٩٨٧ | ٤٣٦٠ | ١٠٥٧ | ٢,٨ |

* خەمڵاندن.

ژمـارەی دانیـشـتـووانی هـەرێمی باشـووری کوردسـتـان، لە شـەست سـاڵی ڕابردوودا (١٩٢٧ – ١٩٨٧)، ٣ ملیـــۆن و ٦١٥ هـەزرا کـــەسـی زیـاد کـــردووە، تێکڕای زیـادبوونـی سـاڵانەش ٢,٩ بـوو. هۆی ئەم زیادبوونـەش زیاتر بۆ هەمـوو ئەو هۆیانە دەگـەڕێتـەوە، کـە پێشـتـر ئـامـاژەمـان بۆ کردن. گومـانیـش لەوەدا نییـە، کە ئەم ژمـارەیە گـەلێ زیاتر دەبوو، ئەگەر بهـاتایە ڕەوشـی ڕامیاریی هێمن بووایە، ژمارەیەکی زۆر لە دانیشـتـووان دەربەدەر و ئاوارەی دەرەوە نەکرانایە و بۆ عێراق ڕانەگوێزرانایەتەوە و بێسـەروبن نـەکرانایە، خەڵکی بە کۆمەڵ نەکوژرانایە و چەکی کیمیاوییان دژی دانیشتووان بەکار نەهێنایە.

دانیـشـتـووانی مـوسڵ، زیاتر لە دانیـشـتـووانی نێـوچەکانـی دیکەی هـەرێمی باشـوو زیاد دەکەن. ژمارەی زیادبـوونی ڕووت لەم پارێزگـایەدا، لە نێوان سـاڵەکانی ١٩٧٧ – ١٩٨٧دا، ٤٠١ هـەزار کـەس بوو. ئەم ژمـارەیە ٩,٥ کـەڕەت، لەچاو ژمـارەی زیادبوونی دانیـشـتـووانی پارێزگـای دهۆکـدا زیاتـرە (٤٢ هـەزار کـەس) و ٣,٨ کـەڕەت لـە ژمـارەی دانیـشـــتـووانی کـەرکـووک و نزیکەی دوو کـەڕەتیش لـەچاو هەولێـر و سلێـمـانیـدا زیـاتر بوو. هۆکـەشـی دیسـانەوە بۆ پێشکـەوتنی ئاستی پیـشـەسازیی دەگـەڕێتەوە، جگە لەوەی پارێزگای مـوسڵ، بـە ناوەنـدێکی گـــەورەی خـــوێـندن و بازرگـــانیـی و ڕێگای هـاتوچۆ دادەنرێ و لـە ڕووی جوگرافییەوە شوێنێکی گرنگ ی هەیە، سافی ڕەوکردنی دەرەوەشی بەرزە.

**هەرێمی ڕۆژئاوا**

دامـودەزگـاكـانی ئـامـاریی لە سـاڵی ١٩٦٠دا، بـۆ جـاری یەكـەم لە هـەرێـمی ڕۆژئاوادا سـەرژمێری گشتییان كرد. لە پاشاندا، هـەر دە ساڵ جارێ ئەو كارەیان دووبارە دەكردەوە. واتا هـەتا كۆتایی سـاڵی ١٩٨٦، تەنیا سێ جـار سـەرژمێرییان كردووە، تەمـاشای خشـتـەی ژمارە (١٥) بكە.

دانیـشـتـووانی هـەرێمی ڕۆژئـاوا، لە نێـوان سـاڵەكـانی ١٩٦٠ – ١٩٨١دا، ٣٠٧ هـەزار كەسیـان زیاد كردووە، تێكڕای زیادبوونی سـالآنەی ٢,٣٪ بووە، واتـە كـەمێكی لە تێكڕای گـشـتـیی زیـاترە. هـۆی زیـادبوونی دانیـشـتـووانیش لـەم بەشـەی كـوردسـتـاندا زیـاتر دەگـەڕێتـەوە، بۆ هـەندێ لەو هـۆیانـەی لە بەشـەكـانی دیكـەدا پەنجـەمـان بۆ ڕاكـێـشـاوون. گومانی تێدا نییـە، ئەگەر دەوڵەتی سـووریا، ڕێگەی بە خـەڵكی بدایە، بە سـەربەسـتی ناوی خـۆیان و پێناسـەی نەتەوەیی خـۆیـان تۆمـار بكردایە، بیـانـووی ڕەگـەزنامـەی سـووریی و بیانییان بە كوردەكان نەگرتایە، لەو ژمارەیە گەلێ زیاتر دەبوو.

قـامـیشلی لـە ڕووی زیادبوونی ژمـارەی دانـیشـتـووانەوە، لە پێش هـەمـوو قـەزایەكـانی دیكەی ڕۆژئاوای كوردسـتـانەوە بوو، زیادەكـەشی ٥٣ هـەزار كـەس بوو، واتـە لە بەشـەكـەی مـالـكیە بـە ٢,١ كـەڕەت و لە ڕەئسولعـەین ٢,٦ كەڕەت و لە عـەینولعەرەب ٢,٣ كـەڕەت و لە عەفرین ٣,٣ كەڕەت زیاتر بوو.

**خشتەی ١٥ ژمارەی دانیشتوانی هەرێمی ڕۆژاوا، ١٩٦٠-١٩٨١**

| سەرژمێر | دانیشتووان هەزار | زیادبوون | |
|---|---|---|---|
| | | هەزار | ٪ |
| ١٩٦٠ | ٤٢٣ | – | – |
| ١٩٧٠ | ٤٩٣ | ٧٠ | ١,٥ |
| ١٩٨١ | ٦٣٤ | ١٤١ | ٢,٣ |

### ۰۲ ڕەوتی سروشتی دانیشتووان

ڕەوتی سروشتیی یاخود زاوزێکردنی دانیشتووان، لە جیاوازیی نێوان ژمارەکانی لەدایکبوون و مردن دا دەردەکەوێ، واتا لە هەر هەزار کەس، ساڵانە چەند لە دایک دەبێ و چەندیان لێ دەمرێ. ئەگەرچی لەدایکبوون و مردن، بە دوو دەرکەوتەی جیاوازی بایۆلۆژی دادەنرێن، بەڵام وا دیارە فاکتەرەکانی باری ئابووریی (پێشکەوتن یا دواکەوتنی پیشەسازیی و جۆری کشتوکاڵ) و کۆمەڵایەتیی (بڵاوبوونەوەی خوێندەواریی، ڕێژەی نەخوێندەوارون، شوێنی ژیان واتە شارنشین یا گوندنشین) لە هەر نێوچەیەکدا، کارێکی یەکجار گەورە، لە ڕێژەی زیادبوون یا کەمبوونی ژمارەی دانیشتووان دەکات، پاشان زیادکردنی سروشتی دێ.

ڕێژەی لەدایکبوون لە ساڵی ١٩٨٥دا ٠/٠٠٤٨ بوو (واتا ٤٨ کەسی تازە لە دایک بوو، لە نێو هەزار کەسدا). ڕێژەی مردنیش ٠/٠٠٢٧ بوو (واتا ٢٧ کەسی مردوو لە هەزار کەسدا). بەوەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە زیادەی سروشتی لە ٠/٠٠٢١ بوو. تێکڕای تەمەندرێژیی ژیان لە هەمان ساڵدا، نزیکەی ٤٥ ساڵ بوو.

هەموو توێژینەوەیەکی لەدایکبوون و مردن، لەسەر ئاستی نێوچەکان و دەوڵەت، پێویستی بە ئاماری زیندوو هەیە، بەڵام ئەم چەشنە ئامارانە، لە شارە گەورەکان نەبێ، ئەویش نەک لە هەموو شارەکاندا، لە گشت کوردستاندا دەست ناکەون، هۆکانیشی بۆ ئەم چەند خاڵانەی لای خوارەوە دەگەڕێتەوە:

١/ بە شێوەیەکی گشتیی، زۆربەی زۆری ژنان، لە ژێر سەرپەرشتی دکتۆردا منداڵیان نابێ، واتا دایکان لە کاتی منداڵبوونیاندا، لە نەخۆشخانە منداڵەکانیان نابێ، لە ئەنجامی ئەم کارەشدا، منداڵەکان بە تەواویی تۆمار ناکرێن، ئەگەر بە زیندوویی دەرباز بن.

٢/ لەبەر ئەوەی دەوڵەت کۆمەک بە منداڵان ناکات، منداڵەکان دوای لەدایکبوونیان و تا ئەو ساڵەی دەچنە قوتابخانە و تەمەنیان دەگاتە شەش ساڵان، پێویستیان بە هیچ جۆرە شوناسنامەیەک نابێ. ئەوانەشی دەمرن، بە هیچ جۆرێ بە ڕەسمی تۆمار ناکرێن.

٣/ ناشتنی مردوو، پێویستی بە ئاگادارکردنەوەی دەزگایەکی تایبەتی کۆمەڵایەتیی نییە، چونکە شاردنەوە و ناشتنی مردوو، لە زۆربەی زۆری نێوچەکاندا بە خۆڕاییە، تەنانەت ئەو پارچە زەوییەی بە گۆڕیش ناو دەبرێ، هەر بە خۆڕاییە.

٤/ ئەو دایکانەی کە لە دامودەزگاکانی دەوڵەتدا کار ناکەن و ژنی ماڵەوەن، لە کاتی سکپڕبوون و منداڵبوونیاندا، پیویستیان بە مۆڵەت وەرگرتن نییە، چونکە دەوڵەت تاکوو

ئێستا، هیچ جۆرە یارمەتییەکی مانگانە یا ساڵانەی بۆ ئەو جۆرە دایکانە تەرخان نەکردووە.

٥/ دایکانی سکپڕ، چ لە پێش لە دایکبوون و چ لە پاش لەدایکبوون، نە خۆی و نە منداڵەکەی، لە ژێر چاودێری دکتۆردا نابن، بۆیە ئەو دایکانەش، بە پێویستی نازانن، تا لە لایەکەوە ناوی منداڵەکانیان تۆمار بکەن.

٦/ نەبوونی هیچ جۆرە دەزگایەکی کۆمەڵایەتی لە زۆربەی نیوچەکاندا، بە تایبەتی لە گوندەکاندا، وا لە دایکان و باوکان و خاوەن مردووەکان دەکەن، کە چ ئەوانەی تازە لەدایکبوون و چ ئەوانەی دەمرن، پشگوێیان بخەن و ناویان تۆمار نەکەن، مەگەر لە هەندێ حاڵەتی پێویستدا نەبێ، وەکوو چوونە قوتابخانە، دابەشکردنی میرات، چونکە پەنابردن بۆ ئەو دەزگایانە، لە زۆربەی شارەکاندا و لە لایەن زۆربەی خەڵکییەوە، بە کار و خەرجییەکی زیادە دادەنرێ.

٧/ لەو کوردستاندا، دەزگای لێکۆڵینەوەی تایبەتیی تەندروستی نییە، تا لە ڕووی بایۆلۆژییەوە، هۆکانی تەمەنکورتی و تەمەندرێژی و مردن بکۆڵنەوە و کەسیش پێویستی بەو جۆرە دەزگا زانستانە نییە.

**ئا) لەدایکبوون**

لەدایکبوون لایەنی نەرێتی خۆی لە زیادبوونی سروشتیدا پێک دەهێنێ و هەتاکوو ئێستاش ئەو ئاستە بەرزەی خۆی لە دەست نەداوە. بەو هۆیەوە کوردستان، بەگەڵ ئەو دەوڵەتانە دەکەوێ، کە بە تەواویی قۆناغی داپەقینەوەی دانیشتووانیان نەبڕیووە.

ڕێژەی لەدایکبوون لە نێو دانیشتووانی کوردستاندا، لە ساڵی ١٩٨٥دا، ٠/٠٠٤٨ بوو. ئەم ڕێژەیە لە ڕێژەی هەموو دەوڵەتەکانی باشووری – ڕۆژئاوای ئاسیادا، وەکوو تورکیا (٠/٠٠٢٨) و ئێران (٠/٠٠٤٢) و عێراق (٠/٠٠٤٣) و سووریا (٠/٠٠٤٤) زیاترە و بە یەکێ لە بەرزترین ڕێژەی لەدایکبوون دادەنرێت لە جیهاندا.

پاراستنی ئاستی بەرزی لەدایکبوون لە کوردستاندا، بۆ چەند هۆیەکی ئابووریی، کۆمەڵایەتیی و بگرە ڕامیارییش دەگەڕێتەوە، هەرە گرنگەکانیان ئەمانەن:

**ژنهێنانی زوو**

ژنهێنان و شووکردن لە کوردستاندا، لە تەمەنێکی زووی مێردمنداڵیدا دەست پێ دەکات. کوڕان لە هەژدە ساڵیدا ژن دەهێنن و کیژان لە شازدە ساڵییەوە مێرد دەکەن. ئەو کوڕانەی تەمەنیان لە ٢٢ ساڵ زیاترە و هێشتا ژنیان نەهێناوە، پێیان دەوترێ پیرەکوڕ.

ئەو کچانەشی تەمەنیان لە بیست ساڵ و بەرەوژورترە و هێشتا شوویان نەکردووە، پێیان دەوترێ گەورەکچ یا قەیرەکچ. ئەگەر هاتوو هۆی دواکەوتنی ژنهێنان و شووکردن، بایۆلۆژیی و دەسکورتی نەبێ، ، خەڵکی بە چاوی گومانەوە لەو جۆرە کەسانە دەڕوانن. ژنهێنان و شووکردن لە تەمەنێکی پچووکدا، واتا زووتر ئەو ژن و مێردە، دەست بە پرۆسێسی منداڵبوون دەکەن.

### هەڵوێستی کۆمەڵ

ئەو خێزانانەی منداڵیان زۆرە، بە تایبەتی ئەگەر کوڕ بوون، ئەوا لە نێو ڕیزەکانی کۆمەڵدا بە شێوەیەکی دیکە سەیر دەکرێن، وەکوو ئەوەی لە خێزانێکی دیکە کە منداڵیان کەم بێ، یا منداڵیان هەبێ، بەڵام زۆربەیان کچ بن، ڕێزیان زیاتر دەگیرێ و خەڵکی زۆر خۆیان لە قەرەیان نادەن.

### مسۆگەرکردنی پاشەڕۆژ

کارمەندانی دەوڵەت، دوای خانەنشین کردنیان مانگانەیان بۆ دەبڕدرێتەوە، بۆیە لە دواڕۆژدا کەمتر پێویستیان بە یارمەتی منداڵەکانیان دەبێ. بەڵام ئەو دایک و باوکانەی کە بە درێژایی تەمەنیان خەریکی کاری ئازادی خۆیانن، ئەوا بێگومان دوای پیربوونیان و لە کارکەوتنیان، پێوۆستیان بە دەسگیرۆیی منداڵەکانیان دەبێ، تا ئەو چەند ڕۆژە کورتەی لە ژیاندا ماویانە بەسەری بەرن، لە پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانە پەکیان نەکەوێ. لەبەر ئەوە ئەوەندەی بۆیان بکرێت، درێغی لە منداڵ دروسکردن ناکەن، تا ئەگەر هەمووشیان بە کەڵکی دایک و باوکیان نەهاتن، یەک دووانێکیان بە دەنگیانەوە بێن.

### ڕیکخستنی خێزان

کۆنترۆڵکردنی منداڵبوون و دیاریکردنی ژمارەی منداڵ لەنێو خێزانەکانی کوردستاندا، تاکوو ئێستا باو نەبووە، بەڵکوو هەموو خێزانێ پەیڕەوی دروشمی (ئەوەندەی خوا بیدا) یان کردووە، لەو بڕوایەشدان، هەر کەسە (ڕسقی خۆی لەگەڵ خۆیەتی)، خوداش کەس لە برسا ناکوژێ.

**بەکارهێنانی دەرمان**

زۆربەی زۆری ژنان، دەرمان دژی منداڵبوون ناخۆن، لاسیکی تایبەتیش بەکار ناهێنن، تا خۆیان لە منداڵبوونی زیاد بپارێزن. چونکە ئەم جۆرە کردەوانەلای ئەوان، بە کارێکی خراپ لێک دەدرێتەوە، بەوەی دادەنێن گوایە دەسکاری ئیشی خوا دەکەن و بەپێی شەریعەت بەکارهێنانی دەرمان حەرامە، ئەوانەی بەکاریشی دەهێنن، ئەوا لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا، یەزدان سزایان دەدا.

**دڵەڕاوکە و گومان**

زۆربەی دایک و باوکان، لەبەر نەخۆشی زۆر و مردنی چاوەڕوان نەکراو و بە هیلاکچوون و دابڕانی ژن و میرد لە یەکدی وکوشتن و جەنگی کوردستان، لە گەورەبوون و مانەوەی منداڵەکانیان دڵنیا نین. بۆیە ئەوەندەی بۆیان بکرێ، ڕێگای منداڵبوون ناگرن و هەموو ساڵێ لە کاتی پێویستی خۆیدا منداڵ بە بەرهەم دێنن.

ڕێژەی منداڵبوون لە ساڵی ١٩٨٥دا، لە نێو دانیشتووانی شارەکاندا – ٨,٤٧ ٠٠/٠ و لە نێو دانیشتووانی گوندەکاندا – ٢,٤٨ ٠٠/٠ بوو، واتا نزیکەی وەکوو یەک بوون.ئەمەش لە لایەکەوە بۆ یەکبوونی هەڵوێستی هەردوو لایان بەرامبەر هۆیەکانی بەرزی منداڵبوون لە نێویاندا دەگەڕێتەوە، کە لەمەوبەر ئاماژەمان بۆ کرد، لە لایەکی دیکەشەوە هۆی شارستانێتی و زیادبوونی ژمارەی مرۆڤ لەسەر زەوی، لە لایەن خەڵکی کوردستانەوە بیری لێ نەکراوەتەوە، وەکوو لە هەموو وڵاتە پێشکەوتووەکانی دیکەی جیهاندا، بیری لێ دەکەنەوە و چارەسەری بۆ دادەنێن.

لە ڕووی منداڵبوونەوە، لە پارچەکانی کوردستاندا. جیاوازییەکی ئەوتۆ بەدی ناکرێ. لە هەموو هەرێمەکاندا ڕێژەی لەدایکبوون وەکوو یەکن (لە دەوروبەری – ٤٨ ٠٠/٠دا بوو)، ئەمەش بۆ لە یەکچوونی باری کۆمەڵایەتیی و ئابووریی دەگەڕێتەوە.

**ب) مردن**

ڕێژەی مردن لە کوردستاندا، لە ساڵی ١٩٨٥دا ٠٠٢٧/٠ بوو. ئەم ڕێژەیە بە بەراوردکردن لەگەڵ ڕێژەی وڵاتەکانی دیکەی باشووری – ڕۆژئاوای ئاسیادا، وەکوو تورکیا، ئێران، عێراق و سووریا، سێ جار زیاترە. گرنگترین هۆکانیشی ئەمانەن:

– کەمی خزمەتگوزاریی تەندروستی

خزمەتگوزاریی تەندروستی لە کوردستاندا، لە نزمترین ئاست دایە. ئەوەشمان لە شیکردنەوەی ژمارەی دکتۆرەکان و نەخۆشخانەکان و جێگای نەخۆشەکاندا، بۆ ڕوون دەبێتەوە.

– ژمارەی دوکتۆر

لە ساڵی ١٩٨٥دا، نزیکەی ٢٥٠٠ دکتۆر لە نەخۆشخانەکانی کوردستاندا کاریان دەکرد، لەوانە ٧١٪ پزیشکی گشتی و لە ٢٩٪ پزیشکی شارەزا و تایبەت بوون. ئەم ژمارەیە چەند جار لەچاو ژمارەی دکتۆرەکانی تورکیا (١٧ هەزار) و ئێران (١٦ هەزار) و عێراق (٣ هەزار) و سووریا( ٤ هەزار) دا کەمترە. واتا هەر یەک دکتۆر خزمەتی ٩٥٠٠ کەس دەکات. ئەم ژمارەیە دوو تا سێ کەرەت لەو وڵاتانەی لەسەرەوە ناومان هێنان، کەم دەبنەوە. (تورکیا – ٥ هەزار کەس، ئێران – ٣ هەزار کەس، عێراق – ٤ هەزار کەس، سووریا – ٦ هەزار کەس).

– ژمارەی نەخۆشخانەکان

لە ساڵی ١٩٨٥دا، نزیکەی ٩٠ نەخۆشخانەی جۆراوجۆر لە کوردستاندا هەبوو. ئەو ژمارەیە لە نیوەی ژمارەی نەخۆشخانەکانی تورکیا (١٩٨٥– ٥٧٤)وئێران (١٩٨٩– ٦٢٥)و عێراق (١٩٨٠– ٢٠١)و سووریا (١٩٨٦– ١٨٩) کەمترە. واتا هەر یەک نەخۆشخانە، بەرامبەر ٢٦١ هەزار کەس بوو. تەنیا بۆ بەراوردکردن دەڵێین، ئەم دیاردەیە چەندین جار لەچاو هی تورکیا ( ١٩٨٥– ٧٦ هەزار کەس)و ئێران ( ١٩٨٩– ٧٩ هەزار کەس و عێراق ( ١٩٨٠– ٦٦هەزار کەس )و سووریا ( ١٩٨٦– ٦٥ هەزار کەس) زیاترە.

– ژمارەی جێگای نەخۆشەکان

نەخۆشخانەکانی کوردستان لە ساڵی ١٩٨٥دا، نزیکەی ١١ هەزار قەرەوێڵەیان تێدا بوو. ئەم ژمارەیە لەچاو ژمارەکانی تورکیا (١٩٨٥ – ٧٣ هەزار قەرەوێڵە)، ئێران (١٩٨٩

– ٧٨ هەزار قەرەوێڵە) و عێراق (١٩٨٠ – ٢٥ هەزار قەرەوێڵە) و سووریا (١٩٨٦ – ٢٤ هەزار قەرەوێڵە) زۆر کەمترە، واتا هەر یەک قەرەوێڵە، بۆ ٢١٠٠ کەس تەرخان کراوە.

**٠٢ نەخۆشی**

جۆری نەخۆشییەکان لە مردنی خەڵکیدا، ڕۆڵی جیاواز دەبینن. بۆ نموونە، نەخۆشی پیس و کرم: ١٢٪ی گشت نەخۆشییەکان، ڕووداوی کتوپڕیی و ژەهر و خۆکوشتن: ١٢٪، گەڕانی خوێن: ١١٪، شێرپەنجە و تومورەکانی دیکە: ٨٪، هەناسە: ٤٪، منداڵبوون: ٣,٨٪، گوارشکردن: ٣,٤٪، نەخۆشییەکانی دیکەش: ١١,٣٪ و ئەو نەخۆشیانەی دەسنیشانیش نەکراوون: ٣٤,٥٪ پێک دەهێنن.

**٠٣ جۆری خواردن**

جۆری خواردەمەنی دانیشتووانی کوردستان، بە لانی کەمەوە لە ڕادەی ئاسایی (٢٢٢٠ کالۆری) کەمترە. تێکڕای کالۆری سالانەی یەک کەس بۆ پیاو و ژن و گەورە و گچکە، لە ساڵی ١٩٨٥دا، لە دەوروبەری ١٦٥٠ کالۆریدا بوو، کە نزیکەی چارەک و نیو لەچاو کالۆریای وولاتەکانی تورکیا (٣١٨٠ کالۆری) و ئێران (٢٥٠٠کالۆری)، کەمترە.

بە شێوەیەکی گشتی، جۆری خواردنی خەڵکی کوردستان وەکوو یەک نییە. لە بەیانیاندا زۆربەی کات، نان وچا و هەندێ کاتیش پەنیر و ماست و هێلکە و نۆک و لۆبیا، نیوەڕوانیش نزیکەی هەمان خواردن و ئێوارانیش ساوەر و نیسک و بروێش، هەندێ جاریش برنج و ساڵی چەند جارێکیش گۆشت دەخۆن، ئەویش زیاتر لە ئاهەنگ و جەژنەکاندا گۆشت دەکرن.

ناتەواویی لە ژمارەی کالۆری ڕۆژانە بە درێژایی ساڵ، دەبێتە هۆی بێهێزکردنی توانای لەش و کەمکردنەوەی بەرگری لەش لە نەخۆشییە جۆربەجۆرەکان و لە ئەنجامدا تووشی نەخۆشی دەبێ، کە لەو بارودۆخەی کوردستاندا، لەبەر نەبوونی داوودەرمان، چارەسەرکردنی زۆر زەحمەتە، چونکە لە دواییدا نەخۆشییەکە لێی پیس دەکا و هێز لە مرۆڤ دەبڕێ و بۆ مردن ئامادەی دەکات.

**٠٤ جۆری خانووەکان**

چەشنی خانووبەرە لە ڕووی باش و خراپییەوە بۆ تەندروستی، لە زیادکردن یا کەمکردنی ڕێژەی مردندا، ڕۆڵی تایبەتی خۆی وازی دەکات. ژمارەی هەموو خانووەکانی

کوردستان لە ساڵی ١٩٨٥دا، لە دەوروبەری ٣ ملیۆن و ٣٠٠ هەزار خانوودا بوو. لە هەمان ساڵدا، نزیکەی چوار ملیۆن خێزان هەبوو، واتا هەر خانوویەک بۆ ١,٢ خێزان بوو.

لێرەدا گیروگرفتەکە لە ژمارەی خانووەکاندا نییە، بەڵکوو لە چەشنی خانووەکان و ئامێرەکانی ژیان و تەسکی ژوورەکان و گەورەیی خێزان و نەبوونی پەنجەرەی پێویست لە ژوورەکاندا، بۆ رووناکی و ئاڵوگۆڕکردنی هەوا و نزمی سەربانەکان لەبەر نزمی دیوارەکان کە دەبێتە هۆی گڵمخاندنی هەوای ژوورەکان و نەبوونی ئاودەسخانەی پاک و موبەق و گەرماو و گەلێ پێویستی دیکەش دایە. سەرباری ئەمانەش لە گوندەکان نەوەک هەر مرۆڤ لە نێو خانووەکاندا دەژین، بەڵکوو ئاژەڵەکانیشیان هاوبەشی ژیانیان لە هەمان خانوودا دەکەن، هەندێ جار لە یەک ژووردا و هەندێ جاری دیکەش لە ژوورێکی تەنیشتدا دەژین.ئەمانە هەموویان پێکەوە، نەخۆشی جۆراوجۆر پەیدا دەکەن و لە نێو خێزانەکاندا بڵاو دەکەنەوە، لە ئەنجامدا ڕێژەی مردنی پێشوەخت زیاد دەکات.

**٥٠ کارەساتی سروشتی**

ساڵانە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی لە ئەنجامی کارەساتی سروشتی وەکوو بەفربارینێکی زۆر، ڕەنوو، ڕۆچوونی چیاکان، لافاو، بومەلەرزە... ژیانیان لە دەست دەدەن. بۆ نموونە، لە مانگی فێبروەری ساڵی ١٩٩٢دا، ٦٠٠ کەس لە ئەنجامی بومەلەرزە و ٢٧٠ کەسیش بەهۆی هاتنی ڕەنوو، لە نێوچەی ئەرزنجاندا ژیانیان لە دەست دا.

**٠٦ مردنی بایۆلۆژی**

ڕێژەی مردنی بایۆلۆژی لە نێو دانیشتووانی کوردستاندا، لە ١٠٪ گشت هەموو شێوە مردنەکانی دیکەدا کەمترە، ئەویش لەبەر بەرزی ڕێژەی هۆیەکانی مردن، کە لەوە پێش باسمان کردن. مردن لە باری ئاساییدا، بە زیادبوونی تەمەن (تەماشای خشتەی ژمارە ١٦ بکە)، زیاد دەکات، واتا هەر چەندێ تەمەن زۆر بێ، ئەوەندە ڕێژەی مردن بەرزتر دەبێتەوە. ئەویش تا ڕادەیەک، ئەوانەی تەمەنیان دەگاتە ٦٥ ساڵ و بەرەو ژوورتر، بەپێی یاسای سروشت، بۆ ماوەیەکی کورت کەسیان لە ژیاندا نامێنن.

**خشتەی ١٦ ڕێژەی مردن بەپێی دەستەی تەمەن، لە ساڵی ١٩٨٥- خەملاندن**

| دەستەی تەمەن | مردن % | دەستەی تەمەن | مردن % |
|---|---|---|---|
| ١ ساڵ کەمتر | ٦,٣ | ٢٥-٢٩ | ٢,٩ |
| ١-٤ | ١٤,٢ | ٣٠-٣٩ | ٥,٨ |
| ٥-٩ | ٧,٢ | ٤٠-٤٩ | ٦,٢ |
| ١٠-١٤ | ٣,٦ | ٥٠-٥٩ | ١١,٩ |
| ١٥-١٩ | ٣,٤ | ٦٠ ساڵ زیاتر | ٣٤,٩ |
| ٢٠-٢٤ | ٣,٦ | کۆ | ١٠٠,٠ |

ڕێژەکانی نێو خشتەکەی سەرەوە، تەنیا پەیوەندی بەو مردووانەوە هەیە، کە لە دەزگاکانی دەوڵەتدا تۆمار کراون، لەو ڕووەوە کەمێ لەگەڵ ڕاستیدا نارێکە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێ ڕاستیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە، لەگەڵ زیادبوونی تەمەندا، ڕێژەی مردن زیاد دەکات. بۆ نموونە، ڕێژەی مردن لە تەمەنی شەست ساڵی و زیاتردا، چەندین جار لە گروپی تەمەنی پیشەخۆیی زیاترە.

**٠٧ جەنگ**

جەنگ بەرفراوانترین و گەورەترین ڕۆڵی سەرەکی، لە ڕێژەی مردنی بە کۆمەڵی خەڵکیدا دەبینێ، بە تایبەتی لە قۆناغی ئێستای کوردستاندا، ئەوەندەی خەڵک بە کوشتن دەڕوا و لە جەنگدا دەکوژرێ، نیو ئەوەندە بە نەخۆشی و بە مردنی خوا نامرن. جەنگیش لەم شێوانەدا خۆی دەنوێنێ:

- جەنگی کوردستان و دەوڵەتە داگیرکەرەکان

جەنگی نێوان کوردستان و تورکیا و ئێران و عێراق، لە ساڵی ١٩٦١ەوە تاکوو ١٩٩٥ی زایینی، نزیکەی ٥٠٠ هەزار کەسی تێدا کوژراوە.

– جەنگی نێوخۆ

بە هۆی جەنگی نێوخۆ یا جەنگی نێوان هێزە ڕامیارییەکانی کوردستانەوە، لە ساڵی ١٩٦٤ەوە هەتاکوو ١٩٩٥ی زایینی، چەندین هەزار کەس گیانیان لە دەست داوە،. بۆ نموونە، لە جەنگی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، لە مانگی مای – ئۆگەستی ساڵی ١٩٩٥، دەوروبەری ٣ هەزار کەسی تێدا کوژرا.

**٠٨ کوشتن**

کوشتنی خەڵکی بە بیانووی جیاجیای وەکوو دژی دەوڵەت، جیاوازیی بیروباوەڕ و ئایدۆلۆژیی، تۆڵەسەندنەوە، بە دەستی کاربەدەستانی دەوڵەتی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا لە لایەک و لە لایەکی دیکەوە بە دەستی هێزە ڕامیارییەکانی نێوخۆی کوردستان، کارێکی ڕۆژانەی زۆر ئاساییە، ڕۆژانە چەندین کەس بەو ڕووداوانە، گیان لە دەست دەدەن.

**٠٩ ئەنفالکردن**

لە ئەنجامی ئەنفالکردنی دانیشتووانی هەندێ نێوچە لە باشووری کوردستاندا، لە ساڵی ١٩٨٨ی زایینیدا، لە لایەن دەوڵەتی عێراقەوە، زیاد لە ١٨٣ هەزار کەس بۆ عێراق ڕاپێچ کران و دوایی هەموو بە کۆمەڵ کوژران.

**٠١٠ بەرزیی ئاستی مردنی منداڵانی ساوا**

بەرزیی ئاستی مردنی کۆرپە ساواکان لە نێو دانیشتووانی کوردستاندا، ڕۆڵێکی یەکجار گەورە، لە زیادکردنی ڕێژەی گشتیی مردندا دەبینێ. ئەم ڕێژەیە لە ساڵی ١٩٨٥دا، خۆی لە دەوروبەری ٠/٠٠٣٠٠ دەدا، (واتا ٣٠٠ کۆرپە لە ١٠٠٠ کۆرپە بوو). ئەم ڕێژەیە چەندین جار لەچاو ڕێژەی مردنی کۆرپەکانی تورکیا (٠/٠٠٧٦) و ئێران (٠/٠٠٦٣) و عێراق (٠/٠٠٦٩) و سووریا (٠/٠٠٤٨) زیاترە.

هۆکانی مردنی کۆرپە ساواکان: جگە لەو هەموو هۆیانەی پێشتر، لە باسی مردنی گشتیدا باسمان کردن، هەندێکی دیکەیان ئەمانەن: نەبوونی پزیشکی منداڵان لە شارەکاندا وەکوو پێویست و نەبوونیان بە شێوەیەکی بنەبڕی لە گوندەکاندا. خراپی تەندروستی دایکان، وەکوو نەخۆشی، برسێتیی، ماندووبوونی لە ڕادەبەدەر بە تایبەتی لە کاتی سکپڕیدا. نەبوونی گەلێ ڤیتامینی پێویست لە شیری دایکاندا لەبەر خراپی خۆراک.

ڕێژەی مردن لە ساڵی ١٩٨٥دا، لە نێو شارنشینەکاندا – ٠/٠٠١٥ کەمتر بوو لەچاو

گوندنشینەکاندا – ٠/٠٠٢٠ لەبەر ئەوەی زۆربەی زۆری کارەکانی خزمەتگوزاریی تەندروستی، وەکوو دکتۆر، نەخۆشخانە، دەرمانخانە، لە شارۆچکە و شارەکاندا کۆ بوونەتەوە.شارنشینەکان زیاتر سەر لە دکتۆر دەدەن، دەرمانی دروسکراوی میللی، بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانییان کەمتر بەکار دەهێنن، توانای دارایی شارنشینییەکان زیاترە، وەکوو گوندنشینەکان ڕێگایەکی دوور بۆ سەردانی دکتۆر نابڕن، پاکوخاوێنی شارنشینییەکان، لەبەر هەبوونی ئاو و خزمەتی شارەوانی، لەچاو گوندنشینییەکاندا کەمتر تووشی نەخۆشی دەبن. هەروەها سروشتی ژیان لە شارەکاندا وا لە خەڵکی دەکات، زیاتر لە گوندنشینییەکان بایەخ بە پاکوخاوێنی خۆیان و تەندروستییان بدەن، جگە لەوەی کارەکانی شارەکان لە ئەوانەی گوندەکان گەلێ خاوێنترن.

لە نێوان هەرێمەکانی کوردستاندا، جیاوازییەکی لەبەرچاو لە ڕێژەی مردندا بەدی دەکرێ. ڕێژەی ئەم دیاردە دیمۆگرافییە لە باشووری کوردستاندا، لە ساڵی ١٩٨٥دا لە ٠/٠٠٢٩ و لە باکوور – ٠/٠٠٢٨ و لە ڕۆژهەڵات – ٠/٠٠٢٧ و لە ڕۆژئاوا – ٠/٠٠٢٦ بوو. ئەمەش لە ئاکامی چەند خاڵێکی جیاوازی وەکوو ڕادەی توندوتیژی جەنگەکە لە لایەکەوە لەگەڵ سوپاکانی تورکیا و ئێران و عێراق، لە لایەکی دیکەشەوە لەبەر جەنگی نێوخۆی نێوان باڵەکانی بزووتنەوەی کوردایەتیدا بوو.

## بەشی دووەم: پێکهاتەی دانیشتووان

زانینی پێکهاتەی دانیشتووان لە ڕووی تەمەن و توخم، ئیتنی، ئایین، خوێندەواری، ژمارەی کارکەران، بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی کۆمەڵ و دانانی پلان بۆ لەنێوبردنیان، بایەخی زۆری هەیە، یاخود کەمکردنەوەی کارتێکردنیان، هەروەها بۆ زانینی ڕێڕەوی ئابووریی دوارۆژی وڵات و باری کۆمەلایەتی دانیشتووان.

### ١٠پێکهاتەی تەمەن و توخم

جۆری ئاوێتەی تەمەن و توخم، واتا ژمارەی دەستەیەکی تەمەن، ژمارەی نێرینە و مێینەی لە ناو گشت دانیشتوواندا، سیستەمی زاوزێی خەڵکی دیاری دەکات، کۆمەڵگای کەم تەمەن (گەنج) وەکوو یاسا، لەچاو کۆمەڵگاکانی لە خۆیان بە تەمەنتر، منداڵیان زۆرتر دەبێ. هەروەها ژمارەی کرێکاران (ئەوانەی دێنە مەیدانی کار، ئەوانەی لە مەیدانی کاردان، ئەوانەی لە مەیدانی کار دەردەچن). لە ڕێگەی ئاوێتەی تەمەن و توخمەوە دەتوانین، بزانین چەند شوێنی کار، چەند خواردن، چەند قوتابخانە (سەرەتایی، ناوەندیی، ئامادەیی)، چەند دەزگای لەشساغی (دکتۆر، نەخۆشخانەی گەورە، نەخۆشخانەی گچکە،) پێویستن.

#### ا. پێکهاتەی تەمەن

دیمگرافیزانەکان، دانیشتووان لە ڕووی تەمەنەوە، بەسەر چەند دەستەیەکدا دابەش دەکەن، کە هەر دەستەیەکیش لە پێنج ساڵ پێک دێت. واتا ئەوانەی بۆ نموونە، تەمەنیان لە ١ – ٤ ساڵ دەبێ، لە یەک دەستەدان، ئەوانەی تەمەنیان لە ٥ – ٩ ساڵ دەبێ، سەر بە دەستەیەکی دیکەن، بەو شێوەیە ئەو دەستانە، یەک بە دوای یەکدا دێن، هەندێ جار کۆتاییان بە ٦٥ ساڵ و بەرەوژورتر دێ و هەندێ جاری دیکەش درێژی دەکەنەوە بۆ ٨٥ ساڵ و بەرەوژورتر. تەمەنی دانیشتووانی کوردستان لە ساڵی ١٩٨٥دا، بەسەر ١٤ دەستەدا دابەش کراوە. تەماشای خشتەی ژمارە (١٧) و گرافی ژمارە (...٤ بکە.

ژمارەی دەستە تەمەنییەکان و ڕێژەیان لە پێکهاتەی گشتی هەموو دانیشتوواندا، بە شێوەیەکی گشتیی تەواو نییە. هۆیەکانیشی هەندێکی بۆ ئەم خاڵانەی لای خوارەوە دەگەڕێتەوە:

**خشتەی ١٧ پێکهاتەی تەمەن و توخمی دانیشتووان، ١٩٨٥ (خەمڵاندن)**

| دەستە | تێکڕا | ٪ نێرینە | ٪ مێینە |
|---|---|---|---|
| ٠–٤ | ١٥,٥ | ١٥,٧ | ١٥,٣ |
| ٥–٩ | ١٤,٥ | ١٤,٦ | ١٤,٢ |
| ١٠–١٤ | ١٢,٢ | ١٢,٤ | ١١,٩ |
| ١٥–١٩ | ١٠,٤ | ١٠,٣ | ١٠,٤ |
| ٢٠–٢٤ | ٩,٠ | ٩,٠ | ٩,٠ |
| ٢٥–٢٩ | ٧,٦ | ٧,٧ | ٧,٥ |
| ٣٠–٣٤ | ٦,٤ | ٦,٢ | ٦,١ |
| ٣٥–٣٩ | ٤,٨ | ٤,٨ | ٤,٨ |
| ٤٠–٤٤ | ٣,٨ | ٣,٦ | ٤,٠ |
| ٤٥–٤٩ | ٣,٦ | ٣,٤ | ٣,٧ |
| ٥٠–٥٤ | ٣,٥ | ٣,٦ | ٣,٥ |
| ٥٥–٥٩ | ٢,٩ | ٢,٧ | ٢,٨ |
| ٦٠–٦٤ | ٢,٣ | ٢,٣ | ٢,٢ |
| ٦٥+ | ٣,٢ | ٣,٥ | ٤,٤ |
| نازانن | ٠,٣ | ٠,٢ | ٠,٢ |
| کۆ | ١٠٠,٠٠ | ١٠٠,٠٠ | ١٠٠,٠٠ |

١/ ئەوانەی تازە لەدایکبوون، یەکسەر لە دوای لە دایکبوونیان، لە دەفتەری مەدەنی تۆمار ناکرێن، تا ئەو ڕۆژەی پێویستیان بە دەکومێنتێک دەبێ، بۆ ئەوەی لە یەکێ لە دایرەکانی دەوڵەتدا، کاروبارە تایبەتییەکانی خۆیانی پێ جێبەجێ بکەن. ئەو کاتەش لەبەر ڕۆشنایی ڕووداوێکی سروشتیی وەکوو بارانێکی زۆر، لافاو، گەرما، سەرما، بومەلەرزە، یاخود ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی وەکوو کوشتنی ناودارێک، بوون بە سەرباز، دەسەڵات وەرگرتن، کۆچکردن، تەمەنیان دەخەملێنن.

٢/ پیاو و ژن کە بە ساڵدا دەچن، وەکوو نەریتێکی کۆن خۆیان بە گەورەتر لە تەمەنیان ناونووس دەکەن، لەو بڕوایەوە، کە بەو خۆ گەورەکردنە، پلە و پایەیەکی گەورەی کۆمەڵایەتی بۆ خۆیان دەپچڕن.

٣/ ڕێککردنی تەمەن لە نێو پیاوان و ژناندا، کارێکی ئاساییە. بۆ نموونە، ئەو کەسانەی تەمەنیان ٤٨ ساڵ بێ، پێیانخۆشە بە ٤٥ ساڵ یاخود بە ٥٠ ساڵی ڕێک خۆیان تۆمار بکەن، دیارە ژمارەکە لای ئەوان جوانترە.

٤/ هەمیشە تەمەنی ژنان لە تەمەنی پیاوان ناتەواوترە، چونکە ژنان کەمتر پێویستیان بە دەکومێنت دەبێت، لەبەر ئەوەی کەمتر دەچنە قوتابخانە و کەمتر لە دایرەکانی دەوڵەتدا کار دەکەن. هەروەها ژنهێنان و مێردکردن، لە هەموو شوێنێ بۆ سەلماندنی تەمەن پێویستی بە دەکومێنت نییە.

٥/ گەورە و گچکەیی تەمەن، تا ڕادەیەکی زۆر بە بەرژەوەندی خودی تاکە کەسییەوە بەستراوە، بۆ نموونە، ئەگەر تەمەن گەورەیی خێری تێدا بوو، بۆ وەرگرتنی یارمەتی و جێگرتنەوەی باوک لە نێو کۆمەڵدا، ئەوا بێگومان ئەو کەسە تەمەنی خۆی گەورە دەکات، بە پێچەوانەشەوە لەو کاتانەی تەمەن گەورەیی بە خراپ بەسەر ئەو کەسانەدا بشکێتەوە، وەکوو بانگکردن بۆ سەربازی، تەمەنیان پچووک دەکەنەوە.

بۆ شیکردنەوەی تەمەن وا باوە، کە هەموو تەمەنەکان لە سێ دەستەی گەورەدا کۆبکرێنەوە، وەکوو لە خوارەوە نیشانی دەدەین:

ا – تەمەنی گچکە (٠ – ١٤ ساڵ)

ڕێژەی ئەو کەسانەی تەمەنیان لە ١٤ ساڵ کەمترە، ئێستا ٤٩,٨٪ی گشت دانیشتووانی کوردستان پێک دەهێنن، ئەم ڕێژەیە لەچاو ڕێژەی تەمەنی دانیشتووانی وڵاتەکانی دیکەی ڕۆژئاوای ئاسیادا، وەکوو تورکیا (١٩٨٥ – ٣٧,٥٪)، ئێران (١٩٨٦ –

٤٥,٤٪)، عێراق (١٩٧٧ – ٤٨,٩٪)، سووریا (١٩٨٦ – ٤٩,٣٪) زیاترە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە دانیشتووانی کوردستان زیاتر لە جموجۆڵ دان و خێراتر ژن دەهێنن و نەوە شوێنی نەوە دەگرێتەوە، لەبەر بەرزی ڕێژەی مردن.

ب – تەمەن ناوەنجی (١٥ – ٦٤ ساڵ)

ئەم دەستەیە بە دووەم دەستەی تەمەن دادەنرێ، ئێستا ٤٦,٨٪ی گشت دانیشتووانی کوردستان پێک دێنێ. ئەم ڕێژەیە لەچاو ڕێژەی تورکیا (١٩٨٥ – ٥٨,٣٪)، ئێران (١٩٨٦ – ٥١,٥٪) کەمترە، بەڵام لەگەڵ عێراقدا وەکوو یەکن (١٩٧٧ – ٤٦,٨٪) و لە ڕێژەی سووریا ش زیاترە (١٩٨٦ – ٤٦,٣٪). گومانی تێدا نییا، کە ڕێژەی تەمەن ناونجییەکان زیاتر دەبوو، ئەگەر بە دەیان هەزار پێشمەرگە خۆیان ناونووس دکردایە، کە هەموویان دەکەونە نێو سنووری ئەم دەستەیەوە.

ج – تەمەن گەورە (٦٥ ساڵ و بەرەوژوورتر)

گروپێکی کەمن، ئێستا ٣,٤٪ هەموو دانیشتووان پێک دەهێنن. بۆ بەراوردکردن دەتوانین بڵێین، ڕێژەی ئەم گروپە لە ڕێژەی تورکیا (١٩٨٥ – ٤,٢٪)و عێراق (١٩٧٧ – ٣,٤٪) و سووریا (١٩٨٦ – ٤,٤٪) کەمترە، بەڵام کەمێکی لە ڕێژەی ئێران زیاترە (١٩٨٦ – ٣,١٪). ئەم گروپە، زیاتر ئەو کەسانە دەگرێتەوە، کە لە مردنی سروشتیی و میکانیکی دەرباز بوون، بەڵام تەندروستییان لەوەدا نییە، کە دوای ئەم تەمەنە زۆرتر بژین.

**ب ـ پێکهاتەی توخم**

ژمارەی نێرینەکان، لە کۆمەڵگاکانی جیهانی سێیەمدا، وەکوو شتێکی سەلمێندراو، لە ژمارەی مێینەکان زیاترە. ئەمەش لەبەر ئەوە نییە، کە دایکان بە شێوەیەکی سروشتیی کوڕیان زیاتر لە کچ دەبێ (١٠٦ کوڕ بەرامبەر ١٠٠ کچ)، بەڵکوو لەبەر بەرزی ڕێژەی مردنە، بە شێوەیەکی سروشتی مێینەکان زۆرتر و زووتر دەمرن، واتا تەمەنیان لە تەمەنی نێرینەکان کورتترە.

دانیشتووانی کوردستان لە ساڵی ١٩٨٥ دا، لە ٥١,١٪ی پیاو بوون و لە ٤٨,٩٪شیان ژن بوون. واتا ڕێژەی پیاوان ٢,٢٪ لە ڕێژەی ژنان زیاتر بوون. هەمان جیاوازی لە تورکیا (ساڵی ١٩٨٥، نێرینە – ٥٠,٧٪ و مێینە – ٤٩,٣٪) و لە عێراق (ساڵی ١٩٨٧، نێرینە – ٥١,٤٪ و مێینە – ٤٨,٦٪) بەرچاو دەکەوێ.

ڕێژەی توخم (ژمارەی پیاو بەرامبەر ١٠٠ ژن)، لە ساڵی ١٩٨٥دا، ١٠٤,٥ بوو. ئەم ڕێژەیە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ڕێژەی وڵاتەکانی دەوروبەری وەکوو تورکیا (١٩٨٥ – ١٠٣ پیاو)، ئێران (١٩٨٦ – ١٠٥ پیاو)، عێراق (١٩٨٧ – ١٠٦ پیاو) و سووریادا (١٩٨٥ – ١٠٤ پیاو) نییە.

**٠٢ خوێندەواری**

بەو کەسانە دەگوترێ خوێنەوار، کە بە ئاسانی توانای خوێندنەوە و نووسینی دەقێکی ئاساییان هەبێ و تەمەنیشیان لە شەش ساڵ زیاتر بێ. ڕێژەی خوێندەوارانی کوردستان لە نیوەی ژمارەی دانیشتووان زیاترە (١٩٨٥ – ٥٦,٣٪) و لە ڕێژەی خوێندەوارانی هەموو وڵاتەکانی دیکەی ڕۆژئاوای ئاسیا کەمترە، وەکوو تورکیا (١٩٨٥ – ٧٧,٥٪)، ئێران (١٩٨٦ – ٦١,٨٪)، عێراق (١٩٨٧ – ٧٢,٦٪). هۆی نزمی خوێندەواری ئەمانەن:

– نەبوونی قوتابخانە: ژمارەی قوتابخانەکان لەچاو پێویستی دانیشتوواندا، گەلێ کەمترە. زۆربەی گوندەکان، یان هەر قوتابخانەیان تێدا نییە، یان بە چەند گوندێ خاوەنی یەک قوتابخانەی سەرەتایین. سەرەڕای ئەمەش، لەبری ئەوەی ژمارەی قوتابخانەکان زیاد بکەن، ساڵ بە ساڵ کەمتر دەبنەوە، چونکە تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا قوتابخانەکان دادەخەن.

– کەمی مامۆستا: زۆربەی قوتابخانەکان مامۆستایان کەمە. وا ڕێک دەکەوێ، قوتابخانەیەک لە چوار پۆل پێک دێ، تەنیا ٢ یا ٣ مامۆستای هەیە. لەو حاڵەتانەدا، مامۆستاکان ناچار دەبن، لە ماوەی چل خولکەدا پۆلەکان تێکەڵ بە یەکدی بکەن و وانەکەی خۆیان بە هەردوو لایان بڵێنەوە، واتا نیو وانە بە هەر پۆلەی دەڵێنەوە.

– زۆریی قوتابیان لە پۆلەکاندا: پۆلی قوتابخانەکان لە ڕادە بەدەر قەرەباڵغن، ژوورێکی ٢٠ کەسی زیاتر لە ٣٠ قوتابی وانەی تێدا دەخوێنن.

– پێویستییەکانی قوتابخانە: پێویستییەکانی خوێندن، هەر لە کورسی دانیشتنەوە و تەختەی ڕەشەوە تا بە قەڵەم و دەفتەر و دەباشیر... دەگات، لە زۆربەی قوتابخانەکاندا کەمە و بەگوێرەی پێویست نییە. لەبەر ئەوە هەندێ جار، دوو قوتابی لەسەر یەک کورسی

دادەنیشن. قوتابخانەی واش هەیە، قوتابییەکان لەسەر زەوی یان تەنەکە دادەنیشن و دەنووسن و دەخوێننەوە.

- پێویستییەکانی خوێندن: قوتابییەکان لە هەندێ قوتابخانەکان، لەبەر کەمی پەرتووکی خوێندن، پێکەوە لە یەک پەرتووکدا دەخوێنن، واتا قوتابی دەتوانێ وانەکانی بخوێنێ، تەنیا لەو کاتەدا کە سەرەی دێتە سەر، نەوەکوو لەو کاتانەدا کە خۆی ئارەزووی خوێندنی هەیە.

- پێویستییەکانی نووسین: قوتابییەکان بە تەواویی هەموو پێویستییەکانی نووسینیان نییە، وەکوو پێنووس، دەفتەر، لاستیک، قەڵەمدایەر، چونکە باری ئابووری خێزانەکانیان، بە شێوەیەک نییە، کە ئەو پێویستییانە بۆ منداڵەکانیان دابین بکەن، تا ژمارەی منداڵەکانیشیان زۆرتر بێ، گیروگرفتەکە زیاتر دەبێ.

- سیستەمی دابەشکردن: دوای ئەوەی فەرمانی دامەزراندنی مامۆستایان، دەگاتە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەوە، مامۆستایان بەسەر قوتابخاناکاندا دابەش دەکرێن. بەڵام لەبەر ئەوەی سیستەمێکی دیاریکراو، بۆ دابەشکردنی مامۆستایان نییە، هەندێ مامۆستا لەبەر هەر هۆیە بێ، یەکسەر لە قوتابخانەی شارەکان یاخود لە قوتابخانەی گوندەکانی دەوروبەردا دادەمەزرێن. هەندێ مامۆستای هەن، چەندین ساڵە کاری مامۆستایی دەکەن، بەڵام لە قوتابخانەیەکی دوور لە شارەوە دانراون، کە تەنیا لە کاتی پشوودانی زستان و هاویندا دەتوانن، سەردانی شارەکان بکەنەوە.

- سەختی ژیان: لەبەر نەبوونی هۆیەکانی شارستانی وەکوو ڕاکێشانی ئاو، کارەبا، چایخانە، کەمی هۆکانی هاتوچۆ، نەبوونی بازاڕ و بێدنگی، ژیان لە زۆربەی گوندەکاندا، بە شێوەیەکی سەخت بەسەر دەبرێ، کە ئەمانە هەموویان پێکەوە، کار لە هەست و ئارەزووی مامۆستا دەکەن و بەرهەمی کەمتر دەبێ.

- تێکچوونی قوتابخانە: هەندێ جار لەبەر نەگەڕانەوەی قوتابییەکان بۆ خوێندن، یاخود نەهاتنەوەی مامۆستاکان بۆ وانە ووتنەوە، لەبەر بارودۆخی تایبەتیی ڕامیاریی و ئاڵۆزبوونی ڕەوشی کۆمەڵایەتی، هەندێ لە قوتابخانەکان تێک دەچن.

– تەواونەکردنی خوێندن: لە سەرەتای هەرساڵێکی خوێندندا، ژمارەیەکی دیاریکراو لە قوتابیان، لە قوتابخانەکانی سەرەتایی، ناوەندیی و ئامادەیی وەردەگیرێن. بەڵام بە داخەوە هەموو ئەوانەی وەرگیراون، بۆیان ناکرێ خوێندن تەواو بکەن. هەندێکیان هەر زوو واز لە خوێندن دێنن، هەندێکی دیکەشیان دوای یەک دوو ساڵ، ڕیزەکانی قوتابخانە بەجێ دەهێڵن. ڕێژەی هەموو ئەوانەی لەسەر خوێندن بەردەوام دەبن و خوێندنەکەیان تەواو دەکەن، لە هەندێ نێوچەدا، لە ژمارەی تێکڕای قوتابییە وەرگیراوەکان کەمترە.

– نائاسایی ژیان: باری نائاسایی ژیان، بە یەکێ لە هەرە گەورەترین گیروگرفتەکانی خوێندن و تەواونەکردنی خوێندن دادەنرێ. بە هۆی ئەو بارە نالەبارەوە، بە شێوەیە سەر لە خەڵکی شێوێندراوە، کە بڕوایان نەک هەر تەنیا بە خوێندن نەماوە، بەڵکوو بڕوایان بە ژیانیش نەماوە و تووشی ڕەشبینییەکی تەواو بوون. هەندێ جار کاری خوێندن، لە نێوچەیەکی دیاریکراودا بە شێوەیەکی باش دەڕوا، بەڵام لە پڕ بە هۆی ڕووداوێکی کتوپڕییەوە، خەڵکەکە ناچار دەبن، ڕوو لە شوێنێکی دیکە بکەن، کە زۆر جار بێ قوتابخانە دەمێننەوە.

– هەڵوێستی کۆمەڵگا: هەتا دوێنێش، لە کۆمەڵگای کوردەواریدا کەم تا زۆر، بە هۆی باری کۆمەڵایەتیی و فاکتەری ئایینەوە، هەندێ جاریش بە هۆی کارکردنەوە، ڕێگەی کچانیان نەدەدا، بچنە قوتابخانە و خوێندن تەواو بکەن، بە بیانووی ئەوەوە، کاری خراپە دەکەن و لە ڕێبازی ئایین لا دەدەن.

– خوێندن بە زمانی بێگانە: دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و سووریا و هەندێ جاریش عێراق، ڕێگە نادەن، منداڵانی کورد بە زمانی زکماکی خۆیان بخوێنن، بەڵکوو خوێندن بە شێوەیەکی گشتیی لە کوردستاندا، بە زمانەکانی تورکی و فارسی و عەرەبییە. ئەمە وا لە قوتابیانی کورد دەکات، لە سەرەتادا لە زۆربەی بابەتەکانی خوێندن نەگەن و لە نیشتمانەکەی خۆیاندا، هەست بە کەموکوڕییەکی نەتەوەیی تەواو و بەشخوراویی بکەن.

– ڕێژەی نەخوێندەوارە گەورەکان: بە زیادبوونی تەمەن، ڕێژەی نەخوێندەواری بەرز دەبێتەوە. واتا بە تەمەنەکان زیاتر نەخوێندەوارن وەک لە گچکەکان. نەخشەی نەخوێندەواریش بە شێوەیەکی گشتی، لە ساڵی ١٩٨٦دا بەم شێوەیە بوو:

له نێو ١٩ ساڵ و کەمتر – ٣٤٪ نەخوێندەوار هەبوو. ١٩ تا ٢٩ ساڵ – ٤٩٪ نەخوێندەوار بوو. ٢٩ تا ٤٤ ساڵ – ٧٥٪ نەخوێندەوار هەبوو. ٤٤ تا ٦٤ ساڵ – ٨٦٪ ەخوێندەوار هەبوو. لە ٦٤ ساڵ بەرەوژورتر – ٩٢٪ نەخوێندەوار هەبوو.

ڕێژەی خوێندەواری لە نێو ڕیزی شارنشینەکاندا، لە ساڵی ١٩٨٦دا، لە ٥٨٪ بوو، لەوانە پیاو ٦٩٪، ژن ٤٦٪ بوون. ئەو ڕێژەیە لە نێو گوندنشینەکاندا، ٢٥٪ بوو، لەوانە پیاو ٣٨٪ و ژن ١١٪ بوون. ئەم جیاوازییە گەورەیە (٣٣٪) لە نێوان ڕێژەی پیاوان و ژنانی خوێندەوارانی شار و گوندەکاندا، بۆ چڕبوونەوەی دەزگاکانی خوێندن لە شارەکاندا دەگەڕێتەوە، جگە لەوەی ئارەزووی خوێندن لە نێو شارنشینەکاندا بەرزترە، کارەکانی بازرگانیی، پیشەسازیی، بەڕێوەبردنی دەزگاکانی دەوڵەت لە شارەکاندا، لەچاو گوندەکاندا زیاتر پێویستیان بە خوێندن و کادێری خوێندەوار هەیە، هەروەها لە شارەکاندا، بەبێ ئەوەی گوێ بە جیاوازی نێوان کوڕ و کچ بدەن، منداڵان بۆ قوتابخانەکان دەنێرن، منداڵە شارنشینەکان زیاتر لە منداڵە گوندنشینەکان، توانای خوێندن و درێژەدان بە خوێندنیان هەیە، چونکە شوێنی ژیانیان زیاتر هێمنترە و بەجێشی ناهێڵن.

## ٠٣ هێزە کارکەرەکان

دواکەوتن یا پێشکەوتنی ئابووریی وولاتانی جیهان، تا رادەیەکی زۆر پەیوەندی بە پلەی شارەزایی و لێهاتوویی و ناشارەزایی کارکەرانەوە هەیە، هەروەها پەیوەندی بە زۆر و کەمی ژمارەی، ئەو کادێرە شارەزا و ناشارەزایانەوە هەیە، بە بەراوردکردن بە رێژەی گشتیی ژمارەی دانیشتووان.

دیاریکردنی ژمارەی هێزە کارکەرەکان، بە یەکێ لە کێشە ئاڵۆزەکانی جوگرافیای ئابووری دادەنرێ، چونکە هەر دەوڵەتێ، بەپێی باری ئابووریی و کۆمەلایەتیی خۆی، ساڵی دەست بەکارکردن و وازهێنان لە کارکردن دیاری دەکات. بەپێی یاسای کارکردن، ساڵی دەست بەکارکردن لە زۆربەی وولاتەکانی ئەوروپادا، بە ١٨ ساڵ دادەنرێ و لە ٦٤ ساڵیشدا تەواو دەبێ. پیاوان لە تەمەنی ٦٤ ساڵیدا و ژنانیش لە تەمەنی ٦٠ ساڵیدا خانەنشین دەکرێن. ئەو دیاریکردنە، لەگەڵ دیاریکردنی بیرۆی کاری نێودەوڵەتیدا یەک دەگرنەوە.

بەپێی یاسای کار، خەڵکی لە کوردستاندا، لە ١٠ ساڵییەوە دەست بە کارکردن دەکەن و لە تەمەنی ٦٤ ساڵیدا کۆتایی پێ دێنن. تەمەنی دەست بەکارکردن لە تورکیادا – ١٢ ساڵە، لە ئێران – ٦ ساڵ، لە عێراق – ١٠ ساڵ، لە هەموو ئەو وولاتانەشدا، لە تەمەنی ٦٤ ساڵیدا، کۆتایی بە کارکردن دەهێنن. بەلام ئەوەی راستی بێ، خەڵکی نە لە کوردستان و نە لەو دەوڵەتانەدا، زۆر گوێ بە یاسای کارکردن نادەن، بەڵکوو لەو رۆژەوە دەست بە کار دەکەن، کە پێیان دەکرێ و درێژەی پێ دەدەن، هەتا ئەو رۆژەی تاقەتیان دەچێ.

رێژەی ئەوانەی تەمەنیان لە نێوان ١٠ – ٦٤ ساڵیدایە، واتا ئەوانەی توانای کارکردنیان هەیە ، لە ساڵی ١٩٨٥دا، لە دەوروبەری ٦٧٪ی گشت دانیشتووانی پێک دەهێنا. ئەمە وا پیشان دەدات، کە کوردستان لە رووی هێزی کارگەرەوە دەوڵەمەندە. بەلام بە داخەوە لە وانە تەنیا ٣٩٪ی دانیشتووانی چالاکی ئابووری پێک دەهێنن. واتا لە پرۆسێسی بەرهەمهێناندا هاوبەشی دەکەن (لە شارەکان – ٣٨٪، لە گوندەکان – ٤٠٪)، لە ٦١٪ەکەی دیکەشی چالاک نەبوون (لە شارەکان – ٦٢٪. لە گوندەکان – ٤٠٪)، واتا لە پرۆسێسی بەرهەمهێناندا هاوبەشی ناکەن، لەبەر ئەوەی یا دەخوێنن، یا دەوڵەمەندن، یا خاوەن موڵکن.

دانیشتووانی چالاکی ئابووری، لە ساڵی ١٩٨٥دا، لە ٨٥٪ی کاریان دەکرد، واتا بەرهەمیان هەبوو (لە شارەکان – ٨٣٪، لە گوندەکان – ٨٧٪). لە ١٥٪ەکەی دیکەشیان بێکار بوون (لە شارەکان – ١٧٪، لە گوندەکان – ١٣٪).

دابەشبوونی دانیشتووانی چالاکی ئابووریی، بەسەر کەرتە جۆراوجۆرەکانی ئابووریدا، لە ساڵی ١٩٨٥دا، بەم جۆرە بوو، کە لە خشتەی ژمارە (١٨) ە گرافی ژمارە (٥) دا هاتووە. بە شیکردنەوەی ژمارەکاندا، ئەم ڕاستییانەی لای خوارەوەمان بۆ دەردەکەوێ:

**خشتەی ١٨ دابەشبوونی دانیشتووانی چالاکی ئابووری بەسەر کەرتەکانی ئابووریدا، ساڵی ١٩٨٥**

| کەرتی ئابووری | ٪ |
|---|---|
| کشتوکاڵ، ڕاوکردن، دارستانداری، ڕاوەماسی | ٥٥,٩ |
| دەرهێنانی کانزا | ٠,٢ |
| پیشەسازی گۆڕین | ٥,٠ |
| ئاو، کارەبا، گاز | ٠,٣ |
| بیناکردن | ٨,٧ |
| فرۆشتنی تاک و جوت، ڕێستۆران، هوتێلداری، بار، گواستنەوە، پەیوەندی عەمبارکردن | ٣,٣ |
| کارەکەری و تەئمین و عەقاری | ٠,٥ |
| خزمەتکردنی گشتی، کۆمەڵایەتی، تایبەتی | ١٩,٣ |
| دابەش نەکراو و نادیار | ٦،٨ |
| کۆ | ١٠٠,٠ |

**گرافی ژماره ٥**



ا – مەیدانی سەرەکی کارکردنی دانیشتووانی چالاکی ئابووری، لە کەرتی یەکەمدا (کشتوکاڵ، ڕاوکردن، داربەخێوکردن و پەروەردەکردنی دارستاناکان، ڕاوەماسی)یە. لەم کەرتەدا، ٥٦٪ی دانیشتووانی چالاکی ئابووری کار دەکەن (لە هەرێمی باکووردا ٧٣٪، لە هەرێمی ڕۆژهەڵاتدا ٣٨٪). هۆکەشی بۆ دواکەوتوویی ئاماری کشتوکاڵ، فراوانی پانتایی زەوییە کشتوکاڵییەکان، لەباری ئاو و هەوا، نەبوونی بواری دیکەی کارکردن لە لقەکانی پیشەسازیی تازەدا، ڕاهاتن و بەرزی داهاتی ساڵانە دەگەڕێتەوە.

ب – کەرتی سێیەم (فرۆشتن بە تاک و بە کۆمەڵ، ڕێستۆران، میوانخانە، بارگواستنەوە، پەیوەندی عەمارکردن، کارکردن لە ماڵاندا، تەئمینی عەقاری و کارکردن لە دوکانەکان و دەزگا تایبەتییەکانی دەوڵەتدا) لە ٣٠٪ دانیشتووانی چالاکی ئابووری بۆ خۆی ڕاکێشاوە، (لە هەرێمی باکووردا – ١٩٪، لە هەرێمی ڕۆژهەڵاتدا – ٤١٪)، هۆکەشی بۆ ئاسانی کارکردن و کەم خوێندن و بێ ئەزموونی و سەربەخۆیی دەگەڕێتەوە.

ج – ڕێژەی ئەوانەی لە کەرتی دووەم (دەرهێنانی کانزاکان، پیشەسازیی گۆڕین، ئاو و کارەبا و گاز، خانوو دروسکردن) کار دەکەن، تەنیا لە ١٤٪ی دانیشتووانی چالاکی ئابووری پێک دەهێنن (لە هەرێمی باکووردا – ٧٪، ، لە هەرێمی ڕۆژهەڵاتدا – ١٦٪). ئەم ڕێژەیە، لەچاو توانای ئابووری ووڵاتدا زۆر کەمە، هۆکەشی بۆ نەبوونی پیشەسازی تازە و ترادیسیای ئابووری دەگەڕێتەوە کە زۆربەی خۆی لە بواری کشتوکاڵدا دەبینێ.

# بەشی سێیەم: پێکهاتەی نەتەوەیی و ئایینی دانیشتووان

## ٠١ پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتووان

کوردستان لە ڕووی پێکهاتەی نەتەوەییەوە، وڵاتێکی یەکجار ئاڵۆزە، کەم نەتەوەی ئاسیا و ئەوروپا هەیە، کە نوێنەریان لەم وڵاتەدا نەبێ، هۆیەکانیشی هەندێکی ئەمانەن:

– هەڵکەوتی جوگرافی: کوردستان وەکوو مەڵبەندێکی ناوەندی ڕێگەی هاتوچۆکەرانی نێوان ئاسیا و ئەوروپا وابووە وایە، هەندێ لەم هاتوچۆکەرانە، لەبەر هۆکانی ئابووریی و کۆمەلایەتیی، تێیدا جێگیر و نیشتەجێ بوون، دابونەریت و شوناسنامەی خۆیان پاراستووە.

– پەنابردن: باری سروشتیی کوردستان لە چیا و دۆڵ و دارستان و ئاو و زەویی کشتوکاڵی... تاد، بۆ خۆشاردنەوە هەڵکەوتێکی زۆر باشی هەیە. ئەم تایبەتمەندییە سروشتییە، لە لایەن نەتەوەکانی ڕۆژهەلاتەوە، ئەوانەی لە ژێر باری چەوساندنەوەی نەتەوەیی و ئایینیدا نالاندویانە، قۆزتراوەتەوە، لە کاتی تەنگانەدا ڕوویان تێ کردووە.

– پاکسازیکردنی کورد: پاکسازیکردنی کورد، پلانێکی داگیرکەرانەی دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریایە و هەمیشە بە بەردەوامی پەیڕەویان کردووە. هەر کاتێک سەرانی ئەو دەوڵەتانە ویستبێتیان، بۆ هەر شوێنێ مەبەستیان بوو بێ، نەتەوەکانی تورک و عەرەب و فارسیان هێناوە و نیشتەجێیان کردوون و کوردیشیان، لەسەر خاکی نیشتمانەکەی خۆی دەرپەڕاندووە و ئاوارە و دەربەدەریان کردوون.

– گۆڕینی داگیرکەر: کوردستان بە درێژایی مێژوو، لە نێوان داگیکەراندا ئەم دەست و ئەو دەستی پێ کراوە، جارێک یۆنانییەکان و جارێکی دیکەش عەرەب فەرمانڕەواییان تێدا کردووە، دەمێ تورکە سەلجوقییەکان و دەمێکی دیکەش مەغۆلەکان دەستیان بەسەردا گرتووە، سەردەمێ تەتەرەکان و سەردەمێکی دیکەش سەفەوییەکان و عوسمانییەکان داگیریان کردووە. دوای کۆتایی پێ هاتنی دەسەلاتی ئەم فەرمانڕەوایانە، هەموویان وڵاتیان چۆڵ کردووە و بەجێ هێشتووە، تەنیا ژمارەیەکی کەمیان ماونەتەوە و بە تەواویی جێگیر بوون و دواتریش بوون بە بەشێک لە دانیشتووانی کوردستان.

دانیشتووانی کوردستان، لە چەندین نەتەوە پێک هاتووە، کە هەر یەکەیان بۆ سەر گروپە زمانێکی جیاواز دەگەڕێنەوە، وەکوو ئێرانی، تورکی، سامی... هتد. لە ڕووی پێکهاتەی ژمارە و ڕێژەیان، بە بەراوردکردن لەگەڵ گشت دانیشتووواندا، بە داخەوە

ناتوانین لەو سەردەمەدا، چەند ژمارەیەک بە ڕەسمی پێش چاو بخەین، بۆ ڕوونکردنەوەی پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتووانی کوردستان، پەنا بۆ بەر خەمڵاندن دەبم. تەماشای خشتەی ژمارە (١٩) و نەخشەی ژمارە (٦) و گرافی ژمارە (٦) بکە.

**خشتەی ١٩**

**پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتووان ١٩٨٥، ١٩٩٥**
**(خامڵاندن)**

| نەتەوە | ١٩٨٥ | | ١٩٩٥ | |
|---|---|---|---|---|
| | هەزار | ٪ | هەزار | ٪ |
| کورد | ١٧٩٢١ | ٧٦,٢ | ٢٣٥٤١ | ٧٥,٩ |
| تورک | ١٢٢٣ | ٥,٢ | ١٦٤٤ | ٥,٣ |
| عارەب | ٨٠٠ | ٣,٤ | ١١١٧ | ٣,٦ |
| عەجەم | ٧٢٩ | ٣,١ | ٩٦١ | ٣,١ |
| فارس | ٦٥٩ | ٢,٨ | ٨٩٩ | ٢,٩ |
| ئاسووری | ٥٤١ | ٢,٣ | ٦٨٢ | ٢,٢ |
| ئەرمەن | ٣٥٣ | ١,٥ | ٤٦٥ | ١,٥ |
| تورکمان | ٣٢٩ | ١,٤ | ٤٣٤ | ١,٤ |
| نەتەوەی دیکە | ٩٦٤ | ٤,١ | ١٢٧٢ | ٤,١ |
| کۆ | ٢٣٥١٩ | ١٠٠,٠ | ٣١٠١٥ | ١٠٠,٠ |

## نەخشەی ٦


1 : 2 000 000
کورد
فارس
کورد–فارس
عارەب
ئاسووری
کورد–عارەب
تورک
عەجەم
قەشقایی
تورکمان
کورد–تورک
کورد–فارس–عەجەم
کورد–ڕووس–عەجەم
ئاشووری–تورک
کەم دانیشتوان
پێکهاتەی نەتەوەیی، ١٩٨٥
نەخشەی ٦

**گرافی ٦**


کورد
تورک
عارەب
عەجەم
فارس
ئاسوری
ئەرمەن
تورکمان
نەتەوەی دیکە
پێکهاتەی نەتەوەیی

### کورد

کورد واتە کرمانج و لوڕ (لوڕ، بەختیاری، کوهگیلویە، مەمەسەنی) و کەلهوڕ و گۆران بە گەورەترین نەتەوە دادەنرێ، ڕێژەکەی لە ساڵی ١٩٩٥دا، نزیکەی ٧٦٪ی گشت دانیشتووانی کوردستان بوو. بۆ بەراوردکردن دەتوانین ئەم ژمارانە نیشان بدەین: ڕێژەی تورک لە تورکیا لە ساڵی ١٩٨٥دا – ٦٩٪ بوو. ڕێژەی فارس لە ئێراندا لە ساڵی ١٩٨٦دا – ٥٤٪ بوو. ڕێژەی عەرەب لە عێراقدا لە ساڵی ١٩٨٧دا – ٧٣٪ بوو. ڕێژەی عەرەب لە سووریا لە ساڵی ١٩٨٠دا – ٨٦٪ بوو.

ڕێژەی کورد لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٥ – ١٩٩٥دا، لەبەر ڕەوکردن بۆ دەرەوە و نکولیکردن لە بوونی کورد و خۆتۆمارکردن بە نەتەوە سەردەستەکان (تورک و عەرەب و فارس) و لەبیرچوونەوەی زمانی دایک و فێرنەبوونی و دانانی زمان بە بنەما و نیشانەکانی نەتەوەیی، کەمێکی کەم کردووە.

پارێزگاکانی کوردستان، لە ڕووی ڕێژەی کوردەوە بۆ گشت دانیشتووان، وەکوو یەک نین. لە ساڵی ١٩٨٥دا، ئەم یەکە ئیداریانە بەم شێوەیە ڕێزیان بەستبوو: سلێمانی ــ ٩٤٪، بەختیاری ــ ٨٨٪، هەولێر ــ ٨٦٪، ئیلام ــ ٨٥٪، کوردستان ــ ٨٥٪، کوهیگیلویە ــ ٨٤٪، هەکاری ــ ٨٤٪، کرماشان ــ ٨٣٪، لوڕستان ــ ٧٨٪، سیرت ــ ٧٨٪، دهۆک ــ ٧٦٪، بدلیس ــ ٧٥٪، ماردین ــ ٧١٪، دیاربەکر ــ ٧١٪، وان ــ ٧١٪، ئاگری ــ ٦٩٪، دەرسیم (تونجەلی) ــ ٦٧٪، بینگۆڵ ــ ٦٥٪، ئورفە ــ ٤٨٪، ئادیەمان ــ ٤٦٪، ئەلازیغ ــ ٣٩٪، کەرکووک ــ ٣٨٪، ئازەربایجانی غەربی ــ ٣٤٪، ئەرزنجان ــ ٣٣٪، مەلاتیە ــ ٢٥٪، موش ــ ١٥٪، ئەرزەڕۆم ــ ١٣٪، موسڵ ١٣٪، گازی ئانتەب ــ ١٠٪، مەرعەش ــ ٩٪.

### تورک

دووەمین گرووپی ئیتنی، لە ڕووی ژمارە و ڕێژەیان بۆ گشت دانیشتووانی کوردستان، کەمەنەتەوەیی تورکە. مێژووی پەیدابوونیان، بۆ پێش چەند سەدەیەک لەمەوبەر دەگەڕێتەوە. بە بۆچوونی هەندێ لە نووسەران، تورک بە ڕەچەڵەک بۆ سەر تیرەی ئۆغز و سەلجوقییەکان دەگەڕێنەوە، وەکوو نەتەوەش کە دروست بوو بن، بۆ سەدەی دەیەم دەگەڕێنەوە. بەڵام ئەم بۆچوونە، لای هەندێ لە نووسەرانی دیکە پەسەند نییە، چونکە تیرەکانی ئۆغوز، لە ماوەی چەند سەد ساڵێکدا، لەگەڵ تیرەکانی دەوروبەریدا تێکەڵاویان بووە، وەکوو کورد، یۆنانی، ئەرمەن، گورجی،، عەرەب، ئاسووری و هەندێکی دیکەش.

پەیوەندی ئۆغزەکان لەگەڵ دراوسێکانیاندا، لە هەموو سەردەمەکاندا باش نەبووە. بە بەردەوامی لەگەڵیاندا تووشی هەراوئاژاوە و جەنگ بوون.لەو جارانەی کە سەرکەوتوون، ژمارەیەکی زۆریان لە خەڵکی ئەو نەتەوانە بە دیل گرتووە. ئەوانیش لە ترسان بوون بە ئیسلام. لە دواییشدا بە تەواویی تێکەڵ بە تورک بوون، بۆیە بۆمان هەیە بڵێین: تورکەکانی ئێستا، لە بەرهەمی ئەو تێکەڵاوبوونە پێک هاتوون، کە لە نێوان تورک و نەتەوەکانی دیکەدا ڕوویان داوە (٥٩). ئەو نەتەوەیە بەرە بەرە قاڵبی نەتەوایەتی خۆی گرتووە تا لەم دوو سەد ساڵەی دواییدا، نەتەوەی تورکی ئەم سەردەمە پەیدا بووە.

ووشەی تورک، وا دیارە تا سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم، تەنیا بە جووتیارەکانی ئاسیای گچکە گوتراوە، کاربەدەستانیش بە خۆیان دەگووت عوسمانی، ئەم نازناوەشیان لە باپیرە گەورەکەیانەوە وەرگرتووە. بەڵام ئەم ووشەیە لە دواییدا پەرەی سەند و بەو شێوە کۆنەی پێشووی نەما، هەتا وای لێ هات، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، زاراوەی تورک بە هەموو ئەو کەسانە بوترێ، کە بە ڕەچەڵەک تورک بوون.

بەرزترین ڕێژەی تورک لە ساڵی ١٩٨٥دا، لە پارێزگای گازی ئانتەب بوو (٩٠٪). یەکە ئیدارییەکانی دیکەش بەو جۆرە ڕیزیان بەستووە: مەرعەش ــ ٨٩٪، ئەرزەڕۆم ــ ٨٦٪، موش ــ ٨٣٪، مەلاتیە ــ ٦٨٪، ئەرزنجان ــ ٦٣٪، ئەلازیغ ــ ٥٩٪، ئادیەمان ــ ٤٧٪، ئورفە ــ ٣٧٪، بینگۆڵ ــ ٣٠٪، ئاگری ــ ٢٩٪، وان ــ ٢٨٪، دیاربەکر ــ ٢٧٪، دەرسیم ــ ٢١٪، ماردین ــ ٢٠٪، بدلیس ــ ٢٠٪، هەکاری ــ ١١٪، سیرت ــ ٧٪.

## عەرەب

عەرەب بە ژمارە و ڕێژەیان لە نێو دانیشتوواندا، لە دوای کەمەنەتەوەیی تورکەوە دێن. پەیدابوونیان بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەمی زایینی دەگەڕێتەوە. عەرەب لە بنەڕەتدا، دانیشتووی نیمچەدوورگەی عەربین.لە دوای پەیدابوونی ئیسلام و بڵاوبوونەوەی لە نێوچەکەدا، بە هەمووووڵاتانی نێوچەکەدا بڵاو بوونەوە.

ڕێژەی عەرەب لە ماوەی دە ساڵی ڕابردوودا، کەمێکی زیاد کردووە، هۆیەکەشی بۆ پەیڕەوکردنی بەرنامەی بە عەرەبکردنی هەندێ نێوچە دەگەڕێتەوە، بەتایبەتی لە باشووردا.

ڕێژەی عەرەب لە ساڵی ١٩٨٥دا، لە نێو دانیشتووانی پارێزگای موسڵدا٨٥٪ بوو، کە لە ڕێژەی گشت پارێزگاکانی دیکە زیاترە. لە پارێزگاکانی دیکەدا بەم شێوەیە بوو: کەرکووک ــ ٤٤٪، دهۆک ــ ١٩٪، ئورفە ــ ١٥٪، سیرت ــ ١٤٪، هەولێر ــ ١٠٪، دیاربەکر ــ ١٪.

### عەجەم

عەجەم بەشێ لە دانیشتووان پێک دێن، بەڵام بە بەراوردکردن لەگەڵ ڕێژەی گشتیی دانیشتوواندا، ڕێژەیان لە ڕێژەی تورک و عەرەب کەمترە.

هەتاکوو ئێستا، دەربارەی ڕەچەڵەکی عەجەم، شتێ بۆ مێژوونووسان و لێکۆڵەرەوەکان بە تەواویی یەکلایی نەبۆتەوە. بە بۆچوونی هەندێ لە نووسەران، بۆ سەر هەمان ڕەگەزی تورک دەگەڕێنەوە. ئەم ڕایەش لای خۆیان زۆر باوە و بە بەردەوامیش هەوڵی چەسپاندنی دەدەن.

لە ڕووی ڕێژەی عەجەم لە پارێزگاکاندا، بۆ گشت دانیشتووان، لە ساڵی ١٩٨٥دا، بەم شێوەیە بوو: ئازەربایجانی غەربی ــ ٥٦٪، کرماشان ــ ٥٪، لوڕستان ــ ٣٪، کوردستان ــ ٢٪.

### فارس

فارس لە ڕووی ژمارە و ڕێژەوە، دوای عەجەمەکان دێن. بە زۆری لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا دەژین. ڕێژەیان لە هەموو پارێزگاکاندا، لە ١٥٪ی گشت دانیشتووان کەمترن. لە ساڵی ١٩٨٥دا، پارێزگاکان بەم شێوەیەی لای خوارەوە، یەک لە دوای یەک دەهاتن:

لوڕستان ــ ١٥٪، ئیلام ــ ١٣٪، کوهگیلویە ــ ١٢٪، کرماشان ــ ١٢٪، بەختیاری ــ ١١٪، کوردستان ــ ١٠٪، ئازەربایجانی غەربی ــ ٨٪.

### ئاسووری (سورایا)

مەبەسمان لە زاراوەی ئاسووری، لەو دیانانەن کە خۆیان بە ئاسووری، کلدانی، یاقوبی دەزانن. بە لای یەکەمیانەوە، جیاوازی نەتەوەیی لە نێوان ئەو سێ دەستەیەدا نییە، هەموویان بە ئاشووری دادەنرێن. بەڵام کلدانییەکان و یاقوبییەکان، ئەم بۆچوونەیان لا پەسەند نییە، بەڵکوو خۆیان بە نەتەوەیەکی سەربەخۆ دادەنێن، با لەگەڵ ئاسووریەکانیشدا، لە زۆر ڕووەوە لە ئاینەکەیاندا هاوبەش بن.

بۆ ساغکردنەوەی ڕەچەڵەکی ئاسوورییەکان، کێشە و باسی زۆر لەسەرە. هەندێک پێیان وایە، ئاسوورییەکانی ئەوڕۆ لە نەوەی ئاشوورییەکانی سەر بە نێوچەی موسڵن، کە لە کاتی خۆیدا میدییەکان (مادەکان) لە ساڵی ٦١٢ی پێش زایینیدا، موسڵیان داگیر کرد و ئیمپراتۆرییەتەکەیان تێک دا و خەڵکێکی زۆریان لێ کوشتن. ئەوانەی لەم کوشتارە خۆیان

ڕزگار کرد، ڕوویان له چیاکان کرد و خۆیان شاردەوە، بەو شێوەیە خۆیان لە دەست مردن قوتار کرد. بەڵگەشیان بۆ ئەم بۆچوونەش ئەوەیە، کە هەردوو زاراوەی (ئاشووری) و (ئاسووری) زۆر لە یەکدیەوە نزیکن. ئەوڕۆش ئاسوورییەکان هەوڵی چەسپاندنی ئەو بیرورایە دەدەن. بەڵام هەندێ سەرچاوە و ژمارەیەک لە نووسەران، ئەو بۆچوونەیان لا ڕاست نییە و پێ لەسەر ئەوە دادەگرن، کە هیچ پەیوەندییەک لە نێوان ئاشوورییەکان و ئاسوورییەکاندا نییە، تەنانەت یەکێ لە نووسەرەکان دەڵێ: (لە ڕاستیدا، ئاسوورییەکان کۆمەڵێکی ئەتنۆگرافین، زیاتر لەوەی کۆمەڵێکی ئەتنۆلۆژی بن. لە تێکەڵاوبوونی چەند نەتەوەیەک پێک هاتوون، کە لە سەردەمی خۆیدا لە نێوچەی موسڵدا ژیاون، بە زمانی سریانی قسەیان کردووە و بە ئایینیش سەر بە دیانەکان بوون) (٢٤).

بە بۆچوونی هەندێ نووسەری دیکە، بەشێ لە ئاسوورییەکانی ئەوڕۆ، ئەو کوردانەن کە کاتی خۆی چوونەتە سەر ئایینی دیانەکان. لەو بارەیەوە نووسەرێ دەڵێ: (ڕاست نییە، ناوی ئاسووری لە تەیاریەکانی دانیشتووانی چیاکانی هەکاری بنێین، ئەوان بە ڕەچەڵەک کوردن و هیچ پەیوەندییەکیان بە ئاشوورییەکانەوە نییە.) (٢٥).

## ئەرمەن

ئەرمەن ئەو نەتەوەیەیە، کە زۆر لە کۆنەوە نەتەوەی کورد لەگەڵی تێکەڵاو بووە و لە زۆر نێوچەی کوردستاندا پێکەوە ژیاون. ئەوڕۆ ڕێژەیان لە ٥ ,١٪ی گشت دانیشتووانی هیچ یەکێ لەو یەکە ئیداریانەی کوردستاندا، زیاتر پێک ناهێنن.

ئەرمەن لە لای هەندێ لە شارەزایانی مێژوو، بە نەوەی بەختیاکان دادەنرێن و باپیرە گەورەیان لە پشتی سێزدەیەمی ئیمپراتۆرییەتی فارس بووە. بە قسەی دەستەیەکی دیکە لە نووسەران، دەبێ ئەرمەن لە هەمان گروپی چەرکەس و گورجی بن.

ئەوڕۆ ئەرمەنەکان بە خۆیان دەڵێن، "های" و وولاتەکەیان بە: هایستان ناو دەبەن، کە بەپێی هەندێ لە ئەفسانە کۆنەکانی خۆیان، لە ناوی "هایک" ەوە هاتووە، کە یەکەمین پاشای ئەو نەتەوەیە و هەمان کەس بووە، کە لە ساڵی ٢٢٠٠ی پێش زایینندا، شاری هایکاشی (هایک) دروست کردووە، یەکەمین پایتەختی ئەرمەن، ئەو شارە بووە.

### تورکمان

تورکمـان ژمـارەیەکی کـەم لە دانیشـتووانی کوردسـتـان پێک دەهێن. تـاکوو ئێسـتـا دەربارەی ڕەچـەڵەکـیـان بـە تەواویی ڕوون نـەبۆتـەوە. بە بیـروڕای هـەندێ لە نووسـەران، تورکمـانەکان دەبێ لە نەوەی ئەو سـەربازانە بن، کە عـوسـمـانییەکان لەشکریان لێ دروست کرد بوون و بۆ سـەندنەوەی عێراق لە دەست سەفـەوییەکـان هێنابوویان. هـەندێکی دیکە لەو بڕوایەدان، کە ئەو کەسـانەن لە کاتی خـۆیدا لە سـەردەمی ئیمـپراتۆرییـەتی عوسـمـانیدا، لە کـوردسـتـان فـەرمـانبـەر بوون، هـەر کـەسـێکیش بیـەوێ ببـێ بە فـەرمـانبـەر، دەبێ تورکی بزانێت. لە دوای ڕوخـاندنی ئیمپراتۆرییەتەکەش، هـەر مایەوە و بە تورکمان ناویان دەرکرد.

## ۰۲ پێکهاتەی ئایینی دانیشتووان

پێکـهاتەی ئـایینی، هـەر وەکـوو پێـکهـاتـەی نەتەوەیی گـەلێ ئاڵۆزە... جگە لە ژمـارەیەک ڕێبـازی جـیاجـیـای سـۆفـیگەرێتی، پەیرەوکـەرانی زۆربەی ئاینە ڕۆژهـەڵاتییـەکـانی تێدایە. ئەوەی لێرەدا پێـویسـتـە بەرچاوی بخـەین، نەبوونی ژمـارەی تازە و سـەرژمـێرێکی تەواوی نەک هـەر یـەکێ لەو ئایینزایانەدا، بەڵکوو بۆ ئایینـە سـەرەکـییـەکـانیش، ئـەمـەش زیـاتر بۆ بڵاونەکردنەوەی ئامـاری پێکهاتنی ئایینی دانیـشتـووان دەگـەڕێتەوە. لە دوای شـەسـتـەکـان ژمـاردنی پەیرەوانـی هـەندێ ئایینـی خـۆجـێـیی بە ئـیسـلام ئاشکرا نەکـردنی بڕوای دڵ و دەروون، لە ترسـی ئـازار و ئەشکەنجـە. بـە شـێـوەیەکی گشـتی لە کوردسـتـاندا، ئەم چەند ئایینـانە هـەن. لە لاپەڕەکـانی داهـاتوودا، بـە گوێرەی سـەردەمی پەیدابوونیـان، باسـی هـەر یەکێ لەو ئایینانە دەکەین و ڕیزیان دەکەین.

### زەردەشتی

بە کۆنترین ئایین لە کوردستاندا دادەنرێ. سـەرەتای پەیدابوونی بۆ چەند سـەدەیە پێش زایین دەگـەڕێتـەوە. ڕابەرەکـەی مرۆڤێکی مـەزنی سـەردەمی خـۆی بووە، لە دایک و باوکێک بووە، کە ناویان دوغز و پاوڕست بووە.

زەردەشت هـەر لە منداڵییەوە، نیشانـەی بلیـمەتی پێوە دیار بووە، کاری وای کردووە، بە شێوەیە جادوگـەرەکانی ئەو سەردەمە، سـەریان سـوڕ بمێنێ و بە تەواوی بیر لە لەنێوبردنی بکەنەوە. ژیانی ئـایینی زەردەشت، لە ۳۰ سـاڵی تەمـەنییـەوە دەسـتی پێ کردووە. پێش ئەو تەمـەنەی بە ۱۰ سـاڵ، خـۆی لە خـەڵکی دوور خـسـتـۆتەوە، خـەریکی ئەشکەنجـەی دەروونی خـۆی بوو. لە پاشـاندا لە گوێـی کەناری ڕووباری (دایئـئی پا)، کـە هـەندێ کـەس بە ئاوی

(ئاراس)ی دادەنێن، خـەڵکی بۆ سـەر ئاینەکـەی خـۆی بانگ کـردووە. دوای ئەوەی ناو و ناوبانگی دەرکـردووە، خـەڵکی بڕوایان پێ کـردووە، #جـاودایی پیـرۆز" ی بۆ ئـاهۆرامـزدا بردووە، دواتریش هەر لەسەر کارەکان و بانگەوازەکانی خۆی بەردەوام بووە، بە تایبەتی لە نێو کۆمـەڵانی خـەڵکی توران و کسلستاندا، بەڵام وا دیارە ئەم کارەی بۆ نەچوبێتە سـەر، چونکە موغەکانی ڕێگەیان پێ گرتووە.

ئاهۆرامـزدا لەسـەر زەردەشت دەکـات،. دوای ئەوەی لە نێـو خـەڵکیـدا سـەرکـەوتنی بە دەست نەهێنا، پەنا بۆ بەر #گشـتاسب" پاشـای باختـەر ببا، ئەویش لە قسـەی دەرنەچووە، هەرچەندە پاشـا پاش دوو سـاڵ، ئایینەکەی زەردەشت پەسـەند دەکا، ئیدی بە بڕواهێنانی پاشا، هەموو لایەک بڕوایان بە زەردەشت هێناوە و بوون بە زەردەشتی.

گشـتاسب ڕۆڵێکی گەورەی لە بڵاوکردنەوەی ئایینی زەردەشتیدا، لە نێو خەڵکی توران و کـوردسـتـان و ئاسـیـای پـچـووکـدا، وازی کـردووە. زەردەشت لەسـەر بڵاوکـردنەوەی ئایینەکـەی خـۆی بـەردەوام بووە، تا بە دەسـتی ئەرجـاسب، سـەرلەشکری نەتەوەی هیـون کوژراوە.

بە گوێرەی ئایینی زەردەشتی، دەبێ جیهـان لە ڕووناکی و تاریکی پێک هاتبێ. ئەو دوو هێـزە بە بەردەوامـی لەگـەڵ یەکدیدا لە شـەڕدان و جـیـهـانـیـان لـە نێـوان خـۆیـاندا دابەش کـردووە. بەشـی یـەکـەمـیـان کـە ڕابـەرەکـەی ئاهۆرامـزدایە، بە دەست ڕووناکـیـیـە. بەشـی دووەمـیان کـە ئەهریمەن پێشـرەوایەتی دەکات، لە ژێر دەسـەڵاتی تاریکی دایە. ئاهۆرامزدا حەوت فریشتەی هەیە، ئەهریمەنیش تەنیا سێ فریشتەی هەیە.

گیـان لە ئایینی زەردەشتدا، لە ناو ناچێ و دوای مردن، بۆ مـاوەی سێ ڕۆژ، هەست بە خـۆشی و ناخـۆشی دەکات. لە دواییدا بەرەو ڕووی دادگا و لێپرسینەوە دەبێتـەوە و لەبەر دەم سێ قـازیدا دادگـایی دەکـرێ. لەو دادگـایـەداچاکە و خـراپەی دەخـرێتـە تەرازووەوە و بڕیاری لـەسـەر دەدرێ. بۆ ئـەوەی گیـان بە بەرزترین پلە و شـێوە بگـات، دەبێ بە قـۆناغی (**بیری چاک و ووتەی چاک و کردەوەی چاک**) دا تێپەڕ ببێ.

ئەهریمەن، بە بەردەوامـی لەگەڵ ئـاهۆرامـزدادا لە شـەڕ دایە و خەڵکی لە ڕێگەی ڕاست دوور دەخـــاتەوە. بـەڵام هـەرچەند درێژە بەو کــارە بدات، لە ئەنجــامــدا هـەر دەبـەزێ و لە کۆتاییدا سەرکەوتن هـەر بۆ ئاهۆرامز دەمێنێتەوە.

ئەوڕۆ زەردەشـتییـەکان، کـەمتر لە ١٪ی ژمارەی دانیشـتووانی هەموو کـوردسـتـان پێک دەهێنن، زۆربەشیان لە پارێزگاکانی ئازەربایجانی غەربی و کرماشـان دەژین.

**ئایینی جوو**

موسا پێغەمبەر، لە چەرخی ١٤ێ پێش زایینەوە، لە نێو خەڵکی ئۆرشەلیم و شارەکانی دیکەی دەوروبەریدا، دەستی بە بڵاوکردنەوەی ئایینەکەی خۆی کردووە. نەبوخودنەسر لە ساڵی ٥٨٧ی زایینیدا، کۆمەڵێکی لە جووەکانی ئۆرشەلیم بە دیل گرتووە و هەمووشیانی هێناوە بۆ بابل. وا دیارە ژمارەیەکیش لەو دیلانە، پەڕیونەتە کوردستان.

جووەکانی کوردستان، لەسەر ئایینزای ئەشکەندی و سەفاری و کارایمەیی و دنیمەیی... هتد بوون. دنیمەییەکان (جولەکایەتی بە نهێنی) لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەدا بوون بە ئیسلام. بەشێکیان بە تورکی و بەشەکەی دیکەشیان بە ئیسپانولی ئاخافتن دەکەن.

جووەکان لەبەر ئەوەی کۆچیان بۆ ئیسرایل و ئەورووپا کردووە، ژمارەیان لە کوردستاندا زۆر کەمە. ئەوانەشی کۆچیان نەکردووە و ماونەتەوە، زۆربەیان لە خوڕەم ئاباد و کرماشان دەژین.

**دیانەکان**

پێغەمبەری دیانەکان، ناوی عیسا کوڕی مریەمە، لە شاری بەیتوللەحم لە دایک بووە.عیسا نزیکەی ٣٣ ساڵ ژیاوە. دوای ئەوەی بووە بە پێغەمبەر، لە ڕێگەی حەوارییەکانەوە، دەستی بە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ئایینی خۆی کردووە. شاری ئورفە (ڕوها)، بە بنکەی یەکەمی بڵاوکردنەوەی ئایینی دیان دادەنرێ، یەکەمین کڵێسە لە چەرخی یەکەمی زایینیدا، هەر لەوێ دروست کراوە. پاشان ئایینی دیان بەرە بەرە بە نێوچەکانی دیکەی کوردستاندا بڵاو بۆتەوە، هەروەها وردە وردە بۆ شارەکانی میسۆپۆتامیا (نێوان دوو زێ) و ئێران و خۆراسانیش تەنیوەتەوە ( سوودم زۆر لە سەرچاوەی ژمارە ٦٠بینیوە).

پەرتوکی پیرۆزی دیانەکان، ناوی ئینجیلە، واتا (مزگێنی)، کە لە ئامۆژگارییەکان و دەستوورەکان و مێژووی عیسا کوڕی مریەم و باسی تەورات پێک هاتووە. خەلیفەکانی عیسا لە چەرخی یەکەمی زایینیدا، دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی ئینجیل و هەموویان نووسییەوە. ئەوڕۆ چوار جۆر ئینجیل هەیە: ئینجیلی لۆقا، مەرقۆس، مەتی و یۆحەنا.

ژمارەی دیانەکان لە ساڵی ١٩٨٥دا، دەوروبەری ٢٠٪ گشت دانیشتووان بوو، زۆربەیان لە باکوور و باکووری ڕۆژهەڵات دەژین و بەشێکی کەمیشیان لە شارە گەورەکانی باشوور و ڕۆژئاوای کوردستان دەژین.

دیانەکانی کوردستان، زۆربەیان ئارسۆدۆکسین و یەک خودا (مۆنۆفیس)ین، بەشەکەی دیکەیان لەسەر ئایینزاکانی کڵێسەی ڕۆژهەڵاتین و سەر بە کڵێسەی ڕۆمای کاسۆلیکە (ئوونیاتەکان) و نەستۆری و کاسۆلیکی و پرۆتستانتی و ئینجیلکانی و... هتد.

### ١/ ئارسۆدۆکس

بەشی هەرە زۆری ئارسۆدۆکسەکانی کوردستان، سەر بە کڵێسەی قوستەنتەنییەن. ئەو کڵێسەیە، لە هەموو کڵێسەکانی دیکەی جیهانی دیانەکان، بە ناوبانگتر و دەوڵەمەندترە، ڕۆژ بە ڕۆژیش لە پێشکەوتن دایە. تا ڕادەیەکی زۆر کاردیناڵەکانی، بە گەورەی کاردیناڵەکانی کڵێسەکانی ئەسکەندەرییە و ئەنتاکییە و ئۆرشەلیم دادەنرێ. کڵێسەی ئارسۆدۆکس، لە هەموو کاتێکدا، دەستێکی باڵای لە دامەزراندنی ئمپراتۆری بێزەنتییەدا هەبووە، لە ڕووی دەسەڵات و خاوەندارێتی زەویوزارەوە، لە سنووری ئیمپراتۆرییەتەکەدا، کڵێسەی ئارسۆدۆکس بە گەورەترین دەزگا دادەنرا.

دیانەکانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆما، لە ساڵی ١٠٥٤ی زایینیدا، لەسەر کێشەی لێکدانەوەی ئینجیل و هەڵوێستیان بەرانبەر حەزرەتی عیسا، لێک جیا بوونەوە. ئەوانەی ڕۆژهەڵات بە ناوی کڵێسەی کاسۆلیکی - گریگۆری ناویان دەرکرد. ئەوانەی ڕۆژئاواش لە ژێر ناوی کاسۆلیکی ڕۆمیدا کاریان دەکرد. لە ئەنجامی ئەو دووبەرەکی و ناکۆکییەشدا، ئیمپراتۆرییەتەکەش بوو بە دوو بەشەوە: ئیمپراتۆرییەتی ڕۆژهەڵات بە ناوی بێزەنتییەوە، ئیمپراتۆرییەتی ڕۆژئاوا بە ناوی ڕۆماوە.

ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتی، لەسەردەمی خاچهەڵگرەکاندا، واتە لە کۆتایی چەرخی ١١ هەتا سەرەتای چەرخی ١٣، تووشی گەلێ جەنگی گەورە بوو. لە ڕۆژئاوا کاسۆلیکەکانی ڕۆما، هێرشیان دەکردنە سەر، لە ڕۆژهەڵاتیشەوە خێڵە سەلجوقییەکان، کە تازە ئیسلام بوو بوون، پەلاماریان دەدان، کە ئەو خێڵانە، تا کۆتایی چەرخی یازدەیەم توانیان، هەموو ئاسیای پچووک داگیر بکەن، کە دانیشتووانی ئەو نێوچانە، بە زۆری لایەنگری کڵێسەی کاسۆلیکی گریگۆری و هەندێ ئایینزای دیکەبوون. دواتر بەشی هەرە زۆریان، لەبەر ترس و لە ناچاریدا، لە ماوەی چەرخی یازدە و سیازدەدا، وازیان لە بیروباوەڕی ئایینی خۆیان هێنا و بوون بە ئیسلام و زمانی تورکیش بوو بە زمانی زۆربەیان.

تاکوو ئێستا، ژمارەی ئارسۆدۆکسەکانی کوردستان بە تەواویی نەزاندراوە، بەڵام هەرچی چۆنێ بێ، لە چەند هەزار کەسێ زیاتر تێپەڕ ناکەن و بە زۆریش لە باکووری

ڕۆژئاوای کوردستاندا دەژین، لە دەوروبەری کەنداوی ئەسکەندەرون و هەندێ لە ئاوەدانییەکانی دیکەی وەکوو قامیشلی... تاد.

**٢/ یەک خودا (مۆنۆفیس)**

ژمارەیەکی زۆر لە دیانەکانی کوردستان، سەر بە ئایینزای یەک خودان. لەوانەیە ژمارەکەیان دوو ئەوەندەی ژمارەی ئارسۆدۆکسەکان ببێ. یەک خوداییەکان، سەر بە دوو کڵێسەن:

ا – ئەرمەنی – گریگۆریی

پەیدابوونی ئەم ئایینزایە، بۆ چەرخی یازدەیەمی زایینی و چەرخەکانی دوایی دەگەڕێتەوە. ئەم ئایینزایە بە زۆری لە نێوچەکانی باکووری کوردستاندا بڵاو بۆتەوە و لە چەرخی حەڤدەدا بووە بە ئایینی ڕەسمی.

ژمارەی ئەرمەنییە گریگۆرییەکان، چەند هەزار کەسێک دەبن و بە زۆری لە ئەرزەڕۆم و ئەرزنجان و وان و بینگۆڵ و موسڵ و هەولێر و ورمێ دەژین.

ب – سوریانی – ئارسۆدۆکس (یەعقوبییەکان)

ئەمانەش دووەمین گرووپی ئایینزای یەک خودا پێک دەهێنن. بە زۆری لە نێوچەکانی باکووری کوردستان دەژین، بە تایبەتی لە شارەکانی ماردین و دیاربەکر و گازی ئانتەب و مەلاتییە... هتد. یەعقوبییەکان زۆربەیان لە دانیشتووانی شارەکانن. تاکوو ئێستا بە تەواویی ژمارەیان نازاندرێ، بەڵام لەوانەیە دەوروبەری چل هەزار کەسێ بن.

یەعقوبییەکان لە کوردستاندا، سەر بە سێ ئەبریشەن (ماردین، میدیات، ئورفە و دیاربەکر). هەر یەکێ لەوانە مەترانی تایبەتی خۆیان هەیە. ئەمانەش هەر سێکیان لە ڕووی ئیدارییەوە، سەر بە مەترانی یەعقوبییەکانن، کە لە دیمشق دادەنیشێ. ئەو مەترانە لە ماردینەوە چووە بۆ ئەوێ. ئەورۆ ژمارەیەک لە مەناستیری یەعقوبییەکان کار دەکەن، وەک بەرسوماس و زافازان لە ماردین.

### ٣/ ئوونیاتی

ئوونیاتی یا دیانەکانی سەر بە ئایینزای کڵێسەی ڕۆژهەڵاتی سەر بە کڵێسەی ڕۆمای کاسۆلیکی، لە کوردستاندا لە چوار تایەفە پێک هاتوون:

ئەرمەنی کاسۆلیکی، کلدان، کاسۆلیکی گریگۆری و کاسۆلیکی سوریانی. ئەمانە هەموویان بە تێکڕایی، نزیکەی لە ٧٠٪ی هەموو دیانەکانی کوردستان دەبن و بە زۆری لە شارە گەورەکاندا دەژین.

### ئەرمەنی کاسۆلیکی:

ئەرمەنە کاسۆلیکەکان، نزیکەی لە ٢٠٪ گشت ئەرمەنەکانی کوردستان دەبن. لە ڕووی ئیدارەی کڵێسەییەوە، ئەو تایەفە ئەرمەنانە سەر بە چەند ئەبرەشیەن و لە هەمووشیان بە ناوبانگتر، ئەسقۆفیای ماردینە، کە لە ساڵی ١٧٠٨ی زایینیدا دامەزراوە. واتا کۆنترین ئەبرەشییەی ئەرمەنە کاسۆلیکەکانە. ئەم تایەفەیە، ژمارەیەکی زۆر لە کڵێسە و خوێندنگا و نەخۆشخانە و مەنەستیرییان، لە زۆر جێگەی کوردستاندا هەیە.

### کلدان:

دووەمین تایەفەی ئوونیاتی کلدانەکانن. کڵێسەی ئەو تایەفەیە، لە ئەنجامی تێکچوونی کڵێسەی نەستۆرییەکاندا، لە چەرخی حەڤدەی زایینیدا دروست کراوە. ژمارەی کلدانەکان بە تەواویی لەبەر دەستدا نییە، بەڵام نزیکەی شەست هەزار کەسێک دەبن. هەتا جەنگی یەکەمی جیهانی بە زۆریی لە باکووری کوردستاندا دەژیان. بەڵام لە کاتی جەنگەکەدا و لە دوای جەنگەکە، ڕوویان لە نێوچەکانی دیکەی کوردستان کرد، وەکوو شارەکانی مەسڵ و هەولێر و کەرکووک. لە کوردستاندا چەند ئەبرەشییەکیان هەیە: دیاربەکر ، کە لە ساڵی ١٥٥٣ی زایینیدا دروست کراوە، ماردین کە لە هەمان ساڵدا دروست کراوە. سیرت کە لە ساڵی ١٨٥٨دا دروست کراوە. بەڵام ئەوڕۆ تەنیا یەکەمیان کار دەکا.

### سووریانی - کاسۆلیکی (سووریانی)

ئەوڕۆ چەند هەزار سووریانییەک لە کوردستاندا دەژین. بە زۆری لە نێوچەکانی ماردین و دیاربەکر لەو دوو شارە ئەبرەشییەیان هەیە، لە ڕووی ئیدارییەوە سەر بە ئەبرەشییەی دیمشقن.

**گریگۆری کاسۆلیکی**

ژمارەیەکی زۆر کەم لە دیانەکانی کوردستان، لەسەر ئەم ئایینزایەن. تاکوو ئێستا ژمارەیان بە تەواویی نازاندرێ. بەڵام هەر دەوروبەری هەزار کەسێک دەبن.

**٤/ کاسۆلیک**

بزووتنەوەی کاسۆلیکەکان لە کوردستاندا، بۆ سەردەمی خاچهەڵگرەکان دەگەڕێتەوە. لە نێوان ساڵەکانی ١٠٩٨ هەتا ١٢٦٨ی زایینی، میرنشینییەکیان لە شاری گازی ئانتەب دروست کرد. قەشەکانیان کە لە کاتی خۆیدا، لەگەڵ شا ڕیچاردا بۆ ئەو نێوچەیە هاتبوون، زەویوزارێکی زۆریان پێ درا و ژمارەیەکی زۆر لە وەرزێرەکان کاریان تێدا دەکرد. ژمارەی کاسۆلیکەکان لە کوردستاندا، لە چەند هەزار کەسێ زیاتر تێپەڕ ناکەن.

**٥/ پرۆتستانت**

ڕێژەی پرۆتستانتەکان، لەوانەیە لە ١٪ی گشت دیانەکانی کوردستان بن. ژمارەیان لە زیادبوون دایە. زۆربەشیان ئەوروپایین و بە شێکیشیان ئەرمەن و ئاسوور و عەرەبن. زۆربەی پرۆتستانتەکان لە شارە گەورەکان دەژین. ئەم تایەفەیە ژمارەیەکیان لە بنکەی میسۆنێریان هەیە، وەک بۆ سەری و ئینگلیزی... تاد.

میسیۆنێرەکان ١٥٠ ساڵ لەمەوبەر لە کوردستاندا پەیدا بوون. کۆنترینیان میسیۆنێری ئەمریکایە، کە لە کاتی خۆیدا، چوونە نێو نەستۆرییەکان. میسیۆنێرەکان قوتابخانە و بنکەی دەرمانکردن و چاپخانە و زۆر شتی دیکەیان دامەزراند. هەندێکیان زمان و وێژە و مێژووی نەتەوکانی کوردستانیان خوێند و ڕێزمان و فەرهەنگیان بۆ هەندێ لەو نەتەوانە دانا.

**ئیسلام**

ئیسلام تازەترین ئایینی دانیشتووانی کوردستانە. پەیدابوونی ئایینی ئیسلام، بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەمی زایینی دەگەڕێتەوە، واتە ساڵی ٦٣٧ی زایینی (١٦ کۆچی). ژمارەیەک لە مێژوونووسەکان لەسەر ئەو بڕوایەن، کە گوایە دانیشتووانی کوردستان بەبێ جەنگ و داگیرکردن و بە خۆشی خۆی، ئەم ئایینە نوێیەیان پەسەند کردووە. بەڵام ئەم بۆچوونە، بە بڕوای هەندێ مێژوونووسانی دیکە، لەگەڵ ڕاستیدا یەک ناگرنەوە. چونکە دانیشتووانی کوردستان، هەرگیز ئامادە نەبوون، بە خۆشی خۆیان، واز

له بیـروبـاوەڕ و ئایینی کـۆنـی باو و باپیـرانیـان بهـێـن، گـەلێ ڕاپەڕینی خـوێـناویان، دژی سـوپـای داگـیـرکـەری عـەرەب بـەرپا کـردووە. تەنانـەت تاکـوو ئێـسـتـاش لە زۆر جـێی کوردسـتـاندا، شـوێنەواری ئەم جـەنگانە لە یاد و بیر و هۆشی خـەڵکیدا هـەر بە زیندوویی مـاون. عـەرەبە مـوسـوڵمـانەکان، بۆ ئەوەی ئایینە نوێکەی خـۆیـان، بەسـەر دانیـشـتـووانی کوردستاندا بسەپێن، دەستیان لە هیچ جۆرە کارێکی ناڕەوا نەگەڕاندۆتەوە. بۆ نموونە، لە ساڵی ٦٣٩ی زایینیدا، لە نـێوچەی شـارەزوور، سـێ شـەو و سـێ ڕۆژ، دەسـتـیان لە کوشـتن و بڕینی کورد هەڵ نەگرتووە( ٥ لاپەڕە ٢٤) بە هـەزاران کـەسـی بێـتـاوانیـان کوشـتـووە تەنیـا لەبەر ئەوەی خەڵکی ئەو نێوچەیە، ئامادە نەبوون، ئایینە نوێکەی عەرەب پەسەند بکەن.

موسـوڵمانان، لـەسـەر مردن و شـوێنی شاردنەوەی پێغەمبەر، لە "مـەکە" یا لە "مـەدینە" هەموو لەسـەر یەک بڕوا نین. هـەروەها لەسەر ئیمـامەتی و میراتی پێغەمبەر کە دوای خۆی کێ جێی بگرێتـەوە و هەڵوێست بەرامـبـەر کـەسـانێ کـە زەکات نەدا و کـاروباری شـورا و ڕووداوی سـەردەمـی سـەرداری مـوسـوڵمـانان (عـەلی کوڕی ئەبـو تالیب)، پاش پێکهـاتن و باوەڕپێکردن (بەیعـەتکردن) ناکـۆکـیـی لەگـەڵ (مـعـاویە)دا. لەبـەر هـەمـوو ئەم هۆیـانە، موسوڵمانان، بەسـەر دوو بەشـی سـەرەکیدا دابەش دەکرێن:

**یەکەم: سوننە**

بەشـێکی زۆر لـە دانیـشـتـووانی کوردسـتـان سـونـین. سـوننە لە ئایینزاکانـی شـافیـعی، حەنەفی، مـالیکی و حەمبەلی پێک هـاتووە. هـەر یەکێ لـەم ئایینزایانە، بیروباوەڕ و پەیڕەوی تایبەتی خۆی هەیە، کە بە ژمارە و پلەی بڵاوبوونەوەی، لەگەڵ ئەوانی دیکەدا جیاواز.

١. شـافیعی

دامـەزرێنەری ئـەم ڕێبـازە، مـحـەمـەدی کـوڕی ئیـدریسـی شـافـیـعی یە (٧٦٧ - ٨٢٠ زایینـی). ئەم ئاییـنزایە، لە نـێـو خـەڵکی کـوردسـتـاندا، بە بـەربڵاوترین ئایینزای سـوننە دادەنرێ و بەشـی زۆری کورد لـەسەر ئەم بیروباوەڕە بەڕێوە دەڕۆن.

٢. حـەنەفی

لە لایەن ئەبو حـەنیفەی کوڕی نەعمانی سابتەوە (٧٠٠ - ٧٦٧ زایینی) دامەزراوە. ئەم ئایینزایە بە زۆری لە نێو پارێزگاکانی ئاگری، بینگۆڵ، دەرسیم، موش و کەرکووکدا بڵاوە.

٠٣ حەنبەلی

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (٧٨٠ – ٨٥٥ زایینی)، بە دامەزرێنەری ئایینزای حەنبەلی دادەنرێ. ژمارەیان لە نێو دانیشتووانی کوردستاندا زۆر نییە.

٠٤ مالیکی

دامەزرێنەرەکەی مالیکی کوڕی ئەنەسە (٧١٥ – ٧٩٥ زایینی)، ژمارەی پەیڕەوکەرانی لەچاو ژمارەی پەیڕەوکەرانی ئایینزاکانی دیکە، لە کوردستاندا کەمە.

جگە لەم ئایینزایانە، لە کوردستاندا گەلێ ڕێبازی ئایینی جیاوازی سۆفیگەرێتیشی تێدایە، کە سەر بە بیروباوەڕی سوننین، هەرە گرنگەکانیان ئەمانەن:

١/ ڕێبازی قادری

دامەزرێنەری ئەم ڕێبازە، شێخ عەبدولقادری گەیلانییە، کە خەڵکی گوندی گەیلانی نێوچەی کرماشان بووە. لە ڕێگەی عەبدولکەریمی گەیلانی نەوەی شێخ عەبدولقادر، بیروباوەڕەکانی ئەم ڕێبازە، بە نێوچە جیاجیاکانی کوردستاندا بڵاو کراوەتەوە.

شێخەکانی سەر بە ڕێبازی قادری، بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی تایبەتی خۆیان، بگرە بۆ بەرزکردنەوەی پایەی کۆمەڵایەتیشیان، هەمیشە ڕەچەڵەکی خۆیان بۆ سەر محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵا (پێغەمبەری ئیسلام) و عەلی کوڕی ئەبو تالیب (یەکێ لە چوار خەلیفەکەی ڕاشدین) بردۆتەوە. بەڵام لە نێو خۆیاندا لەسەر ئەم بیروباوەڕە، یەک نین.

ئەوڕۆ ڕێبازی قادری، بە یەکێ لە ڕێبازە گەورە و بەربڵاوەکان دادەنرێ و پەیڕەوانیشی (دەروێش) لە زۆربەی نێوچەکانی کوردستاندا هەن. بەڵام ژمارەیان لە پەیڕەوکەرانی ڕێبازی نەقشبەندی کەمترە.

لە نێو ڕێبازی قادریدا، چەندین ڕێبازی دیکە هەیە، وەکوو ئەشرەفی، نابولسی، کەهلوسی. ئەم ڕێبازە بە زۆری لە نێو کوردا بڵاوە، پاشان عەرەب دێ و کەمێکیش لە نێو تورکەکاندا بڵاو بۆتەوە.

٢/ ڕێبازی نەقشبەندی

مێژووی پەیدابوونی بۆ سەدەی چواردەیەمی زایینی دەگەڕێتەوە. ئەم ڕێبازە لە شاری بوخارە سەری هەڵ داوە. بە بیروڕای زۆربەی مێژوونووسان، لە ساڵی ١٨١١دا، لە لایەن شێخ زیائەدینی کوڕی خالیدی نەقشبەندی (مەولانا خالید)، ئەم ڕێبازە هاتووەتە

کوردستان. سەرەتا لە شاری سلێمانی و پاشان لە هەولێر و لەوێشەوە بڵاو بۆتەوە. هۆی بڵاوبوونەوەشی بەو خێراییە، زیاتر بۆ هەڵوێستی جیاوازی لەگەڵ ڕێبازی قادری، سەبارەت بە کێشەی دەسەڵاتداریێتی میرانی بابان و فەرامۆش نەکردنی لایەنی دونیایی لە ژیانی مرۆڤدا، لە پێناوی ئاییندا دەگەڕێتەوە. بە واتایەکی دیکە، ئەمان بڕوایان بەوەیە، کە دەڵێ: چۆن دینت دەوێ، بەو شێوەیەش دونیات بوێ. ڕێبازی نەقشبەندی، بە پلەی یەکەم لە نێو کورد و لە دواییدا لە نێو تورک و پاشان لە نێو ژمارەیەکی کەم لە عەرەبدا بڵاوە.

٣/ ڕێبازی ڕفاعی

ژمارەیەکی کەم لە موسوڵمانەکانی کوردستان، پەیڕەوی ئەم ڕێبازە دەکەن. تەکیەکانیان لە شارە گەورەکان دایە. بە زۆری لە نێو تورک و تورکمانەکاندا بڵاوە.

٤/ ڕێبازی هەقە

داهێنەری ڕێبازی هەقە لە کوردستاندا، بە شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە دادەنرێ، کە لە نێوچەی سورداش، شێخی ڕێبازی نەقشبەندی بوو، بۆیە شێخی ناوبراو، وەکوو ڕێبازێکی ئایینی ڕووت و ووشک، سەیری ڕێبازی نەقشبەندی نەکردووە، کە بەهۆی ئەو ڕێگەیەوە، لە خواپەرستیدا خۆی بتوێنێتەوە، بەڵکوو بەم شێوەیە و لە ڕێگەی ئەم ڕێبازەوە ویستوویەتی، ئامۆژگاری و پرینسیپەکانی ڕێبازە ئایینییەکەی خۆیان، بە شێوەیەکی گشتیی لە بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا، لە نێو پەیڕەوکەرانیدا بڵاو بکاتەوە و باوەڕیان بە "یەکسانی" پێ بهێنێ، کە هەزاران ساڵ بوو، ئیدیاڵی ئایین و ئایینزای شۆڕشگێڕانی جیهان بوو، هەر لەو پێناوەشدا بۆی تێدەکۆشان (٢ لاپەڕە ٦٦). ڕێبازی هەقە لە سەردەمی مامەڕەزادا، تووشی گەلێ هەڵکشان و داکشان بووە و شێخیش لە بەندیخانەدا گیراوە.

٥/ بەکتاشی

پەیدابوونی بەکتاشی بۆ سەدەی سیازدەی زایینی دەگەڕێتەوە، ئەم ڕێبازە، ڕۆڵێکی گرنگی لە ژیانی ڕامیاری ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا وازی کردووە و زۆر لە یەنچارەکانەوە (جۆرە سوپایەک بووە) نزیک بوون. بەکتاشی بە زۆری لە نێو تورک و کەمێکیش لە نێو کوردا بڵاو بووە.

جگە لەو هەموو ئەو ڕێبازانەی، کە لەوەو پێش باسمان کردن، چەند ڕێبازێکی دیکەش

له کـوردسـتـاندا هـەن، وەکـوو مـەولـەوی، خـەڵوەتی، تیـجـانی، سـەعـدی، شـاهـدەلی، سەهرەوەردی و... هتد. بەڵام بە ژمارە کەمن و لە نێوچەیەکی بەرتەسکی تایبەتیشدا بڵاو بوونەتەوە و زانیاریشمان لەسەریان زۆر نییە.

**دووەم: شیعە**

لە نێو دانیشتووانی کوردستاندا، پەیڕەوکەرانی تایەفەی شیعە هەن. بەڵام ڕێژەیان چەندین جار، لە ڕێژەی پەیڕەوکەرانی سوننەدا کەمترە و بە لە ٢٤٪ی گشت دانیشتووانی کوردستان دەخەمڵێندرێن. زۆربەی شیعەکان لە پارێزگاکانی ئازەربایجانی غەربی، کرماشان، لوڕستان. ئیلام. بەختیاری. دەرسیم، کەرکووک و هەندێ شوێنی دیکە دەژین.

شیعەکان لە نێو خۆیاندا، بەسەر چەندین دەستەدا دابەش بوون، کە لەگەڵ یەکدیدا لە ڕووی بڕوا و هەڵوێست لە ئیمامی عەلی و ژمارەی پەیڕەوکەران، جیاوازییەکی کەمیان هەیە، گرنگەکانیان ئەمانەن:

١. عەلی ئیلاهی

بە گەورەترین ئایینزای شیعە دادەنرێ و لە زۆر نێوچەی کوردستاندا بڵاوە. عەلی ئیلاهییەکان بڕوایان وایە، کە گیانی خوا هاتۆتە نێو لەشی ئیمامی عەلی، لەبەر ئەوە هەندێ کەس یەکجار زۆر ڕێزی لێ دەگرن و تا ڕادەیەک بە خواشی دەزانن.هەروەها دەڵێن، گیانی ئیمامی عەلی پاش مردنی بەرز بۆتەوە و چۆتەوە نێو ڕۆژ، بۆیە ڕۆژپەرستن بە پێویست دەزانن، هەروەها دەڵێن، محەمەد پێغەمبەری ئیسلام، لە لایەن عەلییەوە ڕەوانە کراوە و قورئانەکەی بۆ نێردراوە، بڕواش بەو قورئانە ناکەن، کە ئێستا لە نێو موسوڵماناندا باوە، چونکە لایان وایە کە قورئانە ڕەسەنەکە، کاتی خۆی سوتاوە و ئەوەی هەیە خەلیفەکانی ئیسلام کۆیان کردۆتەوە و دەسکردی ئەوانە. ئەمە وای لێ کردوون، کە هەر قورئانێکیان بەردەست کەوێ، یەکسەر بیسوتێنن. عەلی ئیلاهییەکان بڕوایان بە دۆناودۆن (کۆپیکردنی گیان) هەیە.

عەلی ئیلاهی ناوێکی گشتییە بۆ هەموو ئەوانەی، کە ئیمامی عەلییان لا زۆر پیرۆزە، بۆیە کارێکی چاک بوو، ئەگەر بە درێژی لەسەر ئەم بیروباوەڕە ئاڵۆزەمان بنووسیایە، بەڵام لەبەر ئەوەی عەلی ئیلاهی (یاخود وەک بە خۆیان دەڵێن: ئەهلی هەق)، لە ژێر ناوی جیاجیادا ناسراوون، بۆیە بە باشمان زانی ناوە نێوخۆییەکان بەکار بهێنین، بۆ ئەوەی لێکیان جیا بکەینەوە، تا بزاندرێ باسی کام تایەفەی عەلی ئیلاهی دەکرێ و لە کوێ؟

ا – کاکەیی

کاکەییەکان سەر بە ئایینێکی کوردی کۆنن (دێوپەرستی)، ئەوانە لەو ڕووەوە هاوبەشی یەزیدییەکان و گەلانی هیندۆئەوروپایی دیکە دەکەن. بۆ نموونە، مردووشتن و بە پیرۆز زانینی حەوت فریشتەکە (یەزەث).

کاکەییەکان ڕێزێکی یەکجار زۆر لە ئیمامی عەلی دەگرن، گوایە گیانی خوا چۆتە نێو لەشی ئیمامی عەلییەوە، هەروەها قورئانیان زۆر لا پیرۆزە و بڕوایان وایە کە لە لایەن خواوە بۆ محەمەد نێردراوە. ڕۆژو دەگرن، بەڵام تەنیا سێ ڕۆژ بە ڕۆژو دەبن، ئەویش لە سەرەتای مانگی دێسەمبەری ڕۆمییەوە دەست پێ دەکات و لە ئێوارەی چوارەمدا جەژن دەکەن. نوێژ ناکەن، لەبەر ئەوەی کاکەیی نییازین نەک نمازی، بە واتایەکی دیکە، ئەوان خەڵکی پاڕانەوەن، نەک نوێژ کردن. کاکەییەکان سمێڵێکی گەورە دەهێڵنەوە و بەرسمێڵکردن لایان حەرامە، ئەمەش لەو بڕوایەوە هاتووە، کە گوێزان ناتوانێ موویەک لە مووەکانی ئیمامی عەلی ببڕێ. ژنوژنخوازی لەگەڵ خەڵکیدا دەکەن،واتا ژن لە تایەفەکانی دیکە دەهێنن و کچیش بە خەڵکی دیکە بە شوو دەدەن. لە ناویاندا مەیخواردنەوە حەرامە. ئەگەرچی هەندێ کەس لەو بڕوایەدان، شوورەیی و ناموس لە نێویاندا هەیە، بەڵام ڕاست نییە.

کاروباری ئایینی و دنیایی لە نێو کاکەییەکاندا، وەک یەزیدییەکان لە ڕێگەی سەیدەکان و باوە (بابا) و مام و دەروێشەوە بە ڕێوە دەبرێ، هەر یەکەشیان لە نێو کۆمەڵگەی کاکەییدا، پایەی تایبەتی خۆی هەیە، کاری تایبەتی خۆشیان پێ دەسپێردرێ. کاکەیی لە نێوچەکانی داقوق و مەندەلی و خانەقین و کرند و ئازابیجانی غەربی و گەلێ شوێنی دیکەشدا دەژین، بەڵام لەبەر ئەوەی ئامارێکی تایبەتی نییە، ژمارەیان بە تەواویی نازانین.

ب – شەبەک

بیروباوەڕی شەبەک، یەکێکە لەو بیروباوەڕانەی کە ڕێزێکی یەکجار زۆر لە ئیمامی عەلی و نەوەکانی دەگرن. لە هەمان کاتدا بیروباوەڕێکی شاردراوەیە، لەبەر ئەوەی پەیڕەوکەرانی لە مێژوودا، لە لایەن ئیسلامەکانی دیکەوە، زۆر جار تووشی ئازار و ئەشکەنجە بوون. شەبەکەکان لەبەر ئەوەی بیروباوەڕەکەیان نهێنییە، زۆر قسەیان بۆ هەڵ بەستراوە، وەک ئەوەی گوایە، پێنج فەرزە نوێژ ناکەن، لە مانگی ڕەمەزاندا، بەڕۆژو نابن، بەڵکوو لە مانگی موحەڕەمدا، دە ڕۆژ بەڕۆژو دەبن. خواردنەوە لایان حەرام نییە، جەژنی لەدایکبوونی عیسا دەکەن و سەر لە پیاوە ئایینییەکانیان دەدەن و داوای لێخۆشبوونیان

لێ دەکەن لە گوناهەکانیان. بەڵام شەبەکەکان خۆیان دەڵێن، ئەمانە ڕاست نییە و ئێمە ئیسلامی تەواوین و هیچ کردەوەیەکی خراپە ناکەین، کە لەگەڵ ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا نەگونجێ.

پەرتوکی پیرۆزی شەبەکەکان مەناقبەی پێ دەڵێن، بوریورق یا بەرخ. ئەو پەرتوکە باسی چۆنێتی خواپەرستی و چاکە کردن و خراپە نەکردن و خۆبەستنەوە بە (ئەهلی بەیت) و هەروەها لەسەرکردن و ڕێپیشاندان و پاڕانەوە و سەڵەوات و هەندێ شتی دیکە دەکات.

بیروباوەڕی شەبەک، وەک هەر بیروباوەڕێکی دیکە، گۆڕانی بەسەردا هاتووە و هەندێ شتی خۆی لە دەست داوە، لە هەمان کاتیشدا هەندێ شتی تازەی هاتۆتە ناوەوە و لە بیروباوەڕەکانی دیکەی دەوروپشتی خۆی وەرگرتووە، بە تایبەتی لە یەزیدی و سارەلی و باجەلانی و ئایینی دیانەکان... تاد.لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین، بیروباوەڕی شەبەکی ئەوڕۆ، لەگەڵ بیروباوەڕی شەبەکی دوێنی، جۆرە جیاوازییەکی هەیە.

ئەتنۆگنیزی شەبەکەکان، هەتاکوو ئەوڕۆ کێشەی زۆری لەسەرە، ئەگەرچی بەڵگە مێژوویی و زانستییەکان، گومانی لە کوردبوونیان نەهێشتووە، ئەو بیروڕایانە لە لایەن زۆربەی زۆری شەبەکەکانەوە چەسپێندراوە. شەبەکەکان خۆیان لەو بارەیەوە دەڵێن: ئێمە لە باشووری کوردستانەوە هاتووین و بە ڕەچەڵەک دەچینەوە سەر هۆزی شوانکارە و زمانەکەشمان کوردی ساغ بوو، بەڵام لەم دواییەدا ووشەی بێگانەی وەکوو عەرەبی و فارسی و تورکی کەوتە ناوی، زمانەکامان سەر بە دیالێکتی گۆرانە، کە لە هۆزەکانی هەورامی و باجەلان و لەک و ڕۆژبەیان و بالانی و جەباری و قەرەگولوس قسەی پێ دەکەن. لە هەمان کاتدا مینۆڕسکی و محەمەد ئەمین زەکی و ئابونە کەرمەلی و شپازنیکۆف و گەلێکی دیکەش، ئەو دید و بۆچوونانەیان لا تەواوە. بەڵام نابێ ڕای ئەو کەسانەش لە بیر بکەین، کە شەبەکەکان بە تورکمان دەزانن، وەکوو سەراف... و(٢٤،ص١٦؛١٥،ص..

ڕۆژهەڵاتی نێوچەی شەبەکەکان، ڕوباری خازەرە و ڕۆژئاوای نێوچەی تلکێفە و باکووری نێوچەی شێخانە (عەینسفنی) و باشووریشی نێوچەی موسڵە. زۆربەی گوندەکانی شەبەکەکان، لە ڕووی ئیدارییەوە سەر بە نێوچەی حەمدانیە و تلکێفن. ژمارەی شەبەکەکان بە تەواویی نازاندرێ، بەڵام لە سەرەتای حەفتاکاندا، هەندێ کەس بە بیست هەزار و بەرەوژوورتر، لە قەڵەمیان دەدان.

ب – قەڵەم حاجی

دانیشتووانی گەڕەکی قەڵەم حاج، لە شارۆچکەی مەندەلی، بە قەڵەم حاج بە ناوبانگن، واتە کاکەیی. وا دیارە زۆریان لا گرانە، ئەگەر بە هەر ناوێکی دیکە بانگیان بکەن.قەڵەم حاجەکان بڕوایان وایە، کە گەرەکی قەلای میر حاج و قەلای بالی، لە لایەن دوو براوە دروست کراون. برای گەورە ناوی لە قەلای خۆی ناوە بالا، لە دوییدا بۆتە بالی و برا پچووکەکەشیان قەلاکەی بە ناوی خۆیەوە(میر حاج) ناو ناوە، لەبەر ئەوەی خۆی حاجی بووە (١، لاپەڕە ٢٨).

بە قسەی هەندێ لە نووسەران، نوێژکردن لە لای قەڵەم حاجییان نییە.گوایە ئیمامی عەلی، ئەو ئەرکەی لەسەر شانی ئەوان لابردووە و خۆی جێبەجێی دەکات. شێخەکانیان دەربارەی ڕۆژو دەڵێن، ووشەکە بە کوردی سێ ڕۆژە، نەک سی ڕۆژ، وەکوو هەندێ لە موسوڵمانەکان بە هەڵە تێیگەیشتوون (٢٧، لاپەڕە ٢٠٩). ژمارەی قەڵەم حاجییەکان بە تەواویی نازاندرێ، بەڵام ئەگەر هاتوو، ژمارەی ساڵەکانی شەست بە هەزار کەس دابنێین، وەکوو هەندێ کەس دەڵێن، ئەوا ئەوڕۆ ژمارەیان، سێ ئەوەندە زیادی کردووە.

ج – بەلورییەکان

ئەمانە دەستەیەکن لە ئەهلی هەق، لە گوندی بەلور دەژین. ئایینزاکەیان بە ناوی گوندەکەیانەوە ناو ناوە، بۆیە پێیان دەڵێن بەلورییەکان. بیروباوەڕی ئەم دەستەیەی ئەهلی هەق، لە ڕووی بڕوا و جێبەجێکردنی ئەرکە ئایینییەکانی سەرشانیان و بڕوایان بە ئیمام، لەگەڵ دەستەکانی پێشوودا کەمێ جیاوازە.

بەلورییەکان لەو بڕوایەدا، کە ئیمامی عەلی خودا نییە، بەڵکوو لە تیشکی خوا دروست بووە. بەلورییەکان لە تەکییەی نورئاباد (دەم ئایزە)، بە شێوەیەکی زۆر ڕێکوپێک و سەرنجڕاکێش، زیکر و تەهلیلە و کۆبونەوەی خۆیان دەکەن. بەلورییەکان هەموو ساڵێ، بە گەورە و گچکەوە، لەسەر کوەقەلعە کۆ دەبنەوە. بەو دارانەی کە هەر یەکێ لە بەلورییەکان، لەگەڵ خۆی هەڵی دەگرێ، ئاگرێکی زۆر گەورە دەکەنەوە. ئەو ژنانەی کە سکیان پڕە، لە سەریان پێویست بوو، کە بەشی خۆیان و منداڵەکەی نێو سکیشیان دار هەڵ بگرن. دوای ئەوەی ئاگرەکە هەڵ دەکرێ و بە تەواویی خۆش دەکرێ، ئینجا یەکێ لە پەیڕەوەکانی بەلورییەکان (خەلیفە)، دەست بە خوێندنەوەی هۆنراوە دەکات، کە هەموو هۆنراوەکانیان، بە ئیمامی عەلیدا هەڵ دەدات. خەڵکەکەش لە دەوری ئاگرەکە کۆ دەبنەوە و لەسەر چۆک بازنە دەبەستن و دەڵێن، (هەق هەق عەلی هەق)، ئەوەندە ئەم ڕستەیە دووبارە دەکەنەوە، تا

به تەواویی گەرم دادێن و حاڵیان لێ دێ و لە دواییدا بە لادا دەکەون.

ئەو ئاهەنگە هەموو ساڵێ بۆ ماوەی چوار تاکوو حەوت ڕۆژ ساز دەکرێ. ڕاگەیاندنی کۆتایی پێ هێنانی ئاهەنگەکە، لە دوا ڕۆژدا دەبێ، ئەو ڕۆژە لای بەلورییەکان بە جەژن دادەنرێ، ئەم ڕاگەیاندنەش لە دەسەڵاتی ڕابەری گەورەی ئەم ئایینزایە دایە. هەریەکە لە شەوەکان، ناوی تایبەتیی خۆی هەیە. یەکەم ناوی ڕۆژی کامەریژانە – Kamerijan، دووەم ناوی شیرخوتییە – Skirghoti، سێیەم ناوی شا عەلییە – Sha Ali، چوارهەمیش ناوی پیرموس – Pirmusi. نانی ئەو چوار ڕۆژە، دەبێ تایبەتی بێ و جیاوازی لەگەڵ خواردنی ڕۆژەکانی دیکەدا هەبێ. خواردنی ئەو چوار ڕۆژە، بە زۆری گۆشت و برنجە. دەبێ خواردنی هەموو خەڵکەکە وەکوو یەک بێت. هەروەها بەپێی توانا، دەبێ هەموو کەس جلی نوێ لەبەر بکەن. هەر کەسێکیش هەژار بوو، توانای کڕینی جلی نوێی نەبوو، ئەوا دەبێ جلەکانی خۆی پاک بشوا، تا بە پاکیی و خاوێنی بچێت بۆ ئاهەنگەکە.

هەموو گەڕەکێ لە ئاوایی بەلوریان، ڕەهبەری تایبەتی خۆی هەیە. ئەم ڕەهبەرانە لە لایەن خەڵکییەوە، بۆ ماڵەوە بانگ دەکرێن، تا دوعایان بۆ بخوێنن، ئەمەشیان کردۆتە نەریتێک، هەر ماڵێ زوو بانگیان بکەن، ئەو ڕەهبەرانە پێشتر سەر لەوان دەدەن، واتە لەسەر سیستەمی سەرەگرتن دەڕۆن بە ڕێوە.

ئەم دەستەیەی ئەهلی هەق، چەند جێژنێکیان هەیە، لە هەموویان بە ناوبانگتر جەژنی غەلان داشە ( Ghelan das )، ئەم جەژنەش لە ١٠ مانگی دێسەمبەردا دەست پێ دەکات و لە ٢٠ی هەمان مانگدا تەواو دەبێ. ڕەهبەرەکان لەو جەژنەدا، هۆنراوەی شێخەکانیان بۆ خەڵکی دەخوێننەوە، بە تایبەتی هۆنراوەکانی خان ئەڵماس، کە بە دیالێکتێکی لەکی نووسراون، هەروەها هۆنراوەکانی تورک ئەمیر – Tork amir و عەلادین و مەلا نیاز و...تاد.

دروشمی ئەو دەستەیەی ئەهلی هەق، لە ژیانی ڕۆژانەیاندا و لەگەڵ خۆیان و لەگەڵ خەڵکی دیکەشدا، لە ڕاسگۆیی و کارکردنی ڕاست و دروست و پەیڕەوی چاکە و دەست درێژنەکردن بۆ سەر ناموسی خەڵکی پێک هاتووە. بلوورییەکان لەو بڕوایەدان، هەر کەس ئەو گوناحانە بکات، ئەوا تەنیا خۆی توش دەبێ و گوناهێکی زۆر گەورە دەکات و هەرگیز جێگەی پڕ نابێتەوە.

ئاگر لە نێو ئەم دەستەیەی ئەهلی هەقدا، ڕێزێکی تایبەتی هەیە و بە چاوێکی پڕ لە ڕێزەوە تەماشا دەکرێ. ئاو بە ئاگردا کردن، لە لایان بە گوناهێکی گەورە دادەنرێ. بلورییەکان سەری هەموو مانگێ، بە جێژن لە قەڵەم دەدەن و دوا ڕۆژی مانگیش، بە ڕۆژی

مـەرگی ئەو مـانگە دادەنێن. هـەروەهـا ڕۆژی یـەکـەمـی هـەمـوو وەرزێ، بە جـەژن حـیـسـاب دەکەن. جـەژنـی سـەرەتای پـایز، کـە بە ناوی تیل تکۆ – Ti l Tiko ناسـراوە، لـە نێو خەڵکیدا ڕێزێکی تایبەتی هەیە.

لە جەژنی نەورۆزدا (جەژنی سـوڵتان یا جەژنی شاه)، خەڵکی خۆیان بۆ ئەو جەژنە، بە بەرگی نوێ و خـواردنی باشـەوە ئامـادە دەکـەن. دوا چوارشـەمـە لە هـەمـوو سـاڵێکدا، کـە بـە چوارشـەمە سـوورە بە ناوبانگە، لە ژیانی بەلوریـیـەکاندا بـە ڕۆژێکی تایبەتی دەناسـرێ. لەو جـەژنەدا ڕێـوڕەسـمـی تایبـەتی هـەیە، ئاگر دەکرێتـەوە و دوعـا دەخـوێنرێت. هـەمـوو کـەسـێ پێـویسـتـە لـەسـەری، بۆ کـردنەوەی ئاگـری چوارشـەمـە سـوورە، دار لەگـەڵ خـۆی بەرێ، کـە ئاگرەکـەش دەکرێتـەوە، خەڵکەکە دەست بە هـاویشتنی دارەکـانیان دەکـەن بۆ نێو ئاگـرەکە. بلوریـیەکان لەو بڕوایەدان، لەگـەڵ هـاویشـتـنی ئەو دارە بۆ نێو ئاگرەکە، هـەر نەخۆشـیـیەکیان هـەبـێ، هـەمـووی دەشـەڕێ، هـەر گـونـاهـێکیـان کـرد بـێ، هـەمـووی پـاک دەبـێـتـەوە، هـەر نەگبـەتییـەکیان لـە ڕێگەدا بێ، هـەمووی لەنێو دەچێ و لەگەڵ دارەکەدا دەسـووتێ، هـەروەهـا بە دەم پاڕانەوە و داواکردن و دوعا خوێندنەوە، بە دەوری ئاگرەکەدا دێن.

ڕۆژانی پێـنج شـەمـە لە هـەر هـەفـتـەیەکـدا، بـە ڕۆژێکی پیـرۆز دادەنرێ. خـەڵکەکـە لەو ڕۆژەدا، نەزر لە خـۆی دەگـرێ. هـەر کـەسـێ بێـەوێ نـەزر بکات، دەبێ بە چەنـد ڕۆژێ پێش پێنج شـەمـە، ڕەهـبـەری گـەڕەکـەکـەی ئاگـادار بکات، کـەوا نەزر دەکات. لەو ڕۆژەدا خـاوەن نەزرەکە، ئاژەڵێ سـەر دەبڕێ و خـەڵکی داوەت دەکات. خەڵکەکە لەو مـاڵەی کە نەزرەکەی کردووە، لە دەوروبەری چێشتەنگاوان کۆدەبنەوە. ئەوانەی بۆ ئەو داوەتە بانگ کراون، دەبێ خۆیان خاوێن بکەنەوە و جلی تـازە یا پاک لەبەر بکەن و بە ڕێکوپێکی و جوانی بچن بۆ ئەو میواندارییە.

ئەو ئاژەڵەی سـەردەبڕرێ، دەبێ ئاگادار بن پیس نەبێ، نابێ سـەگ لە سـی مەتر نزیکتر بێ لـە کـــەلەشـی ئاژەڵـە ســـەربڕاوەکـــەوە. هـەروەهـا دەبێ ڕیـخـــۆڵە و پـێـــســـتـی ئـاژەڵە سەربڕاوەکە، باش بشـاردرێتەوە و بە دزییەوە بخرێتە چاڵەوە و سەگ پێی نەزانێ.

ڕەوشـتـێکی دیکەی بەلوریـیـەکان ئەوەیە، کـە ناو لە منداڵی سـاوا دەنێن، بانگی ڕەهـبـەر دەکـەن، ئەویش چـەند بەردێ یا چەند دار و چیلکەیـە، بە دەسـتـەوە دەگـرێ، کـە هـەریەکـە ناوێکی تایبـەتی خـۆی هـەیە. وا دیارە ناوەکـە لە لایەن باوکی منداڵەکـەوە هەڵ دەبژێردرێ، لە پاشـان ڕەهـبـەرەکە، یەکێ لەو دارانە یا لەو بـەردانە بەردەداتەوە و ناوەکە دەبێ بە ناوی منداڵەکە.

ئەم دەسـتـەیە لە ئەهـلی هـەق، نوێژیان بە ئەرکی سـەرشـان لا حـیـسـاب نییـە. ئەوان لەو

بڕوایەدان، کە ئەوانەی نوێژ دەکەن، تەنیا بۆ ئەوەیە، خۆیان لە نێو خەڵکیدا نیشان بدەن، تا خەڵکی پێیان بڵێن، ئەمانە پیاوی خودان. بە بڕوای بەلورییەکان، ئەگەر مرۆڤ بە دڵ لەگەڵ خودا بێ، بەسە.

جگەرەکێشان لە نێو بەلورییەکاندا قەدەغەیە. هەر کەسێ جگەرە بکێشێ، ئەوا لە کۆمەڵەکەی خۆی دوور دەخرێتەوە.هۆی قەدەغەکردنی جگەرەکێشانیش، بۆ ئەو ڕووداوە دەگەڕێتەوە، کە لە ڕابەرێکیان ڕووی داوە. دەگێڕنەوە، گوایە گەورەی بەلورییەکان، ڕۆژێک لەبەر جگەرەکێشان، تووشی کۆکە دەبێ و هەناسەی تەنگ دەبێ، لەبەر ئەوە بڕیار دەدا کەس جگەرە نەکێشێ.جگە لەو ڕەوشتانەی کە لە سەرەوە باسمان کردن، هەندێ شتی دیکەشیان هەیە، وەکوو بەرسمێڵ نەکردن و ... هتد.

ج – عەلەوی (قزلباش)

عەلەوییەکان، (ناوەکە لە پەیڕەوکەرانی ئیمامی عەلییەوە هاتووە.) لە کوردستان بە نوسەیری و ئەنساری ناسراون. بیروباوەڕیان لە بیروباوەڕی سمایلییەکان و هەندێ ڕەگەزی دیکەی دیانەکان و خواپەرستی ڕۆژهەڵاتی کۆن پێک هاتووە.

سەرچاوەی بیروباوەڕی عەلەوییەکان، لە سێ شتی گرنگ پێک هاتووە: واتا و ناو و باب، کە هەرسێکیان لە کەسایەتیی عەلی و محەمەد و سەلمانی فارسیدا کۆ بوونەتەوە، بەڵام زیاتر لە ئیمامی عەلیدا خۆی دەنوێنێ. دروشمەکانی ئایینی ڕۆژهەڵاتی کۆن، کە لە بیروباوەڕی عەلەوییەکاندا ڕەنگ دەداتەوە، خۆی لە ڕێزگرتن لە ڕۆژ و مانگ و کازیوە و زەردایی ڕۆژدا دەبینێ. عەلەوییەکان لەو بڕوایە دان، کە گیان نامرێ، بەڵکوو لە شێوەی شتێکی دیکەدا، دووبارە دەردەکەوێتەوە. دەڵێن مرۆڤ کە مرد، گیانەکەی بۆ لای ئەستێرەکانی ئاسمان هەڵ دەکشێ و لەوێ بە ئامادەبوونی (عەلی خوا) لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێ. ئەو گیانانەی گوناهیان زۆر کرد بێ، لە شێوەی گیانلەبەردا دروست دەبنەوە،. شێوەی پرسەدانان لای عەلەوییەکان، هەندێ دروشمی ئایینی دیانەکانمان وەبیر دێنێتەوە، وەکوو خوێندنی ئینجیل لەسەر مردوو، دابەشکردنی خواردن و شەراب لە گۆڕستان. هەروەها عەلەوییەکان، ناوی مەسیح لە منداڵەکانی خۆیان دەنێن. عەلەوییەکان دەڵێن، بیروباوەڕی عەلەویی زۆر قوڵ و پڕ مانایە، هەموو کەس هەروا بە ئاسانی تێی ناگات. پەرتووکی پیرۆزی عەلەوییەکان، ناوی (پەرتووکی مەجمەعە)، کە لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا دانراوە. عەلەوییەکان لە نێو خۆیاندا، بەسەر چەند دەستە و گروپێکدا دابەش

دەکرێن، وەکوو شامی (حەیدەری) و غەیبی و نامیس... هتد.

عەلەوییەکان لە هەندێ نێوچەی باکووری کوردستاندا، بە شێکی زۆر لە دانیشتووان پێک دەهێنن، بە تایبەتی لە دەرسیم و ماردین و دیاربەکر... هتد.

٠٢ ئیسناعەشەریی

ئەم ئایینزایە، لە نێو فارس و عەرەبەکانی کوردستاندا بڵاوە. پەیدابوونی ئیسناعەشەری، واتە ئیمامی یاخود جەعفەری، بۆ نێوەڕاستی سەدەی حەوتەمی زایینی دەگەڕێتەوە. یەکەم جار لە عێراق و لە دواییدا لە نێوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەتی عەرەبیدا بڵاو بۆتەوە و پەیڕەوانی پەیدا کردووە. دوا ئیمامی ئیسناعەشەرییەکان، واتە ئیمامی دوازدەیەم کە ناوی محەمەدە و بە مەهدی ناوبانگی دەرکردووە، لە کۆتایی سەدەی یازدەدا بزر بووە. بە بڕوای شیعەکان، ڕۆژێ دێ محەمەدی مەهدی پەیدا دەبێتەوە. ئیسناعەشەرییەکان ڕێزیان زۆر بۆ ئیمامی عەلی داناوە و بەو خەلیفەیەی دادەنێن، کە مافی خوراوە.

ئیسناعەشەرییەکان لە ڕووی کاروباری ئایینیی و دونیایی و پلەی پشتبەستن بە قورئان و فەرموودەکانی محەمەد پێغەمبەری ئیسلامەوە، بەسەر دوو دەستەدا دابەش دەکرێن: ئوسوڵییەکان – سەرەڕای قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر، بڕوایەکی زۆر بە تینیان، بە فتواکانی موجتەهیدەکانیان هەیە. ئەخبارییەکان – تەنیا بڕوایان بە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر هەیە.

لە نێو ئیسناعەشەرییەکاندا، چەندین ڕێبازی جیاواز هەیە، بە بۆچوونی خۆیان، هەر یەکەیان ڕێز و پایە بۆ ئیمامی عەلی و کوڕەکانی (حەسەن و حوسێن) و هەروەها بۆ بنەماڵەی پێغەمبەریش دادەنێن. هەندێ لەو ڕێبازانە ئەمانەن:

نیعمەتییەکان: ئەم ڕێبازە لە لایەن نیعمەتوڵڵای کرمانییەوە دامەزراوە. زۆربەی مریدانی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا دەژین. نیعمەتییەکانیش لە نێو خۆیاندا، چەند لق و پۆپێکیان لێ دەبێتەوە، وەکوو گونابادی – لە نێوچەی کرماشان زۆر بڵاوە، دوورییەساتان – لە کرماشان و دەوروبەری زۆرن، سۆفی عەلی شاە – کرماشان، خوڕەم ئاباد بە بەناوبانگترین شوێنی ئەم ڕێبازە دادەنرێ.

ڕێبازەکانی دیکەی ئیسناعەشەری ئەمانەن: حەیدەری (خاکە سەر)، کوبرەوی (زەهابی)، بەهالی... بەڵام ژمارەیان زۆر کەمە و هەندێکیشیان لە هەزار کەس زیاتر نابن.

## کۆمەڵە ئایینیی و بیروباوەڕەکانی دیکە

### یەزیدی

یەزیدییەکان، بە ئیزیدیش ناو دەبرێن. لە نێوان زاناکاندا، لەسەر ناوی یەزیدییەکان، مشتومڕێکی زۆر هەیە. هەندێ لەو بڕوایە دان، کە ناوی یەزیدی لە ووشەی یەزدانەوە هاتووە، لەبەر ئەوەی خودا پایەیەکی دیاریکراوی ڕەمزیی لە ئایینەکەیاندا هەیە. هەندێکی دیکە دەڵێن، ناوەکە لە ناوی مەڵبەندی یەزدی فارسەوە هاتووە، کە یەکەمین شوێنی پەیدابوونی یەزدییە. بە قسەی هەندێکی دیکەش، دەبێ ناوەکە لە ناوی دامەزرێنەری ئەم ئایینەوە هاتبێ، کە یەزیدی کوڕی عونەیزەیە و شێخ عودەی نوێنەرێتی. هەروەها ژمارەیەک لە زانایان لەسەر ئەو بڕوایەن، کە ئەو ناوە لە ناوی یەزیدی کوڕی معاویەوە هاتووە، کە دووەم خەلیفەی ئەمەوییەکان بوو، بەڵام وا دیارە ئەم بۆچوونەیان، جێگەی بڕوا نییە، لەبەر ئەوەی لێکچوونی ناو، بە نیشانەیەکی ڕاست دانانرێ، بەڵام ڕەنگە یەزیدییەکان لە کاتی خۆیدا، ئەو لێکچوونەیان قۆستبێتەوە، بۆ ئەوەی لە دەسدرێژیکردنی ئیسلامەکان، خۆیان بپارێزن. لەوانەیە هەر شیعەکانیش ئەو ناوەیان لێ نابن و مەبەستیشیان، شەرمەزارکردنی یەزیدی کوڕی معاویە بوو بێ، لەبەر ئەوەی لایەنگری ئەو کۆمەڵەی کردووە. هەندێکی دیکەش دەڵێن، ناوەکە لە هۆزی ئازیدییەوە هاتووە و لەسەردەمی یەزیدییەکاندا گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بووە بە یەزیدی. هەندێ جاریش لە سەرچاوە گشتییەکاندا، بە شەیتانپەرستەکان ناو دەبرێن. بەڵام وا پێ دەچێ، کە ناوی یەزیدی لە ناوی یەزدانەوە هاتبێ، واتە خواپەرستیی و لە لای هەندێ کەسی ناکورد، ووشەکە گۆڕاوە و بووە بە یەزیدی.

ئەتنۆسی یەزیدییەکان – چوونەوەی یەزیدییەکان بۆ سەر ڕەچەڵەکی کورد، لە لایەن ژمارەیەکی زۆر لە زانایان پەسەند کراوە. لەو بارەیەوە. ڕاپۆرتی کۆمەڵەی گەلان دەنووسێ: "یەزیدییەکان بە کوردی دەدوێن و کوردیی زمانی ئایینییانە، بەڵکوو بڕواشیان وایە، کە خواکەشیان بە کوردی دەدوێ". لە لای نووسەرێکی دیکەش، هەمان بۆچوون دووبارە دەبێتەوە و دەڵێ: "گومان لەوەدا نییە، ئەو یەزیدییانە کوردی ساغن و نەک هەر لە ڕووی زمانەوە، بەڵکوو لە ڕووی لەشیان و گشت نیشانەکانی دیکەی بەرچاو و بە تەواوی

له کوردەکانی چیای دەرسیم (٣٣، لاپەڕە ١٨١–١٨٧، ٢٤، لاپەڕە ١٦–١٧) دەچن، ڕەنگە هەر خەڵکی ئەوێش بن، دوای پەیدابوونی تەیموری لەنگ و هێرشە تێکداراکانی بۆ سەر دەوڵەتی ئیسلامی، لە وێوە بۆ چیاکانی شەنگار کۆچیان کردووە". هەندێ نووسەری دیکەش هەن و دەنووسن، کە "یەزیدییەکان لە کوردەکانن و لەشساغن و زیاتر لە دوو سەدەیە، لە چیاکانی شەنگار دەژین". پاشان یەکێکی دیکە دەنووسێ "یەزیدییەکان بەشێکن لە کورد و لە کوردەکانی دیکە زیاتر لەسەر ئایینی زەردەشتیی خۆیان سوور بوون و کاروباری ئایینیی خۆیان پاراستووە" گەلێکی دیکەش هەمان بڕوایان هەیە.

بڕوای یەزیدییەکان

له نێوان هەموو ئەو کەسانەی گرنگییان بەم ئایینە داوە، دەمەتەقێیەکی زۆر گەرم پەیدا بووە. هەندێ دەڵێن "یەزیدیەکان لە بنەڕەتدا، دیان بوون و لە دواییدا سەریان لێ شێواوە" بەڵگەشیان بۆ ئەم بۆچوونە، چەند دروشمێکی دیانەکانە، کە لە ئایینی یەزیدییەکاندا بەرچاو دەکەوێ. هەندێکی دیکە دەڵێن "یەزیدییەکان لە پەیرەوانی ئایینی مانەویین، لە دواییدا بوون بە ئیسلام" بەڵگەشیان بۆ ئەوە، بڕوابوونیانە بە تێکەڵابوویی هێزی سەرووە (دووفاقی). هەندێکی دیکەش لەو بڕوایە دان کە "یەزیدییەکان لە بنەڕەتدا زەردەشتین و دوایی لە ناچاریدا بوون بە ئیسلام، بۆ ئەوەی لە دەست ئازاردانی موسوڵمانەکان و دیانەکان ڕزگاریان ببێ" بەڵگەشیان بۆ ئەوە، بڕوای یەزیدییەکانە بە هێزی چاکە و خراپە (خێر و شەڕ). هەندێکی دیکە دەڵێن "یەزیدییەکان ئیسلامی تەواو بوون، بەڵام بیروباوەڕی زەردەشتی و ئایینەکانی دیکە، تێکەڵاوی ئایینەکەیان بووە". بەڵام وا دیارە، ئەو بیروڕایانەی کە بنوبنەچەی ئایینی یەزیدییەکان، بۆ سەر ئایینی زەردەشتییەکان بەباتەوە، زیاتر لە ڕاستییەوە نزیکن، لەبەر ئەوەی زۆر شتیان لە یەکدی دەچێ.

یەزیدییەکان بڕوایان بە یەک خوایە، کە ناوی "یەزدان" ـە و بە دروسکەری ئەم گەردونە و حەوت فریشتەکە و ئادەمی دادەنێن. یەزیدییەکان هەموو تەورات و ئینجیل و قورئان بە پیرۆز دەزانن. هەروەها ڕێزی عیسا و نیشانەی خاچ دەگرن و ڕێزی تایبەتیان بۆ محەمەد و شاری مەکەی موکەڕەم هەیە. ڕۆژ و مانگ لای یەزیدییەکان پیرۆزە، بە تایبەتی ڕۆژ، کە بە شێخ شەمسەدین ناوی دەبەن و هەموو ساڵێ لە نزیک پەرسگای شێخ شەمسەدینەوە، گایەکی سپی بۆ دەکەنە قوربانی. پیسکردنی ئاو و ئاگر و هەوا، لای یەزیدییەکان دروست نییە. لە هەمان کاتدا دەبێ، ڕێز لە خاک بگیرێ. گەورەی فریشتەکان لە ئایینی یەزیدیدا، پیرۆزترین شوێنی هەیە و پێی دەڵێن "مەلیکە تاووس". یەزیدیەکان لەو

بڕوایەدان، کە "مەلیکە تاووس" یەکەمین فریشتەیەکە لە لایەن خواوە دروست کراوە، پاشان شەشەکەی دیکە دروست کراون. یەزدان لەسەر فریشتەکان دەکات، کە کەسی دیکە نەپەرستن و کڕنوش بۆ کەسی دیکە نەبەن لە خۆی زیاتر. پاش ئەوەی خوا دوای حەوت هەزار ساڵ، ئادەمی دروست کرد، خوا فەرمانی پێ دان، کڕنووش بۆ ئادەم بەرن. ئەوە بوو هەموو فریشتەکان، فەرمانەکەی خوایان بەجێ هێنا، تەنیا "مەلیکە تاووس" نەبێ، لەبەر ئەوەی قسەی ڕابردووی بیر کەوتەوە،لەبەر ئەمە خوا کردووی بە گەورەی فریشتەکانی ئاسمان و ئەوانی دیکەی سزا دا. یەزیدییەکان نکولی لە بوونی ئەهریمەن دەکەن، بە بڕوای ئەوان، هەموو ئەو شەڕوشۆڕەی لە نێو خەڵکیدا ڕوو دەدەن، خەتای ئەهریمەن نییە، بەڵکوو زیتر خەتای دەروونی نەخۆش و شەڕاویی مرۆڤ خۆیەتی. یەزیدییەکان نەفرەت لە ئەهریمەن ناکەن، ئەمە بە دەست هەندێ کەسانی ئایینەکانی دیکەوە، بۆتە بیانوویەک، تا "مەلیکە تاووس" و ئەهریمەن بە یەک چاو تەماشا بکەن، ئەمەش لای یەزیدییەکان بە کفر دادەنرێ و هەرگیز قەبوڵ ناکرێ، لەبەر ئەوە زۆر ڕقیان لە ئەهریمەن دەبێتەوە، بە ڕادەیەک وایان لێ هاتووە، ناوی ئەهریمەن نەبەن و تەنانەت پیتی "ش" ینیش بەکار نەهێنن، ڕقیان لە ڕەنگی شین ببێتەوە، چونکە نیشانەی تووڕەیی ئاسمانە لە ئەهریمەن. یەزیدییەکان پەیکەری "مەلیکە تاووس" یان (قوتیش) لە برۆنز دروست کردووە، کە هەموو ساڵی پیاوێکی ئایینی، بە ناوی (قەواڵ) بەسەر یەزیدییەکانیدا دەگێڕێ.

یەزیدییەکان بڕوایان بە دادگاکردنی گیان هەیە. دوای مردن گیان لەبەردەمی دادگایەکی ڕاستدا ڕادەگیرێ، کە لە حەوت دادگەر پێک هاتوون، ئەو کەسانەی شەڕیان لە خێریان زۆرتر بێ، دەکەونە تاریکاییەوە، یا دەبنە بەراز و مەیموون و مار. ئەوانەی خێر و شەڕیان بەرامبەرە، ئەوە دەیانخەنە شوێنێک بە ناوی (زینەخ)، خۆشی و ناخۆشی دەبینن. ئەوانەشی خێریان زۆرترە، ئەوا دەچنە بەهەشتەوە.

شێوەی خواپەرستیی ئایینی یەزیدییەکان، لە بەیانیان و چێشتەنگاوان نوێژ دەکەن. هەروەها ڕۆژو دەگرن (سێ ڕۆژ ڕۆژو دەگرن، لە ١٢ دێسەمبەرەوە دەست پێ دەکا و لە ١٥ی هەمان مانگدا کۆتایی پێ دێ). جێژنیشیان گەلێ زۆرە، وەلێ جەژنی سەری ساڵی ڕۆژهەڵات، (لە یەکەم چوار شەمەی مانگی ئەپرێلدا) و جەژنی ڕۆژو (ڕۆژی چوارەم لە ڕۆژوبوون)، جەژنی چلەی هاوین (لە مانگی یول)، جەژنی چلەی زستان (لە مانگی فێبروەری). هەروەها هاوبەشیکردنی ئیسلامەکان لە جەژنی قوربان و ڕۆژی چوارەم ڕۆژی ئایینیانە. یەزیدییەکان دەچنە سەر گۆڕی شێخ عودەی لە دۆڵی "لالش" لە نزیک شاری مەسلەوە و حەج دەکەن، ئەوەش لە یەکەم ڕۆژی مانگی ئەکتۆبەردا، بەپێی

کەلەندەری ڕۆژهەلات، منداڵەکانیان بە ئاوی – لالش تەڕ (تەعمید) دەکەن و لە یەکێ لە شەوەکانی ساڵدا، کە ناوی "شەرەفا مەزن" ـە ئاهەنگ دەگێڕن... هتد.

سیستەمی ئایینی و کۆمەلایەتی یەزیدییەکان

لە کۆمەڵگەی یەزیدییەکاندا، چوار چینی ئایینی هەن:

پیر – بە گەورەترین پیاوی ئایینی دادەنرێ.

شێخ – نوێنەری سەرۆکی ئایینییە.

قەوال – ئەو کەسانەن کە کاری گێڕانی "مەلیکە تاووس" یان لە نێو خەڵکیدا پێ سپێردراوە و هەروەها سەرپەرشتی هەندێ کاروباری ئایینی پلە دوو دەگرنە ئەستۆی خۆیان.

هەژار – کاری ئەمانەش تەنیا خزمەتکردنی گۆڕەکەی شێخ عودەیە.

چینێکی دیکەش لە نێو یەزیدییەکاندا هەیە، بە مورید ناو دەبرێن، ئەمانە زۆربەی خەڵکی پێک دەهێنن.

لە نێو یەزیدییەکاندا، ژنهێنان لە نێوان چینە ئایینییەکاندا قەدەغەیە، ژن لە ئایینەکانی دیکە ناخوازن و کچیش جگە لە یەزیدی، بە کەسی دیکە نادەن. لەبەر هەندێ لێکدانەوەی ئایینی، یەزیدییەکان لە ژنهێناندا ئازاد نین، بەڵکوو دەبێ لەو هۆز و چینە ئایینییانە ژن بهێنن، کە بۆیان دیاری کراوە.

سەرۆکی ئایینی و دونیایی یەزیەییەکان، بە "میری میران" ناو دەبرێ. دەسەلاتی لە ڕادە بە دەرە و بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی بەسەر خەڵکیدا، چەندین میری لەبەر دەست دایە. پلە و پایەی "میری میران"، لە باوکەوە بۆ کوڕ بە میرات دەمێنێتەوە.

یەزیدییەکان دوو پەرتووکی پیرۆزیان هەیە، یەکەمیان پێی دەوترێ (مەسحەفا ڕەش)، کە باسی شتە حەرام و حەلاڵەکان دەکا لە ئایینی یەزیدیدا. دووەمیشیان پێی دەوترێ (مەسحەفا جەلوە)، ئەم پەرتووکەش زیاتر باسی سەرگوزشتەی دروسبوونی گەردوون و حەوت فریشتەکە دەکات.

**حروفییەکان**

بیروباوەڕی حروفی لە چەرخی هەشتەمی زایینیدا، لە لایەن فەزڵوڵا ناوێکەوە دروست بووە. ئەو زانایە بیروڕای تەشەیعی لەسەر بناغەی پیت لێک داوەتەوە، لە هەمان کاتداباسی قورئانی بە شێوەیەکی مەجازی کردووە و لێکی داوەتەوە. هەروەها فەرمودەکانی پێغەمبەریشی بە هەمان شێوە باس کردووە، بەلام وای باس کردوون، کە

لەگەڵ بیروڕای تایبەتی خۆیدا بگونجێ و خزمەت بە ڕێبازەکەی خۆی بکات. حروفییەکان دەڵێن، لەبەر ئەوەی واتای قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر، هەمووی مەجازیین، کەس لە فەزڵولاّ زیاتر، توانای تێگەیشتنی لە واتاکانی قورئان نەبووە.

مریدەکانی حروفی، ڕێزێکی زۆریان لە شێخەکەی خۆیان گرتووە. بە بڕوای ئەوان، گوایە پیاوێکی ئیشکەر بووە (جامانەی درووە) و زۆریش سەرڕاست بووە و بێ فڕوفێڵ ناوبانگی دەرکردووە، هەر لەبەر ئەوەش بووە، هەندێ کەس ناویان نابوو (فەزڵولاّی حەلاّڵ خۆر).

وا دیارە فەزڵولاّی حروفی، بەپێی هەندێ لە سەرچاوەکان، دەبێ لە ساڵی ٧٨٨ی کۆچیدا (١٣٨٦یزاییني)، دەستی بە ئاشکراکردنی بیروڕاکانی کرد بێ و خەڵکی بۆ سەر بیروباوەڕەکەی خۆی بانگ کردووە، تا ببنە لایەنگری. لە ساڵی ٧٩٦ی کۆچیدا (١٤٩٠ی زایینی)، بیروڕاکانی خۆی لە پەرتووکی (جاوادان نامە)دا نووسیووە

لە بارەی ساڵی لەدایکبوونی فەزڵولاّی حروفی، هەندێ کەس وای بۆ دەچن، کە لە ساڵی ٧٤٠ی کۆچیدا (١٣٣٩ی زایینی) لە دایک بووە. بەلاّم ساڵی مردنی یا کوشتنی، بە تەواویی ڕوون نییە. هەندێ کەس پێیان وایە، کە لە سەردەمی کوڕی سێیەمی تەیموری گورگانیدا مردووە. لەو سەردەمەدا نەک هەر فەزڵولاّ بۆ خۆی کوژراوە، بەڵکوو لەبەر دەمارگیریی ئایینزایی، ژمارەیەکی زۆریشیان لە مریدەکانی کوشتووە.

حروفییەکان لە ترسی کوشتن و لەنێوبردن، شوێنەکانی خۆیان چۆڵ کردووە و پەنایان بۆ بەر ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بردووە. لەوێ گەلێ خۆیان لە بەکتاشەکان نزیک کردۆتەوە. وردە وردە کاریان تێکردوون. تا ڕادەیەک لە ناو زیاتریان پێ نەماوە. وا دیارە بە پشتیووانی بەکتاشییەکان، کە ئەو سەردەمە کاروباری ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییان، زۆر لەبن چنگدا بوو، نەک هەر لە سنووری ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا، بەڵکوو لە ئێرانیشدا، جارێکی دیکە خۆیان گرتبێتەوە و بەهێز بووبنەوە. بەلاّم ئەم بەهێزبوون و خۆگرتنرەویە، زۆری نەخایاند، لەبەر ئەوەی جارێکی دیکە کوشتاریان لێ کردنەوە، دوای ئەوەی پیاوێکی لوڕی، کە ناوی "ئەحمەد لوڕی" بوو، چەقۆیەکی لە شێخی حروفییەکان (شاروخ) دا و برینداری کرد، بەلاّم دەسوەشاندنەکە زۆر کاریگەر نەبوو، بۆیە شێخ نەمرد، ئەمەش لە ساڵی ٨٧٠ی کۆچیدا (١٤٢٦ی زایینی)، لە مزگەوتی هەرات ڕووی دا.

## بەشی چوارەم: ڕەوکردن و چڕیی دانیشتووان

### ٠١ ڕەوکردنی دانیشتووان

ڕەوکەر بەو کەسانە دەوترێ، کە لە شوێنی لەدایکبوونیان و ژیانیانەوە، لەبەر هەر هۆیەک بێ، بەرەو شوێنێکی دیکە دەگوێزنەوە، ئەو شوێنە بەجێ دەهێڵن و لەوێ نامێننەوە و بۆ نێوچەیەکی دیکە لە چوارچێوەی وڵاتەکەی خۆیاندا، یا بۆ دەرەوەی وڵات بار دەکەن.

#### یەکەم: ڕەوکردنی ناوەکی

ساڵی چەند هەزار کەس و جاری واش هەیە، چەند ملیۆن کەس شوێنی لەدایکبوونیان دەگۆڕن. ڕێژەی ڕەوکەران لە ساڵی ١٩٨٥دا، لە دەوروبەری لە ٣٢٪ی گشت دانیشتووان بوو. ئەم ڕێژەیە بۆ وڵاتێکی دواکەوتووی وەکوو کوردستان زۆرە. تەنانەت بە بەراوردکردن، لەگەڵ دەوڵەتەکانی دیکەی باشووری – ڕۆژئاوای ئاسیادا، وەکوو تورکیا (١٩٨٥ – ٢٣٪)، ئێران (١٩٨٦ – ٢٢٪)، عێراق (١٩٨٧ – ٢٢٪) زۆر زیاترە.

#### هۆکانی ڕەوکردنی ناوەکی

هۆکانی ڕەوکردنی ناوەکی، لە فاکتەرەکانی ڕامیاریی، ئابووریی و کۆمەڵایەتیی پێک هاتوون، وا لە خوارەوە بە درێژی لە هەر یەکێکیان دەدوێین:

#### یەکەم: هۆکارە ئابوورییەکان

باری ئابووری لە ١٩٨٥ دا، بە گەورەترین هۆی ڕەوکردنی ناوخۆ دادەنرێ. زیاتر لە ٧٦٪ی ڕەوکەران، شوێنی لەدایکبوونی خۆیان دەگۆڕن، تا بتوانن کەمی ژیانی ئابووری خۆیان باشتر بکەن. ئەم ڕێژەیە لە هەرێمی باکوور – ٨٥٪ و لە ڕۆژهەڵات – ٨٣٪ و لە باشوور – ٣٦٪ و لە ڕۆژئاوا – ٨٦٪ بوو. هۆ ئابوورییەکانیش لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

– بێکاریی: زۆربەی زۆری دانیشتووانی چالاکی ئابووریی گوندنشینەکان و بەشێکی گەورەی دانیشتووانی شارۆچکە و شارۆکەکانی کوردستان، بێ کار دەمێننەوە، بە تایبەتی پاش تەواوبوونی وەرزی کشتوکاڵ، لە هەمان کاتدا، کارێکی دیکەش نادوزنەوە، تا خۆیانی پێوە خەریک بکەن. لەبەر ئەوە بەشێک لە کرێکاری گوندەکان و شارۆچکەکان،

لەبەر بێکاری ڕوو لەو شوێنانە دەکەن، کە کاری تێدا دەست دەکەوێ، ئەو شوێنانەش بە زۆری دەکەوێتە شارە گەورەکانەوە.

– جیاوازیی ڕۆژانە: ڕۆژانەی کرێکاری کەرتی پیشەسازیی، خانوو دروسکردن و کرێکاری کڕین و فرۆشتن، دوو کەڕەت لە ڕۆژانەی ئەو کرێکارانە زیاترە، کە لە بەشی کشتوکاڵیدا کار دەکەن. ئەم جیاوازییە لە ڕۆژانە و دەسکەوتی کرێکاراندا، بە فاکتەرێکی هاندەر دادەنرێ، بۆ ئەوەی کۆمەڵانی خەڵکی، شوێنی لەدایکبوونیان بگۆڕن.

– پیشەی نوێ: هەندێ کەس لە کاتی سەربازیکردندا، یا لە قوتابخانە پیشەییەکاندا، یا لە ژێر دەستی وەستایەکدا وەک شاگرد کار دەکا، فێری هەندێ پیشەی تازە دەبن. لەبەر ئەوەی لە نێوچەکەی خۆیاندا، بەگوێرەی ئەو پیشەیە کارێ نادۆزنەوە، بۆ شوێنێکی دیکە کۆچ دەکەن، تا کار پەیدا بکەن و بە ئاسانی بژین.

– دروسکردنی عەمار و ئاوبەند: بۆ نموونە، دروسکردنی هەموو ئەو ئاوبەندانەی، لە کوردستاندا، وەکوو دوکان و دەربەندیخان و ئەتاتورک... تاد دروست بوون، بە دەیان گوندیان لەگەڵ خۆیاندا کاول و نقوم کرد. زەوییەکان لە کار کەوتن. خەڵکەکە ناچار بوون، کۆچ بکەن و لە جێگەیەکی دیکە خۆیان نیشتەجێ بکەن و جۆری ژیانێکی تازە و کارێکی نوێ، بۆ خۆیان پەیدا بکەن.

– بەکارهێنانی تەکنیکی نوێ لە کشتوکاڵدا: بەکارهێنانی تەکنیکی نوێ لە کشتوکاڵدا، بۆتە هۆی ئەوەی، بە سەدان کەس لەسەر کارەکانی خۆیان دەربکرێن و دەستیان پێ لە کار بکێشرێتەوە، چونکە تراکتۆرێ یاخود کەمباینێک، لە چەند کاتژمێرێکدا، بە تەنیا دەتوانێ، کاری چەندین ڕۆژی سەدان جوتیار بکات. ئەوانەشی بێکار دەمێننەوە، لە ناچاریدا ڕوو لە شارەکان دەکەن.

**دووەم: هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان**

فاکتەرەکانی کۆمەڵایەتی بوونەتە هۆی گۆڕینی شوێنی ژیانی لە ٤٪ی گشت ڕەوکەرانی ناوەکی. هۆکانیشی ئەمانەن:

– درێژەدان بە خوێندن: ئارەزووی درێژەدان بە خوێندن، پاڵ بە زۆر کەسەوە دەنێ، دوای تەواوکردنی قۆناغی یەکەمی خوێندن، لە شوێنی لەدایکبوونیانەوە کۆچ بکەن، بۆ ئەو شوێنانەی قۆناغی دووەم و سێیەمی خوێندنەکەی خۆیانی لێ تەواو دەکەن، بە تایبەتی بۆ شارە گەورەکان، کە پەیمانگا جۆراوجۆرەکان و زانکۆکانی تێدا کۆ بۆتەوە. هەروەها دوای

تەواوکردنی خوێندن، ژمارەیەکی زۆر لەو خوێندکارانە ناگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی پێشووی خۆیان و لە شارەکان دەمێننەوە.

– ژیانی ئاسوودەیی شار: ژیانی ڕۆژانەی شارنشینەکان، لەچاو ژیانی ڕۆژانەی گوندنشینەکاندا، گەلێ ئاسانتر و ئاسودەتر و خۆشترە. دانیشتووانی شارەکان، پێویستیی ڕۆژانەیان لە کارەبا و ئاو و هۆکانی هاتوچۆ و کەلوپەلە پێویستییەکانی ژیان لە بازاڕەکاندا و شوێنی پشوودان و ڕابواردن وەکوو گازینۆ و سینەما و چایخانە و شانۆ و نامەخانەی گشتیی... هتد هەمیشە لەبەر دەست دایە.

– ناکۆکیی لە نێوان بنەماڵەکاندا: هەندێ جار وا ڕێک دەکەوێ، لە گوندکاندا ناخۆشی لە نێوان دوو بنەماڵەدا دروست دەبێ. زۆربەی ئەو ناخۆشییانە، لەسەر منداڵان و ئاشکرابوونی پەیوەندی نێوان کوڕ و کچ، وێرانکردنی بەرهەمی کشتوکاڵ، دەمەقاڵێ لەسەر هەندێ شتی ئاسایی... ڕوو دەدەن، کە لە ئەنجامدا، یەکێ لە بنەماڵەکان ناچار دەبن، شوێنی ژیانی خۆیان بەجێ بهێڵن و ڕوو لە شوێنێکی دیکە بکەن.

– زەوتکردنی زەوی کشتوکاڵ: بەشی زۆری زەوییە کشتوکاڵییەکان لە گوندەکاندا، بە دەست پیاوە بە دەسەڵاتەکانەوەیە، وەکوو شێخ و ئاغا و میر و بەگزادە و برا گەورە... ئەمانە زەوییەکانیان بە جوتیارەکان بە کرێ دەدەن، پاش تەواوبوونی ماوەکە، جوتیارەکان زەوییەکانیان بۆ خاوەن موڵکەکان دەگێڕنەوە، بۆیە بەشی زۆریان ناچار دەبن. ڕوو لە جێگەیەکی دیکە بکەن، تا زەوی دیکە بە کرێ بگرن.

– کەمی میرات: دوای مردنی باوک، سامانەکەی بەسەر منداڵەکانیدا دابەش دەکرێ. جاری وایە میراتەکە کەمە و بەجیا ژیانی ڕۆژانەی بەشی هەر یەکێ لە منداڵەکان دابین ناکات، لەبەر ئەوە هەندێ لەو منداڵانە، بە خۆیان و خێزانەکانیانەوە، بۆ جێگەیەکی دیکە بار دەکەن.

– دەسەڵاتی گەورە پیاوان: گەورە پیاوان، لە شێخ و ئاغا و میر و بەگزادە و خان و برا گەورە، دەستیان بەسەر خەڵکی گوندەکاندا دەڕوا، بۆیە هەر جوتیارێ لەگەڵیاندا نەگونجێ و تووشی گیروگرفت ببێ، ناچار دەبێ گوندەکە بەجێ بهێڵێ و بار بکا و بڕوا، ئەگینا سزا دەدرێ.

**سێیەم: هۆکارە رامیارییەکان**

نزیکەی لە ٢٠٪ ڕەوکردنە ناوەکییەکان، بۆ هۆی ڕامیاری دەگەڕێتەوە. ئەم ڕێژەیە لە پارچە جیاوازەکانی کوردستاندا جیاوازە، بۆ نموونە لە باکووری کوردستاندا – ١١٪، لە ڕۆژهەلاَت – ١٥٪، لە باشوور – ٦٠٪ و لە ڕۆژئاوادا – ١٠٪ی گشت ڕەوکەران پێک دێنێ، هۆکانیشی دەگەڕێتەوە بۆ:

– چەوساندنەوەی نەتەوایەتی: لەبەر هۆکاری چەوساندنەوەی نەتەوەیی، بە دەیان هەزار کەسی خەڵکی نێوچە جیاجیاکانی کوردستان، شوێنی لەدایکبوون و ژیانیان بەجێ هێشتووە و ڕوویان لە چیاکان کردووە و لە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەیی یەکانیاندا، چەکیان هەڵ گرتووە.

– مەترسی کوشتن: هێزە سەربازییەکانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە، هەمیشە پەلاماری خەڵک دەدەن و بە بیانووی پشگیریکردنی شۆڕش و هێزی پێشمەرگەوە، ڕاویان دەنێن و دەیان کوژن، بۆیە کۆمەلاَنی خەڵکی لە ناچاریدا، بۆ ئەوەی خۆیان لەو دەسدرێژییانەی هێزەکانی داگیرکەر بپارێزن، ڕادەکەن و پەنا بۆ بە نێوچە ئازادکراوەکانی شۆڕش و چیاکان دەبەن.

– گۆڕینی پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتووانی کوردستان: دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا، بە سەدان هەزار کەسیان لە خاکی باوباپیانیانەوە، بۆ نێوچەکانی بندەستی خۆیان و دەرەوەی کوردستان گواستۆتەوە، لەبری ئەوانە تورک و فارس و عەرەبیان لە شوێندا چاندوون، تا بە خەڵکی بسەلمێنن، ئەو شوێنانە کوردستان نییە.

– بنکەی جەنگی: دروسکردنی هەندێ بنکەی سەربازیی و فڕۆکەخانەی جەنگی، لە دەوروبەری شارەکانی کەرکووک و ماردین... وایان لە خەڵکی ئەو نێوچانە کردووە، بۆ جێگەیەکی دیکە کۆچ بکەن، تا لە گیروگرفتەوە دوور بن.

– پاراستنی بیرە نەوتەکان: کوردستان لە ڕووی سامانی سروشتییەوە، بە تایبەتی نەوت، زۆر دەوڵەمەندە. ئەم دەوڵەمەندییە بە شێوەیەکی، لە هەر شوێنێ بیرێ لێ بدرێ، نەوتی لێ دەدوزرێتەوە. ئەگەر ئەو بیرە نەوتانە لە گوندەکانەوە نزیک بن، ئەوا دەزگاکانی دەوڵەت، دانیشتووانی ئەو نێوچانە، بۆ شوێنێکی دیکە ڕادەگوێزن.

**ئەنجامەکانی ڕەوکردنی ناوەکی**

لە ئەنجامی ڕەوکردنی ناوەکیدا، کۆمەڵە دیاردەیەکی ڕامیاریی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی دێتە کایەوە، جا ئەو دیاردانە، چ لەو شوێنانەدا بێ کە خەڵکی کۆچیان لێ دەکات، یا لەو شوێنانەدا بێ کە خەڵکی کۆچیان بۆ دەکات، هیچ لە باسەکە ناگۆڕێ. بە کورتی خۆیان لە مانەدا دەبینن:

- شێواندنی پێکهاتەی تەمەن و توخم

وەکوو دەردەکەوێ، ئەوانەی بۆ شارە گەورەکان ڕەو دەکەن، بە زۆری نێرینەن و تەمەنیان لە نێوان ١٥ – ٢٠ ساڵان دایە. ئەنجامی ئەم کۆچکردنەش، ئەوەیە کە ڕێژەی ئەم دەستەیە لە گوندەکاندا کەم دەکا و لە شارەکاندا زیاد دەکات.

- زیادبوونی بێکاری لە شارەکاندا

زۆربەی ئەو کەسانەی ڕوو لە شارەکان دەکەن، بۆ مەبەستی کار پەیدا کردنە، لەبەر ئەوەی لە شارەکاندا کارێکی زۆر دەست ناکەوێ، پرۆژەی ئابووری زۆری تێدا نییە، بازاڕی شارەکان توانای ئەوەیان نییە، بۆ کرێکارە بێکارە کۆنەکانی شارەکان خۆیان و ئەو کرێکارە بێکارە تازانەی لە گوندکانەوە هاتوون، کاریان بۆ بدۆزێتەوە. لەبەر ئەوە دەبینین، ژمارەیەکی زۆر لە کرێکارە کۆچکردووەکان، بەبێ کار دەمێننەوە.

- ناشیرینکردنی دیمەنی شارەکان

ئەو پارە و پوڵەی ڕەوکەرەکان پێیانە، تا لەشارەکاندا کارێ دەدوزنەوە و بە تەواویی دادەمەزرێن، بەشی خواردن و کرێ خانوو ناکات.لەبەر ئەوە ڕەوکەرەکان ناچار دەبن، لە دەرەوەی شار و لەو شوێنانەدا کە موڵکی شارەوانی نین، یاخود دەستی دەزگاکانی شارەوانی پێدا ناگات، هەندێ خانوبەرەی خواروخێچ، لە قوڕ و تەنەکە و دار و دەوار دروست دەکەن، تا تێیدا بحەوێنەوە، ئەو خانووانە بە شێوەیەکن، کە دیمەنی شارەکە تێک دەدەن.

- هەرا وئاژاوە

لەو گەڕەکانەی ڕەوکەرەکانی لێ دەژین، لەبەر نەبوونی هێمنی و ئاسایش، لە ژیانی ڕۆژانەدا گەلێ گیروگرفت و هەراوئاژاوە و ناخۆشی ڕوو دەدات. ئەمەش زیاتر بۆ ئەم چەند

فاکتەرانە دەگەڕێتەوە: جیاوازیی دابونەریتی ڕەوکەرەکان، نەبوونی هۆکانی ژیان وەکوو ئاو و کارەبا و جادە و شەقامی قیرتاو و هۆکانی هاتوچۆ، بڵاوبوونەوەی بێکاری لە نێویاندا.

### دووەم: ڕەوکردنی دەرەکی

مەبەست لە ڕەوکردنی دەرەکی، ئەو چەشنە ڕەوکردنانەیە کە ڕەوکەران سنووری ڕامیاری دەوڵەت دەبڕن، واتە لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی دیکە کۆچ دەکەن.

ژمارەی ڕەوکەرانی دەرەکی، واتە ژمارەی هەموو ئەو کەسانەی کوردستان بەجێ دەهێڵن و ژمارەی هەموو ئەو بێگانانەی دێن بۆی، ئامارێکی تایبەتی لەو بارەیەوە، لەبەر دەستدا نییە. بەپێی بۆچوونی هەندێ کەس، ژمارەی بێگانەکان، لە ساڵی ١٩٨٥دا، لە دەوروبەری پێنج هەزار کەسدا بوون، (تەنیا لە باکووردا دوو هەزار کەس بوون). بەڵام ئەم ژمارەیە، زۆر زیاترە، ئەگەر ژمارەی هەموو ئەو کەسانەشی لەگەڵدا حیساب بکەین، کە لە تورکیا و ئێران و عێراق و سووریاوە، کۆچیان بۆ کوردستان کردووە و لەوێ نیشتەجێ بوون، دەتوانین بڵێین ئەو کاتە، ژمارەیان دەگاتە چەند ملیۆنێک. بەڵام ژمارەی خەڵکی کوردستان لە دەرەوەی وڵات، بەپێی هەندێ سەرچاوەی ڕامیاری، خۆی لە دەوروبەری دوو ملیۆن کەس دەدات. ئەگەر هەموو ئەوانەشیان لەگەڵدا حیساب بکەین، کە لە وڵاتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا دەژین، ئەوا ژمارەکە دوو ئەوەندە دەبێ.

#### هۆکانی ڕەوکردنی دەرەکی

هۆکانی ڕەوکردنی دەرەکی، لە کۆمەڵێ فاکتەری ڕامیاریی و ئابووریی پێک هاتوون. وا لە خوارەوە لێیان دەدوێین:

– سەرنەکەوتنی شۆڕش

دوای کوژاندنەوەی هەر شۆڕشێکی چەکداری، دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، زۆر بە شێوەیەکی کێوییانە داخی دڵی خۆیان بە خەڵکی بێتاوانیان ڕشتووە، لەبەر ئەوە گەلێ لە شۆڕشگێڕانی کورد، بۆ شوێنی تایبەتی خۆیان نەگەڕاونەتەوە و ڕوویان لە یەکێ لە دەوڵەتەکانی نێوچەکە، یا یەکێ لە دەوڵەتەکانی دیکەی جیهان کردووە، یاخود بە بیانووی ئەوەی کە خەڵکی کوردستان، یارمەتی شۆڕشیان داوە و چەکیان هەڵ گرتووە، پەلاماری دانیشتووانی گوند و شارۆچکە و شارەکانی کوردستانیان داوە و بەرەو خاکی

دەوڵەتە داگیرکەرەکان ڕاپێچیان کردوون. بۆ نموونە، ئەنفالی سەر و ماڵی خەڵکی لە باشووری کوردستاندا، کە لە لایەن دەوڵەتی داگیرکەری عێراقەوە، لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٨ – ١٩٩٠دا کرا، نزیکەی ١٨٣ هەزار کەس گیران و بەرەو بیابانەکانی سەر سنووری نێوان عێراق و عەرەبستانی سعوودییە و ئوردون ڕاپێچ کران و هەمووش لەوێ بە کۆمەڵ گوللەباران کران. هەروەها ڕاگوێزانەوەی زۆربەی گوند و شارۆچکەکانی سەر بە پارێزگاکانی سلێمانی و کەرکووک و هەولێر و دهۆک، هەزاران گوند لە نێوچەکانی سیرت و دیاربەکر و دەرسیم.

– سەپاندنی دەسەڵاتی دەوڵەت

بە بیانووی پارێزگاریکردنی یەکێتی دەوڵەت و یەکپارچەیی خاک و گەڕانەوەی ئاشتیی و ئاسایش و هێمنی و چەسپاندنی دەسەڵات، دەوڵەتانی تورکیا، ئێران، عیراق و سووریا، بە دەیان هەزار سەرباز و پۆلیس و سیخوڕ و چڵکاوخۆر و فەرمانبەری تورک و فارس و عەرەبیان هێناوەتە کوردستانەوە.

– گۆڕینی پێکهاتەی نەتەوەیی کوردستان

هەر لە ساڵەکانی بیستەوە، تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا، بە بەردەوامی ژمارەیەکی زۆریان لە تورک و فارس و عەرەب هێناوە و نیشتەجێیان کردوون، تا ڕێژەیان لە نێو دانیشتووانی کوردستاندا زیاد بکا. ئەم بەرنامەیە لە سەرەتادا زیاتر لە نێوچەی سەر سنوورەکان بەگەڕ خراوە، پاشان پەلیان بۆ نێوچە ستراتیژییەکان هاویشتووە، تا لەو ڕێگایانەوە، لە پانتایی خاکی کوردستان کەم بکەنەوە و نێوچە ئیدارییەکانی ئەم وڵاتە بەرتەسک بکەنەوە.

– نەبوونی ئاسایش

جەنگ لە کوردستاندا، پاڵی بە ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانەوە ناوە، کە وڵاتەکەیان بەجێ بهێڵن و ڕوو لە دەوڵەتەکانی دیکەی جیهان بکەن، تاکوو ژیانێکی ئاسایی و دوور لە چەرمەسەری، بۆ خۆیان و خێزانەکانیان دابین بکەن و لە ڕاونان و گرتن و کوشتن و برینەوە دوور بن.

- گۆڕانکاریی لە ژیانی ئابووریدا

بێکاریی و بەرزبوونەوەی نرخی خواردەمەنیی و هەموو پێویستییەکانی دیکەی ژیان و کەم دەرامەتیی، وای لە هەزاران خەڵکی بێچارە کردووە، کە نیشتمانەکەی خۆیان بەجێ بهێڵن و لە پێناوی پەیداکردنی کار و دابینکردنی پێویستییەکانی ژیاندا، پەنا بۆ دەوڵەتەکانی جیهان (بە تایبەتی ئەوروپا) بەرن و پەنابەری بۆ خۆیان هەڵ بژێرن، کە دواتر گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەر شێوازی ژیانیاندا دێت.

- ڕاهاتن لەگەڵ ژیانی دەرەوەدا

ئەوانەی بۆ خوێندن ڕێیان کەوتۆتە دەرەوەی وولات، هەندێکیان دوای ئەوەی خوێندنەکەیان تەواو دەکەن، تاقەتی ئەوەیان نییە لەو وولاتانەوە، بۆ کوردستان بگەڕێنەوە، جا لەبەر هەر هۆیەک بێ، لەبەر ژنهێنان بێ یاخود لەبەر ڕاهاتن و کارپەیداکردن و کاریگەرێتی ئەو کلتورە نوێیە بێ لەسەریان، گرنگ نییە.

### چڕیی دانیشتووان

وەکوو دەزانین، لە هەندێ نێوچەدا دانیشتووان زۆرن و لە هەندێ نێوچەی دیکەش کەمن، نێوچەی واش هەن، کەسی تێدا ناژی. بۆ ئەوەی بە تەواویی نەخشەی دابەشبوونی جوگرافیی دانیشتووان بزانین، دەبێ وەک جوگرافیزانێ، باسی چڕی دانیشتووان بکەین. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، دەبێ ژمارەی دانیشتووان، لەسەر یەک کیلۆمەتری چوارگۆشە (کچگ) زەوی (بە هەموو جۆرەکانییەوە) دیاری بکەین.

### چڕی گشتیی

چڕی گشتیی دانیشتووان لە کوردستاندا، لە ساڵی ١٩٨٥دا، ٤٥ کەس بوو لە یەک کیلۆمەتری چوارگۆشەدا. ئەم دیاردەیە لەچاو چڕی دانیشتووانی دەوڵەتەکانی تورکیا (١٩٨٥ - ٦٥ کەس) و سووریا (١٩٨٦ - ٥٠ کەس) کەمترە. بەڵام لە چڕی دانیشتووانی ئێران (١٩٨٦ - ٣٠ کەس) و عێراق (١٩٨٧ - ٣٦ کەس) زیاترە.

## هۆکانی دابەشبوونی دانیشتووان

**یەکەم: هۆ سروشتییەکان**

- دیاردەی ڕووبەر

خانوو دروسکردن، جادە ڕاکێشان، کەناڵ لێدان، هاتوچۆ لە نێوچە تەختاییەکان، لەچاو نێوچە ئاوییەکان یا نێوچە شاخاوییەکاندا، گەلێ ئاسانترە. لەبەر ئەوە خەڵکی زیاتر ئارەزووی ئەوە دەکەن، لە نێوچە تاختاییەکاندا بژین، وەک لە نێوچانەکانی دیکە.

- سەرچاوەی ئاو

ئاو پێویستییەکی ڕۆژانەی گەلێ گرنگە، بۆیە سەرچاوەکانی ئاو، کانی، بیر، چەم، ڕووبار، ئەم شوێنانە هەموو مەڵبەندی ژیانی کۆمەڵانی خەڵک دیاری دەکەن، بە مەرجێ لە تەنیشت ئەو سەرچاوانەوە، زەوی بۆ کشتوکاڵ کردن هەبێ و ئاووهەواش تا ڕادەیەک لەگەڵ ژیاندا بگونجێ.

- پلەی گەرما

هەر لە کۆنەوە مرۆڤ هەوڵی داوە، زیاتر لەو شوێنانەدا بژی، کە پلەی گەرمای مامناوەندییە و بارانبارینیشی بەشی ئەوەندە بکات، تا بە ئاسانی دەغڵودانی لێ بچێندرێ و شین ببێ. لەبەر ئەوە، ئەو شوێنانەی لە کوردستاندا ئاووهەوایان خۆشترە، خەڵکیان زیاتر لێ دەژی لەچاو نێوچەکانی دیکەدا.

- بەپیتی زەوی

پانتاییەکی دیاریکراوی زەوی کشتوکاڵ، ئەگەر بەپیت و بەرەکەت بێ، لەو زەوییانەی بێپیتن، توانای بەخێوکردنی خەڵکیان زیاترە. بۆیە دەبینین، ئەو شوێنانەی زەوییەکانیان بەپیتن، دانیشتووانیان زیاتر.

- کاروباری ئیداری

لەبەر ئەوەی سەنتەری یەکە ئیدارییەکان، مەڵبەندی سەرەکی کاروبارە ئیداری و کڕین و فرۆشتن، دەزگاکانی تەندروستی: (نەخۆشخانە، دەرمانخانە، دکتۆر)، خوێندن: (پەیمانگاکان و زانکۆکان و خوێندنی دیکە)، ڕاگەیاندن: (ڕادیۆ، تەلەفیزیۆن، ڕۆژنامەگەری)، شوێنی ڕابواردن: (شانۆ، سینەما، گازینۆ، چایخانە...) ئەمانە هەمووی کاریکیان کردووە، کە خەڵکی زیاتر بۆ ژیان و کارکردن، ڕوویان تێ بکات، بۆیە چڕی دانیشتووان لە یەک (کچگ) دا، لەچاو شوێنە گشتییەکانی دیکەدا، چەندین جار زیاترە، هەرچەندە سەنتەری یەکە ئیدارییەکان گەورەتر بێ، ئەوەندە زیاتر خەڵکی رووی تێدەکات

- دووریان

یەکگرتنەوەی ڕێگاوبانەکان لە شوێنێکی دیاریکراودا، زیاتر دەبێتە هۆی پەیدابوونی کاری خزمەتگوزاریی و ئاڵوگۆڕکردن و هاتوچۆ، هەندێ جاریش هەندێ پیشەسازیی پچکۆلە، لەو شوێنانەدا دادەمەزرێندرێ، کە بە هۆی هەموو ئەو هۆیانەوە، خەڵکی ڕوولەو نێوچانە دەکەن و زیاتر نیشتەجێ دەبن و بەرە بەرە چڕی دانیشتووان لە یەک (کچگ) دا، زیاد دەکات.

- دەرهێنانی کانزاکان

دەرهێنانی کانزاکان و بەکارهێنانیان لە هەر نێوچەیەکدا، لە ماوەیەکی کورتدا، سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشێ و کرێکارێکی زۆر بە خۆیان و خێزانەکانیانەوە، لەو نێوچەیەدا کۆ دەبنەوە و کار دەکەن. ئەمە لە لایەکەوە خۆی لە خۆیدا، قەرەباڵغییەک پەیدا دەکات، لە لایەکی دیکەشەوە، لە بوارەکانی خزمەتگوزاریی و هاتوچۆکردن و ئاڵوگۆڕکردنی کەلوپەلدا، جوڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتیی و بازرگانیی، بۆ کەسانی دیکە دێنێتە کایەوە.

### سێیەم: هۆ ڕامیارییەکان

- کۆکردنەوەی خەڵکی

کـۆکـردنەوەی دانیـشـتـووانی چەند گـوندێ لـە شـوێنێکی دیاریکراودا، وەکـوو ئەو کۆکردنەوە زۆرەملیانەی لە باشووری کوردستاندا، لە دوای ساڵەکانی ١٩٧٠ز دەستی پێ کرد، پلەی چڕی دانیشتـووان لە شوێنێکی دیاریکراودا بەرز دەکاتەوە. بۆ نموونە، چڕی دانیشتووانی ناحیەی دیانا، لە ساڵی ١٩٦٥دا، ٣٥ کەس بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٧دا ئەو چڕییە زیاەی کرد و گەیشتە ٩٣ کەس لە یەک (کچگ)ەدا، واتا نزیکەی سێ جاری زیاد کردووە.

- بنکەی سەربازیی

دامەزراندنی بنکەی سەربازیی لە هەر شوێنێکدا، بە یەکێ لە ئاکامەکانی زیادکردنی ژمارەی دانیشتووان، لە یەک یەکەی ڕووبەردا دادەنرێ. دیارە لە کوردستاندا، بەرزی چڕی دانیشتووانی هەندێ نێوچە، بە کاریگەرێتی ئەم فاکتەرەوە بەسراوەتەوە.

- بارەگای هێزە ڕامیارییەکان

دامـــەزراندنی بارەگـای هەندێ لە هێـزە ڕامـیـارییـەکـانی ووڵات، لە نێـوچەیەکی دیاریکراودا، وەک فـاکـتـەرێکی بەرزبوونەوەی پلەی چڕی دانیـشـتـووان لەو نێـوچانەدا، ڕۆڵێکی گرنگ وازی دەکات. لەو جێگایانەدا بە بەردەوامی، کۆمەڵێ خەڵکی تێدا دەژی، لە هەمان کاتیشدا، ڕۆژانە بەسەدان کەس، بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانیان، دێن و دەڕۆن. ئەم جوڵانەوەیەش پێویستی بە خزمەتکردنی جۆراوجۆر هەیە.

### جیاوازیی هەرێمەکان لە چڕیی گشتیدا

لەبەر ئەوەی پارێزگاکانی کوردستان، لە ڕووی پانتایی و ژمارەی دانیشتووان و باری پێشکەوتنی پیشەسازیی و بەرهەمی هەمەجۆرەی کشتووکاڵ و گەورەیی و گچکەیی سەنتەرە ئیدارییەکان و شوێنی جوگرافییان، لە یەکدی جیاوازن، پلەی چڕی دانیشتووان لە نێوانیاندا، وەکوو یەک نیین. تەماشای خشتەی ژمارە (٢٠) و نەخشەی ژمارە (٧) بکە.

## خشتەی ٢٠

### شێی ڕێژەیی لە مانگەکانی ساڵدا، ١٩٨٠

| مانگ | ئێستگە | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | حەویجە | کەرکووک | ئەرزەڕۆم | ئورفە | وان | شەهری کورد | ئیلام |
| ژەنیوەری | ٥٤ | ٧٥ | ٧٦ | ٧٨ | ٧٠ | ٥٥ | ٧١ |
| فێبروەری | ٥٩ | ٦٥ | ٧٥ | ٦٧ | ٧١ | ٥٢ | ٧٠ |
| مارس | ٤٩ | ٥٩ | ٧٤ | ٦٥ | ٦٩ | ٥٥ | ٥٦ |
| ئەپریل | ٤١ | ٤٩ | ٦٥ | ٥٣ | ٦٤ | ٥٠ | ٦٠ |
| مایی | ٢٦ | ٣٢ | ٦٠ | ٤٣ | ٥٧ | ٦٠ | ٥٥ |
| یونی | ١٦ | ٢٠ | ٦٥ | ٣٠ | ٥٠ | ٥٥ | ٤٥ |
| یول | ١٥ | ١٩ | ٥٠ | ٢٧ | ٤٤ | ٤٢ | ٣٦ |
| ئوگوست | ١٦ | ١٨ | ٤٦ | ٢٨ | ٤١ | ٣٢ | ٣٢ |
| سەپتەمبەر | ١٣ | ٢١ | ٤٩ | ٣٢ | ٤٣ | ٣٠ | ٢٩ |
| ئوکتۆبەر | ٢٥ | ٢٩ | ٦٠ | ٤٢ | ٥٨ | ٣٧ | ٤٧ |
| نۆڤەمبەر | ٣٣ | ٤٩ | ٧١ | ٥٨ | ٦٧ | ٤٥ | ٥٥ |
| دێسەمبەر | ٤٢ | ٦٩ | ٧٥ | ٦٩ | ٧٠ | ٥١ | ٥٦ |
| کۆ | ٣٢ | ٤٨ | ٦٣ | ٤٨ | ٥٩ | ٤٧ | ٥١ |

## نەخشەی ٧




نەخشەی ٧ چڕیی گشتیی دانیشتووان، ١٩٨٥

- چڕی گشتیی زۆر بەرز (٨٠ کەس و بەرەو ژوور)

بەرزترین چڕی لە پارێزگاکانی موسڵ و گازی ئانتەب دایە، نزیکەی دوو جار لە چڕی دانیشتووانی هەموو وولات زیاترە. ئەمەش لەبەر هەبوونی دوو شاری هەرە گەورەی وولات (موسڵ و گازی ئانتەب) پیشەسازی گەورە و گچکەی جۆراوجۆر بە تایبەتی فیتەرچی، جگە لەوەی ڕێژەی پانتایی زەوی چاندراو گەلێ زۆرە و بەرهەمیشی زۆرە. لە هەمان کاتدا، سەنتەرێکی گەورەی هاتوچۆکردن و پێکگەیشتنی شارەکانی کوردستان و دەرەوە پێک دەهێنێ، بازرگانییەکی گەرموگوڕیشی تێدایە. هەروەها بە مەڵبەندێکی گەورەی کلتوریی و خوێندن دادەنرێ و گەلێ پەیمانگا و زانکۆی لێ کراوەتەوە.

- چڕی گشتیی بەرز (٥٠ - ٨٠ کەس)

پلەی چڕی گشتیی لە پارێزگاکانی مەرعەش و کرماشان و دیاربەکر و ئادیەمان و سلێمانی و مەلاتیە و کەرکووک و ئەلازیغ و هەولێر و ئازەربایجانی غەربی و ماردین، لە پلەی چڕی تێکڕای کوردستان زیاترن. هۆی ئەم زۆرییەش جۆراوجۆرن، لەوانە: هەبوونی شاری گەورە، ژمارەیەکی زۆر لە دەزگای پیشەسازیی بە تایبەتی گۆڕین، ئاستی بەرهەمی سالانەی کشتووکاڵ، لە یەک هێکتاردا بەرزە.

- چڕی گشتیی ناوەندی (٣٠ - ٥٠ کەس)

گەورەیی و فراوانی پانتایی زەوی، لەچاو ژمارەی دانیشتوواندا، کشتوکاڵی فراوان، نەبوونی پیشەسازیی گەورە (١٠ کەس و زیاتر)، ئەمانە هەموویان ئەو فاکتەرانەن، کە بوونەتە هۆی نزمی پلەی چڕی دانیشتووان، بە بەراوردکردن لەگەڵ دوو گرووپەکەی پێشوودا .بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا لە چڕی پارێزگاکانی سەرانسەری وولات زیاترن..

- چڕی گشتیی نزم (٣٠ کەس و کەمتر)

مەبەست لە چڕی گشتیی نزم ئەوەیە، کە لە پلەی چڕی سەرانسەری دانیشتووانی پارێزگاکانی کوردستان کەمترە. ئەم پلەی چڕییەش خۆی لەم پارێزگایانەدا دەبینێ: بینگۆڵ، کوهگیلویە، وان، ئەرزنجان، دەرسیم، هەکاری. هەندێ لەو هۆیانەی ئەم نزمییەیان لەو پارێزگایانەدا هێناوەتە کایەوە، بۆ کەمی زەوی کشتوکاڵ و دواکەوتوویی باری ئابووریی و نائارامی باری ڕامیاریی و ژیانی کۆچ و ڕەوکردن و کەم ئاویی دەگەڕێتەوە.

## چڕیی کشتووکاڵی

چڕیی گـــشـــتی لـە وولآتێکدا، وێنەیەکی تەواومـــان ناداتێ، لەبەر ئەوەی لە کـــاتی دابەشکردنی زەوییەکاندا بەسەر دانیشتووواندا، هەموو وەکوو یەک سەیر کراون. بۆ زانینی ژمارەی تەواوی دابەشبوونی دانیشتووان، جوگرافیزانەکان، دانیشتووانی گوندەکان بەسەر زەوییە کشتوکاڵییەکاندا دابەش دەکەن، ئەمەشیان بە چڕی کشتووکاڵی ناو ناوە.

چڕی کشتووکاڵ:- لە ساڵی ١٩٨٥دا، بریتی بوو لە ٥٧ کەس لە یەک کچگ دا. ئەم چڕییەش لەچاو چڕی هەندێ لە وولّاتەکانی باشووری – ڕۆژئاوای ئاسیادا بۆ نموونە – عێراق (١٩٨٧ – ٢٧٨ کەس) زۆر کەمتر بووە، ئەمەش ئەو ڕاستییە دووپات دەکاتەوە، کە کوردستان وولآتێکی شاخاوییە.

جیاوازی نێوان نزمترین و بەرزترین دیاردەی چڕی کشتوکاڵی، زیاتر لە ١٠٠٠ کەس لە یەک کچگ دا دەبێ. بەرزترین چڕی کشتووکاڵی لە ساڵی ١٩٨٥دا، لە پارێزگای ئازەربایجانی غەربی بوو (١٠٣٠ کەس)، نزمترینیشیان لە پارێزگای وان بوو (٢٤ کەس)، هەموو پارێزگاکانی دیکەش، دەکەونە نێوان ئەم دوو چڕییەوە.

## بەشی پێنجەم: شارنشین و گوندنشین

کوردستان یەکێ لەو وولاتانەی سەر رووی زەمین پێک دەهێنێ، کە مرۆڤ هەر لە کۆنەوە تێیدا ژیاوە و بە تواویی نیشتەجێ بووە و ئاوەدانی تێدا دروست کردووە. لەبەر ئەوەی ئاووهەوای بۆ ژیانی کۆمەڵانی خەڵکی سازگار بووە، زەوی بەپیتی زۆری هەبووە و خەڵکی لە دێر زەمانەوە، ئەو زەوییانەیان چاندووە، لە دار و بەرد، کەرەسەی کشتوکاڵیان دروست کردووە، تا وردە وردە خەڵکی پێکەوە کۆ بوونەتەوە و پەیوەندی کۆمەڵایەتیی و ئابوورییان لە نێوانیاندا پەرەی سەندووە، لە ئاکامدا دەستیان بە ئاوەدانکردنەوە و دروسکردنی خانوبەرەی خۆیان کردووە. گردی چەرمۆی نزیکی شاری کەرکووک، یەکێ بووە لەو ئاوەدانییانەی، لە سەرەتای ئاوەدانکردنەوەی کوردستاندا، واتە چەند هەزار ساڵێ پێش ئێستا مرۆڤ دروستی کردوە، کە ئەورۆ بە کۆنترین ئاوەدانی نێوچەی رۆژهەڵاتی نێوەراست دادەنرێ.

ژیانی رامیاریی، ئابووریی و کۆمەڵایەتیی، لە یەک کات و بە یەک شێوە و پلە، وەکوو یەک گەشەی نەکردووە. ئەم پرۆسەیە، لەو ئاوەدانیانەی کەوتبوونە سەر رێگە و بانەکان و ئەوانەی لە نێوان دوو نێوچەی بە بەرهەمی جیاوازی (کشتووکاڵ و بەخێوکردنی مەڕوماڵاتەوە) هەڵ کەتبوون، لەو ئاوەدانیانەی خەڵکەکەی زیاتر بە دروسکردنی کەلوپەلی نێوماڵ و کشتوکاڵ خەریک بوون، هەروەها ئەو نێوچانەی بە سەنتەرێکی خواپەرسی دادەنران، لە هەموو ئەو نێوچانەدا، پرۆسەی گۆڕان و گەشەسەندن، خێراتر و بە تەوژمتر بووە لەچاو نێوچەکانی دیکەدا دەتوانین بڵێین، لە نێو ئەو ئاوەدانیانەشدا، نێوچەی وا هەبووە، لە ئاوەدانیەکانی دیکەی دەوروبەری زیاتر پەرەی سەندووە و خێراتر ئاوەدان کراوەتەوە.

### ١٠ شارنشین

سەرەتای پەیدابوونی شار لە کوردستاندا، بۆ کۆتایی سەدەی چوارەم و سەرەتای سەدەی سێیەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە. وەک شارەکانی ئەربائیلۆ (ئەربیل – هەولێر) و ئەرابخا (کەرکووک)... تاد. شاری هەولێر یەکێکە لە کۆنترین شارە مێژوویی‌یەکانی جیهان. ئەم شارە نەک هەر توانی وەک سەنتەرێکی شارستانی و هەندێ جاریش وەکوو گەورەترین، شاری باشووری رۆژئاوای ئاسیا بمێنێتەوە، بەڵکوو ناوەکەی خۆشی پاراست، لە کاتێکدا شارە هاوتەمەنەکانی هەولێر، ئەورۆ تەنیا پاشماوە و کەلاوەکانیان ماون.

**ژماره و دینامیکی شارنشینەکان**

لەبەر ئەوەی کوردستان بەسەر دوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریادا دابەش کراوە، یەک پێناسەی دیاریکراو بۆ شار نییە. لە باکووری کوردستاندا، بەو ئاوەدانیانە دەڵێن شار، کە سەنتەری پارێزگا (ئیل)، قەزا (ئیلچە)،هەروەها ئەوانەی ژمارەی دانیشتووانیان لە دە هەزار کەس زیاترە. لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا، بەو ئاوەدانیانە دەگوترێ شار، کە وەزارەتی شارەوانی پلەی شارداری پێ بەخشیوون، ئەمانەش لە سەنتەری پاریزگاکان (ئوستان)، قەزا (شارستان)، ناحیە (بەخش) و هەندێ ئاوایی دیکە پێک هاتوون. لە باشووری کوردستاندا، بەو ئاوەدانیانە دەگوترێ شار، کە سەنتەری یەکە ئیدارییەن (پارێزگا و قەزا و ناحیە) بێ ئەوەی ژمارەی دانیشتووان و جۆری چالاکی ئابووریی دانیشتوانەکەی تێدا ڕەچاو بکرێ. لە ڕۆژئاوای کوردستاندا، بەو ئاوەدانیانە دەوترێ شار، کە سەنتەری پارێزگا و قەزان و هەروەها ئاوەدانییەکانی دە هەزار کەس زیاتر.

ڕێژەی شارنشینەکان بەپێی پێناسە ڕەسمییەکان، لە ساڵی ١٩٨٥دا، ٤٥,٢٪ی (١١ ملیۆن کەس) گشت دانیشتووانی کوردستانی پێک دەهێنا. ئەم ڕێژەیە لەچاو هی ڕێژەی تورکیا (١٩٨٥ – ٥٣,٧٪)، ئێران (١٩٨٦ – ٥٤,٣٪)، عێراق (١٩٨٧ – ٧٠,٢٪) و سووریا (١٩٨٥ – ٥١,٨٪) کەمترە.

ژمارە و ڕێژەی شارنشینەکان، بە بەردەوامی لە زیاد بوون دان، تەماشای خشتەی ژمارە (٢١) بکە.

ژمارەی دانیشتووانی شارەکان لە چل ساڵی ڕابردوودا، ١٣ ملیۆن و ٣١٥ هەزار کەسیان زیاد کردووە. هۆکانیشی بۆ ئەم خاڵانەی لای خوارەوە دەگەڕێتەوە:

- کۆچکردنی گوندنشینەکان بۆ شارەکان.
- پاراستنی ئاستی بەرزی زیادبوونی سروشتی.
- هاتنی بێگانەیکی زۆر بۆ کوردستان.
- گواستنەوەی دانیشتووانی گوندەکان بۆ شارەکان، یاخود گواستنەوەیان بۆ ئاوەدانییە نوێکان، کە بەپێی پێناسەی تازە، بە شار دادەنرێن.
- گۆڕینی ستاتوسی هەندێ لە ئاوەدانییەکان لە گوندەوە بۆ سەنتەری یەکە ئیدارییەک.

**خشتەی ٢١ ژمارە و ڕێژەی شارنشین و گوندنشین لە کوردستاندا، ١٩٥٥-١٩٩٥ (خامڵاندن)**

| ساڵ | دانیشتووان هەزار | شارنشین هەزار | شارنشین ٪ | گوندنشین هەزار | گوندنشین ٪ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٥٥ | ٩٧٥٠ | ٢٣٧٩ | ٢٤,٤ | ٧٣٧١ | ٧٥,٦ |
| ١٩٦٥ | ١٢٩٨٦ | ٤١١٧ | ٣١,٧ | ٨٨٦٩ | ٦٨,٣ |
| ١٩٧٥ | ١٧٤٢٨ | ٦٩٨٧ | ٤٠،١ | ١٠٤٤١ | ٥٩,٩ |
| ١٩٨٥ | ٢٣٥١٩ | ١٠٦٢٣ | ٤٥,٢ | ١٢٨٩٦ | ٥٤,٨ |
| ١٩٩٥ | ٣١٠١٥ | ١٥٦٩٤ | ٥٠,٦ | ١٥٣٢١ | ٤٩،٤ |

پارێزگاکان لە نێوان خۆیاندا، لە ڕووی پلەی شارنشینییەوە، جیاوازییەکی یەکجار زۆریان هەیە. دانیشتووانی پارێزگای هەولێر، لە ٤,٧٧٪ لە شارەکاندا دەژین. تەنیا لە ١,٢٣٪ی دانیشتووانی موش، لە شارەکاندا دەژین. تەماشای خشتەی ژمارە (٢٢) و گرافی ژمارە (٧) بکە.

بۆ ئاسانکردنی شیکردنەوەی پلەی شارنشینی پارێزگاکان (ژمارەی شارنشینەکان بۆ ژمارەی گشت دانیشتووان)، هەوڵ دەدەین، لەم گروپانەی لای خوارەوەدا دەسنیشانیان بکەین:

خشتەی ٢٢ پایەی شارنشینیەتی لە پارێزگایەکاندا، ١٩٨٥

| پارێزگا | دانیشتووان هەزار | شارنشین | | گوندنشین | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | هەزار | ٪ | هەزار | ٪ |
| ئادیەمان | ٤٣١ | ١٥١ | ٣٥,١ | ٢٨٠ | ٦٤,٩ |
| ئاگری | ٤٢١ | ١٤٢ | ٣٣,٧ | ٢٧٩ | ٦٦,٣ |
| بینگۆڵ | ٢٤٢ | ٦٢ | ٢٥,٣ | ١٨٠ | ٧٤,٧ |
| بدلیس | ٣٠١ | ١٢٠ | ٣٩,٨ | ١٨١ | ٦٠,٢ |
| دیاربەکر | ٩٣٥ | ٤٧٢ | ٥٠,٥ | ٤٦٢ | ٤٩,٥ |
| ئەلازیغ | ٤٨٤ | ٢٣٤ | ٤٨,٣ | ٢٥٠ | ٥١,٧ |
| ئەزرنجان | ٣٠٠ | ١١٢ | ٣٧,٤ | ١٨٨ | ٦٢,٦ |
| ئەرزەڕۆم | ٦٣٤ | ٣١١ | ٤٩,٠ | ٣٢٣ | ٥١,٠ |
| گازی ئانتەب | ٩٦٦ | ٦٤٣ | ٦٦,٥ | ٣٢٣ | ٣٣,٥ |
| هەکاری | ١٨٣ | ٥٦ | ٣٠,٤ | ١٢٧ | ٦٩,٦ |
| مەلاتیە | ٦٦٦ | ٣٠٨ | ٤٦,٢ | ٣٥٨ | ٥٣,٨ |
| مەرعەش | ٦٣٩ | ٢٩٤ | ٤٦,٠ | ٣٤٥ | ٥٤,٠ |
| ماردین | ٦٥٢ | ٢٤٤ | ٣٧,٤ | ٤٠٨ | ٦٢,٦ |
| موش | ٣٣٩ | ٧٨ | ٢٣,١ | ٢٦١ | ٧٦,٩ |
| سیرت | ٥٢٥ | ٢٣٧ | ٤٥,٢ | ٢٨٨ | ٥٤,٨ |
| دەرسیم | ١٥٢ | ٤٣ | ٢٨,٤ | ١٠٩ | ٧١,٦ |
| ئۆرفە | ٧٩٥ | ٤٠١ | ٥٠,٥ | ٣٩٤ | ٤٩,٥ |
| وان | ٥٤٧ | ١٨٩ | ٣٤,٦ | ٣٥٨ | ٦٥,٤ |
| ئازربایجانی غ | ١٩٧٢ | ٩٠٣ | ٤٥,٨ | ١٠٦٩ | ٥٤,٢ |
| کرماشان | ١٤٦٣ | ٨٢٢ | ٥٦,٢ | ٦٤١ | ٤٣,٨ |
| کوردستان | ١٠٧٨ | ٤٢٨ | ٣٩,٧ | ٦٥٠ | ٦٠,٣ |
| بەختیاری | ٦٣١ | ٢٢٩ | ٣٦,٣ | ٤٠٢ | ٦٣,٤ |
| لوڕستان | ١٣٦٧ | ٦٣٩ | ٤٦,٧ | ٧٢٨ | ٥٣,٣ |
| ئیلام | ٣٨٢ | ١٥٧ | ٤١,١ | ٢٢٥ | ٥٩,٠ |
| کوهگیلویە | ٤١٢ | ١١١ | ٢٦,٩ | ٣٠١ | ٧٣,١ |
| نەینەوا | ١٣٣٠ | ٩٤٨ | ٧١,٣ | ٣٨٢ | ٢٨,٧ |
| کەرکووک | ٦٠١ | ٤٥٣ | ٧٥,٤ | ١٤٨ | ٢٤,٦ |
| دهۆک | ٢٩٣ | ٢١٩ | ٧٤,٦ | ٧٤ | ٢٥,٤ |
| هەولێر | ٧٧٠ | ٥٩٦ | ٧٧,٤ | ١٧٤ | ٢٢,٦ |
| سلێمانی | ٩٥٢ | ٦٨١ | ٧١,٥ | ٢٧١ | ٢٨,٥ |

**گرافی ٧**
**شارنشین و گوندنشین**



گرووپی یەکەم:

ڕێژەی شارنشینان لەم گرووپەدا، کە پارێزگاکانی هەولێر و کەرکووک و سلێمانی و دهۆک دەگرێتە خۆی، لە ٧٠٪ی گشت دانیشتووان زیاترن. هۆکانیش بۆ ئەم خاڵانە دەگەڕێتەوە:

- ڕوخاندنی نزیک لە چوار هەزار گوند و گواستنەوەی دانیشتووانیان و نیشتەجێکردنیان لە شارەکان.
- بەرزی ئاستی چالاکی ئابووریی دانیشتووان.
- نیشتەجێکردنی بێگانە لە شارەکاندا.
- کەمبوونەوەی ژمارەی گوندەکان بە بەراوردکردن لەگەڵ یەکەی شارەکاندا.

گرووپی دووەم:

دانیشتووانی پارێزگاکانی موسڵ، گازی ئانتەب، کرماشان، ئورفە و دیاربەکر، لە نێوان ٥٠٪ تا ٦٨٪ یان لە شارەکاندا دەژین. هۆکانیش بۆ بەرزی چالاکی پیشەسازیی، گەرمی بازاڕ، کاری کشتوکاڵی، دوریان دەگەڕێتەوە، جگە لەوەی ئەو شارانە بە سەنتەرێکی گرنگی خوێندن دادەنرێن.

گرووپی سێیەم:

ئەم گرووپە لە ڕووی ڕێژەی شارنشینانەوە، دوای دوو گرووپەکەی سەرەوە دێ. ڕێژەی شارنشینان لە پارێزگاکانی ئەرزەڕۆم، ئەلازیغ، لورستان، مەلاتیە، مەرعەش، ئازەربایجانی غەربی، سیرت، ئیلام، بدلیس، ئەرزنجان، بەختیاری، ئادیەمان، وان، ئاگری، هەکاری، لە نێوان ٣٠٪ تا ٤٩٪ی گشت دانیشتووان پێک هێناوە. هۆکانیشی دەگەڕێتەوە بۆ: لە لایەکەوە تاکوو ئێستا گۆڕانێکی لەبەرچاو لە بواری چالاکی ئابوورییدا ڕووی نەداوە و ژمارەیەکی زۆر بە کاری کشتوکاڵەوە خەریکن، لە لایەکی دیکەشەوە کەرتی چالاکی پیشەسازیی نزمە و کەرتی خزمەتگوزارییش دواکەوتووە.

گرووپی چوارەم:

نزمترین ڕێژەی شارنشینان، لە پارێزگاکانی دەرسیم، کوهگیلویە، بینگۆڵ، موش، دایە. ڕێژەی شارنشینان لە ٣٠٪ی گشت دانیشتووان کەمترە. هۆکانیشی بۆ نەبوونی پیشەسازیی تازە و توانای کشتوکاڵی و پشگوێ خستنی دەوڵەت دەگەڕێتەوە.

### دابەشکردنی شارەکان

شارەکان بە دوو شێوە دابەش دەکرێن: یەکەم، بەپێی قەوارەیان، واتا ژمارەی دانیشتووان. بۆ ئەم مەبەستەش زاراوەی ڕیزبەندی (تەرتیب) بەکار دەهێنین. دووەم، بەپێی چەشنی کار. بۆ ئەمەش زاراوەی پۆلێنکردن (تصنیف) بەکار دەهێنین.

### ڕیزبەندی شارەکان

کوردستان ساڵی ١٩٨٥، خاوەنی ٣٨٦ ئاوەدانی بوو، کە هەموویان بە شێوەیەکی ڕەسمی بە شار ناسرا بوون. ژمارەی دانیشتووانی هەرە گەورەکەیان، لە نیو ملیۆن کەس تێپەڕی کرد بوو. ژمارەی دانیشتووانی هەرە پچووکەکەشیان، لە سەد کەس کەمتر بوو.

شارەکان بەپێی ژمارەی دانیشتووانیان، بەسەر نۆ دەستەدا دابەش دەکرێن. تەماشای خشتەی ژمارە (٢٣) و نەخشەی ژمارە (٨) بکە. بۆ ئەوەی بە تەواویی لە نەخشەی دابەشبوونی شارنشینەکان بگەین، ئەو شارانەی کە بە ژمارە لە یەکدییەوە نزیکن، کۆیان دەکەینەوە و لە ژێر دەستەیەکی گەورەتردا ڕیزبەندیان دەکەین.

**خشتەی ٢٣ ڕیزبەندی شارەکان، بەپێی ژمارەی دانیشتووانیان، ١٩٨٥**

| چینەکانی شار | ژمارەی شار | دانیشتووان: هەزار | دانیشتووان: ٪ |
|---|---|---|---|
| ٥٠٠ و زیاتر | ٢ | ١٢٢٥ | ١١,٥ |
| ١٠٠-٥٠٠ | ١٧ | ٢٩٠٩ | ٢٧,٤ |
| ٥٠-١٠٠ | ٣١ | ٢٨٣١ | ٢٦,٦ |
| ٣٠-٥٠ | ٢٩ | ١١٣٨ | ١٠,٧ |
| ٢٠-٣٠ | ٣١ | ٧٧٦ | ٧,٣ |
| ١٠-٢٠ | ٥٩ | ٨١٧ | ٧,٧ |
| ٥-١٠ | ٨٢ | ٦٠٤ | ٥,٧ |
| ٢-٥ | ٧٨ | ٢٧٤ | ٢،٦ |
| لە ٢ کەمتر | ٥٧ | ٤٩ | ٠,٥ |
| کۆ | ٣٨٦ | ١٠٦٢٣ | ١٠٠,٠ |

## نەخشەی شارەکان ٨




**نەخشەی ٨** **شارەکان بەپێی ژمارەی دانیشتووان، ١٩٨٥**

**یەکەم: شار**

ئەم زاراوەیە بۆ ئەو ئاوەدانیانە بەکار دەهێنین، کە ژمارەی دانیشتووانیان لە بیست هەزار کەس زیاترە. لە ڕاستیدا هەر لەم ئاوەدانیانەدا، شار وەک تێگەیشتنێکی تەواو پێناسە دەکرێ، ئەمەش بەسەر چەند لقێکی دیکەدا دابەش دەکرێ:

– شارە گەورەکان (١٠٠ هەزار کەس و زیاتر)

ئەورۆ لە کوردستاندا، ١٩ شاری لەم چەشنە هەیە. واتە ٤,٩٪ی گشت شارەکان دەگرێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، لە ٣٨,٩٪ی شارنشینی تێدا دەژین. هۆیەکانی بریتین لە: کۆبوونەوەی زۆربەی پیشەسازییە تازە و گەورەکان لەم شارانەدا، دوو لەسەر سێی هەموو دەزگا سەرەکییەکانی دەوڵەت و کاروباری ئیداریی زانکۆ و پەیمانگا و خوێندنگاکان و بەشی تەندروستی و نەخۆشخانەکان و جوڵانەوەی بازرگانی کڕین و فرۆشتن لەم شارانەدا خڕبوونەتەوە. لە نێوان هەموو ئەو شارانەشدا، موسڵ (١٩٨٧ – ٦٦٤ هەزار کەس)، کرماشان (١٩٨٦ – ٥٦١ هەزار کەس)، گازی ئانتەب (١٩٨٥–٤٧٦ هەزار کەس)، هەولێر (١٩٨٧ – ٤٤٦ هەزار کەس)، کەرکووک (١٩٨٧ – ٣٩٩ هەزار کەس)، سلێمانی (١٩٨٧ – ٣٦٤ هەزار کەس)، دیاربەکر (١٩٨٥ – ٣٠٦ هەزار کەس)، ئەمانە هەموو بە گەورەترین شاری کوردستان دادەنرێن.

– شارە ناونجییەکان (١٠٠ – ٢٠ هەزار کەس)

ژمارەی ئەم شارانە لە ساڵی ١٩٨٥دا، ٩١ شار بوو، واتا ٢٣,٦٪ی گشت شارەکانی پێک دەهێنا. ژمارەی دانیشتوانیشیان ٤٤,٦٪ی گشت دانیشتووانی شارنشینان بوو. ئەم شارانە بە زۆری لە سەنتەری پارێزگا و قەزاکان پێک هاتوون. لە ڕووی پیشەسازیی، بازرگانیی و خوێندنەوە لەم شارانەدا، لەچاو ئەو شارانەی پێشووتردا، گەلێک نزمترە. هەروەها چالاکی ئابووری بەشی زۆربەی زۆری ئەم ئاوەدانیانە، لەسەر بناغەی کشتوکاڵ دامەزراوە.گەورەترین شارەکانی ئەم دەستەیە بریتییە لە: ورمێ (١٩٨٦ – ٣٠١ هەزار کەس)، ئەرزەڕۆم (١٩٨٥ – ٢٤٦ هەزار کەس)، مەلاتیە (١٩٨٥ – ٢٤٣ هەزار کەس)، مەرعەش (١٩٨٥ – ٢١٠ هەزار کەس)، خوڕەم ئاباد (١٩٨٦ – ٢٠٩ هەزار کەس)، سنە (١٩٨٦ – ٢٠٦ هەزار کەس).

**دووەم: شارۆچکە**

بـاری ئابـووریی و کـــۆمـــەڵایەتیی و ڕامـــیـــاریی، لەو ئاوەدانیـــانەی کـــە ژمـــارەی دانیشـتووانیـان لە نێوان ٢٠ – ٥ هەزار کەس دایە، لەچاو ئەو ئاوەدانیانەی پێشوودا (٢٠ هەزار کـەس و زیاتر) گـەلێک دواکـەوتوون.، لەبەر ئەوە بە هەڵەدا دەچین، ئەگـەر هـەمـان زاراوەی شاریان بۆ بەکار بهێنین. بۆیە ئێمە لێرەدا، زاراوەی شارۆچکە پڕ بە پێستی ئەم ناوە دەزانین. شارۆچکەش بەسەر دوو بەشدا دابەش دەکرێت:

– شارۆچکە گەورەکان (٢٠ – ١٠ هەزار کەس)

ژمـارەی ئەم جـۆرە لـە سـاڵی ١٩٨٥دا، ٥٩ شـارۆچکە بوو. ڕێژەی دانیـشـتـووانیـان، نزیکەی ٨٪ی گـشت دانیـشـتـووانی شـارەکـانی کوردسـتـان بوو. واتا بـە ژمـارە و ڕێژە، لە گروپی پێشوتر گچکەترە.

لەم شـــارۆچکانەدا جگە لـە بەڕێوەبـردن، گـەلێ خـــزمـــەتگوزاری دیکە هـەیە، وەکـــوو قـوتابـخـانەی سـەرەتایـی و ناوەندیی کوڕان و کـچـان، خـەسـتـەخـانە، دوکـانی شـتـتـومـەک فرۆشتنی هەمەجەشنە، فیترچی و جێگای چاککردنەوەی مەکینەی دیکە. لەگەڵ ئەم هەموو کارە شارییانەشدا، هێشتا کشتوکاڵ بە بناغەی چالاکی ئابووری دانیشتووان دادەنرێ.

گرنگترین شارۆچکەکانی ئەم بەشە، ئەمانـەن: دەهدەشت (١٩٨٦ – ٢٠ هەزار کەس)، سـایین قەڵا (١٩٨٦ – ٢٠ هەزار کەس)، عەینکاوە (١٩٨٧ – ١٩ هەزار کەس)، قەرەقۆش (١٩٨٧ – ١٩ هەزار کەس)، دەرسیم (١٩٨٥ – ١٨ هەزار کەس).

– شارۆچکە پچکۆلەکان (١٠ – ٥ هەزار کەس)

ئەگـەرچی ژمـارەی شـارۆچکەکـانی ئەم بەشـە، لە سـاڵی ١٩٨٥دا، ٨٢ شـارۆچکە بوو، بەڵام ژمـارەی دانیشـتـووانیـان، لە ٦٪ی گشت شـارنشـینان کـەمـتر بوو.لەم شـارۆچکانەدا مـرۆڤ دەتوانـێ، پێویسـتـیـیـە سـەرەکـیـیـەکـانی ژیانی ڕۆژانەی، لە خـواردن و جلوبەرگ و هەندێ خـزمـەتگوزاریی وەکوو قـوتابخـانە و خـەسـتـەخـانە و کـارەبا، هەروەهـا لە هەندێ کەلوپەلی دەسکرد دابین بکات.

هەندێ لە شارۆچکە گرنگەکانی ئەم دەستـەیە، ئەمـانەن: بلداجی (١٩٨٦ – ١٠ هەزار کـەس)، خانێ (١٩٨٥ – ١٠ هەزار کەس)، قەرەقۆچان (١٩٨٦ – ١٠ هەزار کەس)، لێجە (١٩٨٥ – ١٠ هەزار کەس)، بەرتەللە (١٩٨٧ – ١٠ هەزار کەس).

**سێیەم: شارۆکە**

ئاوەدانییەکانی ئەم دەستەیە، کە ژمارەیان لە ساڵی ١٩٨٥دا، ١٣٥ دانە بوو، ژمارەی دانیشتووانیشیان لە ٦٪ی لە ژمارەی گشت شارنشینیەکان کەمتر بوو، بە شارۆکە ناویان دەبەین. چونکە باری ئابووریی و کۆمەڵایەتییان، زۆر لە باری ئابووریی و کۆمەڵایەتی، گوندەکانی دەوروبەریان دەچن. لەگەڵ ئەوەشدا، جۆرە جیاوازییەکیان هەر لە نێواندا دەبینرێ. لەبەر ئەو هۆیە، وەک ئەو بەشانەی پێشووتر، بەسەر دوو بەشدا دابەشیان دەکەین:

- شارۆکە گەورەکان (٥ - ٢ هەزار کەس)

بە ژمارە بە یەکێ لە دەستە گەورەکان دادەنرێ، ژمارەیان لە ساڵی ١٩٨٥دا - ٧٨ شارۆکە بوو. ژمارەی دانیشتووانەکانیان، لەچاو ژمارەی شارۆکەکاندا، زۆر کەمە. لە ساڵی ١٩٨٥دا، لە ٦٪ی ژمارەی گشتێ شارنشینییەکان، کەمتر بوو. ئەم شارۆکانە هەندێکیان بە سەنتەری قەزا و هەندێکی دیکەیان بە سەنتەری ناحیە دادەنرێن. دانیشتووانەکانیان بە زۆری خەریکی کشتوکاڵ کردنن. جگە لە هەندێ خزمەتگوزاریی وەکوو قوتابخانە و خەستەخانە و هەندێ دوکان، هیچ جۆرە کارێکی دیکەی شارییان نییە.

گەورەترین شارۆکەکان، ئەمانەن: شەک (١٩٨٧ - ٥ هەزار کەس)، سیسخت (١٩٨٦ - ٥ هەزار کەس)، ئامێدی (١٩٨٧ - ٥ هەزار کەس)، ئەشترینان (١٩٨٦ - ٥ هەزار کەس)، شیروان (١٩٨٦ - ٥ هەزار کەس).

- شارەدێ

مەبست لە شارە دێ، هەموو ئەو ئاوەدانیە شارانەن، کە ژمارەی دانیشتووانیان لە دوو هەزار کەس کەمترە. ژمارەیان، لە ساڵی ١٩٨٥دا، ٥٧ شارەدێ بوو، ژمارەی دانیشتووانیشیان لە ١٪ی گشت شارنشینەکان کەمتر بوو.

چالاکی ئابووری شارە دێیەکان، بە هیچ جۆرێ لەگەڵ چالاکی ئابووری گوندەکاندا، جیاوازییان نییە. ئەگەر خەسڵەتی ئیداریی ئەم شارەدێیانە لەبەر چاو نەگرین، ئەوا هیچ دیاردەیەک نامێنێ، تا لە گوندەکانی دراوسێیان جیا بکەینەوە.

هەندێ شارەدێ: ساڵح ئاباد (١٩٨٦ - ١,٥ هەزار کەس)، چوارتا (١٩٨٧ - ١,٥ هەزار کەس)، باقرتە (١٩٨٧ - ١,٥ هەزار کەس)، قەزانیە (١٩٨٧ ١,٤ هەزار کەس).

**پۆلێنکردنی شارەکان**

بۆ پۆلێنکردنی شارەکانی کوردستان، بەپێی فەرمانەکانیان Function، شوێنگەی جوگرافی ئابووریی، شوێنی شار لە دابەشبوونی کاردا، ژمارەی دانیشتووان و خەسڵەتی ئیداریی، لەبەرچاو گیراوە. گرنگترین فەرمانەکانی شارەکان، ئەمانەی لای خوارەوەن:

- پایتەخت

ئەورۆ شارێکی دیاریکراو نییە، پایتەختی هەموو کوردستان بێ. لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٨ - ١٩٢٤دا، شاری سلێمانی بوو. لە ساڵی ١٩٤٦دا، شاری مهاباد بوو. لە یونی ١٩٩٢دا، دوای هەڵبژاردنی پەرلەمان و ڕاگەیاندنی فیدراڵی، بە بڕیاری پەرلەمانی کوردستان، شاری هەولێر بوو بە پایتەخت. لە پایتەختدا مەڵبەندی پەرلەمان و ئەنجوومەنی وەزیران و هەموو دەزگا سەرەکییەکانی حوکومەتی هەرێم و مەڵبەندی هەندێ لە دەزگاکانی جیهان و بارەگای سەرکردایەتی هێزە ڕامیارییەکان و پەیمانگاکان و زانکۆ و نەخۆشخانەی گەورە و کاروباری بازرگانی و بانکەکان، وەک سەنتەرێکی سەرەکی نێوان شارەکانی دیکەی کوردستان، هەموو ئەم دامودەزگایانە لە هەولێردا کۆ بۆتەوە، کە ئەمانە هەموو پێکەوە، هۆی زیادبوونی ژمارەی دانیشتووانی شارەکە نیشان دەدەن (١٩٦٥ - ٩١ هەزار کەس بوو، ١٩٧٧ - ١٩٤ هەزار کەس بوو، ١٩٨٧ - ٤٤٦ هەزار کەس بوو، ١٩٩٥ - زیاتر لە یەک ملیۆن کەس بوو) فراوانبوونی ڕووبەرەوە (١٩٩٥ - نزیکەی ٨٠٠ هەزار هێکتار) زیادبوونی چڕی گشتی (١٩٩٥ - ٤٠٠ کەس لە ١ کچگ دا) بوو. لەم شارەدا هەندێ گەڕەکی نوێ و خانووی تازەی چەند نهۆمی و ڕێکوپێک دروست کراون.

- ئەو شارانەی ئەرکی هەمەچەشنەیان هەیە

شارەکانی ئەم دەستەیە، لە شوێنە سەرەکییەکانی چڕبوونەوەی پیشەسازیی کۆن و نوێ، بازرگانی، بەیەکگەیشتنی ڕێگاکان، خوێندنی باڵا - زانکۆ، پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەرەوە، گەلێ دامودەزگای سەرەکی حوکومەت...هتد دیاری دەکرێ. نموونەی ئەو شارە گرنگانەش، وەکوو موسڵ، دیاربەکر، گازی ئانتەب و ورمێ، کرماشان، خوڕەم ئاباد.

- شاری خزمەتگوزاری

پلەی خزمەتگوزاری و قەڵەمڕەوی و چەشنەکانی، لە شارێکەوە بۆ شارێکی دیکە

دەگۆڕێ. لەبەر ئەوە شارەکان، بەپێی پلەی خزمەتگوزاریی بەسەر سێ دەستەدا دابەش دەکەین:

ا – شارە خزمەتگوزارییەکان لەسەر ئاستی پارێزگاکان

سەنتەری پارێزگاکان لەم بەشەدا، بە گەورەترین شوێن دادەنرێت. لە چوارچێوەی ئەم بەشە ئیداریانەدا، بۆ خزمەتکردن لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە، نەک هەر تەنیا بۆ سەنتەری شارەکان، بەڵکوو بۆ گشت یەکە ئیدارییەکانی دیکەش، کە لە ڕووی ئیدارییەوە بەیەکەوە بەستراون، مرۆڤ دەتوانێ گشت پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەی هەر لە خواردەمەنی و جلوبەرگەوە تا ئامراز و شتومەکی پیشەسازیی و داوودەرمان و پێویستییەکانی تەندروستی و لەشساغی و خوێندن و هۆکانی گواستنەوە بۆ هاتوچۆکردن و دەرهێنانی هەمو جۆرە دەکومێنتێکی پێویست بە مەبەستی بەکارهێنانی لە دەرەوەی وولات، لە سەنتەری ئەم پارێزگایانە دەستی بکەوێ. لە هەمان کاتیشدا دەتوانێ، بەرهەمی کشتوکاڵ و کەلوپەلی دەسکردی خۆماڵی، بۆ فرۆشتن بخاتە بازاڕەکانەوە. لەو شارە گرنگانەش ئەمانەن: ئادیەمان، ئەرزنجان، ئیلام، شەهری کورد، قەرەکۆسە، بدلیس، چەولیک، یاسوچ، جۆڵەمێرگ.

ب – شارە خزمەتگوزارییەکان لەسەر ئاستی قەزاکان

ئەم شارانە بە سەنتەری ئیداری خوێندن و لەشساغی و بازرگانی و ڕێگەوبانی گشت ناحیە و گوندەکانی دیکە دادەنرێ. دانیشتووانی نێوچەکە بۆ هەڵسوڕاندنی کاروبارەکانی ڕۆژانەیان و سوودوەرگرتن لە خزمەتگوزارییە جۆراوجۆرەکان، هەموو ڕۆژ دەچنە سەنتەری شارۆچکەکان، لە کوردستاندا ٢١٠ شارۆچکە هەن، کە کارەکانیان لە پێشکەشکردنی خزمەتکردن بە دانیشتووانی قەزاکان پێک هاتووە، لەوانە. بەسنی، دیادین، گەنج، مۆتکی، چنار، پالو، ڕەفاعیە، کیلیس، شەمدینان، گەواش، زاخۆ، چوارتا، ڕەواندز، مەهاباد، سەقز، مەریوان، بڕوجەن، بروجەرد، قامشلی و عەفرین... هتد.

ج – شارە خزمەتگوزارییەکان لەسەر ئاستی ناحیەکان

کاروباری ئیداری و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی و خەستەخانە و پۆستە و بازاڕ، لە سەنتەری ئەم ناحیانەدا هەیە. ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ ، ژمارەیەک لە دانیشتووانی ئاوەدانییاکانی دەوروبەری ناحیاکان، بە مەبەستی سوودوەرگرتن لە

خزمەتگوزارییە جۆربەجۆرەکان و بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری تایبەتی ڕۆژانەی خۆیان، ڕوو لە سەنتەری ئەم ناحیانە بکەن. شارۆکە خزمەتگوزارییەکان لەسەر ئاستی ناحیەکان، ژمارەیان ٤٣٢ شارۆکەن، لەوانە: دیبەگە، دیانا، ئەبدانان، دەهدز، سەحنە، کۆتەک، حەسەن کێف، سورگوجو، گول دوزو، داملاجیک... تاد.

– شارە پیشەسازییەکانی دەرهێنان

بەشێوەیەکی گشتی، کوردستان بە کانزای هەمەچەشنە گەلێ دەوڵەمەندە. هەندێ لەو کانزایانەش لە جیهاندا ناویان دەرکردووە، وەکوو نەوت. شارەکانی کەرکووک، مەسجدی سلێمان، خانەقین، باتمان، گەچساران، کراتشوک (قەرەچوغ)، لە کوردستاندابە گەورەترین شاری دەرهێنانی کانزاکان دادەنرێن. ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانی ئەم شارانە، لە ڕووی چالاکی ئابوورییەوە، خۆیان بەم کارانەوە خەریک کردووە.

– شارەکانی سەر سنوور

پەیوەندی کوردستان لەگەڵ وڵاتەکانی دەوروبەر و جیهاندا، بە شێوەیەکی گشتی لە ڕێگەی چەند دەروازەیەکەوە بە ئەنجام دەگەیەندرێ. بەشێکی زۆر لە دانیشتووانی ئەو نێوچانە، بە بازرگانی و کاروباری ئابووریی و چالاکی ڕێکخستنی هۆیەکانی هاتوچۆوە خەریکن.

– شاری هاوینەهەوار

لەبەر سازگاریی ئاووهەوا و جوانی سروشت، گەلێ نێوچەی کوردستان بۆ ئەوە دەست دەدەن، وەک نێوچەیەکی گەشتگوزاری حیسابیان بۆ بکرێ. هەندێ لەو نێوچانە، هەر لە کۆنەوە بوونەتە نێوچەیەکی گەشتگوزاریی و سەنتەرێکی ڕابواردن و کارکردن، بە شێوەیەک کە سەرنجی خەڵکی و دانیشتووانی کوردستان و وڵاتەکانی دەرەوەی بە لای خۆیدا ڕاکێشاوە. جوڵانەوەی گەشتگوزاریی، لە ساڵانی پڕ لە هێمنی و ئاشتی و ئاساییشدا، دەسکەوتێکی دارایی زۆر گەورەی بە خەزێنەی دەوڵەت بەخشیووە، کە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ. کار لە پەرەسەندنی ژیانی ئابووری وڵات دەکات. لە شارە هاوینەهەوارییە بەناوبانگەکانی ئەوڕۆی کوردستان، شەقڵاوە، سەلاحەدینە.

- شارەکانی بنکەی سەربازیی

بنکەی سەربازیی لە زۆر نێوچەی کوردستاندا دروست کراوە. لەو بنکانەدا مەشق بە دەیان هەزار سەربازی بێگانە دەکەن. ئەم سوپا داگیرکەرانە بە شێوەیە ئامادە کراون، کە ئەگەر لە هەر نێوچەیەکی کوردستاندا، دەنگی نارەزایی بەرز بۆوە و راپەرین و شۆرشی چەکداری دژی ستەم و چەوساندنەوەی نەتەوایەتی بەرپا بوو، ئەوان بە زووترین کات دەگەنە سەری و پالاماری دەدەن و دەنگی شۆرشەکە دەخنکێنن.

- شارە سەکۆییەکان

نەوت بە بۆری دەگەیەندرێتە شارۆچکەی دۆرت یۆل، کە لەسەر کەنداوی ئەسکەندەرونیە. لە ناو ئاو و بەرانبەر ئەم شارۆچکەیە، بە چەند کیلۆمەتر سەکۆی بارکردن دروست کراوە، تا تانکەرە گەورەکان لە نەوتی کوردستان پڕ بکەن.

- شارە بەندەرییەکان

هەندێ لە دانیشتووانی ئەو شارانەی دەکەونە سەر رۆخی ئاوەکان (کەنداوی ئەسکەندەرون، کەنداوی عەرەبی، گۆلی ورمێ و وان) بە کاروباری بارکردن و سەرخستن و گواستنەوەوە خەریکن، . هەردوو شارۆچکەی دەیلەم و دۆرت یۆل، بە بەناوبانگترین و چالاکترین شارەکانی بەندەریی کوردستان دادەنرێن.

## ٠٢ گوندنشین

گوند - ئەو ئاوەدانیانەن کە بەر پێناسەی رەسمی شار نەکەون. واتا ئەو ئاوەدانیانەی کە نە سەنتەری یەکە ئیدارییەکانیان هەیە (پارێزگا، قەزا، ناحیە)، نە ژمارەی گشتیشیان دەگاتە دە هەزار کەس

### ژمارە و دینامیکی گوندنشینەکان

رێژەی گوندنشینەکان لە ساڵی ١٩٨٥دا، ٥٤,٨٪ی گشت دانیشتووانی کوردستان بوو. واتا ١٢ ملیۆن و ٨٩٦ هەزار کەس. ئەم رێژەیە لەچاو رێژەی وولاتەکانی رۆژئاوای ئاسیادا، وەکوو تورکیا (١٩٨٥ - ٤٦,٣٪)، ئێران (١٩٨٦ - ٤٨,٢٪)، عێراق (١٩٨٧ - ٢٩,٨٪) و سووریا (١٩٨٥ - ٤٨,٢٪) زیاترە.

ئەگــەرچی ژمــارەی گــوندنشــینــەکــان، لە زیـادبوون دایە، بـەڵام ڕێژەیان لـە گــشــتی دانیـشتووانی وڵاتدا، بە شـێـوەیەکی گشتی لـە کەمبـوون دایە. تەماشـای خشـتەی ژمـارە (٢١) بکە. هۆکانیـشـی بۆ چەند خـاڵێ دەگـەڕێتـەوە: گـواسـتنەوەی زۆرەملی دانیـشـتـوانی گوندەکان لە لایەن دەوڵەتـەوە، کۆچکردنی هەندێ لە گوندییەکـان بۆ شـارەکان بە ئارەزوو و ویستی خۆیان، تێکدانی گوند و شارۆچکەکانی کوردستان لە لایەن داگیرکەرانەوە.

پارێزگـاکـانی مـوش، بینـگۆڵ، کـوهگیلویـە و دەرسـیـم، لە ڕووی ڕێژەی دانیـشـتـووانی گوندنشینەکانەوە، لە پێش هەموو پارێزگاکانی دیکەوە دێن. پاشان پارێزگاکانی هەکاری، وان، بەخـتـیـاری، ئەرزنجـان... تـاد و لە دوای ئەمـانەش ئازەربـایـجـانی غـەربی، مـەرعـەش، لوڕسـتـان، مەلاتیە دێن. دواتریش هەولێر، کـەرکـووک، دهۆک، سلێـمـانی دێن. هۆکانی ئەم جیـاوازییـەش، بۆ دواکەوتـوویی باری پیشـەسـازیی و ئابـووری کشـتـوکـاڵ و بەرزی ئاسـتی ژیانی شارنشینەکان و گواستنەوەی دانیشتووانی گوندەکان دەگەڕێتەوە.

**دابەشکردنی گوندکان**

گـوندەکـانیش وەکـوو شـارەکـان، بەپێی ژمـارەی دانیـشـتـووان و چەشنی کـارەکـانیـان دابەش دەکرێن.

ڕیزبەندی گوندەکان

کـوردسـتـان لە سـاڵی ١٩٨٥دا، نزیکەی ٣٠ هـەزار گـوندی هەبـوو. تێکڕای ژمـارەی دانیشتـوان، لە هـەر گوندێکدا ٤٣٠ کـەس بوو، واتا هـەر ٧٨ گوند بەرانبەر یەک شـار بوو. لە هـەر ١٠٠ کچگ دا ٥،٦ گوند هەبوو

تێکڕای قەوارەی گوندەکان لە پارێزگاکاندا، وەکوو یەک نییە. لەبەر جیاوازی ژمارەیان و دانیـشـتـووانیان و کـەم و زۆری کشـتـوکـاڵ لە یەک هێکتـاردا، تەمـاشـای خشـتـەی ژمـارە (٢٤) بکە.

لە ڕووی ژمـارەی دانیـشـتـووانەوە، جـیـاوازییـەکی زۆر لە نێوان گـوندەکـاندا هـەیە. بۆ ئاسـانکردنی باسـەکـەمـان، گـونـدەکـان بەسـەر پێنج دەسـتـەدا دابەش دەکـەین. تەمـاشـای خشتەی ژمارە (٢٥) بکە.

- کوێرە گوند (١ - ٥٠ کەس)

ئەم جـۆرە گـوندە، چ لە ڕووی ژمــارەیـان و چ لە ڕووی ژمــارەی دانیــشــتـووانی هـەر گـوندێکەوە، جـێگـایەکی دیاریکراو لە نەخـشـەی جـوگـرافی گـوندەکـاندا دیـاری ناکـات.

خشتەی ٢٤ ژمارەی گوندەکان لە پارێزگاکاندا، ١٩٨٥-١٩٨٧

| پارێزگا | گوندنشین هەزار | گوند | تێکرا قەوارەی گوند |
|---|---|---|---|
| ئادیەمان | ٢٨٠ | ٣٤٩ | ٧٩٩ |
| ئاگری | ٢٧٩ | ٥٥٨ | ٥٠٠ |
| بینگۆڵ | ١٨٠ | ٣١٧ | ٥٦٨ |
| بدلیس | ١٨١ | ٢٧٧ | ٦٥٣ |
| دیاربەکر | ٤٦٢ | ٦٩٣ | ٦٦٧ |
| ئەلازیغ | ٢٥٠ | ٥٧٦ | ٤٣٤ |
| ئەزرنجان | ١٨٨ | ٥٧٠ | ٣٣٠ |
| ئەرزەڕۆم | ٣٢٣ | ٦٢٧ | ٥١٥ |
| گازی ئانتەب | ٣٢٣ | ٥٩٩ | ٥٣٩ |
| هەکاری | ١٢٧ | ١٤٤ | ٨٨٢ |
| مەلاتیە | ٣٥٨ | ٥٢٠ | ٦٨٨ |
| مەرعەش | ٣٤٥ | ٣٤١ | ١٠١٢ |
| ماردین | ٤٠٨ | ٧٢١ | ٥٦٦ |
| موش | ٢٦١ | ٣٦٨ | ٧٠٩ |
| سیرت | ٢٨٨ | ٤٩٩ | ٥٧٧ |
| دەرسیم | ١٠٩ | ٤٢٣ | ٢٥٨ |
| ئۆرفە | ٣٩٤ | ٦٩٠ | ٥٧١ |
| وان | ٣٥٨ | ٥٧٠ | ٦٢٨ |
| ئازربایجانی غ | ١٠٦٩ | ٣٢٠٦ | ٣٣٣ |
| کرماشان | ٦٤١ | – | – |
| کوردستان | ٦٥٠ | ٢٠٢٢ | ٣٢١ |
| بەختیاری | ٤٠٢ | ٨٩٥ | ٤٤٩ |
| ئیلام | ٧٢٨ | ٣٣٦ | ٢١٧ |
| لورستان | ٢٢٥ | ٩٨٥ | ٢٢٨ |
| کوهگیلویە | ٣٠١ | ٢٤٦٦ | ١٢٢ |
| نەینەوا | ٣٨٢ | – | – |
| کەرکووک | ١٤٨ | – | – |
| دهۆک | ٧٤ | – | – |
| هەولێر | ١٧٤ | ١٢٩٠ | ١٣٥ |
| سلێمانی | ٢٧١ | ١٨٥٤ | ١٤٦ |

**خشتەی ٢٥ ڕیزبەندی گوندەکان بەپێی ژمارەی دانیشتووان لە هەندێ نێوچەدا، ساڵی ١٩٨٠**

| چینەکانی گوند | گوند | | دانیشتووان | |
|---|---|---|---|---|
| | ژمارە | ٪ | هەزار | ٪ |
| ١-٥٠ | ١٢٩ | ١,٦ | ٤ | ٠,١ |
| ٥١-٣٠٠ | ٢٧٣٩ | ٣٤,٨ | ٥٢٦ | ١٢,٨ |
| ٣٠١-٧٥٠ | ٣٥٧٦ | ٤٥,٤ | ١٧٢٤ | ٤٢,٠ |
| ٧٥١-١٥٠٠ | ١١٧٧ | ١٤,٩ | ١١٨٠ | ٢٨,٧ |
| ١٥٠١ و زیاتر | ٢٦١ | ٣,٣ | ٦٧١ | ١٦,٤ |
| کۆ | ٧٨٨٢ | ١٠٠,٠ | ٤١٠٥ | ١٠٠,٠ |

دانیشتووانی ئەم جۆرە گوندانە، بە زۆری لە کەسوکاری یەکدی پێک هاتوون: باوک و کوڕ، مام و برازا، ئامۆزا، پورزا ...تاد. یاخود لەو جۆرە گوندانەن کە لە دوای مردنی باوکیان، منداڵەکانیان بوون بە دوو بەشەوە و هەر یەکەیان لە گەڕەکێکی دوور لەوی دیکەوە دانیشتوون، پاشان هەندێ خەڵکی گوندەکە لە دەوری هەردوو لایان کۆ بوونەتەوە، تا بوون بە دوو گوند، جاری واش هەیە، هەر بە یەک گوندی ماوەتەوە، بەڵام کەمێ لە یەکدییەوە دوور هەڵکەوتوون وەک ئەوەی یەکێکیان لە سەرەوە بێ و ئەوی دیکەیان لە خوارەوە، یاخود یەکێکیان لە ڕۆژهەڵات و ئەوی دیکەیان لە ڕۆژئاوا، کە هەردووکیشیان هەر یەک ناویان هەیە.

- گوندی گچکه (٥١ - ٣٠٠ کەس)

دانیـشــتـووانی ئەم گـوندانە، بە زۆری لە چەند بەرە بابێ پێک هاتوون و لەبەر کـەمی زەوی کشتوکاڵ و دوورەدەست، توانای گەورەبوونیان نییە.

- گوندی ناوەنجی (٣٠١ - ٧٥٠ کەس)

لە ڕووی ژمارەی گوند و ژمارەی دانیشتووانەوە، بە گەورەترین جۆری گوند دادەنرێ. لە نێو ئەم دەستەیەدا، ئەو گوندانەی ژمارەی دانیشتووانیان لە نێوان (٥٠١ - ٧٥٠ کەس) دایە، ژمـارەیان خـۆی لە ١٤٦٥ گـوند دەدات. ئەمــەش لەگــەڵ ســروشــتی ئابـووریی و کۆمەڵایەتیی کوردستاندا دەگونجێ.

- گوندی گەورە (٧٥١ - ١٥٠٠ کەس)

دووەم دەستـە گوندە بە ژمارە و ژمارەی دانیـشتووانی هەر گوندێ. ئەم جـۆرە گوندانە، لە شـوێنی بەئاو و لـە زەوی بەپیت و لە نزیکی شـارەکانەوە هەڵکەوتوون.دانیـشـتـووانی ئەم گوندانە، زیاتر خەریکی چاندنی ڕووەکی پیشـەسازیی و ئالیکی ئاژەڵن، هەندێکیان جگە لە کشتوکاڵ، بازرگانیش دەکەن.

- شارە گوند (١٥٠١ کەس و بەرەوژوور)

گوندکانی ئـەم دەستـەیە، لە نزیکی شـارە گـەورەکان هـەڵکـەوتوون، لە ڕووی کارکـردن و خزمـەتگوزاری جـۆراوجۆرەوە، پـەیوەندییـان بە شـارەکـانەوە بەتـینە. هـەندێ لەم گـوندانە بە جـێگـای دانیـشـتـنی سـەرۆک هـۆزەکـان دادەنرێن. ئەم گـوندانە گـەلێ گـەورەن، بەڵام لەو ئاوەدانیانەن کە پێناسـەی شار نایان گرێتەوە، لەبەر ئەوەی ستاتووسی ئیداریان نییە.

**پۆلێنکردنی گوندەکان**

گـوندەکـانی کـوردسـتـان لە ڕووی فـەرمـانەکـانیـانەوە، بەسـەر سێ دەسـتـەدا دابەش دەکرێن:

- گوندە کشتوکاڵییەکان

دانیشتووانی ئەم جۆرە گوندانە، بە کاری کشـتوکاڵییەوە خەریکن. زۆربەی زەوییەکانی ئەم ئاوەدانیـانە، بـۆ چاندن و بەرهـەمـهـێنانی بەروبوومـی کێڵگەی وەکوو دانەوێڵـە (گەنم و

جۆ)، پیشەسازی (تووتن، لۆکە، چەوەندەر) و ئالیک (وێنجە و سێپەڕە) بەکار دەهێندرێن و خۆشیان بە بەخێوکردنی مەڕومالاتەوە خەریک دەکەن.

– گوندە تێکەلاوەکان

بەرهەمهێنانی بەروبوومی کشتوکاڵی جۆراوجۆر، بازرگانی کڕین و فرۆشتن، ناردن و هێنان، چەک هەڵگرتن و پاسەوانی، لە ئەرکە سەرەکییەکانی دانیشتووانی ئەم جۆرە گوندانەن. هەروەها زۆربەی سەنتەری ناحیەکان، دەتوانرێ لەگەڵ ئەم گروپە گوندەدا دابنرێن.

– گوندە ناکشتوکاڵییەکان

دانیشتووانی ئەم جۆرە گوندانە، بە پلەی یەکەم بە ئەرک و ئیشوکاری هێنان و بردن و کڕین و فرۆشتن و چەک هەڵگرتن و پاسەوانییەوە خەریکن و ژمارەشیان زۆر نییە.

**نەخشەی گوندەکانی کوردستان**

لە ئەنجامی چەند فاکتەرێکی وەکوو هۆی سروشتی و مێژووی و ترادیسیۆنی نەتەوەیی و فاکتەرەکانی ئابووریی و کۆمەلایەتیی، باری نەتەوەیی و ڕەوشی ڕامیاری و جەنگ، پلاندانانی گوندەکان هەمە چەشنەن، کە گرنگەکانیان ئەمانەن:

– گوندی هەرمێی

ئەم شێوە گوندە لە نێوچە شاخاوییەکاندا زۆر بلاوە.ڕیزی لە نێو دۆڵەکاندا دروست دەکرێن. لە سەروی ئەوەوە ڕیزێ خانووی دیکە دروست دەکرێ، لە خوار ئەمیشەوە ڕیزی دووەم و سێیەم... دێ، بەو شێوەیە خانووەکان بە قەد پالی شاخەکانەوە بەرز دەبنەوە، کە لە هەندێ نێوچەدا، بەرزاییان تا ٥٠٠ مەتر دەڕوا و ڕیزەکان بەرە بەرە تەسک دەبنەوە، تا وای لێ دێ، ژمارەی خانووەکانی دوا ڕیز، لە دوو یا سێ خانوو تێپەڕ ناکات. لە زۆر شوێنیش سەربانی پێشەوەی ماڵەکان، دەبنە حەوشە و ڕێگەی هاتوچۆی ماڵەکانی سەروو خۆیەوە، خەڵکی خانووەکانیان بەم شێوەیە دروست دەکەن، تا دەست بە زەوییەکانیانەوە بگرن و بۆ چاندن و کاری کشتوکاڵی بەکاری بهێنن، تا بە کەمترین ماندووبوون، بگەنە سەر سەرچاوەکانی ئاو و لە سەرمای زستان خۆیان بپارێزن، چونکە دۆڵەکان کەمتر با دەیانگرێتەوە.

- گوندی هۆبەیی

خـانووەکـان گـەڕەک گـەڕەک هەڵکەوتوون، دانیـشـتـووانەکـانیـان لـە بەرەبابێکەوە کەوتوونەتەوە. مـاڵی باپیرە گەورەیان لە مـاڵەکانی دیکە گرنگتر و لەبەرچاوترە و شـوێنی بەیەکگەیشتنە.

- گوندی ڕشتی

خـەڵکی خـانووەکـانیـان زۆر لە نزیک یەکـدی و چڕوپڕ دروست دەکـەن، ئەمـەش بە مەبەسـتی داکۆکیکردن لە خۆ و لە سـامانەکانیـان، تا لە دوژمنانی دەرەوە خۆیـان بپارێزن. هەروەها بۆ ئەوەی هـەمـوو لایەکیـان، لـە سـەرچاوەی ئاوی گوندەکـانەوە، وەکوو یەک دوور بن.

- گوندی پەرشوبڵاو

خـانووەکـانی ئەم جـۆرە گـوندانە، تاک تـاک و جـوت جـوت و لێـرە و لـەوێ و بڵاو هەڵکەوتوون. لە نێوانیـاندا بۆشاییەکی زۆر هەیە. دانیشتووانی ئەم گوندانە، خزمایەتییان لەگەڵ یەکدیدا یا نییە، یا کەمە. شوێنی گشتی بەیەکگەیشتنیان، تەنیا مزگەوتە.

- گوندی لاکێشەیی

یەکێ لـە تازەترین نەخـشـەی خـانوو دروسکردن، ئـەم شـێـوە لاکـێـشـەییـە یـە. ئەگـەر شـوێنەکـە دەشـتـایی و تەخت بوو، ئـەوا خـانووەکـان لەم بەر و ئەو بـەری جـادەکـان دروست دەکـرێن. ئەگـەر شـوێنـەکـە گـردۆڵکە و بە قـەد چیـاکـانـەوە بوو، لە لای ڕاست و چـەپی دۆڵەکانەوە، یاخود لە ڕۆخی هەردوو بەری چەم و ڕووبارەکاندا دروست دەکرێن.

- گوندی شەترەنجی

پەیدابوونی ئەم جۆرە نەخشەیە، بۆ ساڵەکانی حـەفتا دەگەڕێتەوە.ئەم جـۆرە گوندانە لە سـەرەتاوە، بـۆ دانیـشـتـووانی گـوندە ڕاگـوێزراوەکـان درەست کـراون. خـانووەکـانی بە شـێوەیەکی ئەندازیاریی، بـەرانبـەر بە یەکدی دروست کراون و جـادەکانیش بە نێوانیـاندا تێپەڕ دەبێ.

## بەشی شەشەم: سنووری کوردستان

کوردستان لە باکوورەوە لەگەڵ تورکیا و لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ ئێران و لە باشوورەوە لەگەڵ عێراق و لە ڕۆژئاواشەوە لەگەڵ سووریادا هاوسنوورە. بەڵام سنووری لەگەڵ ئەم دەوڵەتانەدا، بە شێوەیەکی ڕەسمی دەسنیشان نەکراوە و لە لایەن ئەم چوار دەوڵەتەوە، نە دان بە بوونی خاکی کوردستاندا دەنێن و نە بڕواش بەو سنوورانە دەکەن، بەڵکوو کوردستان بە بەشێک لە خاک و نەتەوەی کوردیش بە بەشێک لە نەتەوەکانی خۆیان دادەنێن.

بەشێک لە سنووری ئێستای دەوڵەتانی تورکیا، ئێران، عێراق و سووریا، بە نێو جەرگەی خاکی کوردستاندا کێشراوە، لە لایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتانیشەوە، بە ڕەسمی دانی پێدا نراوە.

ڕەنگڕشتنی سنوورەکانی چوار دەوڵەتەکەی دەوروبەری کوردستان، مێژووی تایبەتیی خۆیان هەیە. بۆ نموونە، سنووری ڕۆژئاوای ئێران، لە لایەکەوە سنووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا و عێراق بووە، لە لایەکی دیکەشەوە سەرچاوەکەی بۆ سەدەی شازدەیەم دەگەڕێتەوە، ڕوونتر بڵێین، بۆ دوای جەنگی چاڵدێرانی ساڵی ١٥١٤ی زایینی نێوان هەردوو ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و سەفەوی دەگەڕێتەوە، کە یەکێ لە ئاکامە هەرە گرنگەکانی ئەو جەنگە، دەسنیشانکردنی سنووری نێوانیان بوو، پاشتریش بەپێی پەیماننامەی سنووریی ئەرزەڕۆم لە ساڵی ١٦٣٩ی زایینیدا، لەسەر زۆر ناکۆکییەکانی نێوان خۆیان ڕێک کەوت و ئەم سنوورەش تاکوو ئەوڕۆ، جگە لە دەسکارییەکی کەم نەبێ، هەر وەکوو خۆی ماوەتەوە.

سنووری باشووری تورکیا، باکووری عێراق، ڕۆژهەڵات و باکووری سووریا لەگەڵ یەکدیدا، بنچینە سەرەکییەکەی بۆ دوای ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی دەگەڕێتەوە. بۆ نموونە، سنووری تورکیا و عێراق، بۆ ساڵی ١٩٢٥ و دواتریش سنووری سووریا و عێراق، بۆ ساڵی ١٩٣٦ دەگەڕێتەوە.

لێرەدا نووسەر خۆی لە قەرەی چۆنێتی سنوورکێشانی نێوان دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا نادات، باسی هەمووی ئەو گیروگرفت و تەنگوچەڵەمانە ناکات، کە بە هۆی کێشەی دیاریکردنی سنووری نێوان ئەو چوار دەوڵەتەوە ڕووی داوە، باسی سنوورە دەسکردەکانی ئەو دەوڵەتانەی بە نێو خاکی کوردستاندا تێپەڕ دەبێ، ناکات. بەڵکوو بە درێژی باسی بۆچوونی نووسەران و مێژوونووسان و جوگرافیزان و پیاوانی ڕامیاری دەکات، کە ئەسپی خۆیان لەو کایایدا تاو داوە. هەروەها بە فراوانی سنوورەکانی

نێوان کوردستان و دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا دەسنیشان دەکەین. باسەکەشمان تەنیا لەو قاڵبەدا خۆی دەنوێنێ، وەکوو نووسەر بۆی دەچێ و بڕوای پێەتی.

**١. بۆچوونی نووسەران**

دیاریکردنی سنووری کوردستان، بە دژوارترین و گەورەترین کێشەی سەردەم دادەنرێ. لەبەر ئەوەی بۆچوونێکی جیاوازی گەلێ زۆر، لەم بارەیەوە هەیە. ئەم بۆچوونانەش تەنیا لە لایەن، لێکۆڵەرەوان و توێژەرەوان و شارەزایان و ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان و دەزگا ڕەسمییەکان و هێزە ڕامیارییەکانەوە نییە، بەڵکوو لە هەمان کاتدا، لە نێوان خەڵکی کوردستانیش خۆیدا، جیاوازیی و ناکۆکییەکی گەورە هەیە. بێگومان ئەمەش زیاتر بۆ نەبوونی سەربەخۆیی ڕامیاریی و دانەمازراندنی دەوڵەتێکی ناسیۆنالی یەکگرتووی کوردستانی دەگەڕێتەوە. بۆیە سنووری کوردستان، چ لە کۆندا و چ لە مێژووی تازەیدا، چەندین جار گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بە ڕادەیەک کە باسی نێوچەیەکی جوگرافی کوردستان دەکرێ، خەڵکی پێش ئەوەی بۆ مێژوو بگەڕێنەوە، بە گومانەوە گوێ لەو باسە دەگرن، یا بە زەردەخەنە و سەرسوڕماوییەوە تێیدەڕوانن.

**سنووری کوردستان و شرفخانی بدلیسی**

شرفخان لە شاکارە بەناوبانگەکەیدا، شرفنامە کە لە ساڵی ١٠٠٥ی کۆچی - ١٥٩٦ی زایینیدا نووسراوە، دەربارەی سنووری کوردسان نووسیوویەتی (سنوور و کەوشەنیووڵاتی کوردان کە ناوی کوردستانە، لەسەر لێواری دەریای هورمزەوە، کە لەسەر کەناری دەریای هیند هەڵکەوتووە - دەست پێ دەکات و لەوێوە بە خەتێکی ڕاست دەکشێ و دێت هەتا لە مەڵبەندی مەلاتیە و مەرعەش دەبڕێتەوە).

ووڵاتی فارس و عێراقی عەجەم و ئازەربایجان و ئەرمەنستانی چکۆلە و ئەرمەنستانی گەورە دەکەونە لای باکووری ئەو خەتەوە. عێراقی عەرەب و موسڵ و دیاربەکر دەبنە باشووری ئەو سنوورە) (٣، لاپەڕە ٢٩-٣٠).

**سنووری کوردستان و ئەولیا چەلەبی**

ئەولیا چەلەبی لە ساڵی ١٠٦٥ی کۆچی - ١٦٦٥ی زایینیدا، بەم شێوەیە لەسەر سنووری کوردستانی نووسیووە ((ئەم ووڵاتە سەری لای باکووری دەگاتە: ئەرزەڕۆم و لەوانیشدا هەکاری و جەزیرە و ئامێدی (عەمادیە) و موسڵ و شارەزور و هەریر و

ئەردەڵان و بەغدا و درنە و دەرتەنگ، تا دەگاتە بەسرە خاکێکی حەفتا قۆناغی (٤٢٠ کم – ع.غ.) بە کوردستان و بە بەردەلان، بەڵام پانایی کوردستان بەقەدەر درێژاییەکەی نییە. لای خۆرهەڵاتی سنووری عەجەمە و لە هەریر و ئەردەڵانەوە تا خاکی شام و حەڵەب، بیست – بیست و پێنج قۆناغە (١٢٠ – ١٨٠ کم، ع.غ.). بەشی هەرە تەسکی ئەم پانایییە. پێنج قۆناغە..) ) (٣٠کم – ع غ) (١٢ لاپەڕە ٩٠–٩١).

## سنووری کوردستان و شەریف پاشا

دوای تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهانی، شەریف پاشا لە ساڵی ١٩١٩دا، سنووری ئەتنۆسی (نەتەوەیی) کوردستانی، بەم شێوەیە پێش چاوی ئەندامانی کۆنفرانسی ئاشتی خەست لە پاریس، لەوێدا دەڵێ ((لە باکوورەوە شاری زیڤن( سوونگوتاشی ع . غ وێراوێرای سەرسنووری وولاتی قەوقاز، کە درێژ دەبێتەوەبەرەو رۆژئاوا ،تا دەگاتە ئەرزەرۆم، ئەرزنجان، کەماخ، عەرەبکیر، بەهسنی، دیڤریگ ( راستر بیرەجووگ ع . غ )، لە باشوورەوە حەران (ئالتن بەشاک ع.غ.)، تەپۆڵکەکانی سنجار، تەلەعفەر، ئەربیل، کەرکووک، سلێمانی، Akk - el - Man، سنە. لە رۆژهەڵاتیشەوە بە رەواندز دەست پێ دەکا، باشقەڵا، وەزیر قەڵا، واتا وێراوێرای سنووری وولاتی فارس، تا دەگاتە چیای ئارارت) (٤، لاپەڕە ٦٤).

## سنووری کوردستان و سەنتەری لێکۆڵینەوەی کورد

سەنتەری لێکۆلینەوەی کورد لە پاریس، لە ساڵی ١٩٤٦دا، لەسەر سنووری ئەتنۆسی کوردستان، بەم شێوەیە دەنووسێ و دەڵێ (سنووری ئەم خاکەی کوردی لێ دەژی، لە باکوورەوە بە هێڵێک دەست پێ دەکا لە چیای کورد لە سووریا و بەرەو باکوور هەڵ دەکشێ و بە ناوچەکانی کیلیس و مەرعەش و ئەلبیستان و دیڤریکی تێدەپەڕێ هەتا دەگاتە رووباری کەلکیت. سنووری رۆژهەڵاتی، دەست پێ دەکا بە هێلێک لە فارس، بەرەو باشووری رۆژهەڵات وکەناری رۆژئاوای زەریاچەی ورمێ دەبڕێ، لە دوای درێژ دەبێتەوەبەرەو سنە و کرماشان، هەتا لورستان و ناوچەی بەختیاری. سنووری باشووری رۆژئاوا، بە هێڵێک دەست پێ دەکا، لە باشووری لورستانەوە درێژ دەبێتەوە بەرەو رۆژئاوا و مەندەلی دەبڕێ و بەرەو رۆژئاوای خانەقین تێدەپەڕێ هەتا تەپۆڵکەی حەمرین و هەتا پشتێنەی یەکەم لە چیای شێخان. لە دوایی پێچ دەکاتەوە بەرەو باکووری رۆژئاوا بە

درێژایی قەدی تەپۆڵکەکانی، هەتا فیشخابور (پیشخابور – ع.غ.) لەسەر زێ دیجلە و لە دوای پێچ دەکاتەوە، بۆ ڕۆژئاوا و بەرە و چیای شەنگار و هەتا کۆتایی پێ دێت بە زێی فورات لە نزیکی جەرابلس) – (٧٣، لاپەڕە ٣–٤).

**سنووری کوردستان و ئەدمۆنس و شاکر خەسباک**

سنووری کوردستان لە ساڵی ١٩٥٦دا، لە لایەن پۆلتەلۆگی ئینگلیزی ئەدمۆنسەوە نووسراوە. (لە باکوور، ئەم سنوورە بە گشتی هێڵێکە کە بە یەریڤان، ئەرزەڕۆم، ئەرزنجاندا تێدەپەڕێ و لەوێوە لار دەبێتەوە و لە مەرعەش ڕوو لە حەڵەب دەکات. لە باشووری ڕۆژئاوا بە بناری چیاکاندا دەچێتە پێش تا دەگاتە دیجلە و لەوێوە شانبەشانی لای ڕۆژهەڵاتی ڕووبار دەچێتە خوارێ، دوایی هێندێک باکورتر بە هێڵی چیای حەمرێن ڕوو لە ناوچەیەکی سنووری ئێران و عێراق لە نزیکی مەندەلی دەکات. لە ڕۆژهەڵات یانی لە ئێران، سنووری کوردەکان بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات لە یەریڤانەوە دەست پێ دەکات و هەرێمەکانی ماکۆ، بەشێک لە خۆیە، ورمێ، مەهاباد (سابلاغ)، سەقز و سنە تا کرماشان لە نێو خۆیی دەگرێ. جادەی ئەسڵی کرماشان بۆ کریند لەوێوە بە هێڵێکی ڕێکدا تا مەندەلی ناوچەیەکە کە کوردەکان لە خزمەکانی لەک و لوڕیان کە جار جارە وەک کورد دەژمێردرێن جیا دەکاتەوە) (٧٤، لاپەڕە ٢) ئەو سنورکێشانە لە لایەن شاکر خەسباکەوە پەسەند کراوە، دوای ئەم چەند تێبینییە (ئەگەر هاتوو لوڕەکانمان بە کورد دانان، کە زۆر بەڵگە ئەوە دەسەلمێنێ، وەکوو نیشانەی مێژوو و زمان، ئەوا سنوری کوردستان درێژ دەبێتەوە هەتا کەنداوی عەرەبی بە درێژایی چیای زاگرۆس) – (٢٣، لاپەڕە ٢٥).

سنووری کوردستان لە لایەن چەندین نووسەری دیکەوە، وەکوو بابەتێ دەمەتەقێیەکی زۆری لەسەر کراوە، لەوانە: مینۆڕسکی، محەمەد ئەمین زەکی، نیکیتین، قاسملو، لازەریف، و گەلێکی دیکەش، کە هەمووشیان لە یەک چوارچێوەی دیاریکراودا دەسوڕێنەوە و جیاوازییان زۆر کەمە.

### ٢. بیروڕای نووسەر

سنووری کـوردسـتـان لـه لایەن نووسـەری ئـەم پەرتووکـەوە، لە لاپەڕەکـانـی داهاتوودا لەســەری دەنووسـێ. بۆ دەربڕینی بیــروڕاکـانـی نووسـەریش، زۆربەی هـەرە زۆری دید و بۆچوون و نەخــشــەکــانـی بەر لـەم نووسـینە لـەبەرچاو گـیــراوە. هـەروەها نـووسـینە مێژووییـەکان، جـوگرافییـەکان، ڕامیـارییـەکان، ئاووهـەوا، گۆڕانکارییەکانی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی... هتد تێکڕا حیسابیان بۆ کراوە.

سنووری کوردسـتان – زەمینی و ئاویی – لەگەڵ دەوڵەتەکانی تورکیا، ئێران. عێراق و سـووریادا، چەندین هـەزار کـیلۆمـەتر دەبێ. هـەروەها کـەنداوەکانی عـەرەبی – فـارسی و ئەسکەندەروون، لەگەڵ ئەو سنوورەدا تێهەڵکیش دەبن.

### سنوری زەمینی کوردستان

#### سنووری نێوان کوردستان و تورکیا

سنووری باکوور کوردستان لە تێکەڵابوونی ئاوی ئارپاچای Arpacay C ی و ڕووباری ئاراس Aras N ەوە دەست پێ دەکــات و لەگــەڵ ڕووبـاری دواییــدا، بـەرەو ڕۆژئاوا درێـژ دەبێـتـەوە، هـەتـا دەگـاتە گـوندی ئاقـچـەقـەلا Akçakale ، لە دوایدا بەرەو باکـووری گـوندی شابان کۆیی Sabanköy و باکووری گوندی بوجوکلو Böcüklü شـۆڕ دەبێتـەوە. لە پاشـاندا بەرەو باکووری گوندی پاسلی Paslı دەکشێ و ئینجا بەرەو ڕۆژئـاوا درێژ دەبێتـەوە، هـەتا دەگاتە بـاکووری گوندی ئـۆلوکلو Oluklu ، لە دوایدابەرەو بـاشـوور شـۆڕ دەبێتـەوە، هـەتا دەگاتە باکووری گوندی تونج کایە Tunç kaya . لەویشـەوە بەرەو ڕۆژئاوا درێژ دەبێتـەوە، دوای ئەوەی کـڕکڕەی پشـتی چیای بالی کلی . Balıklı DA دەبڕێ. لە پاشـاندا بەرەو ژوور بۆ لای ڕۆژهـەڵاتی گـونـدی بۆزات Bozat هـەڵ دەگــەڕێتــەوە. لـە دوایدا ڕوو لە ڕۆژهـەڵاتی گوندی جاتاک Catak دەکا، ئینجا بەرەو ڕۆژهـەڵاتی گوندی یەنی قازی Yenigazi دەکشێ، لە پاشاندا بەرەو ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە، دوای ئەوەی بە باکووری گوندی یایکلیدا Yayıklı تێـپـەڕ دەبێ. بەرەو ڕۆژهـەڵاتـی گـوندی یۆکـاری سـالا پنار Yukarısalla pınar دەڕوا و لە دوایدا هـەر بەرەو باکـوور دەکـشێ، ئینجـا بـەرەو ڕۆژئاوا دەشکێـتـەوە، دوای ئـەوەی بە باکـووری گـوندی ئاشـاغی سـالا پنار Asacg salla pınar دا تێـدەپەڕێ. لـە پاشـان بـەرەو باشـووری – ڕۆژئـاوا شـۆڕ دەبێـتـەوە، دوای ئەوەی بە ڕۆژئاوای گـوندی بۆیالی Boyalı دا تێدەپەڕێ، درێژە بە ڕێڕەوەکەی خـۆی دەدات، هـەتا دەگـاتە باکوور و باکووری – ڕۆژئاوای چیـای سـۆغـانلی .Soganlı D.A. پاشـان بـەرەو باشـووری ڕۆژئاوا درێژ دەبـێـتـەوە، پاش

ئەوەی بە ڕۆژئاوای گوندەکانی کوێر ئۆغڵۆ Köroglu و یەنی کۆی Yeni koy دا بە دەیان کیلۆمەتر دەڕوا، هەتا دەگاتە باکووری لوتکەی تۆپ یۆلو .Top yolu T . لە پاشاندا بەرەو ڕۆژئاوای گوندەکانی قزلەر قەلا Kızlar kale و مورات باغی Murat bagı و باخچە کۆیی Bahçeköy شۆڕ دەبێتەوە، هەتا دەگاتە باکووری گوندەکانی یوروکجلتی Yürükcltı و کوچوک قۆناغ Küçükkonak، لە پاشاندا بەرەو ڕۆژئاوای گوندی ئۆرتاکلار Ortaklar شۆڕ دەبێتەوە، ئینجا بەرەو باکووری گوندەکانی ئەسەندەرە Esendere و ئاردنجلی Ardınçlı ، لە دواییشدا بەرەو ڕۆژهەڵاتی گوندەکانی دەمیر دۆڤەن Damirdöven و تیمار Tımar دەڕوا، لە ڕۆژهەڵاتی ئەم گوندەی دواییدا، بەرەو ڕۆژئاوا دەشکێتەوە، هەتا دەگاتە باکووری گوندی یایلاداغی Yayladagı ، ئینجا بەرەو باشوور شۆڕ دەبێتەوە، دوای ئەوەی بە ڕۆژئاوای گوندەکانی بویک دەرە Büyükdere و تاش کایناک Taskaınak دا تێپەڕ دەبێ هەتا دەگاتە باکووری گوندی ئۆڤەنلەر Ovenler، لە دواییدا بەرز دەبێتەوە بەرەو باکور هەتا دەگاتە ڕۆژهەڵاتی گوندی پۆرسوک Porsuk، لێرەشەوە بەرەو ڕۆژهەڵاتی گوندەکانی چۆغەندەر Çögender و کەڤەنلیک Kevenlik درێژ دەبێتەوە، لە دواییدا بەرەو باکووری گوندی قوش کۆیی Kösköy بەرز دەبێتەوە، لە پاشاندا ئاستی خوارەوەی دەگاتەچەمی تۆرتوروم .Tortum C لە ڕۆژهەڵاتی گوندی کیرک گوزی Kırkgöze، دواتر لەگەڵ ئاستی ئەم ڕووبارە بە دەیان کیلۆمەتر بەرەو باشووری گوندی قاراگوباک Karagöbek دەکشێ، هەتا دەگاتە ڕۆژهەڵاتی چیای دوم .Dumlu DA لە دوایدا لە بڕبڕەی پشتی ئەم چیایەوە، بەرە و ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە، هەتا دەگاتە باکووری گوندی چاتاک Çatak، پاشان لەسەر ئەو ڕۆشتنەی خۆی بەردەوام دەبێ، هەتا دەگاتە باشووری گوندی ئاغزیاچیک Agzıaçık لە دوایدا دەگاتە ڕۆژهەڵاتی چیای بۆزان .Bozan DA پاشان بەرەو ڕۆژئاوای گوندی تاش پنار Taspınar لەگەڵ ئەم زنجیرە چیایەدا درێژ دەبێتەوە، ئینجا بەرەو ڕۆژهەڵاتی چیاکانی ئۆتلوبەلی .Otlukbelı DA شۆڕ دەبێتەوە، لەگەل بڕبڕەی پشتی ئەم چیایانەدا بەرەو ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە، هەتا دوای چەند کیلۆمەترێ دەگاتە باشووری گوندی ئاکیاکا Akyaka، لە دوایدا بەرەو لوتکەی خەتابی .Hatabi T شۆڕ دەبێتەوە، ئینجا بەرەو چیاکانی ئەسەنجە Esence DA دێتە خوارێ، لە دوایدا پاش ئەوەی بە باکووری لوتکەی کۆزداغیT Kozdagı و باشووری گوندی یەنی یۆل Yeniyol دا تێدەپەڕێ، بەرەو ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە، هەتا دەگاتە باشووری گوندی کوزورەن Közoren و باکووری لوتکەی کیرانچاتما .Kirançatma T، لە دوایدا بەرەو باشوور شۆڕ دەبێتەوە، هەتا دەگاتە ڕۆژئاوای گوندی چات کۆیی Çatkoy ، ئینجا بەرەو ڕۆژئاوا دەشکێتەوە، هەتا دەگاتە باکووری گوندی

یۆکاری یەمنی کۆیی Yukarıyeni köy. لە دوایدا پاش هەندێ پێچکردنەوە، بەرەو باشوور درێژە بە ڕۆیشتنەکەی خۆی دەدات، هەتا دەگاتە باکووری چیای قاراداغ Karadag و ڕۆژئاوای گوندی یانجابایین Yancabayın و ڕۆژهەڵاتی چیای چەنگەللی Çengellı و ڕۆژئاوای گوندی چاملیک Çamlık و ڕۆژئاوای گوندی ئۆواچیق Ovacık و ڕۆژئاوای گوندی یاغباسان Yagbasan ، ئینجا بەرەو باکووری گوندی کیرکگۆزە Kırkgöze شۆڕ دەبێتەوە، لە دوایدا بەرەو ڕۆژئاوا درتژ دەبێتەوە، تا دەگاتە باکووری گوندی گوللوجە Gullüce و ڕۆژئاوای گوندی شێخ یوسف Yusuf seyh، لە پاشان ڕێبازی ڕۆیشتنەکەی خۆی بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات دەگۆڕێ، هەتا دەگاتە ڕۆژئاوای گوندی یالنیز ئۆغۆت Yalnızögut و باکووری چیای یامان Yaman Dagı ، لەگەڵ ئەم چیایەدا بەرەو باشور درێژ دەبێتەوە، تا ناوەڕاستی چیاکە، لە دوایدا بەرەو ڕۆژئاوا دەشکێتەوە، هەتا دەگاتە نزیک گوندی ئاقچەماغار Akçamagara . لە پاشان بەرەو ڕۆژهەڵاتی گوندی یاشیل قەڵا Yesilkale درێژ دەبێتەوە. لە دوایدا بەرەو ڕۆژئاوا پێچ دەکاتەوە، پاش ئەوەی بە باشووری گوندەکانی ئیگدەلیدەرە Igdelidere و کوزیاکە Kuzyaka دا تێدەپەڕێ، جارێکی دیکەش پێچ دەکاتەوە، ئەو جارەیان بەرەو باشوور، پاش ئەوەی بە ڕۆژئاوای گوندی کارک Karık دا تێدەپەڕێ، بەرەو ڕۆژهەڵاتی گوندی ئایڤالی Ayvalı دەبێتەوە، ئینجا پێچ دەکاتەوە، پاش ئەوەی بە باکووری گوندی ئاغیلیازی Agılyazı دا تێپەڕ دەبێ، بەرەو باشووری ڕۆژئاوا دەڕوا، هەتا دەگاتە چەمی توخمە Tohma C. ، بە چەند کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژئاوای گوندی چوکورکایا Çukurkaya ، لە دوایی بەرەو سەرچاوەی دەرەی سارساب Sarsap D. و لە باکووری گوندی قارماغارا Karamagara درێژ دەبێتەوە، لەگەڵ ئاوەڕوویی ئەم دەرەیە دێتە خوارێ، هەتا دەگاتە باشووری گوندی سۆیساللی Soysalli بە دەیان کیلۆمەتر، لە دوایدا لەگەڵ ڕووباری جەیحان Ceyhan N بەرەو باشوور دەڕوا، هەتا دەگاتە ڕۆژئاوای گوندی ئیسمایلی Ismailli بە دەیان کیلۆمەتر، لە دوایدا هەر بەرەو باکووری ڕۆژئاوا دەکشێ، تا لە دوایدا بەرەو ڕۆژئاوای گوندی یایلائوستو Yaylaüstü و ڕۆژهەڵاتی گوندەکانی ئالانلی Alanlı و ئەفیراغزلی Efiragızlı شۆڕ دەبێتەوە، لەگەڵ ئاوی ئەو گوندەی دێتەوە خوارێ، هەتا دەگاتە ڕوباری جەیحان Ceyhan N، لە دوایدا لەگەڵ ئەم ڕوبارە بەرەو باشوور درێژ دەبێتەوە، تا باکووری گوندی باخچە Bahçe کە بە دەیان کیلۆمەتر دەکەوێتە ڕۆژئاوای ئەم ڕووبارەوە، لە پاشان بەرەو باکووری گوندی کوچیوردو Koçyurdu درێژ دەبێتەوە، ئینجا بەرەو ڕۆژهەڵات دەشکێتەوە، هەتا دەگاتە ڕۆژئاوای گوندی کیرماچلی Kırmacı، لە پاشاندا بەرەو باشوور درێژ دەبێتەوە، هەتا دەگاتە

ڕۆژئاوای گوندی تویسوز Tüysüz دوایی درێژە بە ڕۆیشتنەکەی خۆی دەدات، هەتا دەگاتە هێـڵـی درێژی ٣٦ ی ڕۆژهەڵات، لەگـەڵ ئەم هێـڵــەدا بەرەو باشــوور درێژ دەبێـتــەوە، هەتا دەگاتە سەر کەنداوی ئەسکەندەرون.

**٠٢ سنووری نێوان کوردستان و ئێران**

سنووری کـوردسـتـان لەگـەڵ ئێـرانـدا، لە ڕێژگـەی ئاوی گـوندی پـهناور، کـە دەڕژێتـە ڕووباری ئـاراســەوە، دەست پێ دەکـات و لەگـەڵ ڕووباری ئاراســدا بەرەو ڕۆژئـاوا درێژ دەبێـتـەوە، هەتا ڕێژگـەی ئاق چای، لە دوایدا لەگەڵ ئەو چەمـە بەرەو گونـدی قـاپولیخ دێتـە خوارێ. لە دوایدا لە ڕۆژهەڵاتی ئەو گوندەوە، بە چەند کیلۆمەترێ درێژ دەبێتەوە، لە دوایدا بەرەو ڕۆژئاوا و لە پاشـاندا بەرەو باشـوور و بە ڕۆژئاوای کوەقـازاندا تێدەپەڕێ، لە دوایدا بەرەو ڕۆژهـەلاتی گوندی قزڵجە شـۆڕ دەبێتەوە، لە پاشـان ڕاست دێتە خـوارێ هـەتا دەگاتە زەریـاچەی ورمـێ. لە دوایـدا خــەتـی سنـووری زەریـاچەی ورمـی دەکــا بـە دوو بەشـــەوە، ڕۆژهـەڵاتـی ئێــران و ڕۆژئاوای کــوردســتــان، لە دوایدا بـەرەو زەلکاوەکـانـی باشـــووری زەریاچـەی ورمێ درێژ دەبێـتــەوە. لـە دوای ڕێژگــەی چغـتـوچای و لە پاشــان لەگــەڵ ئەو ڕووبارەی دەرێـژ دەبێـتــەوە، هـەتا دەگـاتە هـێـڵـی پانـی ٣٧ی باکـوور. لێــرەشــەوە بەرەو ڕۆژهـەڵات دەڕوا، لە دوایدا بەرەو باشـوور درێژ دەبێـتەوە، هەتا دەگاتە ئەو شـوێنەی قـوری چای لەزرینـە ڕود دەکاتەوە. ئەمـەش دەکـەوێتـە باشـووری ڕۆژئاوای گوندی چاحـلامـاز بە چەند کیلۆمەتر، لە پاشـان لەگەڵ قـوری چای بەرەو ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە، هـەتا دەگـاتە هێــڵـی پانی ٣٧ی بـاکـوور. بـە واتایـەکی دیکـە، چەند کــیلۆمــەترێ لە ڕۆژئـاوای گــوندی یادامـلو.لە دوایدا ئەو خـەتە درێژ دەبێـتــەوە، هـەتـا دەگـاتـە باشـووری گونـدی قم تپـە، واتا ڕۆژئاوای کـوەخـالە ئو شـاغی، لێرەشــەوە درێژ دەبێـتـەوە و بە بەرزترین شـوێنەکـانی ئەو چیایەدا بەرەو ڕۆژهـەڵات تێپـەڕ دەبێ، هەتا دەگاتە ڕۆژئاوای گوندی زەڵم ئاباد، لە دوایدا بەرەو خـوار دەبێتـەوە، پاشـان دەچێـتـەوە سـەر هێلی پانی ٣٧ی باکـوور، لە دوایدا بەرەو ئاوی ئەجیرلو درێژ دەبێـتـەوە. لە دوایدا لەگەڵ ئەو ئاوە شۆڕ دەبێتەوە، تا دەگاتە باکووری کـوە قـرەداش، لـە پاشــان بـەرەو ڕۆژهەڵات دەبێـتــەوە،هەتا دەگــاتە هێـڵـی درێژی ٤٧ی ڕۆژهەڵات. لە پاشـان بەرەو ڕۆژهـەڵات درێژ دەبێتەوە و بە باکوری گوندەکانی زرەشـوان و قینـرجـەدا تێدەپەڕێ، هـەتـا دەگاتە ڕۆژئاوای کوە بـەلقیس، لە دوایدا بەرەو بـاشـوور درێژ دەبێتـەوە، هەتا ڕۆژهـەڵاتی گوندی بابانەزر لە دایدا بەرەو سـەرچاوەی قشـلاق چوق درێژ دەبێتەوە، لە پاشان بەرەو باشوور دێتە خوارێ، هەتا دەگاتە ڕۆژهەڵاتی گوندی چهارتاق و

له دوایدا بەرەو ڕۆژئاوای کوهقرەداغ درێژ دبێتەوە، پاشان بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە، هەتا لە خوارووی گوندی قواق تێدەپەڕێ و بەرەو ڕووباری قزل ئوزن درێژ دەبێتەوە، هەتا ڕۆژئاوای گوندی گاریز سیاه مەنسور، لە دوایدا لەگەڵ ئەو ڕووبارە بە خواروی گوندی قواقدا تێپەڕ دەبێ، هەتا دەگاتە ڕووباری قزل ئوزن لە ڕۆژئاوای گوندی کاریز سیاه مەنسوور، لەوێشەوە لەگەڵ ئەو ڕووبارە بەرەو خوار درێژ دەبێتەوە. لە دوایدا لەگەڵ هێڵی درێژی ٤٨ی ڕۆژهەڵات دەڕوا. هەتا دەگاتە سەر هێڵی ٣٦ی پانی باکوور. لە پاشان بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە، ئینجا بە ڕۆژهەڵاتی گوندی خورخورەدا دەڕوا، لە دوایدا بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە، هەتا دەگاتە چم کچی کرد. لە دوایدا لە هێڵی ٤٨ درێژی ڕۆژهەلات دەپەڕێتەوە و بە خوارووی گوندی گونایدا تێدەپەڕێ و ئینجا بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە، هەتا دەگاتە باشووری گوندی ئیستی بلاغ، لە دوایدا بەرەو باکووری ڕۆژئاوا دەبێتەوە و دەڕوا تا دەگاتە ڕۆژهەڵاتی کوە چنگ ئەڵماس، لە دوایدا بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە. ئینجا بەرەو باشوور درێژ دەبێتەوە و بە ڕۆژهەڵاتی گوندی قزان قرە تێپەڕ دەبێ. دوایی بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە، هەتا دەگاتەوە هێڵی ٤٨ درێژی ڕۆژهەڵات. لە دوایدا بە خوارووی گوندی جانماغیدا دەڕوا و سەردەکەوێتەوە بۆ باکوور، تا دەگاتە چم کچی کرد. لەوێشەوە لەگەڵ ئەو ڕووبارەدا بەرەو خوار دەبێتەوە. ئینجا بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات پێچ دەکاتەوە، هەتا دەگاتە ڕۆژهەڵاتی ئەحمەد ئاباد، لەوێشەوە بەرەو خوار شۆڕ دەبێتەوە و لە ڕۆژئاوای گوندی سرایجوق تێدەپەڕێ. ئینجا دووبارە دێتە خوارەوە و لە هێڵی ٤٨ درێژی باکوور نزیک دەبێتەوە.. لە باکووری ڕۆژهەڵاتی گوندی مالوجە، سنووری کوردستان، ئەو هێڵە دەبڕێ. لە دوایدا بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات دەبێتەوە، ئینجا بەرەو باشوور و لە دوایدا بە ڕۆژئاوای گوندی نارنجکدا تێدەپەڕێ، لەوێشەوە بەرەو خوار شۆڕ دەبێتەوە، هەتا بە ڕۆژهەڵاتی گوندی کنداب باڵادا دەڕوا. لە دوایدا بە باکووری تاج پیرملودا تێپەڕ دەبێ، ئینجا بەرەو باکوور هەڵ دەکشێتەوە، تا لە هێڵی ٣٥ی باکور تێدەپەڕێ. ئینجا لە هێڵی درێژی ٤٨ی ڕۆژهەڵات نزیک دەبێتەوە. لە دوایدا لەگەڵ ئەو هێڵە دێتە خوارەوە و بە ڕۆژهەڵاتی گوندی سوتپە دا تێدەپەڕێ، ئینجا بەرز دەبێتەوە و بەرەو باکوور و لە هێڵی ٣٥ی پانی باکووردا تێدەپەڕێ. لە دوایدا دێتە خوارێ و بەرەو ڕۆژهەڵاتی گوندی گلالیدا تێدەپەڕێ.ئینجا جارێکی دیکە دێتەوە خوارێ و بە ڕۆژهەڵاتی گوندی هزارخاندا دەڕوا. لە دوایدا بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە، هەتا ڕۆژهەڵاتی ئاب باریک، ئینجا بەرەو ڕۆژهەڵات دێتەوە و بە ڕۆژهەڵاتی گوندی تپەدا دەڕوا. لەوێشەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوا، هەتا دەگاتە ڕۆژهەڵاتی گوندی ڕش ئاقبلاق، لەوێشەوە بەرەو ڕۆژئاوا

دەبێتەوە، ئینجا بە باکووری کوەدالاخانی، بەرەو ڕۆژهەڵات دێ. لەوێشەوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات، بە چەند کیلۆمەترێک لە ڕۆژهەڵاتی گوندی توشمالانەوە، بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە، لەوێشەوە بە چەند کیلۆمەترێ بەرەو باکوور دەبێتەوە و بە ڕۆژئاوی گوندی مشدا بەرەو سەرەوە دەڕوا، لە دوایدا لە باشووری گوندی کازم ئابادەوە، بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە و درێژ دەبێتەوە، هەتا دەگاتەوە بە هێڵی ٤٨ درێژی ڕۆژهەڵات. ئینجا لەوێشەوە بەرەو سەرەوە دەڕوا، لە باکووری گوندی خەسرەو ئابادەوە بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە، لە دوایدا بەرەو خواروو درێژ دەبێتەوە و بە نێوان گوندی باقر ئاباد و گودیندا دەڕوا. ئینجا درێژە بە ڕۆیشتنەکەی دەدات و دێتە خوارەوە، هەتا دەگاتە ڕۆژهەڵاتی گوندی قارلق، لەوێشەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە، هەتا جارێکی دیکە خۆی لە هێڵی ٤٨ درێژی ڕۆژهەڵات دەداتەوە. لەوێشەوە بەرەو ڕۆژئاوادرێژ دەبێتەوە و بە نێوان گوندی سولتان ئاباد و ئاراندا دەڕوات. لە دوایدا بە باکووری گوندی سراب و ئینجا پێچ دەکاتەوە و بەرەو خوارەوە ە بە ڕۆژهەڵاتی گوندی بیدسرخدا و لە دوایدا لە ڕووباری گاماسیاب دەپەڕێتەوە و بەرەو ڕۆژهەڵاتی گوندی گروس دەڕوا، لەوێشەوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات دەبێتەوە، هەتا دەگاتە ڕۆژئاوای کوەگرین. لە دوایدا لە باکوری ئەو شاخەوە، بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە، هەتا بە چەند کیلۆمەترێ لە باکووری گوندی جان هێڵی ٤٨ درێژی ڕۆژهەڵات دەبڕێ و بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە، هەتا ڕۆژئاوای گوندی تازەباب. لە دوایدا بە خاکی نێوان ئەو گوندە و گوندی شاە ئاباددا تێپەڕ دەبێ و هەتا لە هێڵی ٣٢ی پانی باکورەوە نزیک دەبێتەوە، لەوێشەوە بە باکووری کوەگریندا دەڕوا، (ئەمە ئەو چیایەی پێشەوە نییە، بەڵکوو دوو چیای بەو ناوەوە هەیە) ئینجا بەرەو باکوور بەرز دەبێتەوە و بە نێوان گوندی مگسان و سهراندا تێپەڕ دەبێ. لە دوایدا بە ڕۆژهەڵاتی گوندی میلاب و ئینجا بە باشووری گوندی ئانوچدا تێدەپەڕێ. لە دوایدا بەرەو سەرەوە بەرز دەبێتەوە و تا نزیک گوندی کەهکەدان دەڕوا. ئینجا بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە و بەرەو ڕۆژئاوای گوندی ئاچمیزان دێ، ئینجا بەرەو خوار دەبێتەوە و تا لە دوایدا لە هێڵی ٣٤ی پانی باکوور نزیک دەبێتەوە. لە دوایدا بەرز دەبێتەوە و بە خوارووی گوندی قەلعەنودا دەڕوا، ئینجا لە هێڵی ٤٩ی درێژی ڕۆژهەڵات نزیک دەبێتەوە، لە دوایدا لە ڕۆژئاوای ئەو هێڵەوە بەرەو خوار دەبێتەوە و بە ڕۆژئاوای گوندی کلەجوبدا دەڕوا، ئینجا لەگەڵ هێڵی درێژی ٤٩ی ڕۆژهەڵات دەڕوا. لە دوایدا بەرەو ڕۆژئاوا و ئینجا بە ڕۆژئاوای گوندی بیاتاندا دەڕوا و بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە، ئینجا بە نێوان گوندی گوشە و دووخواهرندابەرەو ڕۆژهەڵات تێدەپەڕێ. لە دوایدا بۆ سەرەوە بەرز دەبێتەوە و بە ڕۆژئاوای ئاشور ئاباددا دەڕوا و بەرەو

ســەرەوە درێژەی پێ دەدات و بە ڕۆژهەڵاتـی گونـدی دەئاقـادا دەڕوات، ئینجـا لە باكـووری گوندی پڵنگ درەوە بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە و بە خـوارووی گوندی نورئاباددا دەڕوا و لە دوایدابەرەو سەرەوە بەرز دەبێتەوە، ئینجا بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە و بە باكووری گوندی قاقـاندا دەڕوا و بەرەو ڕۆژهەڵات درێژەی پێ دەدات و بە ڕۆژهەڵاتی گوندی تخماردا دەڕوا و لەوێشـــەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەبێـتـــەوە و درێژە بە ڕۆیشـــتنەكـەی دەدات تالە دوایدا لە ڕۆژهەڵاتـی گـوندی خـروسـاندا، بەرەو باشـووری ڕۆژهەڵات درێژ دەبێـتـەوە. ئینجـا بە ڕۆژئاوای گوندی كازم ئاباددا داڕوا و لـو دوایدا باشووری ئەو گوندە دەبڕێ، ئینجـا بەرەو سـەرەوە دێ و بەرز دەبێتـەوە، هەتا لە باكووری گوندی سكانە، بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتـەوە، ئینجـا باشـووری ڕۆژهـەڵات دەبڕێ و بە نێـوان گـوندی نشـهـر و گـوندی سكانەدا بەرەو باشـــووری ڕۆژهەڵات دەڕوا . لەوێشـــەوە بەرەو ڕۆژهەڵاتـی گـوندی نـەسـر ئاباد، درێـژە بە ڕۆیشـتنەكـەی دەدا و هەتا دەگـاتە هـێڵـی درێژی ٥٠ی ڕۆژهەڵات. لە پاشـان ئەو هێڵـەش دەبڕێ و بە ڕۆژئاوای گوندی قرغندا دێتـە خـوارێ. لە دوایدا بە ڕۆژهەڵاتی گوندی هندەدا تێـپـەڕ دەبـێ، ئینجـا بەرەو ڕۆژئـاوا دەڕوا، هەتا دووبـارە دەگـاتـەوە هێـڵـی درێژی ٥٠ی ڕۆژهەڵات. لە پاشـان بە ڕۆژهەڵاتـی گونـدی ڕوكن ئاباددا و گوندی سـوڵتاندا تێپـەڕ دەبێ، ئینجـا بەرەو باشـووری ڕۆژئـاوا دەڕوا، لە دوایدا بەرەو باشـوور درێژ دەبێـتـەوە، هـەتا لە باشـووری گـوندی خـەلعـەت پوشـان، بەرەو ڕۆژهـەڵات دەبێـتـەوە، لە دوایدا لـە ڕۆژهەڵاتی گوندی فرسش بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتـەوە و دەڕوا و بـە باكووری گوندی ڕاجـەدا تێدەپەڕێ، پاشـان بەرەو باشـووری ڕۆژئاوا و لە دوایدا بـەرەو گوندی درەبادام دا تێـدەپەڕێ و بەرەو ڕۆژهەڵات دێتەوە، هەتا هێڵی پانی ٣٣ی باكوور، ئەو هێڵـە دەبڕێ و لە دویدا پێچ دەكاتەوە و بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوا، دیسـانەوە پێچ دەكاتەوە و بەرەو ڕۆژهەڵات و بە ڕۆژهەڵاتی گوندی كێـشـدا تێـدەپەڕێ و بەرەو باشـووری ڕۆژهەڵات دەڕوا، ئینجـا لە ڕۆژهەڵاتی گوندی تـبرە دووبارە بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتـەوە و درێژە بە ڕۆیشتنەكەی دەدات، هەتا بە باشـووری گوندی دشـتگرددا تێـدەپەڕێ، لە دویدا بـەرەو باشـوور دەبێـتـەوە، هەتا لە بـاكووری گـوندی لیـرو بەرەو ڕۆژئاوا دەبێـتـەوە، ئینجـا بەرەو باشـووری ڕۆژهەڵات و بە بەرزترین شـوێنـەكـانی كـوەمـناردا دەڕوا و بەرەو باشـــووری ڕۆژهەڵات بەو لایەدا دەڕوا، هـەتا دەگـاتـە ڕۆژهەڵاتی بازئـاباد، لـەوێشـــەوە بەرەو بـاكـــووری ڕۆژهـاڵات بەرز دەبێـتـــەوە. لە ڕووبـاری دوب ئاب دەپەڕێتــەوە و بەرەو باكـووری ڕۆژهەڵات، ئینجـا بەرەو گـوندی گـوكـان لە خــوارووی ئەو گوندەوە دووبارە بـەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە. پاشـان لە ڕۆژهەڵاتی گوندی تـوف بەرەو خوار دەبێتەوە، لە دوایدا هـەر وا دەڕوا، تا لە باشـووری گوندی كوگانك بەرەو سـەرەوە دەبێتەوە.

لە ڕووبـاری زایندرود دەپـەڕێتــەوە و بەرەو بـاشــووری ڕۆژهـەڵاتی گـوندی ئورگــان دەڕوا، لەوێشـەوە بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە و درێژە بە ڕۆیشتنەکەی خۆی دەدات، هەتا لە دوایدا بە نێوان گوندی حەیدەری و شێخ شەعبان، بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوا و لە باشووری گوندی قەلعەحەوز بەرەو باشوور دێتەوە بە ڕۆژهەڵاتی گوندی سوارجاندا دەڕوا، ئینجا گوندی شورئاب دەبڕێ و زۆر لە هێڵی درێژیی ٥١ی ڕۆژهەڵات نزیک دەبێتەوە. لە هەندێ جێگاش لەگەڵ ئەو هێڵەدا دەڕوا، ئینجا بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات، پاشان ئەو هێڵە دەبڕێ و درێژەی پێ دەدات، تا بە نێوچەی نێوان گوندی هاردنگ و زردیهـادا دەڕوات و بەرەو باشوور و بە چەند کیلۆمەترێک ڕۆژهەڵاتی گوندی سفیددشت دەبڕێ وبەرەو هێڵی پانی ٣٢ی باکوور دێ، ئینجا بە ڕۆژئاوای گوندی نقنەدا بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوا، لەوێش چەند کیلۆمەترێک بە ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی گندمان، بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات تێدەپەڕێ، هەتا لە ڕۆژهەڵاتی گوندی ئیمام قەیسەوە تێپەڕ دەبێ، ئینجا بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە، بە ڕۆژئاوای گوندی سولکاندا دەڕوا. لە دوایدا بەرەو خوار دێتەوە و بە ڕۆژهەڵاتی گوندی گردبیشەدا تێدەپەڕێ و بەرەو ڕۆژئاوی گوندی ونگ و بە بەردەوامی بەرەو خوار دەبێتەوە، دوای ئەوە چەند کیلۆمەترێ بە ڕۆژهەڵاتی گوندی گردابدا دەڕوا و لەوێشەوە بە ڕۆژهەڵاتی گوندی ئەبو ئیسحاقدا دێتە خوارێ، لە دوایدا ڕۆژهەڵاتی مال خلیفە و لە ڕۆژئاوای گوندی سندگان و لەوێشەوە بە خاکی نێوان گوندی ئاب ملخ و گوندی میمنددا دەڕوا و هەتا دەگاتە کوەدنا. لە دوایدا بە شوێنە بەرزەکانی ئەو چیایانەدا دەڕوا، هەتا دەگاتە کوە حجال، لەوێشەوەبەرەو باشوور دەبێتەوە و بە ڕۆژئاوای گوندی وزگدا دەڕوا، لەوێشەوە درێژ دەبێتەوە و بە ڕۆژهەڵاتی گوندی دەشت ڕۆمدا تێدەپەڕێ، ئینجا بەرەو باشوور دێتە خوارەوە و بە ڕۆژهەڵاتی گوندی مورکا و لە دوایشدا ئەبشاردا تێپەڕ دەبێ، لەوێشەوە دێتە خوارێ، هەتا دەگاتە گوندی زیررود، لەوێشەوە بەرەو ڕۆژهەڵاتی گوندی تلئەنجیر، ئینجا بە ڕۆژهەڵاتی گوندی کرکاندا دەڕوا. لەوێشەوە دێتە خوارێ و بە ڕۆژهەڵاتی گوندی دووسیران و گوندی کندە و گوندی بو ئەلحەیات و گوندی گاوکشکدا درێژ دەبێتەوە، هەتا باکووری گوندی پل ئەبگینە، ئینجا بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە و بە باشووری گوندی مهرنجاندا تێدەپەڕێ، لە دوایدا بە باشووری گوندی دهلە بەرەو ڕۆژئاوا تێدەپەڕێ. لە دوایدا بە باشووری گوندی بورکیدا تێدەپەڕێ، ئینجا بەرەو سەرەوە دەبێتەوە و بە باکووری گوندی مزراعی و باشووری گوندی سیاە مەنسوور و باشووری گوندی دشت گوڕ، لە دوایدا دێتە باشووری گوندی خیاررزار، ئینجا باشووری گوندەکانی خەلیفە و چهار ڕۆستایی و پوزەگاە، ئینجا بەرەو کەنداوی فارس دەڕوا، هەتا بە چەند کیلۆمەترێ

له باشـووری بـه‌نده‌ر گناوه ده‌گاته سـه‌ر ئـاو، له‌وێشـه‌وه به ڕۆخی که‌نداوی فـارسـدا ،به‌ره‌و باکووری ڕۆژئـاوا هـه‌تا چه‌ند کیلۆمـه‌تر باشـووری رگ سـفیـد، له‌وێشـه‌وه بـه‌ره‌و باکووری ڕۆژهه‌ڵاتی ده‌ڕوا و درێژ ده‌بێتـه‌وه، هـه‌تا نزیکی شـارۆچکه‌ی سـه‌رده‌شت، له دوایدا به‌ره‌و ڕۆژهه‌ڵات ده‌ڕوا و بـه باشـووری گـونده‌کـانی گنجـه‌کـان و کـپـیـدا ده‌ڕوا. لـه‌وێشـه‌وه به ڕۆژهه‌ڵاتی گوندی قـه‌لعه کلابدا تێده‌په‌ڕێ و بـه‌ره‌و باکووری ڕۆژئاوا و ڕۆژهه‌ڵاتی گوندی سـه‌رحـه‌د ئاغـادا ده‌کـشێ. له‌وێشـه‌وه له باشـوری گـوندی وه‌لی ئاباد تێـده‌په‌ڕێ، پاشـان باشـووری گوندی حـاجی ملک ده‌بڕێ و ئینجا باشـووری گونده‌کانی پازنـان و بیلوان و له دوایی ئه‌و هێڵه به باکوری گوندی گدارجیسدا تێده‌په‌ڕێ و به‌ره‌و باکووری گوندی ڕۆژئاوا و به باشـووری گـوندی مـه‌یدان جـه‌عفـه‌ردا ده‌ڕوا. له دوایدا به باشـووری گـونده‌کانی جاه سـالم و گـوندی ئه‌مـیـدیه و له‌وێشـه‌وه به ڕۆژهـه‌ڵاتـی گوندی باتولیـدا تێده‌په‌ڕێ. ئینجـا به باشووری گوندی ته‌بره و باشووری گوندی ڕه‌زواندا ده‌ڕوا، هه‌تا ده‌گاته ڕۆژهـه‌ڵاتی گوندی بۆخـامه، ئینجـا هـه‌تا نزیک گوندی چم هـاشم، له‌گه‌ڵ ڕووباری جه‌ڕاحیدا ده‌ڕوا، له‌وێشه‌وه به‌ره‌و باشـووری گوندی عین کره و بـاشـووری گوندی مـوراد به‌گ سـه‌رده‌که‌وێ. پاشـان به باشـووری گوندی مـربچـه و له دوایشـدا به‌ره‌و گوندی شیـفه سـه‌رده‌که‌وێ و به ڕۆژهـه‌ڵاتی ئه‌و گـونده‌دا به‌ره‌و ڕۆژئاوای گوندی جـره ده‌ڕوات. ئینجـا به‌ره‌و ڕۆژئـاوای گـوندی رودزرد سـه‌ر ده‌که‌وێ، لـه‌وێشـه‌وه به‌ره‌و ڕۆژئاوای گـونـدی قـه‌لعـه تل و ئـینجـا له‌گـه‌ڵ ئاوی مـرغـاب سـه‌رده‌که‌وێ، هـه‌تا ئـه‌و ئاوه له نزیک گـوندی کـمبـو به ڕووباری کـارون ده‌گـاته‌وه، له دوایدا به‌ره‌و ڕۆژئاوا ده‌بـێتـه‌وه و له‌گـه‌ڵ هێـڵـی ٣٢ی پانـی باکـوور درێژ ده‌بـێـتـه‌وه، هه‌تا ده‌گـاته ڕووباری کرخه، ئینجـا له‌گه‌ڵ ئه‌و ڕووبـاره‌دا، هه‌تا باشـووری گوندی حـه‌مزه، به‌ره‌و سه‌ره‌وه درێژ ده‌بـێـتــه‌وه، لـه‌وێشــه‌وه بـه ڕۆژئاوای شــارۆچکه‌ی شـوشــدا تـێـده‌په‌ڕێ و لـه دوایدا ڕۆژئاوای گونده‌کانی خارکو، قه‌لعه نه‌سیر، جریه ده‌بڕێ و ئینجا ده‌گاته‌وه ڕووبـاری کرخه، له‌و گونده‌ی دواییشـه‌وه له‌گـه‌ڵ ڕووبـاری کرخـه‌دا، هه‌تا ڕۆژهـه‌ڵاتی گوندی لزا سـه‌رده‌که‌وێ، له‌وێشـه‌وه به چه‌ند کیلۆمـه‌ترێ به ڕۆژهـه‌ڵاتی گونده‌کانی ده‌شت عـه‌باس و ئه‌بوغرێب و ئه‌بو قـیـردا ده‌ڕوات، پاشــان به‌ره‌و خـوار ده‌بێتـه‌وه و به ڕۆژئاوای گـوندی شـێـخ قندیدا ده‌ڕوا، ئینجـا بـه‌ره‌و باشـووری گوندی فکه باده‌داته‌وه، هـه‌تا ده‌گـاته سنووری عـێـراق، پاشـان به چه‌ند کـیلۆمـه‌ترێک له خـوارووی گـونـدی شـێخ فـارسـه‌وه، ئه‌و هێـڵـه درێژ ده‌بێتـه‌وه به‌ره‌و سه‌ره‌وه، تا به باکووری گوندی کویتدا ده‌ڕوا، له‌وێشـه‌وه به‌ره‌و ڕۆژهـه‌ڵاتی گوندی چنه و له دواییدا به گوندی شـێخ ئه‌حـمـه‌د دا تێپـه‌ڕ ده‌بێ، هـه‌تا له هێـڵی پانی ٣٣ی باکوور به چه‌ند کیلۆمه‌ترێک نزیک ده‌بێته‌وه.

ئەو سنووره بە هێڵی پانی٣٣ی باکوور دەست پێ دەکات، لە دواییدا بەره بەره بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتـەوه، هەتا دەگـاتە هێـڵی درێژی ٤٦ی ڕۆژهەڵات، بە چەند کیلۆمەترێک لە باشووری گوندی سیمامەوه، لە دواییدا لەگەڵ ئەو هێڵەدا دێتە خوارەوه، ئینجا پاش چەند کیلۆمـەترێ بەرەو ڕۆژئاوا پێچ دەکاتەوه و لە پاشان بە باشووری شارۆچکەی جەساندا تێدەپەڕێ، لە دوایدا ئەو هێڵـە بەرەو باکوور دەبێتـەوه، لە پاشان بە ڕۆژئاوای گوندی ئەشان میرز ئاباددا تێپەڕ دەبێ. پاشان بە خەتێکی ڕاست بەرەو ڕۆژئاوای گوندەکانی سوڵتان و حاجی محەمەد و عەبدول عەترۆزدا دەڕوا و هەتا دەگاتە ڕۆژئاوای شارۆچکەی بەلەدروز. لە پاشان بە ڕۆژئاوای گوندەکانی سەلمانول سەعدون و بەنی باعس و چیچاندا، بەرەو ڕۆژئاوای شارۆچکەی میقدادیە (شارەبان) دا تێپەڕ دەبێ. لە پاشان درێژ دەبێتەوه هەتا دەگـاتە ڕووباری سـیروان، لە دوایدا لەگـەڵ ئەو ئاوەدا تا چەند کـیلۆمـەترێ بەرەو باکوور دەکشێ، هەتا ڕێژگەی ئاوی چینچال لە ڕووباری سیروان، لە دوایدا بەرەو ڕۆژئاوا پێچ دەکاتەوه و پاشـان باکووری ڕۆژئاوا دەبڕێ، هەتا دەگاتە چیای حـەمرێن. پاشـان بە بڕبڕەی پشتی ئەو چیایەدا تێدەپەڕێ، هەتا دەگاتە ئاوی داقوق، لە پاشان لەگەڵ ئەو ئاوەدا بەرەو باکووری ڕۆژئاوا دەڕوا، هەتا دەگاتە چیای مەکحول و پاشان مکێحیل، دوای ئەوه بە بەرزترین شـوێنەکـانیـدا تێدەپەڕێ و بەرەو فـەتحـە درێژ دەبێتـەوه، هـەتا دەگـاتە زێی دیجلە، لە دوایدا لەگەڵ ئەو زێیەدا بەرەو باکور بە چەند کیلۆمەترێ درێژ دەبێتـەوه، هەتا نزیک شـاری مـوسڵ،لە دوایدا بە باشـووری ئەو شـارەدا تێپـەڕ دەبێ، بەرەو ڕۆژئـاوا پێچ دەکاتەوه، هەتـا دەگاتە باشووری گوندی ئەلبویر. پاشـان دەگاتە باشـووری شـارۆچکەی تەلەعفەر، لە دواییدابە باشـووری گوندەکانی تەرمی و ئەبرات و کابێرادا تێپەڕ دەبێ. لە دوایدا بەرەو بـاکـوری گـوندی عـەین جـەسـان دەبێتـەوه و لە پاشـان بـەرەو ڕۆژئاوا درێژ دەبێتــەوه، لە پاشـان بەرەو بـاشـووری گـوندی قـەرەداغ درێژ دەبێتـەوه، لـە دوایدا بەرەو باکووری گوندەکانی شادوقی ڕۆژئاوا و سەباحیەدا دەڕوا، پاشـان بەرەو باشووری گوندی حـامرنی درێژ دەبێتەوه، ئینجا بە باکووری گوندەکانی قیکسرۆک و وەردییـەدا دەڕوا. لە پاشـــان باشـــووری گـــوندی دالە و ســەکـینیــە دەبڕێ، هەتا دەگــاتە هێـڵـی درێژی ٤١ی ڕۆژهەڵات، لە دوایدا بە زنجیرەی چیـای جەریبدا، بەرەو سنوورەکانی نێوان کوردسـتان و سووریادا تێپەڕ دەبێ.

## سنووری نێوان کوردستان و سووریا

سنووری نێوان کوردستان و سووریا، له‌ باشووری ڕۆژئاوای چیای جه‌ریب ده‌ست پێ ده‌کات. له‌ دوایدا ئه‌و خه‌ته‌ به‌ره‌و باکوور درێژ ده‌بێته‌وه‌، پاشان دوای چه‌ند کیلۆمه‌ترێ به‌ ڕۆژئاوای گوندی خاتوینه‌دا تێپه‌ڕ ده‌بێ و به‌ره‌و ڕۆژهه‌ڵاتی گوندی سه‌فیات ده‌ڕوا، هه‌تا ده‌گاته‌ هێڵی پانی ٣٦,٣٠ی باکوور. له‌ پاش چه‌ند کیلۆمه‌ترێ به‌ ڕۆژهه‌ڵاتی گوندی ته‌ل غولیدا تێپه‌ڕ ده‌بێ. دوایی پێچ ده‌کاته‌وه‌ و به‌ره‌و ڕۆژهه‌ڵات و و به‌ره‌و هێڵی درێژی ٤١,٣٠ی درێژی ڕۆژهه‌ڵات درێژ ده‌بێته‌وه‌.له‌ دوایدا به‌ خه‌تێکی ڕاست داڕوا، هه‌تا ده‌گاته‌ ته‌ل باشی، له‌ پاشان به‌رو باکووری ڕۆژهه‌ڵات سه‌رده‌که‌وێ، هه‌تا ده‌گاته‌ ڕۆژئاوای گوندی ته‌ل ده‌هسراتا، له‌ دوایدا به‌ ڕۆژئاوای گونده‌کانی دلاکی و مشیرفه‌دا ده‌ڕوا، پاشان ده‌گاته‌ باکووری ڕۆژهه‌ڵاتی شارۆچکه‌ی یه‌عروبیه‌،له‌وێشه‌وه‌ به‌ره‌ وباکووری ڕۆژئاوا درێژ ده‌بێته‌وه‌، له‌ پاشاندا به‌ ڕۆژهه‌ڵاتی گوندکانی مه‌سعه‌ده‌ و ته‌ل مه‌سرادا تێپه‌ڕ ده‌بێ. له‌ دوایدا به‌ره‌و باکوور درێژ ده‌بێته‌وه‌، دوای ئه‌وه‌ی چه‌ند کیلۆمه‌ترێ ده‌بڕێ، به‌ره‌و ڕۆژهه‌ڵات ده‌بێته‌وه‌، ئینجا به‌ره‌و هێڵی درێژی ٤٢ی ڕۆژهه‌ڵات و ده‌ڕوا و زۆر لێی نزیک ده‌بێته‌وه‌. له‌ دواییدا به‌ ڕۆژئاوای گوندی ئه‌لبونه‌دا تێپه‌ڕ ده‌بێ و به‌ره‌و ڕۆژئاوا و به‌ره‌و ڕۆژهه‌ڵاتی گوندی عه‌لی ئاغادا ده‌ڕوا. له‌ پاشان به‌ چه‌ند کیلۆمه‌ترێ به‌ ڕۆژئاوادا شۆڕ ده‌بێته‌وه‌، پاشان له‌وێشه‌وه‌ به‌ره‌و ڕۆژئاوا ده‌ڕوا، ئینجا به‌ باکووری گوندی تل علودا ده‌ڕوا، پاشان سه‌رده‌که‌وێته‌وه‌ و له‌ دوایشدا به‌ره‌و ڕۆژئاوا دێته‌وه‌، له‌ پاش چه‌ند کیلۆمه‌ترێ به‌ باکووری گوندی مشلشه‌دا به‌ره‌و باکووری ڕۆژئاوا تێپه‌ڕ ده‌بێ، ئینجا جارێکی دیکه‌ سه‌رده‌که‌وێته‌وه‌، تا له‌ دوایدا به‌ باکوری گونده‌کانی بزونه‌، خربه‌ سولیه‌دا تێپه‌ڕ ده‌بێ. ئینجا له‌ هێڵی ٤١,٣٠ درێژی ڕۆژهه‌لات ده‌په‌ڕێته‌وه‌. له‌ پاشان به‌ره‌و باشوور ده‌بێته‌وه‌ و به‌ ڕۆژئاوای ئه‌و هێڵه‌دا ده‌ڕوا، هه‌تا له‌ باکوری گوندی متلونه‌ی پچووک نزیک ده‌بێته‌وه‌، ئینجا به‌ره‌و باکوور سه‌رده‌که‌وێته‌وه‌ و به‌ ڕۆژهه‌ڵاتی گوندی خربه‌ عریزه‌دا تێپه‌ڕ ده‌بێ. ئینجا له‌وێشه‌وه‌ به‌ ڕۆژئاوای گوندی تل بلیچدا ده‌ڕوا، له‌ پاشان به‌ره‌و باکوور سه‌رده‌که‌وێ، هه‌تا له‌ هێڵی ٣٧ی پانی باشوور نزیک ده‌بێته‌وه‌، له‌ پاشان چه‌ند کیلۆمه‌ترێ به‌ باکووری گوندی حاجیه‌ی گه‌وره‌دا ده‌ڕوا، له‌وێشه‌وه‌ به‌ ڕۆژهه‌ڵاتی گوندی خربه‌ خزنه‌دا تێپه‌ڕ ده‌بێ، ئیجا دێته‌وه‌ خوارێ، هه‌تا ده‌گاته‌ ڕۆژئاوای گوندی توبیل. ئینجا به‌ره‌و ڕۆژئاوا ده‌بێته‌وه‌، له‌ دوایشدا به‌ره‌و باشور ده‌ڕوا، هه‌تا له‌ ڕۆژهه‌ڵاتی گوندی تل ستیح نزیک ده‌بێته‌وه‌، ئینجا به‌ره‌و ڕۆژهه‌ڵات دێته‌وه‌، هه‌تا چه‌ند کیلۆمه‌ترێ له‌ ڕۆژئاوای گوندی تل عنبر، له‌وێشه‌وه‌ به‌ره‌و باشوور ده‌بێته‌وه‌ و به‌ ڕۆژئاوای گوندی حه‌دادیه‌دا تێپه‌ڕ ده‌بێ،

ئینجا بەرەو خوارەوە دێتەوە، هەتا دەگاتە نزیک باکووری گوندی تەل عەجین، لەوێشەوە بەرەو باکوور سەردەکەوێتەوە، ئینجا بە ڕۆژئاوای گوندی مشیرعەی گەورەدا دەڕوا، لەوێشەوە بە باشووری گوندی باوعەدا تێپەڕ دەبێ، پاشان بەرەو ڕۆژئاوا دێتەوە خوارێ، لە پاشان بە چەند کیلۆمەترێ بە ڕۆژهەڵاتی گوندی غالیدا، بەرەو خوار دەبێتەوە. لە پاشان بە چەند کیلۆمەترێ بە ڕۆژئاوای گوندی ئەلبویردا تێدەپەڕێ. لە دوایدا دێتەوە خوارەوە و بە باکووری گوندی خربە ئەلشێخدابەرەو ڕۆژئاوا، تێدەپەڕێ، هەتا دەگاتە هێڵی ٤١ی درێژی ڕۆژهەڵات، لەوێشەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەکشێ. لە پاش چەند کیلۆمەترێ بە باکووری گوندی کورماتیدا تێپەڕ دەبێ. ئینجا سەردەکەوێتەوە و لە پاش چەند کیلۆمەترێ، بە باشووری گوندی کرعافیشکدا تێپەڕ دەبێ. لە پاشان بە باشووری گوندی بیرپازان و لەوێشەوە بەرەو ڕۆژئاوادەبێتەوە و بە چەند کیلۆمەترێ بە باشووری گوندی شاموکە قبلیەدا تێپەڕ دەبێ. ئینجا لە باشووری گوندی خربە ئەلبەیادرەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە، هەتا دەگاتە هێڵی ٤٠,٣٠ی درێژی ڕۆژهەڵات. لە دوایدا بە باکووری گوندی حەسنەدا، بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە. ئینجا بەرەو باکوور سەردەکەوێتەوە، لە پاشان بە باشوری گوندی تەل ئەلوەردی ڕۆژهەڵاتدا تێپەڕ دەبێ. لەپاشان بەرەو باشووری ڕۆژئاوا دەبێتەوە، ئینجا بەرەو باکووری ڕۆژئاوا دەڕوا و جارێکی دیکە بەرەو باشووری ڕۆژئاوا و لە دوایدا باشووری ڕۆژهەڵات پێچ دەکاتەوە، هەتا دوای چەند کیلۆمەترێ دەگاتە ڕووباری خابوور، لە خوارووی گوندی تەل عریشەوە. لەوێشەوە شێوی سفیان دەبڕێ و پاشان بەرەو هێڵی ٣٦,٣٠ی پانی باکوور دێتە خوارەوە. ئینجا بە ڕۆژئاوای بکارات ئەلجەبەلدا تێپەڕ دەبێ، لە دوایدا بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە، ئینجا بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات و لەدوایشدا بە ڕۆژهەڵاتی شاخی ئەلسفیاندا، بەرەو باشوور تێپەڕ دەبێ، هەتا دوای چەند کیلۆمەترێ، باکووری ئاوایی سجریە دەبڕێ. لە دوایدا لە ڕۆژهەڵاتی هێڵی ٤٠ی درێژی ڕۆژهەڵاتەوە، بەرەو باکووری ڕۆژئاوا دەبێتەوە. لەوێشەوە لە ڕۆژئاوای بیری خریفە تێپەڕ دەکا، ئینجا بە ڕۆژهەڵاتی بیری جزیەدا تێپەڕ دەبێ. ئینجا دوایی دەگاتەوە هێڵی ٣٦,٣٠ی پانی باکوور، لەوێشەوە بەرەو باکووری ڕۆژئاوا بادەداتەوە، لە دویدا لە ڕۆژئاوای دۆڵی ئەلحمار و شعب عدوانی، بەرەو هێڵی ٣٩,٣٠ی درێژی ڕۆژهەڵات تێپەڕ دەکا. ئینجا لەوێشەوە بەرەو باشووری گوندی نسف تەل دێ، لە پاشان بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە و بە باشووری ئێسگەی غوجاردا دەڕوا، لەوێشەوە دوای چەند کیلۆمەترێ بە باشووری گوندی تەل شووردا بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوا، هەتا دوای چەند کیلۆمەترێ، بە ڕۆژهەڵاتی گوندی جەنداویدا تێپەڕ دەبێ. لەوێشەوە بەرەو باشووری ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە. لە پاشان بە

ڕۆژئاوای بیری لویبدەدا بەرەو خوار تێپەڕ دەکات و زۆر لە هێڵی ٣٩ی درێژی ڕۆژهەڵاتەوە نزیک دەبێتەوە. ئینجا لەو هێڵەوە بەرەو ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە، لەدوایدا بە باشووری گوندی خربەی ڕزدا بەرەو ڕۆژئاوا تێپەڕ دەکا، پاش چەند کیلۆمەترێ، بە باشووری گوندی منکلیدا تێپەڕ دەبێ. لە دوای چەند کیلۆمەترێک، لە ڕۆژهەڵاتی گوندی واستەوە، بەرو باکوور دەبێتەوە و پاشان بە ڕۆژهەڵاتی گوندی خنیزیردا بەرەو ڕۆژهەڵاتی گوندی ئەبو حنیرەدا تێپەڕ دەبێ، ئینجا لە باکووری ئەو گوندەوە، بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە و بە باشوری گوندی بربرەدا، بەرەو باشوری گوندی کتال عەبیددا تێپەڕ دەبێ. لەوێشەوە بەرەو باشوور دەبێتەوە، پاشان بە ڕۆژئاوای گوندی کلجەدا تێپەڕ دەکات. ئینجا ڕۆژئاوای گوندی سەبع جەفار دەبڕێ، هەتا دەگاتە سەر هێڵی ٣٦,٣٠ی پانی باکوور. لەوێشەوە بەرەو باشوور درێژ دەبێتەوە، پاشان داوی چەند کیلۆمەرێک، بە ڕۆژهەڵاتی گوندی ئەبونیتۆلەدا تێپەڕ دەکات، ئینجا دوایی بەرەو ڕۆژئاوا بادەداتەوە و لە ڕۆژهەڵاتی گوندی شەهم تێپەڕ دەکات. لە پاشان لە هێڵی ٣٨,٣٠ی درێژی ڕۆژهەڵات تێپەڕ دەبێ. لە دویدا پاش چەن کیلۆمەترێک، بە باکووری گوندی ڕەجم ئەلرحابیەدا تێدەپەڕێ، ئینجا بەرەو باکوری گوندی شەلال دەکشێ و لەوێشەوە دەڕوا هەتا دەگاتە زێی فورات. ئینجا لەگەڵ ئەو زێیەدا بەرەو باکوور، هەتا گوندی زورمغار سەردەکەوێتەوە، پاشان لەوێشەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە و بە باشووری گوندی یوسڵساڵدا دەڕوا. ئینجا دوای چەند کیلۆمەترێ، بە باشووری گوندی هوڵمندا تێپەڕ دەکات. پاشان بە چەند کیلۆمەترێکی دیکە باکووری گوندی زوعر جێ دەهێڵێ. لەوێشەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە. لە دوایدا بە چەند کیلۆمەترێ بە باشوری گوندی کەنیسەی ئەزیردا، بەرەو ڕۆژئاوا تێپەڕ دەبێ، ئینجا بە باشووری گوندی بیاریدا دەڕوا، هەتا دەگاتە هێڵی ٣٧,٣٠ی درێژی ڕۆژهەڵات و لە پاشان بە باکووری گوندی سەلجەی ڕۆژهەڵاتدا تێدەپەڕێ. ئینجا بە باشووری گوندی سلڤان دەبڕێ و لەوێشەوە بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە و بە باشووری گوندی سیویدا تێپەڕ دەکات. لەوێشەوە بەرەو باکوور دەبێتەوەو بە ڕۆژئاوای گوندی قوزردا دەڕوا. لە پاشان بەرەو ڕۆژئاوای گوندی عومەر جیکدا دەڕوا و لەوێشەوە بە باکوری گوندی قرە بیاکدا تێپەڕ دەبێ.ئینجا بە باشووری گوندی بولاتللی دەڕوا و بەرەو ڕۆژهەڵاتی گوندی موسی بیلی دەکشێ، لە پاشان لە ڕۆژهەڵاتی ئەو گوندەوە، بەرەو باشوور دەبێتەوە، هەتا دەگاتە ڕۆژهەڵاتە گوندی مغار چیک، ئینجا بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە. پاشان دوای چەند کیلۆمەترێ، بە باشووری گوندی مردانلیدا تێپەڕ دەبێ، ئینجا بە باشووری گوندی کارتیە و لە دوایشدا بە ڕۆژئاوای گوندی ئاگری کینا و ئینجا کەمێ بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە. تا بە

تەواوی بەرەو هێڵی ٣٧ی درێژی ڕۆژهەڵات دەڕوا و لێی نزیک دەکەوێتەوە. لە دوایدا بە ڕۆژئاوای گوندی زاولی و بەرو ڕۆژهەڵات پێچ دەکاتەوە، تا پاشان لە ڕۆژئاوای گوندی تاتیە نزیک دەبێتەوە. لەوێشەوە دوای چەند کیلۆمەترێک بە ڕۆژئاوای ئەعزاز، بەرەو ڕۆژئاوای گوندی سیجراندا تێپەڕ دەبێ، ئینجا لە هێڵی ٣٧ی درێژی ڕۆژهەڵات دەپەڕێتەوە. لە دوایدا بە دەوروبەری ئەو خەتەدا دێتە خوارەوە، هەتا ڕۆژئاوای تەل عجار بە چەند کیلۆمەترێک. لەوێشەوە چەند کیلۆمەترێک بەرەو ڕۆژهەڵاتی گوندی ئابین دەڕوات، ئینجا بە ڕۆژئاوای گوندی دیر حەجالدا تێپەڕ دەکات. پاشان دوای چەند کیلۆمەترێک بەرەو ڕۆژهەڵات دەبێتەوە و بە ڕۆژهەڵاتی گوندی غەربیەدا تێپەڕ دەکات. ئینجا بەرەو ڕۆژئاوا بادەداتەوە، لە دوایدا بەرەو ڕۆژئاوای گوندی بنلدا تێپەڕ دەکات. پاشان لە هێڵی ٣٧ی پانی باکوور نزیک دەبێتەوە، هەتا ڕۆژهەڵاتی گوندی تنورەش دەڕوات. لەوێشەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە، پاش چەند کیلۆمەترێک. بەرەو سەر دەبێتەوە و لە باکووری گوندی باسوفانەوە دێتە خوارەوە، پاشان بەرەو ڕۆژهەڵاتی گوندی سلوە دەڕوا و لەوێشەوە بەرەو باشووری گوندی ئەتمە دەڕوا، تا لە دوایدا بە باکووری گوندی خۆجەدا تێپەڕ دەکات و لەوێشەوە بەرەو ڕۆژئاوای گوندی ئەلحەمامدا دەڕوا و بەرەو باکوور دەکشێ، هەتا دوای چەند کیلۆمەترێک، لە ڕۆژهەڵاتی گوندی سوجو، بەرەو سەرەوە دەڕوات، هەتا دەگاتە ئاوی قەرە سو. لە دوایدا لە باشووری چیای کوێر ئۆغلۆ کۆی، بەرەو ڕۆژئاوا دەبێتەوە. ئینجا لە ئاوی موبنیک چای دەپەڕێتەوە، لە دوایدا بە چەند کیلۆمەترێک لە باشووری گوندی ئاقبنەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەکشێ، ئینجا بە ناوەڕاستی چیای نورداغلیدا دەڕوات و بەرەو ڕۆژئاوا دەکشێ. هەتا دەگاتە سەر کەنداوی ئەسکەندرون، لە خوارووی گوندی ساری سکی بە چەند کیلۆمەترێک.

**سنووری ئاویی کوردستان**

کوردستـان لە دوو لاوە سنوورەکەی دەگاتەوە سـەر ئاو، ئەوشی لە باکووری ڕۆژئاوا و باشـووردایە. درێژی سـنووری ئاویی، لەچاو درێـژایی سنووری زەمـینیـدا، زۆر کـەمـە و لە چەند سەد کیلۆمەترێک زیاتر نابێ.

**سنووری کوردستان لەسەر کەنداوی ئەسکەندەرۆن**

لە باشـووری گوندی سـاری سکی بە چەند کیلۆمەترێک، ئەم سنوورە دەست پێ دەکات و بەرەو باکوور بە چەند کیلۆمـەترێک دەکشێ. لە دوایدا بەرەو باکوری ڕۆژئـاوا دەبێتـەوە، هەتـا دەگـاتـە هێـڵـی درێژی ٣٦ی ڕۆژهەڵات و لەگــەڵ ئەو خــەتەدا کــۆتـایی بە سـنووری کوردستان دێت، لە کەنداوی ئەسکەندەرۆن.

**سنووری کوردستان لەسەر کەنداوی عەرەبی (فارسی)**

لە باشـووری بەندەری ڕیگەوە دەست پێ دەکات و بەرەو باکووری ڕۆژئاوا هەڵدەکشێ، و بەلای ڕۆژئاوای شـارۆچکەی بەندەر گناوە دا تێـپـەڕ دەکـات. لە دوایـدا بەرەو ڕۆژئاوای گوندەکانی مال سلێمان، چامک، چاه شور، نبگ و لە پاشان بەرەو باکوور درێژ دەبێتەوە و بە ڕۆژئاوای گوندی ئیمام حەسـەن و حەسـاردا دەڕوات. لە دوایدا درێژە بە ڕۆیشـتنەکەی دەدات وبە ڕۆژئاوای گـوندکـانی لیلتین، بویرات، بە چەند کـیلۆمـەترێک تێـپـەڕ دەبێ، هەتا دەگاتە ڕۆژئاوای بەندەر دەیلەم، لەوێشـەوە بەرەو باکووری ڕۆژئاوا دەڕوا و لە دوایدا بەرەو ڕۆژئاوای گوندی ڕگ سەفید، بە چەند کیلۆمەترێک درێژە بە ڕۆیشـتنەکەی دەدات، پاشان هەتا لە ڕۆژهـەڵاتی هێڵی درێژی ٥٠ی ڕۆژهەڵات بە چەند کـیلۆمـەترێکی دیکە کـۆتایی پێ دێت. واتە سـنووری کوردسـتـان، لەگەڵ ئـاسـتی کـەنداودا، لە باشـووری بـەندەری ڕیگەوە، هەتا ڕۆژهەڵاتی هێڵی درێژی ٥٠ی ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە.

# بەشی حەوتەم: دابەشبوونی ئیداری خاک (تێریتۆریا)

بۆ هەڵسوڕانی کاروبارەکانی ئیداری لە هەموو وولاتەکانی جیهاندا، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و ئاسان، پێویستە نێوچە جوگرافیەکانی ئەو وولاتانە، بەسەر چەند یەکەیەکی ئیداری جیاوازدا دابەش بکرێن، کە هەر نێوچەیەک بەپێی ڕووبەری خاکەکەی، باری ئابووریی، ڕەوشی کۆمەلایەتیی، گیروگرفتەکانی نەتەوەیی و ڕامیاریی، شوێنی جوگرافیی و دوور و نزیکیی ئەو نێوچانەوە لە پایتەختی دەوڵەتەکەوە، هەروەها بەپێی بارودۆخ و دوور و نزیکیانەوە، لە وولاتەکانی دەوروبەرەوە، ئەو یەکە ئیداریانە دیاری دەکرێن و بەڕێوە دەبرێن.

دابەشبوونی ئیداری خاک لە کوردستاندا، هەر لە کۆنەوە تاکوو بەم قۆناغەی ئەوڕۆ گەیشتووە، چەندین قۆناغی بڕیوە و گەلێ گۆڕانکاریی گەورەی لە شێوە و ناوەڕۆکدا بەسەردا هاتووە، بۆیە لێرەدا بە کورتی لە هەندێ لەو گۆڕانکارییانە دەدوێین:

## دابەشبوونی ئیداری خاک لە پێش ساڵەکانی هەشتادا

### لە سەردەمی هەخامەنشیەکاندا (٣٣٠ - ٥٥٩ پێش زایین)

کۆنترین زانیاری لەسەر دابەشبوونی ئیداریی خاک لە کوردستاندا، هەروەها لە وولاتەکانی دەوروبەردا، بۆ سەردەمی دەسەلاتدارێتی داریۆشی یەکەم دەگەڕێتەوە. داریۆش وولاتی هەخامەنشی بەسەر چەند بەشێکدا دابەش کرد بوو، بەڕێوەبەرێکیشی بۆ هەر بەشێک دیاری کرد بوو، کە نازناوی (خشسراپاون) پێ بەخشی بوون. پاشان یۆنانییەکان لەبری ئەم نازناوە، (ساتراب) یان بەکار دەهێنا. وولاتی هەخامەنشییەکان لە سەردەمی داریۆشی یەکەمدا، لە ٢٠ تاکوو ٢٨بەشی ئیداری پێک هاتبوو، ناوەکانیشیان بەپێی بووسینەکانی نەخشی ڕۆستەم ئەمانە بوون:

مەملەکەتی مادی (ئازەربایجان، کوردستان و عێراقی عەجەم). خۆزستان. پارس (خۆراسان و گورگان). هەرات. باختەر. بەلخ. سەغد (بوخارە و سەمەرقەند). خوارەزم (خیوە). سیستان. ڕەخج (باشووری ئەفغانستان هەتاکوو قەندەهار). پەنجابی هیند. کابول و پیشاور. سەند. ساکها و پشت سەیحون. بابل. ئاسوور. عەرەبستان. میسر. ئەرمەنستان. ڕۆژئاوای ئاسیای پچووک. یۆنانییەکانی ئاسیای پچووک. سکەهای لای

زەریا. مەکەدۆنیا. یۆنانییەکانی سپرداد (تورکیای ئەورۆ). سۆماڵ و عەدەنی ئەورۆ. حەبەشە. کاپادۆکیا (بەشی ڕۆژهەڵاتی ئاسیای پچووک). بەرقە. قەرتاجنە (٤٤، لاپەڕە ٢٦٥١).

**لە سەردەمی ئەشکانییەکاندا** (٢٢٦ پ..ز. - ٢٥٠ د.ز.)

ئەشکانییەکان وولاتەکەیان بەسەر دوو بەشی ئیداری جیاوازدا دابەش کرد بوو، یەکەمیان: وولاتە سەربەخۆ گچکەکانی وەکوو (پرسید، لیمائید، مەسن، ماد، ئاترۆپایین، هیرکان و سکستان. دووەمیشیان لە ١٨ ساتراپ پێک هاتبوو کە بە ڕیز ئەمانەن: بابل. ئاپۆلۆنیاتیس. خالونیت. کارینا (شوێنی بە تەواویی نازانرێ، دوور نییە هەمەدان نەبێ) کامبادان (کرماشان). مادی سەروو (هەمەدان) مادی خواروو یاخود مادی ڕازی (ڕەی) خوئارن (خوار) کەمین (قومیش) نزیکەی دامغانی ئەورۆ دەگرێتەوە. وهرکان (گورگان) ئاستونێن (بە تەواویی ناناسرێتەوە). پارتی تایبەت. ئاپائاوار تاکس (بەشێکە لە پارتی تایبەتی). مەرگیان (مرۆ). ئاریا (هەرات). ئانا ئوئر (بەشێکە لە هەرات). زرنگ (سیستان) . ئاراخوزیا (رخج یا هیندستان). (٥٠، لاپەڕە ١٣١).

**لە سەردەمی ساسانییەکاندا** (٢٢٦ - ٦٥٢ز)

ساسانییەکان لە دابەشبوونی خاکدا، لە ڕوی ئیدارییەوە دوو شتیان لە پێش چاو دەگرت: یەکەمیان – دەسنیشانکردنی تەواوی سنوورە ئیدارییەکان و دەسەڵاتداری فەرمانڕەواکان و سەنتەر بوو. دووەمیشیان: باری سەربازیی (سوپایی) بوو. ئیمپراتۆرییەتی ساسانی لەبەر ڕۆشنایی ئەم دابەشکردنەدا، لە چوار بەش پێک هاتبوو:

١. خۆراسان (ڕۆژهەڵات)، خۆراسانی ئەورۆ، خوارزم، بوخارا، سەغد، گورگان، سیستان، بلوجستان.

٢. خوربران (ڕۆژئاوا)، عێراق، کرماشان و کوردستان.

٣. باختەر (مەبەست لە باکوورە)، ئازەربایجان، ئەرمەنستان، گورجستان، قەفقاز، تەپورستان (مازندەران)، دەماوەند.

٤. نیورۆژ (مەبەست لە باشوورە)، خۆزستان، پارس، کرمان، سگستان، سند. (٥٣، لاپەڕە ٢٦٧).

**له سەردەمی عەرەبەکاندا** (٦٣٧ - ١٢٥٨ ز)

عەرەبەکان لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین و ئەمەوییەکان و عەباسییەکاندا، هەتاکوو بەغداش لە لایەن مەغۆلییەکانەوە گیرا و کاول کرا، لە نێوچەیەکی فراوانی ڕۆژهەڵاتدا، بە ناوی ئیسلامەوە فەرمانڕەوایی ئەو نێوچانەیان دەکرد. لەبەر ئەوەی عەرەبەکان پێشتر، خاوەنی هیچ جۆرە سیستەمێکی ئیداری نەبوون، لەگەڵیدا ئاشنایەتییان نەبوو، ناچار بوون، لەو وڵاتانەی داگیریان کرد بوون، بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ پەیڕەوی سیستەمی ئیداری سەردەمی ساسانییەکان بکەن. ئیمپراتۆرییەتەکەشیان بەم شێوەیە دابەش کرد بوو:

١. جەزیرە: دیاری موزیر (ڕقە)، دیاری ڕەبیعە (موسڵ)، دیاری بەکر (ئامێد).

٢. عێراقی (عەرەبی): حەلوان (سەرپێڵی زەهاو).

٣. وڵاتی ڕۆم: مەلاتیە، تۆقات، سێواس.

٤. ئەرمینیا و ئاران و ئازەربایجان: وانە، بەرزەعە، تەبرێز، ئەردەبیل، مەراغە.

٥. هەرێمی چیا (عێراقی عەجەم یاخود کوهستان): سوڵتانیە، هەمەدان، قرمەسێن (کرماشان)، هەولێر، شارەزوور (یاسین تەپە). (١٣، لاپەڕە ٨-٩).

**له سەردەمی مەغۆلەکاندا** (١٢١٧ - ١٣٨٢ ز)

مەغۆلەکان لە ماوەی فەرمانڕەواییاندا، هەندێ گۆڕانکارییان لە سیستەمی ئیداریدا کرد. ژمارەی بەشە ئیدارییەکانیان لە ئیمپراتۆرییەتەکەیاندا زیاد کرد، بۆ ئەوەی لەگەڵ هەڵوێستی ڕامیاریی و کۆمەڵایەتی، بە تەواویی بگونجێ. کوردستان لە سەردەمی مەغۆلەکاندا (١٣٤٠ ز)، لەم بەشە ئیداریانە پێک هاتبوو (٤٥، لاپەڕە ١٠٢-١٠٩):

- **وولایەتی کوردستان:** ئەم وولایەتە لە شانزە یەکەی ئیداری بە ناوی ئیالەتەوە (نێوچە) پێک هاتبوو. وەکوو: ئالانی، ئەلیشتەر، بەهار، خەفتیان، دەربەندی تاج خاتوون، دەربەندی زەنگی، دەزبیل، دینەوەر، سوڵتان ئاباد، شارەزوور، کرماشان، کەرەند و خۆشان، گەنکاوەر، مایدەشت (واستام - بێستوون)، هەرسین.

- **وولایەتی دیاربەکر و ڕەبیعە:** ئەم وولایەتە لە ٢٩ یەکە ئیداری، بە ناوی ئیالەتەوە (نێوچە) پێک هاتبوو. وەکوو: موسڵ، ئەربیل، ئەرزن، ئامەد، باسەیدە، بازەرنوح، بەرتللی، بوازیج، جەسار، جەزیرە، حانی و سیوان، حەڕان، حەسەنکیف، خابور، ڕەسولعەین، ڕەقە، ڕوها،

ساعرد، سنجار، سوق سەمانین، عەقرە، عەمادیە، قەرقیسیا، کەرمەلێس، ماردین، موش، میافارقین، نەسیبین، موسڵ.

- **وولایەتەکانی عێراقی عەرەبی و خۆزستان**: بەرازی روز (بەلەدروز)، بەندنیچین، (مەندەلی)، حەلوان (سەرپێڵی زەهاو)، خانەقین، داقوق، زەنگ ئاباد، باجسری، شارەبان، قەسری شیرین، دێزفول، سوس، لوڕی بزرگ (نێوچەی بەختیاری)، لووڕی پچووک، لۆردگان، بروجەرد، خوڕەم ئاباد، سەمسا و سێمەرە.

**لە سەردەمی سەلجوقییەکاندا** (١٠١٩ - ١١٩٦ ز)

سەلجوقییەکان لە دەوروبەری ساڵی ١٠١٩ هەتا ١١٩٦ی زایینی، لە کوردستاندا فەرمانڕەواییان کردووە. لەو ماوەیەدا، بەپێی سیستەمی ئیداری خۆیان، کاروباری ئیداریان بەڕێوە بردوو. وولاتەکەیان بەسەر چەند یەکەیەکی ئیداری گەورەدا، بە ناوی (ئیالەت) ەوە دابەش کردووە و کاربەدەستێکی باڵا سەرپەرشتی کردووە.

کوردستان وەک زاراوەیەکی ئیداری و بگرە وەک زاراوەیەکی جوگرافییش (خاک)، بۆ یەکەم جار لە سەردەمی سەلجوقییەکاندا بەکار هێنراوە. بە واتایەکی دیکە دەتوانین بڵێین، پێش دەسەڵاتی سەلجوقییەکان، بە تایبەتی سوڵتان سەنجەری سەلجوقی (١١١٧ – ١١٥٧ ز.)، ئەم زاراوەیە نەبوو. ئەم سوڵتانە لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا، هەموو ئەو یەکە ئیداریانەی کەوتبوونە، ڕۆژئاوای هەرێمی چیای (کۆهستان – عێراقی عەجەم) لە سەنتەری ئەم هەرێمەی دابڕی و لە بەشێکی ئیداری تازەدا کۆی کردنەوە و ناوی لێ نا (ئیالەتی کوردستان). ئەم بەشە ئیدارییە تازەیەش، لە سەرەتادا لەم نێوچانە پێک هاتبوو: هەمەدان، دینەوەر، کرماشان، شارەزوور، سنجار، قەڵای بەهار لە سەرەتاوە، لە دواییشدا سوڵتان ئاباد (چەمچەماڵ) کرا بە پایتەخت (٧٧، لاپەڕە ١٩٢).

**لە سەردەمی سەفەویەکان و عوسمانییەکاندا:**

کوردستان لە سەردەمی عوسمانییەکان و سەفەوییەکاندا، بەسەر چەند یەکە ئیدارییەکی گەورە، بە ناوی (ئیالات – وولایەت) ەوە، دابەش کرا بوو. هەر یەکێ لەم ئیالەتانەش، لە چەند یەکە ئیدارییەکی پچووکتر پێک هاتبوو، پێیان دەگووت (سنجا ق)، کە لە لایەن سنجاقدارێکەوە بەڕێوە دەچوو. ئیالەتەکانی کوردستان لە دەوروبەری ساڵی ١٥١٥ی زایینیدا، ئەمانە بوون:

- **ئیالەتی دیاربەکر**: یەکە ئیدارییەکانی ئەم ئیالەتە، لە ڕووی شێوەی بەڕێوەبردنی کاروباری ئیداریی و هەندێ شتی دیکەوە، بەسەر سێ دەستەدا دابەش دەکرێن:

ا – سنجاق: ئەم سنجاقانە، یەکسەر لە لایەن کاربەدەستانی دەوڵەتی عەسمانییەوە بەڕێوە دەبران، بەپێی ئەو سیستەمە ئیدارییەی کە لە بەشەکانی دیکەی ئەم دەوڵەتەدا هەبون. سنجاقەکانیش ئەمانە بوون ؛ خارپۆت، ئەرغەنی، سێوەرکی، نەسیبین، حەسەنکیف، چەمشکەزەک، سعرد، مفارقین، ئاقچە قەڵای نەسیبین، خابور، سنجار.

ب – سنجاقی خانەدانان: میرە کوردەکان، لە بەڕێوەبردنی کاروبارە نێوخۆییەکانی ئەم سنجاقانەدا، پرسیان بە کاربەدەستانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی نەدەکرد و بەو شێوەیەی خۆیان دەیانویست، میرنشینییەکانیان بەڕێوە دەبرد، واتە لە ڕووی ئیدارییەوە سەربەخۆ بوون. سنجاقەکانیش ئەمانە بوون: سیغمان، قوڵب، مەهرانیە، تەرجیل، ئەتاق، پرتک، جەپاقچور، چەرمک.

ج – حوکومەتی سەربەخۆ: لە چوارچێوەی ئیالەتی دیاربەکردا، چەند حوکومەتێکی سەربەخۆ هەبوون، لە هەڵسوڕاندنی کاروباری نێوخۆی خۆیاندا سەربەخۆ بوون و لە لایەن سوڵتانەکانی عوسمانییەوە، نازناوی #میری میران" یان پێ بەخشرا بوو. حوکومەتەکانیش ئەمانە بوون: ئەگیل، پاڵۆ، جەزیرەی ئیبن عومەر، حەزۆ، گەنج، خابور، مالاشکرد.

- **ئیالەتی وان**: ئەم ئیالەتە، بەپێی هەندێ سەرچاوە لە ٤١ یەکە ئیداری پێک هاتبوو: (٣٧ سنجاق و ٤ حوکومەتی سەربەخۆ)، کە هەمان سیستەم و پایەی ئیداری ئیالەتی دیاربەکری هەبووە.

ا – سنجاق: ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، لە دانان و لابردنی ئەم یەکە ئیداریانە بەرپرسیار بوو. ناوەکانیان ئەمانە بوون: ئەرجیش، عادیلجەواز، موش، بارگر، گەڕگەڕ، کسانی، هێزان، سعرد، ئاغاکیش، شروی (شیروانی کوردان)، قەتور، قەڵای بایەزید، بەردەع، ئەرەجک، کورلادێک، چۆپانلۆ، شۆرگر، دالەگیر، زریقی، وان.

ب – سنجاقی خانەدانان: ئاباغای، قەرەجەقەڵا، ماکۆ، زیادین، کارنی، سورەکێو، مەکەس، لادیک، ئاقچەقەڵا، شتاق، لاموس، ئوزەجک... هتد.

ج – حوکومەتی سەربەخۆ: هەکاری، بدلیس، مەحموودی، بنیانش.

- **ئیالەتی ڕوها**: ٤/ ئیالەتی موسڵ. ٥/ ئیالەتی کوردستان. ٦/ ئیالەتی لوڕستان.

**دووەم: دابەشبوونی ئیداری خاک لە دوای ساڵەکانی هەشتاوە:**

باری ئابووریی و کۆمەلایەتیی و ڕامیاریی، لە سیستەمی دابەشکردنی ئیداری کوردستاندا، ڕۆڵی گرنگی تایبەتیی خۆی وازی دەکات. گرنگترین ئەو تایبەتمەندییانەش ئەمانەن:

– چەسپاندنی دەسەلات: دەوڵەتی ناوەندی، لە کاتی نەخشەدانانی ئیداریدا، زیاتر بایەخ بە لایەنی سەربازیی دەدات، وەک لە لایەنە ئابووریی و کۆمەلایەتیی، ئەمەش زیاتر بە مەبەستی چەسپاندن و درێژەدانە بە دەسەلات و کۆنترۆلکردنی نێوچە جیاجیاکانی بندەستییەتی.

– ناوگۆڕین: گۆڕینی ناوە مێژووییەکانی شوێنە جوگرافییەکان، لە کوردییەوە بۆ تورکی و عەرەبی و فارسی، بە مەبەستی سەرلێشێواندنی ناشارەزایان، تا ئەو نێوچە و شوێنانە نەناسنەوە و دروسکردنی بەڵگەی ساختە، تا بیسەلمێنن، ئەو شوێنانە کوردستان نین و دەسەلاتی حوکومەتی ناوەندی زیاتر تێدا بچەسپێنن، لە لایەکی دیکەشەوە ناوە کۆنەکان لە بیر دانیشتووان بەرنەوە و فێری ناوە تازەکانیان بکەن. نموونەش لەسەر ئەم کردارانە گەلێک زۆرن، وەکوو گۆڕینی ناوی گوند و قەزا و شارەکان. بۆ نموونە، لە باکووردا، تورکیا لە ساڵی ١٩٣٦دا، ناوی دەرسیمیان گۆڕی بە تونجەلی. لە ڕۆژهەلاتدا، ئێران لە ساڵی ١٩٧٩دا، ناوی کرماشانیان گۆڕی بە باختەران. لە باشووردا عێراق، لە ٢٩-١-١٩٧٦ دا، ناوی پارێزگای کەرکووکیان گۆڕی بە تەئمیم.

– سڕینەوە: دەوڵەتی عێراق، لە نێوان ساڵەکانی ١٩٧٧ – ١٩٨٧ دا، ٤٣ ناحیەی بە تەواویی سڕییەوە و زۆربەشیانی چۆڵ کرد و دانیشتووانەکانیشی دەربەدەر و ئاوارە کرد، تا مەبەستە سەربازییەکانی خۆی بەدی بهێنێ. ئەمەش ناوەکانیانە:

قوشتەپە، خەبات، کەندیناوە، تەقتەق، شۆڕش، برادۆست، مێرگەسوور، بارزان، خۆشناو، باڵەک، حاجی هۆمەران، بەرواری بالا، ڕزگاری، قەرەداغ، خورماڵ، بیارە، گەرمک، سیوەیل، ماوەت، هێرۆ، مەرگە، ڕانیە، ئاغجەلەر، سەنگاو، تیلەکۆ، قەرەحەسەن، شوان، یایجی، کەڵەک، وانە، مریبە، مزوری، نەهلە، سورچی، گروەشین، مەیدان، قۆرەتو، جەباری، سەرقەلا، کۆکس، نەوجۆڵ، قادر کەرەم، زڕباتییە.

– گۆڕینەوەی ناو: هەر ڕژێمێکی تازە دێ، ناوی ئەو شوێنە جوگرافییانەی پێش ئەو گۆڕا بوون، جارێکی دیکە دەیان گۆڕنەوە وبە ناوی ڕووداوە گرنگەکانی ڕژێم و سەرکردەکانییەوە، ناوی تازەیان لێ دەنێن، بە مەرجێ لەگەڵ بیروڕای خۆیاندا بگونجێ. نموونەی ئەمانەش لە ڕۆژهەلاتی کوردستاندا، وەکوو گۆڕینی ناوی قەزای سەلماس بۆ

شاهپور و دیسانەوە جارێکی دیکە گۆڕییانەوە بەسەلماس. هەروەها ناوی شاری ورمێیان گۆڕی بۆ ڕەزاییە، پاشان کردیانەوە بە ورمێ. پەهلەوی دژ بۆ نەنور. شاهین دژ بۆ سایین دژ. شا ئابادی ڕۆژئاوا بۆ ئیسلام ئابادی ڕۆژئاوا... تاد.

– لێکداپچڕاندن: باری ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و هەندێ جاریش، ڕەوشی ڕامیاریی وا دەخوازێ، کە هەندێ یەکە ئیداری لە یەکە ئیدارییەکانی پێشوو بکرێنەوە و بە یەکە ئیدارییەکی دیکەی تازە یا دراوسێوەی ببەستنەوە. بۆ نموونە قەزای توزخورماتوی لە ساڵی ١٩٧٦دا، لە پارێزگای کەرکووکیان داپچڕی و بە پارێزگای سەلاحەدینیانەوە لکاند. هەروەها ناحیەی ئەبدانانیان لە قەزای دێهلۆران داپچڕی و بە قەزای بەدریانەوە بەستەوە.

– گۆڕینی پلە: زیادبوونی ڕۆڵی هەندێ یەکە ئیداری لە نێوچەکەدا، پێویستی بە گۆڕینی ستاتۆس دەکات، بۆ ئەوەی بە فەرمانە تازەکانی خۆیان هەڵبستن. بۆ نموونە، گۆڕینی ستاتووسی دهۆک، لە کۆتایی مانگی مای ساڵی ١٩٦٩دا، لە سەنتەری قەزاوە بۆ سەنتەری پارێزگا. ، گۆڕینی شیروان و چرداول لە پارێزگای ئیلام، لە سەنتەری ناحیەوە بۆ سەنتەری قەزا. هەروەها هەمان شتیش لە ناحیەی لوردیگان لە پارێزگای بەختیاری ڕووی دا.

– بەرزکردنەوەی پلە: ئەو گوندانەی کە لە شوێنە ستراتیژییەکاندا هەڵ کەوتوون و بە سامانەکانی ژێر زەوی دەوڵەمەندن، ستاتووسی ئیداری بە هەندێکیان دەبەخشن و دەبنە سەنتەری یەکەیەکی ئیداری. بۆ نموونە، لە ساڵی ١٩٨٠دا، گوندی ئینزل لە قەزای ورمێ کرا بە ناحیە.

خاکی کوردستان بەگوێرەی دەسەڵات و بەرپرسیاری یەکەم لە نێوچەکەدا، جۆری پەیوەندییەکانی لەگەڵ سەنتەر، ژمارە و چۆنێتی کارکردن و ئەرکەکانی کارمەندان، ڕووبەر و ژمارەی یەکە ئیدارییەکان... هتد بەسەر پێنج پلەی ئیداری جیاوازدا دابەش دەکرێ، پلەکانیش ئەمانەن:

– پارێزگا (ئیل، ئوستان، موحافەزە) – بە گەورەترین یەکە ئیداریی کوردستان دادەنرێ. کاروبارەکانی ئیداریی پارێزگا لە لایەن کاربەدەستێکی دەوڵەتەوە بەڕێوە دەبرێ، بە ناوی پارێزگارەوە (والی، ئوستاندار، موحافیز)

پارێزگار بە فەرمانی کۆماری دادەمەزرێ و دەستیشی لە کار دەکێشرێتەوە. ئەم کارمەندە بەرپرسیاری یەکەمی بەڕێوەبردنی هەموو کاروبارە ئیدارییەکانی پارێزگایە و هەندێ جاریش کاروباری سەربازیش لە ئەستۆی خۆی دەگرێ. لە هەمان کاتدا بڕیار و

فەرمانەکانی دەوڵەتی ناوەندی جێبەجێ دەکات و بە نامە و ڕاپۆرتی تایبەتیی و سەردان بۆ پایتەخت، دەسەڵاتی ناوەندی، لە هەموو دەنگوباسەکانی پارێزگاکە ئاگادار دەکاتەوە.

قەزا (ئیلچە، شەهرستان، مەنتیقە) – قەزا لە ڕوی دەسەڵات و ڕووبەر و ژمارەی دانیشتووانەوە، لە دوای پارێزگاوە دێ. لەسەر هەر یەکێ لەم یەکە ئیداریانە، کاربەدەستێکی دەوڵەت بە ناوی قایمقامەوە (مودیری مەنتیقە، شارستاندار، ئیلچەقایمقامی) دادەنرێ، کە ئەویش بە فەرمانی تایبەتی کۆماری دادەمەزرێ و لادەبرێ. ئەم کاربەدەستە بە زۆری پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ پارێزگاردا هەیە، لە هەمان کاتدا لە جێبەجێکردنی فەرمانەکان و ئاگادارکردنی لایەنەکانی سەروتر لە خۆی، لە هەموو کاروبارەکانی ئیداریی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و ڕامیاریی و سەربازیی، لە چوارچێوەی یەکە ئیدارییەکەی خۆیدا بەرپرسیارە.

– ناحیە (بۆچاغ، بەخش) بە سێیەم پلەی ئیداری دادەنرێ لە کوردستاندا، گەورەترین بەرپرسیاری ئەم یەکە ئیدارییە، کاربەدەستێکە بە ناوی بەڕێوەبەری ناحیەوە (مودیری بۆچاغی، بەخشدار)، کە بە فەرمانی وەزیری ناخۆ دادەنرێ دەستی لە کار دەکێشرێتەوە، هەندێ جاریش بە فەرمانی کۆماری دادەنرێ. ئەرکەکانی سەرشانی مودیری ناحیە، زیاتر خۆی لە هەڵسوڕاندنی کاروباری ئیدارییە لە ناحیەکە و ئاگادارکردنەوەی قایمقام لە بارەی دانیشتووانی ناحیەکەدا دەنوێنێ، هەروەها بڕیار و فەرمانەکانی پارێزگار و قایمقام، بە خەڵکی دەگەیەنێ و جێبەجێیان دەکات.

– دەهستان (موقاتەعە) بریتییە لە یەکە ئیدارییەکی پچووک، لە ژمارەیەک گوندی سەربەیەکەوە پێک هاتووە، لە ڕووی هەڵسوڕاندنی کاروباری ئیداری و کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەوە، بە سەنتەری ناحیەوە بەسراونەتەوە.

– گوند – گچکەترین یەکە ئیدارییە لە کورستاندا و لە ژمارەیەکی نادیار لە خێزان پێک هاتووە. کاروباری ڕۆژانەی هەمەچەشنەی گوندەکان، لە لایەن یەکێ لە دانیشتووانی گوندەکەوە، بە ناوی (موختار) هوە دەبرێ بەڕێوە، کە بە شێوەی هەڵبژاردن یاخود بە شێوەی دیاریکردن لە لایەن بەڕێوەبەری ناحیەوە دیاری دەکرێ. ئەرکی سەرشانی موختار، ئاگادارکردنەوەی سەنتەری ناحیەیە، لە هەموو جۆرە جموجۆڵێکی دانیشتووانی گوندەکان و گەیاندنی هەمو بڕیار و ڕاسپاردەکانی بەڕێوەبەری ناحیەیە بە خەڵکی گوندەکان.

له ساڵەکانی هەشتاوە، کوردستان بەسەر سی (٣٠) پارێزگا و ٢١٠ قەزا و ٤٣٢ ناحیە و نزیکەی سی (٣٠) هەزار گوندا دابەش کراوە. دابەشبوونیان بەسەر هەرێمەکاندا، بەو شێوەیە کە لە خشتەی ژمارە (٢٦) نیشان دراوە.

**خشتەی ٢٦ — رووبەر و ژمارەی دانیشتووان و یەکە ئیدارییەکانی کوردستان**

| هەرێم | رووبەر کچگ | دانیشتووان هەزار | ژمارەی یەکەی ئیداری | لەوانە پارێزگا | قەزا | ناحیە | گوند |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| باکوور–١٩٨٥ | ٢١٥٨٩٢ | ٩٨٦٤ | ٤٠٢ | ١٨ | ١٣٢ | ٢٥٢ | ٩٣٥٤ |
| باشوور– ١٩٧٧ | ٨٧١١٧ | ٣٣٠٣ | ١٢٩ | ٥ | ٣١ | ٩٣ | – |
| رۆژهەلات–١٩٨٦ | ٢١٧٧٦٦ | ٩٢٠٠ | ١٢٣ | ٧ | ٤١ | ٧٥ | – |
| رۆژاوا–١٩٨١ | ١٥٢٦٤ | ٦٣٤ | ١٨ | – | ٦ | ١٢ | ٢٤٧٢ |
| کۆ | ٥٣٦٠٣٩ | ٢٣٠٠١ | ٦٧٢ | ٣٠ | ٢١٠ | ٤٣٢ | – |

وا له خوارهوه به درێژیی، ناوی هەموو یەکە ئیدارییەکانی کوردستان، به ڕێنووسی کوردی دهنووسین، هەر وهکوو له سەرچاوه ڕەسمییەکاندا تۆمار کراون. نووسەر له ناچاریدا، ئەم ڕێیەی گرتۆته بەر، لەو بڕوایەدایە ئەگەر وا نەبووایە، زۆر له ناوه جوگرافییەکان نه دەزاندران کە کەوتوونەته چ نێوچەیەکەوه. بۆ زانیاری زیاتریش، پاشکۆیەکمان له ناوه ڕەسمی و ناڕەسمییەکانی یەکە ئیدارییەکان نووسیووه. کوردستان، لەم پارێزگا و قەزایانەی خوارهوه پێک هاتووه، تەماشای نەخشەی ژماره ۹ بکه:

**ئادیەمان:**

۰۱سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاق پینار، باغ پینار، کۆچالی، کۆیوجاک.
۰۲ بەسنی. ناحیەکانی: – سەنتەر، چاکیرخویک، قیز یلین (باش یۆڵ)، سوڤار، شام بەیات، توت.
۰۳ چەلیکخان. ناحیەکانی:– سەنتەر.
۰٤ گەرگەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، تاراک سوو (گوڵ یۆرت)
۰٥ گوڵ باشی. ناحیەکانی: – سەنتەر، بەلۆرەن، خەرمانلی.
۰٦ کەحاته. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاقینجیلەر، داملاجیک، نارینجه، سینجیک (یارپوزلو).
۰۷ سەمسات. ناحیەکانی: – سەنتەر.

**ئاگری (قەره کۆسه):**

۰۱ سەنتەر. .ناحیەکانی: – سەنتەر، چومەچای، مورات،
۰۲ دیادین. ناحیەکانی: – سەنتەر.
۰۳ دۆغو بایەزید. ناحیەکانی: – سەنتەر، سولوچام.
۰٤ ئەلەشکیرد.ناحیەکانی: – سەنتەر، تاهیر.
۰٥ خامور. ناحیەکانی: – سەنتەر.
۰٦ پاتنۆس.ناحیەکانی: – سەنتەر، دەدەلی، دۆغان سوو، ساری سوو.
۰۷ تاشلی چای. ناحیەکانی: – سەنتەر.
۰۸ توتاق. ناحیەکانی: – سەنتەر.

## نەخشەی ژمارە ٩




**نەخشەی ٩**

**دابەشبوونی ئیداری، ١٩٨٠**

**بینگۆڵ (چەولیک):**

١٠ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاغا چەلی (ئیچ پینار)، سانجاق، یاماچ.

٢٠ گەنج.ناحیەکانی: – سەنتەر، سۆغوتلی (چای تەپە)، سەرڤی، یاییلا، یەنی سوو.

٣٠ کارلۆڤا. ناحیەکانی: – سەنتەر، گوینیوک.

٤٠ کیغی. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاداقلی، یاییلادەرە، یەدی سوو.

٥٠ سۆلحان. ناحیەکانی: – سەنتەر، یەنی باشاک.

**بدلیس:**

١٠سەنتەر.ناحیەکانی: – سەنتەر، بۆلوک یازی، چوقوڕ (گورۆی ماک)، نارلیدەرە، ساری قۆناغ.

٢٠ عادیلجەواز. ناحیەکانی: – سەنتەر، گۆڵ دوزو.

٣٠ ئاخلات. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئۆڤاقیشلە.

٤٠ خیزان. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاق شار، ساغینلی.

٥٠ مۆتکی. ناحیەکانی: – سەنتەر، گەییک پیناری، کەڤاک باشی، مەیدان.

٦٠ تاتوان. ناحیەکانی: – سەنتەر، کوچوک سوو، ڕەشادیە (یەلکەنلی).

**دیاربەکر:**

١٠ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئەغیل، مەڕمەڕ، یۆڵ بۆیو.

٢٠ بیسمیل. ناحیەکانی: – سەنتەر، تەپە، یوکاری سەلات.

٣٠ چەرمیک. ناحیەکانی: – سەنتەر، باشاری،

٤٠ چنار. ناحیەکانی: – سەنتەر، کیلوان (ئۆڤاباغ).

٥٠ چونگوش. ناحیەکانی: – سەنتەر.

٦٠ دیجلە. ناحیەکانی: – سەنتەر.

٧٠ ئەرغانی. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئەحمەتلی.

٨٠ هانی. ناحیەکانی: – سەنتەر.

٩٠ حازرۆ. ناحیەکانی: – سەنتەر.

١٠٠ قوڵپ. ناحیەکانی ؛ – سەنتەر، ئەغاچلی، ئەقچەسیر (ئایگون)، هەمزەلی.

١١٠ لیجە. ناحیەکانی: – سەنتەر، کەیاجیک (ساوات).

١٢٠ سیلڤان. ناحیەکانی: – سەنتەر، باغ دەرە، چەتەکۆپرو.

**ئەلازیغ:**

٠١ سەنتەر.: ناحیەکانی: – سەنتەر، خان کەندی، خارپوت، خدر بابە، ئیجمە، مەلا کەندی، پۆیراز.

٠٢ ئاغین. ناحیەکانی: – سەنتەر.

٠٣ باسقیل. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئایدینلەر (ئەشاغی کولوشاغی)، قوش سارای.

٠٤ قەرەقۆچان. ناحیەکانی: – سەنتەر، باش یورت، چان.

٠٥ کەبان. ناحیەکانی: – سەنتەر.

٠٦ مەعدەن. ناحیەکانی: – سەنتەر، هەزار(کەڤاک)

٠٧ پالو. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاری چاک، چای باغی، گۆگ دەرە.

٠٨ سیڤریجە.ناحیەکانی: – سەنتەر، گوزەلی.

**ئەرزنجان:**

٠١ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، چەغلەیان، چەتەل ئەرموت، تان یەری (ئۆجاغ باشی)، ئوزوملو.

٠٢ چای یرلی. ناحیەکانی: – سەنتەر، باش کۆی (یایلا کەند)، ئۆتلوک بەیلی.

٠٣ یلیچ. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئارموتلو (بیوک ئارموتلو)، قوروچای.

٠٤ کەماخ. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئالب کۆی، بۆزغلاک، دۆغان بەیلی، ئۆغوز.

٠٥ کەمالیە. ناحیەکانی: – سەنتەر، باش پینار، دوتلوچە.

٠٦ ڕەفاعیە. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاقار سوو، جەنگەرلی (دۆغان دەرە)، چەتەل چەم، گومو شاکار.

٠٧ تەرجان. ناحیەکانی: – سەنتەر.

**ئەرزەڕۆم:**

٠١ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، دوملو، ئیلیچە، ئۆڤاجیق (ئوچ کۆسە).

٠٢ ئاش قەڵا. ناحیەکانی: –سەنتەر، چیفتیلیک، کەندیللی.

٠٣ چات. ناحیەکانی: – سەنتەر.

٠٤ خنس. ناحیەکانی: – سەنتەر، خەلیل چاووش، قەرەکۆپرو.

٠٥ خۆراسان. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاراس.
٠٦ قەرەیازی. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئەلما لیدەرە (مەلا عوسمان)، گۆک سوو، سۆیلەمەز (مەسجیتلی)
٠٧ پاسینلەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، چۆپان دەرە (کۆپری کۆیی).
٠٨ تەکمان. ناحیەکانی: – سەنتەر، گۆک ئۆغلان (کیرکخان).

**گازی ئانتەب:**

٠١ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، بورج.
٠٢ عارەبان. ناحیەکانی: – سەنتەر.
٠٣ ئیسلاحیە. ناحیەکانی: – سەنتەر، فەوزی پاشا، ساک چاگوزە.
٠٤ کیلیس. ناحیەکانی: – سەنتەر، موسا بەیلی، پولا تەلی (گوڵ دوزو)
٠٥ نیزیب. ناحیەکانی: – سەنتەر، بەراک (کەرگامێش).
٠٦ ئۆغوزەلی، ناحیەکانی: – سەنتەر، ئەل بەیلی، دۆغان پینار.
٠٧ یاوز ئەلی. ناحیەکانی: – سەنتەر.

**هەکاری (جۆلەمێرک):**

٠١ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، باغی شلی، گەچیتلی.
٠٢ بەیتوش شەباب. ناحیەکانی: – سەنتەر.
٠٣ چوقورچا. ناحیەکانی: – سەنتەر، چیغلی.
٠٤ شەمدینلی. ناحیەکانی: – سەنتەر.
٠٥ ئولودەرە: ناحیەکانی – سەنتەر، ئورتەباغ.
٠٦ یۆکسەکۆڤا: ناحیەکانی – سەنتەر، داغ لیجە، ئەسەندەرە.

**مەلاتیە:**

٠١سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، چۆلاقلی، ئاسکی مەلاتیە، کالە (باغ لیجە)، یازی خان.
٠٢ ئاقچەداغ. ناحیەکانی: – سەنتەر (ئالیجەری)، کورەجیک (کەپەز)، لەوەنت.
٠٣ عارەبکیر. ناحیەکانی: – سەنتەر، تاشدەلەن..

٠٤ ئارگوڤان. ناحیەکانی: – سەنتەر، چوبان دەرە (یۆنجەلی)
٠٥ دارەندە. ناحیەکانی: – سەنتەر، بالابان، کولونجاق.
٠٦ دۆغان شەهیر. ناحیەکانی: – سەنتەر، سورگو.
٠٧ حەکیم خان.ناحیەکانی: – سەنتەر، حەسەن چەلەبی، قورشونلو.
٠٨ پۆتورگە. ناحیەکانی: – سەنتەر، دۆغان یۆڵ، تەپەخان (سینان)
٠٩ یەشیل یورت. ناحیەکانی: – سەنتەر.

**مەرعەش:**

٠١ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئەلی بەیلی (ئاغا بەیلی)، سولەیمانلی، یەنی کۆیە (قەیسلی).
٠٢ ئەلبیستان. ناحیەکانی: – سەنتەر، گوجوک، نورهەق.
٠٣ پازارچیک. ناحیەکانی: – سەنتەر، نارلی.
٠٤ تورک ئۆغڵۆ. ناحیەکانی: – سەنتەر.

**ماردین:**

٠١ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاقینجی.
٠٢ جیزرە. ناحیەکانی: – سەنتەر، دیجلە.
٠٣ دەریک. ناحیەکانی: – سەنتەر، قۆچە تەپە.
٠٤ گەرجوش. ناحیەکانی: – سەنتەر، حەسەن کێف، قایاپینار.
٠٥ ئیدیل. ناحیەکانی: – سەنتەر، خەبەرلی، ئۆیالی.
٠٦ قزل تەپە. ناحیەکانی: – سەنتەر، شان یورت.
٠٧ مازی داغی. ناحیەکانی: – سەنتەر.
٠٨ میدیات. ناحیەکانی: – سەنتەر، دارگەجیت.
٠٩ نوسەیبین. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاقارسوو، گەرمەلی.
٠١٠ ئۆمەرلی. ناحیەکانی: – سەنتەر.
٠١١ ساڤور. ناحیەکانی: – سەنتەر، سورگوچو.
٠١٢ سیلۆپی. ناحیەکانی: – سەنتەر.

**موش:**

١٠ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، قیزیل ئاغاج، کۆرکوت، مەرجیمە قەڵا، یایغین.
٢٠ بولانیک. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئەرەن تەپە، قەرەئاغیل.
٣٠ مەلازگیرت. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاق توزلا، قەرە حەسەن (ئاداق سوو)، نورەدین (قۆناغ کوران).
٤٠ ڤارتۆ. ناحیەکانی: – سەنتەر، چای لەر، قەرە کۆی (ئومجەلی).

**سیرت:**

١٠ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئایدینلەر.
٢٠ باتمان. ناحیەکانی: – سەنتەر.
٣٠ بایکان. ناحیەکانی: – سەنتەر، دیلەق تەپە.
٤٠ بەشیری. ناحیەکانی: – سەنتەر، بەیچایری، ئۆغوز.
٥٠ ئەروھ. ناحیەکانی: – سەنتەر، باغ گویزە، فندق.
٦٠ قۆزلوک. ناحیەکانی: – سەنتەر، بەکر خان (ئوزون چایر)، توزلە گویزە.
٧٠ کورتەلان. ناحیەکانی: – سەنتەر، باغ لیجە، باش پینار، یانارسوو.
٨٠ پەرڤاری. ناحیەکانی: – سەنتەر، دۆغان جە.
٩٠ ساسۆن.ناحیەکانی: – سەنتەر، یوجە باغ.
١٠٠ شیرناق..ناحیەکانی: – سەنتەر، قزل سوو.
١١٠ شیروان.ناحیەکانی: – سەنتەر، جەویزلیک، ئۆزپینار.

**دەرسیم (کەلان):**

١٠ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، چیچکەلی (بوغولو)، قۆچە قۆج، سوتلووجە (توللوک).
٢٠ چەمشگەزەک. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئەقچە پینار، گەدیکلەر.
٣٠ خۆزات. ناحیەکانی: – سەنتەر، چاغلەرجە.
٤٠ مازگرت. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاق پازار، داریکەنت.
٥٠ نازمیە. ناحیەکانی: – سەنتەر، بویوک یۆرت (دەرەئوڤا)، دەللی باخچە.
٦٠ ئۆڤاجیق. ناحیەکانی: – سەنتەر، قەرەئۆغلان، یەشیل یازی.
٧٠ پەرتەک. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاق دەمیر، دەرە، پینار لەر.

٠٨ پولومور. ناحیەکانی: – سەنتەر، بال پەیام، داغ یۆڵو، قرمزی کۆپرو (مەزرەع)، ئوچ دام.

**ئورفە:**

٠١ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاق زیارەت (جولەن)، چاملی دەرە، قەرە حەیدەر (قەڵاجیک)، پەیاملی (دۆلونای)، یاردیمجی.
٠٢ ئاقچە قەڵا. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئالتین بەشاق (حەڕان)، شەهید نوسرەتبای.
٠٣ بیرەجیک. ناحیەکانی: – سەنتەر، بۆغوتلەن.
٠٤ بۆزوڤا. ناحیەکانی: – سەنتەر، قانلی ئەفشار، یایلاق،
٠٥ جەیلان پینار. ناحیەکانی: – سەنتەر.
٠٦ خالفەتی. ناحیەکانی: – سەنتەر.
٠٧ حیلڤان. ناحیەکانی: – سەنتەر، گوڵ جوک، ئۆڤاجیق.
٠٨ سیڤەرەک. ناحیەکانی: – سەنتەر، بوجاق (بەغدەش)، چای لەر باشی، داغ باشی، قەرەجەداغ، قەرەکاچی، شەکەرلی.
٠٩ سوروچ. ناحیەکانی: – سەنتەر، مورشید پینار (کوچوک کەندیرجی).
٠١٠ ویران شەهیر. ناحیەکانی: – سەنتەر، دەمیرجی.

**وان:**

٠١ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئەرچەک، گوموش دەرە (سەرمان سوویو)، تیمار (گەدیک بولاق).
٠٢ باش قەڵا. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئەلبەیراق.
٠٣ چاتاک. ناحیەکانی: – سەنتەر، نارلی.
٠٤ ئەرجیش. ناحیەکانی: – سەنتەر، دەلی چای، قوجە پینار.
٠٥ گەڤاش. ناحیەکانی: – سەنتەر، باخچە سەرای.
٠٦ گورپینار. ناحیەکانی: – سەنتەر، گوزەل سوو، کیرک گەچیت، یالینجە.
٠٧ مورادیە. ناحیەکانی: – سەنتەر، چاڵدێران.
٠٨ ئۆزالب. ناحیەکانی: – سەنتەر، دوروتاییی، سارای.

* * *

٠١ باخچە. ناحیەکانی: – سەنتەر، هارونیە.
٠٢ عوسمانیە. ناحیەکانی: – سەنتەر، کایپاک، تاجرلی، تۆپراغ قەلآ، یارپوز.

* * *

٠١ دۆرت یۆڵ. ناحیەکانی – سەنتەر، یاکاجیک، یەشیل کەند.
٠٢ خاسە. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاق تەپە.

* * *

٠١ ئەرالیک. ناحیەکانی: – سەنتەر.
٠٢ ئیغدیر. ناحیەکانی: – سەنتەر، تاش بوران.
٠٣ کاغیزمان. ناحیەکانی: – سەنتەر، کۆتەک.
٠٤ ساری قامیش. ناحیەکانی: – سەنتەر، قەرەقورت، قەرەئورگان.
٠٥توزلوجە. ناحیەکانی: – سەنتەر، قازیلەر.

* * *

٠١ دیڤریکی. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئەریک باشی (دانیشمەنت)، قەدیک باشی، مورسەل، سینجان.

* * *

**دهۆک:**

٠١ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، سیمێڵ، دۆسکی (مانگیش)، زاویتە.
٠٢ ئامێدی. ناحیەکانی: – سەنتەر، سەرسەنگ، نیروەوڕێکان (بیبۆ)، بەرواری باڵا (کانی ماسی)
٠٣ زاخۆ. ناحیەکانی: – سەنتەر (شرانش)، کولی (باتوفە)، ڕزگاری (برایم خەلیل)، سلیڤانی (عاسی).

**سلێمانی:**

٠١ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، تانجەرۆ (عەربەت)،بازیان (تەیناڵ)، سەرچنار، قەرەداغ.
٠٢ هەڵەبجە. ناحیەکانی: – سەنتەر، سیروان (کێلە سپی)، خورماڵ، بیارە، شارەزوور (سەید سادق).
٠٣ پێنجوین. ناحیەکانی: – سەنتەر، گەرمک.

٠٤ شارباژێڕ. ناحیەکانی: – سەنتەر (چوارتا)، سیوەیل (باسنێ)، سروچک (بەرزنجە)، ماوەت.
٠٥ پشدەر. ناحیەکانی: – سەنتەر (قەڵادزێ)، هێرۆ. ناودەشت (سەنگەسەر).
٠٦ ڕانیە. ناحیەکانی: – سەنتەر، ڕانیە، (چوارقوڕنە)، بێتواتە، مەرگە (بنگرد).
٠٧ دوکان. ناحیەکانی: – سەنتەر، سورداش، چناران (خەلەکان).
٠٨ دەربەندیخان. ناحیەکانی: – سەنتەر.
٠٩ چەمچەماڵ. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاغجەلەر، سەنگاو (گۆگ تەپە).
٠١٠ کەلار. ناحیەکانی: – سەنتەر، بێباز (باوەنور)، تیلەکۆ.

**هەولێر:**

٠١ هەولێر. ناحیەکانی: – سەنتەر، عەینکاوە، قوشتەپە، خەبات (هەنجیرۆک)
٠٢ مەخموور. ناحیەکانی: – سەنتەر، گوێر، قەراج (باقرتە)، کەندیناوە (دیبەگە).
٠٣ کۆیە. ناحیەکانی: – سەنتەر، تەقتەق، شۆڕش (دێگەڵە).
٠٤ ڕواندز. ناحیەکانی: – سەنتەر، دیانا، خەلیفان، برادۆست (سیدەکان).
٠٥ زێبار. ناحیەکانی: – سەنتەر (مێرگەسۆر)، بارزان، مزوری بالا (شێروان مازن)
٠٦ شەقلاوە. ناحیەکانی: – سەنتەر، هەریر، سەلاحەدین، خۆشناو (هیران).
٠٧ چۆمان. ناحیەکانی: – سەنتەر، باڵەک (گەلاڵە)، حاجی هۆمەران.

**کەرکووک:**

٠١ سەنتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، تازەخورماتوو، داقوق، یایجی، قەرە حەسەن (لەیلان)، شوان (ڕێدار).
٠٢ حەویجە. ناحیەکانی: – سەنتەر، عەباسی (جبور)، ڕیاز.
٠٣ دوبز.. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاڵتون کۆپری.

**نەینەوا:**

٠١ موسڵ. ناحیەکانی: – سەنتەر، بەعشیقە، زاب (شەک).
٠٢ حەمدانیە.ناحیەکانی: – سەنتەر (قەرەقوش)؛ نەمرود (خزر)، بەرتەللە، کەڵەک (ئاسکی کەڵەک)..

٠٣ تلکێف. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئەلقوش، وانە.

٠٤ شەنگار. ناحیەکانی: – سەنتەر، شیمال (سنونی).

٠٥ تەلەعفەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، زومار، عیازیە (ئاڤەگەنی)، ڕەبیعە.

٠٦ شێخان. ناحیەکانی: – سەنتەر (عەین سفنی)، مریبە، مزوری (ئەتروش).

٠٧ عەقرە. ناحیەکانی: – سەنتەر، نەهلە (دینارتە)، عەشایەر سەبعە (بەردە ڕەش)، سورچی (بجێل)، گروەسێن.

* * *

٠١ خانەقین. ناحیەکانی:ڕ سەنتەر، جەلەولا، سەعدیە، مەیدان، قۆرەتو.

٢. مەندلی. ناحیەکانی:ڕ سەنتەر، بەلەدروز، قەزانیە.

٣. کفری. ناحیەکانی:ڕ سەنتەر، قەرەتەپە، کۆکس، سەرقەڵا، جەبارە.

* * *

١. میقدادیە. ناحیەکانی: سەنتەر، مەنسووریە.

* * *

١. توزخورماتوو. ناحیەکانی: سەنتەر. ئامیرلی، سلێمان بەگ، نەوجۆل، قادرکەرەم.

* * *

٠١ بەدرە. ناحیەکانی: – سەنتەر، جەسان، زڕباتییە.

* * *

**ئازەربایجانی غەربی:**

٠١ ورمێ. ناحیەکانی: – سەنتەر (ورمێ)، سۆما و برادۆست (کەنگەجین) سیلوانە، ئینزل (قوشچی).

٠٢ مهاباد. ناحیەکانی: – سەنتەر، بۆکان.

٠٣ خۆی. ناحیەکانی: – سەنتەر، چای پارە (قەرە زیادین).

٠٤ ماکۆ. ناحیەکانی: – سەنتەر، سیاچەشمە، پولدەشت (شائاباد).

٠٥ میاندواب. ناحیەکانی: – سەنتەر، ساین قەڵا، تەکاب.

٠٦ سەلماس. ناحیەکانی: – سەنتەر.

٠٧ نەغەدە. ناحیەکانی: – سەنتەر، شنۆ.

٠٨ سەردەشت. ناحیەکانی: – سەنتەر.

٠٩ پیرانشەهر، ناحیەکانی: – سەنتەر.

**کرماشان:**

٠١ کرماشان. ناحیەکانی: – سەنتەر، سەحنە، هەرسین.

٠٢ قەسری شیرین. ناحیەکانی: – سەنتەر، سۆمار.

٠٣ پاوە. ناحیەکانی: – سەنتەر، جوانرۆ، باباجانی (ئازگەلە)، ڕەوانسەر، باینکان، نەوسوود.

٠٤ ئیسلام ئاباد. ناحیەکانی: – سەنتەر، کەڕیند.

٠٥ سونقوڕ. ناحیەکانی: – سەنتەر.

٠٦ کنگاوەر. ناحیەکانی: – سەنتەر.

٠٧ سەرپێڵی زەهاب. ناحیەکانی: – سەنتەر.

٠٨ گەیلانی غەربی. ناحیەکانی: – سەنتەر.

**کوردستان:**

٠١ سەنەندوج. ناحیەکانی: – سەنتەر، دیواندەرە، کامیاران.

٠٢ مەریوان. ناحیەکانی: – سەنتەر، خاوومیرئاباد (خاو)، کەلاتەرزان (تیژتیژ)، سەرشیوی مەریوان، سەروئاباد.

٠٣ سەقز. ناحیەکانی: – سەنتەر.

٠٤ بانە. ناحیەکانی: – سەنتەر، نەنور، ئالوت، نەمەشیر.

٥. بێجار. ناحیەکانی:– سەنتەر.

٦. قروە. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئیلاق (دێگولان).

**جەهارموحال و بەختیاری:**

٠١ شەهری کورد. ناحیەکانی: – سەنتەر، کەیار(شەلەمزار).

٠٢ بروجەن. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئەردەل، گەندومان.

٠٣ فارسان. ناحیەکانی: – سەنتەر، شورئاب.(چلگرد)

٠٤ لوردیگان. ناحیەکانی: – سەنتەر.

**لوڕستان:**

٠١ خوڕەم ئاباد. ناحیەکانی: – سەنتەر، کوهی دەشت، ئەلیشتەر (قەڵای موزەفەری) دولفان (نور ئاباد)، زاغە، مەلاوی، وەیسیان (ماسوور)، پاپی (سەفیدەشت)، دورەجەگنی (سەراب دورە)، جەغەلەوەندی.

٠٢ بروجەرد: ناحیەکانی: – سەنتەر، ئوشترینان، دورود.

٠٣ ئەلیگودەرز: ناحیەکانی: – سەنتەر، چاپڵق (مامون)، زەزوماهرو(شولە ئاباد).

**ئیلام:**

٠١ ئیلام. ناحیەکانی: – سەنتەر، چوار، ئەیوان.

٠٢ دێهلۆران. ناحیەکانی: – سەنتەر، موسیان، زەرین ئاباد (میمە).

٠٣ میهران. ناحیەکانی: – سەنتەر،ساڵح ئاباد، ئەرکەوازی (قەڵادرە).

٠٤ بەدرە. ناحیەکانی: – سەنتەر (دەڕە شەهر)، بەدرە (ئەبهەرێ باڵا)، ئەبدانان.

٠٥ شیروان و چردال. ناحیەکانی: – سەنتەر.(لومار)

**کوهگیلۆیە و بوێر ئەحمەدی:**

٠١ بوێر ئەحمەدی. ناحیەکانی: – سەنتەر(یاسوچ)، دروهان (لوداب).

٠٢ کوهگیلویە.. ناحیەکانی: – سەنتەر(دەهدەشت)، بەهمەیی (سەیدان)، لندە، چرام.

٠٣ گەچساران. ناحیەکانی: – سەنتەر(دۆگوبەندان)، باشت.

* * *

٠١ دێزفول. ناحیەکانی: – سەنتەر، شوش، سەردەشت.

٠٢ بەهبەهان. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئاغا جاری، زەیدون (دەهدەشت).

٠٣ ئیزە. ناحیەکانی: – سەنتەر، دەهدز، جانگی (باغی مەلیک)

٠٤ ڕامهورمز. ناحیەکانی: – سەنتەر، ڕامشیر.

٠٥ شوشتەر. ناحیەکانی: – سەنتەر، گۆتوند.

٠٦ ئەندیمشک. ناحیەکانی: – سەنتەر، ئەلوارگەرمەسێر (حوسێنیەی عولیا).

٠٧ مەسجیدی سلێمان. ناحیەکانی: – سەنتەر، هەفت کل، ئەندیکە (لالی).

* * *

٠١ کازرون. ناحیەکانی: – سەنتەر، خشت و کەمارج (کەنار تەختە)، کوهمەرە

(نودان)

٠٢ مامەسەنی. ناحیەکانی: – سەنتەر (نورئاباد)، ماهور میلاتی (بابامونیر).

* * *

٠١ گناوە. ناحیەکانی: – سەنتەر، ڕیگ، دەیلەم.

* * *

٠١ ڕەسولعەین. ناحیەکانی: – سەنتەر، دەرباسیە.

٠٢ قامیشلی ناحیەکانی: – سەنتەر، عامودە، قەحتانیە.

٠٣ مالکیە. ناحیەکانی: – سەنتەر، جەوادیە (چل ئاغا).

٠٤ عەفرین.ناحیەکانی: – سەنتەر، بولبول، جندرێس، ڕاجۆ، شەران (شەرانلی)، شێخ حەدید، مەعبەتلی.

٠٥ عەینول عەرەب. ناحیەکانی: – سەنتەر، شیوخ تەحتانی، سەرین (سەرین شیمالی).

٠٦ تەل ئەبیەز. ناحیەکانی: – سەنتەر.

* * *   * * *

## بەشی یەکەم: کشتوکاڵ

دوای نەوت، کشتوکاڵ گەورەترین کەرتی ئابووری پێک دەهێنێ. لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا، نزیکەی ٤٠٪ی لە بەرهەمی نیشتمانی پێک هێنابوو. ئەم ڕێژەیە لە عێراقدا (١٩٨٦ – ١٩٪) زۆرترە وەک لە سووریا(١٩٨٥ – ١٧٪) و لە تورکیا (١٩٨٥– ٢٢٪).

کشتوکاڵ بە یەکەمین چالاکی ئابووری دادەنرێ. لە ڕووی ژمارەی کرێکارەوە، لە ساڵی ١٩٨٥دا، زیاتر لە نیوەی (٥٦٪) دانیشتووانی چالاکی ئابووری، پەیوەندییان پێوە هەبوو، ئەو پەیوەندییە بە چەشنێ بوو، کە بۆ زۆربەی زۆریان وەک پیشەیەکی هەمیشەیی بوو. ئەم ڕێژەیە لە ڕێژەی تورکیا کەمترە (١٩٨٥ – ٨٥٪) و لە ڕێژەی ئێران (١٩٨٦ – ٢٩٪)، عێراق (١٩٧٧ – ٣١٪)، سووریا (١٩٨٤ – ٢٥٪) زیاترە.

ئەو کەرەسانەی لە کوردستانەوە بۆ دەرەوە دەنێردرێ، جگە لە نەوت، بە زۆری بریتییە لە بەرهەمی کشتوکاڵ، وەکوو دانەوێڵە بە هەموو جۆرەکانییەوە، تووتن، چەوەندەر، سەوزە، سپیایی، ئاژەڵ، خوری... هتد. پشکی کشتوکاڵ لە ناردنەدەرەوەدا، لە هەشتاکاندا نزیکەی دوو لەسەر سێی هەموو ئەو کەرەسانەی پێک دەهێنا، کە بۆ دەرەوەیان نارد بوون.

دەوڵەت لە پێناوی پێشخستنی کشتوکاڵدا، بایەخێکی زۆری بە کەرتی کشتوکاڵ داوە. بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش، پشکی کشتوکاڵ لە پلانی پێنج ساڵەی دەوڵەتدا، لە بودجەی ساڵانەدا ، لە یەک بۆ ئەوی دیکە زیاد دەکات. بۆیە لە زۆربەی ناوچەکان، دەزگای کشتوکاڵی دەکاتەوە وەکوو خوێندنگا، کۆمەڵەی هەرەوەزیی کشتوکاڵی، پرۆژەی چاندن و ئاوەدانکردنەوە، کێڵگەی تاقیکردنەوە، دابەشکردنی تۆوی چاککراو، هەندێ جاریش ئاژەڵی ڕەسەنیش دابەش دەکەن... هتد.

### ٠١ فۆند و چەشن و چارەسەرکردنی زەوی

#### فۆندی زەوی

پانتایی کوردستان کە ٥٣٦ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەیە،(٥٣ ملیۆن و ٦٠٠ هەزار هێکتار، یاخود ٢١٤ ملیۆن و ٤٠٠ هەزار دۆنم)، نزیکەی لە ٣٦٪ لەو زوییانەن کە بۆ چاندن دەست دەدەن، ٦٤٪یشی لەو زەوییانەن لە ئێستادا، کە بۆ چاندن بەکار ناهێنرێن. لەبەر ئەوەی هەندێکیان لە چیا و دۆڵەکان پێک هاتوون، هەندێکی دیکەیان گوند و

شارۆچکە و شارەکانیان لەسەر دروست کراوە و ئاوەدان کراونەتەوە، هەندێکی دیکەیان بۆ ڕێگەوبان تەرخان کراون، هەندێکی دیکەشیان ئاو دایپۆشیوون.

پانتایی ئەو زەوییانەی بۆ چاندن دەست دەدەن، دەوروبەری ١٩٣ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەیە. (کە دەکاتە ١٩ ملیۆن و ٢٩٦ هەزار هێکتار) ساڵانە زیاتر لە ٩٥٪ دەچێندرێ، واتە زەوی چاندراون. لە ٥٪ ەکەی دیکەشی، زەوی بەیارە.

## چەشنەکانی زەوی کشتوکاڵی

سیستەمی زەویداری، بە بەرهەمێکی تەواوی پرۆسێسی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و ڕامیاریی و مێژوویییەکانی، سەدان ساڵی ڕابوردوو لە قەڵەم دەدرێ. ئەورۆ لە کوردستاندا، چوار جۆرە پەیوەندی زەویداری هەیە:

**- زەویداری تایبەتی:**

پانتایی هەموو ئەو زەوییە تایبەتییانە، کەمێ زیاترە لە نیوەی هەموو ئەو زەوییانەی کە بۆ چاندن دەست دەدن. خاوەنەکانیان بە هەموو شێوەیە سەربەستن لەوەی کە بیفرۆشن یا بیچێنن، یا لەقەبەری بکەن، یا دابەشی بکەن... هتد.

ڕێژەی زەویداری تایبەتی لە زۆربەی پارێزگاکانی وولاتدا، لە ٥٠٪ زیاترە. لە بینگۆل (١٩٨٠ – ٨٦٪)، تادیەمان (١٩٨٠ – ٧٨٪)، لە مەلاتییە (١٩٨٠ – ٧٠٪)، لە ئەوانی دیکە بەرزترە. لە هەندێکیشیان کەمترە وەکوو موسڵ (١٩٧٩ – ٤٧٪)، موش (١٩٨٠ – ٤٦٪)، بدلیس (١٩٧٩ – ٤٢٪) و هتد.

**- زەوی ئەمیریی:**

ئەم جۆرە زەوییانە، لە هەموو ئەو زەوییانە پێک هاتوون، کە میراتگریان نییە، یاخود بە تەواوی ساغ نەکراونەتەوە، یاخود لە لایەن دەوڵەتەوە لە خاوەنەکانیان زەوت کراون. بۆ نموونە، زەوی ئەو تیرە و هۆزانەی کە لە دژی زۆرداری ڕاپەڕین و بۆ شوێنەکانی دیکە ڕاپێچ کران، هەروەها زەوییەکانی دەوروپشتی دەزگا سەربازییەکان، نێوچەی چاڵە نەوتییەکان... تاد.

ڕێژەی زەوی ئەمیریی زۆر نییە، بەڵام زۆر جاران، لە لایەن پیاوە دەسەڵاتدار و بە تواناکانەوە، بە ڕێگەی نایاسایی لەسەر خۆیان و کەسانی دیکەیان تاپۆ کردووە.

**- زەوی ئەوقاف:**

زەوی ئەوقاف، ئەو زەوییانەن کە خەڵکی لە ژیاندا، یاخود لە دوای مردنی خۆیان، لەقەبەر مزگەوتەکان، تەکییەکان، شێخەکان، پیاوە ئایینییەکانییان کردووە. ئەم زەوییانە نافرۆشرێن و خاوەنەکانیان ناگۆڕێن. بەڵام لە زۆربەی نێوچەکان، پیاوە ئایینییەکان و بە دەسەڵاتەکان، بەشێک لە ئەم زەوییانەیان لەسەر خۆیان تاپۆ کردووە.

دەزگا ئایینییەکانیش وەکوو مزگەوت، تەکییە، حەوزە، ئەم زەوییانە بە کرێ دەدەن، گوایە پارەکەشی بۆ کاروباری ئایینی تەرخان دەکرێ و خەرج دەکرێ.

**- زەوی گشتی:**

زەوی گشتی، واتە زەوی چیاکان، تەپۆلگەکان. لەم زەوییانەدا، هەموو کەس مافی ئەوەی هەیە، مەڕوماڵاتی تێدا بلەوەڕێنێ، دار ببڕێ، بەری درەختەکانی بخوا، گیا بدورێتەوە. زەوی گشتییەکان لە هەندێ نێوچەدا، لەو ساڵانەی دواییدا، لە لایەن پیاوە دەسەڵاتدارەکانەوە (ئاغا، میر، شێخ، بەگزادە) دەستی بەسەرەدا گیراوە و بە پارە بە خاوەن مەڕوماڵاتەکان، بۆ ماوەیەکی دیاریکرا و بە کرێی دەدەن.

پانتایی زەوی گشتییەکان، زۆر نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، ساڵ بە ساڵ کورت دێنێ، لەبەر ئەوەی دەسەڵاتدارەکان، لەسەر خۆیان تاپۆی دەکەن.

**قەبارەی خاوەندارێتی کشتوکاڵی**

خاوەندارێتی کشتوکاڵی، واتە مرۆڤێ یا لایەنێکی دیاریکراو، خاوەنی پارچە زەوییەک بێ، پانتاییەکەی لە نێوان یەک دۆنمەوە بۆ هەزاران دۆنم بێ. خاوەن زەوی ئەو کەسەیە یاخود ئەو کۆمپانیایەیە، کە زەوییەکەی چ لە لایەن خۆیەوە، چ لە لایەن خەڵکییەوە بۆ چاندن بەکار دەهێنرێ.

ژمارەی خاوەن زەوییە کشتوکاڵییەکان، لە چەند ملیۆنێک پێک هاتووە. لەوانە نزیکەی ٦٠٪ خاوەن زەوین، ٤٠٪ بێ زەوین. خاوەن زەوییەکان لە ڕووی پانتایی و قەوارەوە، وەکوو یەک نین. تەماشای خشتەی ژمارە (٢٧) بکە.

**خشتەی ٢٧** **دابەشبوونی موڵکەکانیی کشتوکاڵ بە پێی قەوارەی زەوی ساڵی ١٩٨٠**

| ڕووبەری موڵکی کشتوکاڵ (دێکار) | موڵکدار | | ڕووبەری موڵکی کشتوکاڵ | | تێکڕای ... موڵکی کشتوکاڵ |
|---|---|---|---|---|---|
| | هەزار | ٪ | هەزار دێکار | ٪ | |
| ٠ - ٢٥ | ٣٦١ | ٥٢,٧ | ٤٣٣٥ | ١١,١ | ١٢,٠ |
| ٢٦ - ٥٠ | ١٣٣ | ١٩,٥ | ٥٠٠٨ | ١٢,٨ | ٣٧،٧ |
| ٥١ - ١٠٠ | ١٠٦ | ١٥,٤ | ٧٧٦٦ | ١٩,٩ | ٧٣,٣ |
| ١٠١ - ٢٠٠ | ٥٦ | ٨,٢ | ٧٩٢٣ | ٢٠,٣ | ١٤١,٥ |
| ٢٠١ - ٥٠٠ | ٢٢ | ٣,٢ | ٦٤١٨ | ١٦,٥ | ٢٩١,٧ |
| ٥٠١-١٠٠٠ | ٥ | ٠,٧ | ٣٢٨٩ | ٨,٤ | ٦٥٧,٨ |
| ١٠٠٠ + | ٢ | ٠,٣ | ٤٢٦٩ | ١٠,٩ | ٢١٣٤,٥ |
| کۆ | ٦٨٥ | ١٠٠,٠ | ٣٩٠٠٨ | ١٠٠,٠ | ٥٦,٩ |

لە شیکردنەوەی ژمارەکانی نێو ئەو خشتەیەی سەرەوە، دەتوانین ئەم خاڵانەی لای خوارەوە دیاری بکەین:

١/ تێکڕای بارستایی قەوارەی موڵکە کشتوکاڵییەکان، ٥٧ دێکارە. ئەم ژمارەیە زۆر لە هی وولاتەکانی تورکیا، ئێران، عێراق، سووریا دەچێت. واتە موڵکداری گچکە لە کوردستاندا باوە. ئەوەش بۆ کەمیی زەوی و زۆری ژمارەی جوتکارەکان دەگەڕێتەوە،.

٢/ پەیوەندییەکی پێچەوانە لە نێوان قەوارەی موڵکی کشتوکاڵی لەگەڵ ژمارەی موڵکدارەکاندا هەیە، واتە چەند قەوارە گەورە بێ، ئەوەندە موڵکدارەکان کەم دەکەنەوە.

٣/ زیاتر لە نیوەی موڵکدارەکان (٥٣٪)، موڵکەکانیان لە ٢٥ دێکار کەمترە و تەنیا ١١٪ی گشت ئەو زەوییانەی بۆ کشتوکاڵ دەست دەدەن، لەبەر دەستیان دایە.بەرهەمی ئەم موڵکانە، بە زۆری تەنیا بۆ دابینکردنی ژیانی ڕۆژانەی موڵکدارەکان بەکار دەهێنرێ، واتە ئەو موڵکانە کەمن، بە شێوەیەک کە تەنیا پێویستی بە کاری خاوەن موڵکەکان و

منداڵەکانیان هەیە، زۆربەی کاروبارە کشتوکاڵییەکانیش، بە هۆی گا و مانگاوە جووت دەکرێ.

٤/ زۆربەی زۆری ئەو زەوییانەی کە بۆ کشتوکاڵ دەست دەدەن، بە دەست ژمارەیەکی زۆر کەمەوەیە لە موڵکدارەکان. ئەو خاوەن زەوییانەش بە زۆری لە سەرۆک تیرە و هۆزەکان، پیاوە ئایینییەکان، پێک هاتوون. هەندێ لەو موڵکدارانە لە گوندەکان دەژین و سەرپەرشتی موڵکەکانیان دەکەن و هەندێکی دیکەشیان لە شارەکان دەژین و لە کاتی جووتکردن و دروێنەکردندا، دێنەوە بۆ گوندەکان و دوای تەواوبوونی کارەکانیان، دەگەڕێنەوە بۆ نێو شارەکان.

**چارەسەرکردنی زەوی**

زۆربەی زەوییە کشتوکاڵییەکان، لە چنگی ژمارەیەکی کەم لە موڵکدارەکاندا کۆ بۆتەوە. جوتکارە بێزەوییەکان بەشی زۆربە پێک دەهێنن. بۆ دابینکردنی خواردەمەنییە سەرەکییەکان بۆ هاوولاتییان، بۆ پەیداکردنی بازاڕێک بە شێوەیەکی بەردەوام، بۆ فرۆشتنی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان، بۆ هەڵسەنگاندنی نرخی ڕۆژانەی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان، هەموو ئەم ئامانجانە، وایان لە دەوڵەت کردووە، چەندین یاسای چارەسەرکردنی کشتوکاڵ دەربکات، کە خەسڵەتە هەرە گرنگەکانیان ئەمانەن:

١- یەکەمین یاسای چارەسەرکردنی زەوی لە کوردستاندا، لە ساڵی ١٩٤٣دا دەرچوو. لە دوای ئەم یاسایە، لە ساڵە جیاوازەکانی دیکەشدا، یاسای جۆربەجۆری دیکەش بڵاو کراونەتەوە. هەموو ئەو یاسایانە بۆیە دەرکراوون، گوایە بۆ خزمەتی جوتکارەکانە.

٢- یاسای چارەسەرکردنی زەوی، سنووری بۆ موڵکدارێتی خاوەن زەوییەکان دیاری کردووە، ئەگەر هاتوو موڵکی هەر کەسێ لەو سنوورە تێپەڕی کرد، ئەوا لێیان دەسەندرێتەوە و بەسەر جوتکارە بێزەوییەکاندا، دابەش دەکرێن.

٣- زەوییەکانی دێم و بەراو، لە یاساکانی چارەسەرکردنی زەوی کشتوکاڵدا، بە یەک چاو سەیر ناکرێن. پانتایی ئەو زەوییە دێمانەی کە بۆ موڵکدارەکان دەمێنێتەوە، یاخود بەسەر جوتکارەکاندا دابەش دەکرێ، دوو ئەوەندەی زەوییە بەراوەکان دەبێ، لەبەر ئەوەی داهاتی ساڵانەی زەوییە دێمەکان، لە زەوییە بەراوەکان کەمترە.

٤- ئەو موڵکدارانەی کە زەوییان لێ دەسەندرێتەوە، تەنیا لەبەر ئەوەیە کە زەوییەکانیان لە سنووری یاسا تێپەڕی کردووە، بۆیە لە بەرامبەر ئەوەدا، پارە وەردەگرن.

دەبێ ئەو جوتکارانەی زەوییەکانیان بەسەردا دابەش دەکرێ، لە ماوەی چەند ساڵێکدا پارەی ئەو زەوییانە بدەن. واتە گۆڕینەوەی زەوی بە پارە.

٥- بەپێی یاسای چارەسەرکردنی زەوی، لەسەر جوتکارەکان پێویستە، ئەو زەوییانەی وەری دەگرن، بیانچێنن، تا ژیانی ڕۆژانەی خۆیان و خێزانەکانیان دابین بکەن و بەرهەمی کشتوکاڵیش زیاد بکات. بەڵام وا دیارە لە هەندێ نێوچە، لەبەر نەبوونی هەندێ کەرەسەی کشتوکاڵی پێویست، بۆ چاندن و کۆکردنەوەی بەروبوومی ساڵانەی کێڵگە، جوتکارەکان ناچار دەبن، موڵکەکەی خۆیان بە نرخێکی هەرزان بفرۆشن، یا بە موڵکدارێکی لە خۆیان دەوڵەمەندتر، بە کرێی بدەن.

٦- هەندێ بڕگەی یاسای چارەسەرکردنی زەوی، جوتکارەکان ناچار دەکەن، لە یەکێ لە کێڵگە کشتوکاڵییە هەرەوەزییەکاندا، ببنە ئەندام، بۆ ئەوەی سوود لە مەکینەی کشتوکاڵی و ئامۆژگارییەکانی ڕابەرە کشتوکاڵییەکان وەربگرن، تا بەرهەمی کشتوکاڵ پەرە بسێنێ.

٧- دەزگاکانی کشتوکاڵ لە زۆربەی نێوچەکاندا، لەو زەوییانەی لە خاوەن موڵکەدارە گەورەکان وەرگیراونەتەوە، کێڵگەی دەوڵەتی دروست دەکەن، ئەوەش تەنیا بە مەبەستی بەکارهێنانی ئامێری تازەی کشتوکاڵ و زیادکردنی بەرهەمی کشتوکاڵییە،

٨- یاسای چارەسەرکردنی زەوی کشتوکاڵی، لەبەر ناتەواویی و دروست نەبوونی هەندێ تەنگوچەڵەمە، دەتوانێ خۆی لە جێبەجێکردنی یاساکە بپارێزێ، بە شێوەیە کە تووشی سزادانیش نەبێ. وەکوو ئەوەی موڵکەکە، بەسەر ئەندامانی خێزانەکەدا دابەش بکرێ.

## ٢. جۆرەکانی بەروبوومی کشتوکاڵ

ئاو و هەوا (پلەی گەرما و قەوارەی باران)، جۆری خاک لە کوردستاندا، نەک هەر بۆ چاندنی تۆ و سەوزبوون و بەرگەگرتنی ڕووەکەکانی نێوچە فێنکەکان، بەڵکوو بۆ ڕووەکەکانی نێوچە گەرمەکانیش، بە دوو فاکتەری گرنگ و لەبار و گونجاو دادەنرێن.

کوردستان یەکێکە لەو وڵاتانەی، کە چەندین بەرهەمی کشتوکاڵی جۆراوجۆری لێ دەچێندرێ و دێتە بەرهەم. ئەم بەرهەمانە لەسەر بنچینەی چەشن یا جۆر، شێوەی بەکارهێنانی بۆ خواردن (خواردنی مرۆڤ و ئاژەڵ)، پانتایی (زۆر و کەمی) زەوییە چاندراوەکان، بەسەر چوار کەرتدا دابەش دەکرێ:

یەکەم: بەروبوومی کێڵگە Fild Crops
دووەم: میوە Fruits
سێیەم: سەوزە Vegetables
چوارەم: بەروبوومی ئالیک Fodder Crops

## یەکەم بەروبوومی کێڵگە

بەروبوومی کێڵگە، نەک هەر لە ڕووی پانتایی زەوی چێندراو و بەرهەمی ساڵانە و ژمارەی کرێکار (چ موڵکدار و چ پاڵە) و دەسمایە و قازانج کردنەوە، بەڵکوو لە ڕووی بەکارهێنانیشەوە، لە کایەی بازرگانی دەرەوەدا، بە گەورەترین کەرتی کشتوکاڵی دادەنرێ.

بەروبوومی کێڵگە لەبەر ڕۆشنایی زانیارییەکانی پێشوودا، بەسەر پێنج دەستەدا دابەش دەکرێن:

١- بەروبوومی دانەوێڵە (دەغڵودان) Cereals Crops
٢- بەروبوومی پاقلەیی Legeomus Crops
٣- بەروبوومی پیشەسازی Industrial Crops
٤- بەروبوومی تۆوە ڕۆنییەکان Oil Seeds Crops
٥- بەروبوومی ڕووەکە بۆندارەکان Tuber Crops

### بەروبوومی دانەوێڵە

بەروبوومی دانەوێڵە، لە نێو بەرهەمەکانی دیکەی کێڵگەدا، شوێنێکی دیاریکراوی تایبەتی هەیە. ساڵانە نزیکەی لە ٧٥٪ لە زەوییە تۆوکراوەکان و لە ٦٥٪ لە بەرهەمەکانی کێڵگە و لە ٧٥٪ لە گشت کرێکارانی کشتوکاڵ، بە بەرهەمهێنانی دانەوێڵەوە خەریکن، بەشی زۆری ئەم بەرهەمە بە باران ئاو دەدرێ، واتە دێمییە.

ئامانجی جوتکارانی کوردستان لە بەرهەمهێنانی دانەوێڵەدا، بە پلەی یەکەم بۆ فرۆشتن دەگەڕێتەوە، پاشان بۆ بەکارهێنانی وەک ئالیک بۆ ئاژەڵەکانیان دێ. جگە لەوەی خەرجی و دەسهەقی چاندن و تۆوکردن و دروێنەکردنی لێ دەردەچێ، ئەوی ماشەوە بۆ خواردنی خۆیان بەکاری دەهێنن.

ئەو بەرهەمانەی دانەوێڵە کە لە کوردستاندا دەچێندرێن و دێنە بەرهەم، لەم جۆرە

دانەوێڵانە پێک هاتوون: گەنم، جۆ، برنج، چەودەر (Rye)، هەرتۆمان، (Oats)، عەلەس (Spet)، مازیز ( Maziz )، هەرزن، دانی کەناری (Canary Seed)... هتد.

پارێزگاکانی کوردستان بە هۆی جیاوازی فاکتەرەکانی سروشتیی و مرۆیی یەوە، لە ڕووی پانتایی زەوی چاندراو و بەرهەمی ساڵانە و دەسکەوت لە یەک هێکتاردا، چوون یەک نین. بۆ ئەو مەبەستە، تەماشای خشتەی ژمارە (٢٨):

**خشتەی ٢٨ زەوی تۆکراو و دروێنەکراو و بەرهەمی دانەوێڵە ساڵی ١٩٨٨**

| پارێزگا | زەوی هەکتار چاندراو | زەوی هەکتار دروا‌و | بەرهەم تەن | کگم لە ١ هەکتاردا |
|---|---|---|---|---|
| ئادیەمان | ١٦٠ | ١٦٠ | ٣٢٤ | ٢٠٢٥ |
| ئاگری | ١٩٠ | ١٨٩ | ٢٢٨ | ١٢٠٦ |
| بینگۆڵ | ٢٧ | ٢٧ | ٣٢ | ١١٨٥ |
| بدلیس | ٦٤ | ٦٣ | ٦٩ | ١٠٩٥ |
| دیاربەکر | ٤٠٤ | ٤٠٤ | ٧٥٥ | ١٨٦٩ |
| ئەلازیغ | ٧٩ | ٧٩ | ١١٨ | ١٤٩٤ |
| ئەزرنجان | ٩٥ | ٩٥ | ١٦٥ | ١٧٣٧ |
| ئەرزەڕۆم | ١٩٤ | ١٩٢ | ٢٥٩ | ١٣٤٩ |
| گازی ئانتەب | ١٧٧ | ١٧٧ | ٤١١ | ٢٣٢٢ |
| هەکاری | ٥ | ٥ | ٨ | ١٦٠٠ |
| مەلاتیە | ١٦٩ | ١٦٩ | ٢٤٤ | ١٤٤٤ |
| مەرعەش | ٢٤٧ | ٢٤٧ | ٥٠١ | ٢٠٢٨ |
| ماردین | ٢٢١ | ٢٢٠ | ٣٩٠ | ١٧٧٣ |
| موش | ١٤١ | ١٢١ | ١٦٣ | ١٣٤٧ |
| سیرت | ٩٩ | ٩٩ | ١٦٢ | ١٦٣٦ |
| دەرسیم | ٤٧ | ٤٧ | ٥٠ | ١٠٦٤ |
| ئۆرفە | ٥٧٥ | ٥٧٥ | ١١٦٩ | ٢٠٣٣ |
| وان | ١٣١ | ١٢٦ | ١٤٣ | ١١٣٥ |

## گەنم

گەنم یەکێکە لەو بەروبوومانەی کێڵگە، کە بە شێوەیەکی فراوان لە کوردستاندا دەچێندرێ. پانتایی ئەو زەوییانەی بە گەنم تۆو دەکرێ، بەرهەمی ساڵانەی، ژمارەی کارگەرانی، دوو تا سێ جار، لە گشت بەرهەمەکانی دیکەی دانەوێڵە زیاترە. نرخی گەنم لە ژیانی کۆمەڵانی خەڵکیدا، گەلێ گرنگە، چونکە لە لایەکەوە بە خۆراکێکی سەرەکی زۆربەی زۆری دانیشتووانی کوردستان دادەنرێ و لە لایەکی دیکەشەوە، بۆ بەدەسهێنانی دەسمایە سەرچاوەیەکی باشە.

پانتایی هەموو ئەو زەوییانەی بە گەنم تۆو دەکرێ، خۆی لە چەند ملیۆن هێکتارێ دەدا .(١٩٨٨ – ٥ , ٤ ملیۆن هێکتار). بەرهەمی ساڵانەی گەنمەکە، لەو پانتاییە زیاترە کە تێیدا دەچێندرێ (١٩٨٨ – ٧ , ٥ ملیۆن تەن)، بە شێوەیەکی گشتی لە هێکتارێکدا دەسکەوتی نزیکەی ١٥٠٠کگم (١٩٨٨ – ١٥١٠ کگم) بوو.

گەنم لە کوردستاندا لە کەژی زستان و بەهاردا دەچێندرێ، هەر جۆرە گەنمەی بۆ تۆوکردن و دروێنەکردن، کاتی تایبەتی خۆی هەیە. هەروەها لە دوو ئاو و هەوای جیاوازدا دەروێن.

یەکەم – گەنمی زستانی:

بەو گەنمانە دەگوترێ، کە لە مانگی سەپتەمبەر یا ئۆکتۆبەردا تۆو دەکرێن و لە مانگی یول یا ئۆگەستدا دروێنە دەکرێن. گەنمی زستانی بەپێی کاتی تۆوکردنی، پێش یا پاش پەرەدان دەکرێتە: وشکاوز، واتە ئەو گەنمانەی پێش پەرەدان تۆو کراون. تەراوز، ئەو گەنمانەن کە دوای پەرەدان تۆو دەکرێن. گەنمی زستانی بە تایبەتی لە دەشتاییەکان و نێوچە گەرمەکاندا لە کوردستاندا دەروێن.

دووەم – گەنمی بەهاری:

ئەم چەشنە گەنمە، لە کۆتایی هاویندا تۆە دەکرێ، بە درێژایی زستان و بەهار، لە ژێر زەویدا دەمێنێتەوە. لە کۆتایی مانگی مارسدا، وردە وردە سەر دەردەهێنێ و سەوز دەبێ. لە مانگی ئۆگەستدا کۆتایی بە دروێنەکردنی دێ. گەنمی بەهاری بە تایبەتی لە نێوچە شاخاوییەکاندا دەچێندرێ.

چەشنەکانی گەنم لە کوردستاندا ئەمانەن: ئازەر، ڕەشید، سەرداری، قەندەهاری، سوورگوڵ، ڕەش گوڵ، یەقەدادرای، ڕەزاییە، تورکی، هەڕەمە، کوردی، عومێرە، گوڵ ڕووت، ئۆسترالی، مەندۆڵە، عەجیبە، سابیر بەگ، ئەڵمانی، سورکە، ساقی قوم، گوڵ پەڕشە، تریتیکوم، پۆیلۆس، تاریس تیس و ئاراس... تاد.

زۆربەی نێوچەکان، کەم و زۆر، گەنمیان لێ دەچێندرێ. فراوانترین زەوی تۆوکراو لە ساڵی ١٩٨٦دا، لە نەسیبی پارێزگای کوردستان، ٤٢٩ هەزار هێکتار بوو. بەرهەمی ساڵانەی پارێزگای ئورفە، لە ساڵی ١٩٨٦دا، نزیکەی ٦١٩ هەزار تەن بوو، ئەو بەرهەمە لە بەرهەمی هەموو پارێزگاکانی دیکە زیاتر بوو. تێکڕای دەسکەوتی ساڵانە لە پارێزگای دهۆک، لە یەک هێکتاردا ١١٣٣کگم بوو، ئەو بەرهەمە لە نێوچەکانی دیکەی کوردستاندا، بەراورد نەدەکرا تەماشای خشتەی ژمارە (٢٩) بکە.

**جۆ**

جۆ چاندن لە کوردستاندا زۆر باوە، بە تایبەتی لەو نێوچانەی کە کەمتر بۆ چاندنی گەنم دەست دەدەن. جۆ چ لە ڕووی پانتایی زەوی چێندراوەوە، چ لە ڕووی بەرهەمی ساڵانەوە، چ لە ڕووی بەکارهێنانییەوە بۆ خواردن، چ لە ڕووی دەسمایە و قازانجەوە، لە دوای گەنم دێ.

مەبەست لە جۆ چاندن، پێش هەموو شتێ بۆ دابینکردنی ئالیکە بۆ ئاژەڵە جۆربەجۆرەکان، بە تایبەتی لە کەژی زستاندا، پاشان بۆ مەبەستی پیشەسازی بەکار دەهێنرێ، بە تایبەتی بۆ بیرە دروسکردن. هەروەها لە هەندێ نێوچەدا، وەک خواردن بەکار دەهێنرێ، جا یا بە تەنیا، یاخود بە تێکەڵاویی لەگەڵ گەنمدا(مزاش).

پانتایی هەموو ئەو زەوییانەی ئەوڕۆ، بە جۆ تۆو کراوە، دەوروبەری دوو ملیۆن هێکتار دەبێ (١٩٨٨ – ١,٨ ملیۆن هێکتار). بەرهەمی ساڵانەشی خۆی لە ٣,٥ ملیۆن تەن دەدات (١٩٨٦ – ٣,٢ ملیۆن تەن). بەرهەمی لە یەک هێکتاردا، نزیکەی دوو هەزار کگم دەبێ (١٩٨٨ – ١,٨ هەزار کگم).

جۆ جۆری زۆرە، هەرە بەناوبانگەکانیان ئەمانەن: جۆ ڕەشە، جۆ سپیکە، شەشپەڕ، دووپەڕ... هتد. هەر جۆرێ لەم جۆرانە، لە نێوچەیەکی تایبەتی دیاریکراودا، دەڕوێ و زیاتر بڕ دەکات، وەک لە نێوچەیەکی دیکە.

جوتیارەکان لە هەموو پارێزگاکاندا، بەشێ لە زەوییە کشتوکاڵییەکانی خۆیان، بۆ جۆ چاندن تەرخان دەکەن. گەورەترین پارێزگا بۆ جۆ چاندن، پارێزگای موسڵیە، (١٩٨٨ – ٢٥٨ هەزار تەن)، بەرهەمیشی (١٩٨٦ – ٨٨٨ هەزار تەن)، لە بەرهەمی هەموو یەکە ئیدارییەکانی دیکە زیاتر بوو. زۆرترین تێکڕای بەرهەمی لە یەک هێکتاردا، لە نەسیبی، (١٩٨٨ – ١٤٤٢کگم). تەماشای خشتەی ژمارە (٣٠) بکە.

## خشتەی ٢٩ زەوی تۆوکراو و دروێنەکراو و بەرهەمی ساڵانەی گەنم، ساڵی ١٩٨٨

| پارێزگا | زەوی هەکتار (هەزار) چاندراو | دروا | بەرهەم هەزار تەن | کگم لە ١ هەکتاردا |
|---|---|---|---|---|
| ئادیەمان | ١١٦ | ١١٦ | ٢٣٩ | ٢٠٥٤ |
| ئاگری | ١٣١ | ١٣١ | ١٥١ | ١١٥١ |
| بینگۆڵ | ٢٣ | ٢٣ | ٢٥ | ١١٠١ |
| بدلیس | ٦١ | ٦٠ | ٦٢ | ١٠٣٤ |
| دیاربەکر | ٢٦٧ | ٢٦٧ | ٤٩٧ | ١٨٦٤ |
| ئەلازیغ | ٦٨ | ٦٨ | ١٠٠ | ١٤٧٤ |
| ئەزرنجان | ٦٥ | ٦٥ | ١١٠ | ١٦٩٠ |
| ئەرزەرۆم | ١٢٩ | ١٢٧ | ١٥٩ | ١٢٤٩ |
| گازی ئانتەب | ١١١ | ١١١ | ٢٤٧ | ٢٢١٨ |
| هەکاری | ٤ | ٤ | ٦ | ١٧٢٦ |
| مەلاتیە | ١٤٣ | ١٤٣ | ٢٠٦ | ١٤٣٤ |
| مەرعەش | ١٩٢ | ١٩٢ | ٣٨٣ | ١٩٩٥ |
| ماردین | ١٤٦ | ١٤٥ | ٢٤٦ | ١٦٩٢ |
| موش | ١٢٢ | ١٠٣ | ١٣٥ | ١٣١٤ |
| سیرت | ٧٢ | ٧٢ | ١١٨ | ١٦٤٧ |
| دەرسیم | ٣٥ | ٣٤ | ٣٥ | ١٠٤٠ |
| ئۆرفە | ٣٢٩ | ٣٢٩ | ٦١٩ | ١٨٨٢ |
| وان | ١١٣ | ١٠٨ | ١٢٣ | ١١٣٧ |
| ئازربایجانی غ | ٣١٩ | – | ٣٢٤ | ١٠١٧ |
| کرماشان | ٢٨٣ | – | ٢٧٣ | ٩٦٥ |
| کوردستان | ٤٢٩ | – | ٢٢٦ | ٥٢٧ |
| بەختیاری | ٨٦ | – | ١٥٢ | ١٧٦٧ |
| ئیلام | ١٠٧ | – | ٣٢ | ٢٩٨ |
| لورستان | ٣٠٣ | – | ٢٨٨ | ٩٥٠ |
| کوهگیلویە | ٧٦ | – | ١٤٢ | ١٨٦٨ |
| نەینەوا | ١٦٧ | – | ٣٩٥ | ٢٣٦٥ |
| کەرکووک | ٥٣ | – | ٩٦ | ١٨١١ |
| دهۆک | ١٥ | – | ٥٠ | ٣٣٣٣ |
| هەولێر | ٣٨ | – | ٧٧ | ٢٠٢٦ |
| سلێمانی | ٧٥ | – | ٥٠ | ٦٦٧ |

**خشتەی ٣٠ زەوی تۆکراو و دروێنەکراو و بەرهەمی ساڵانەی جۆ، ساڵی ١٩٨٨**

| پارێزگا | زەوی هەکتار (هەزار) | | بەرهەم هەزار تەن | کگم لە ١ هەکتاردا |
|---|---|---|---|---|
| | چاندراو | درواو | | |
| ئادیەمان | ٤٢ | ٤٢ | ٨٢ | ١٩٥٤ |
| ئاگری | ٥٥ | ٥٥ | ٧١ | ١٣٠٨ |
| بینگۆڵ | ٢ | ٢ | ٣ | ١٦٧٠ |
| بدلیس | ٠,٦ | ٠,٦ | ٠,٦ | ١٠٦٠ |
| دیاربەکر | ١٣٤ | ١٣٤ | ٢٥١ | ١٨٧٩ |
| ئەلازیغ | ١٢ | ١٢ | ١٨ | ١٥٤٩ |
| ئەزرنجان | ٢٤ | ٢٤ | ٤٧ | ١٩٤١ |
| ئەرزەڕۆم | ٥٨ | ٥٧ | ٨٨ | ١٥٤٠ |
| گازی ئانتەب | ٦٤ | ٦٤ | ١٦٢ | ٢٥١٩ |
| هەکاری | ٠,٥ | ٠,٥ | ٠,٧ | ١٥١٨ |
| مەلاتیە | ٢٥ | ٢٥ | ٣٧ | ١٤٧٣ |
| مەرعەش | ٥٢ | ٥٢ | ١١٤ | ٢١٨٢ |
| ماردین | ٧٤ | ٧٤ | ١٤٣ | ١٩٢٥ |
| موش | ١٨ | ١٨ | ٢٦ | ١٤٤٣ |
| سیرت | ٢٧ | ٢٧ | ٤٤ | ١٦٤١ |
| دەرسیم | ١٢ | ١٢ | ١٤ | ١١٨٢ |
| ئۆرفە | ٢٤٥ | ٢٤٥ | ٥٥٠ | ٢٢٤٢ |
| وان | ١٨ | ١٨ | ١٩ | ١٠٩٣ |
| ئازربایجانی غ | ١١٩ | – | ١٣٠ | ٩٤ |
| کرماشان | ٦٣ | – | ٧٩ | ١٢٥٧ |
| کوردستان | ٤٥ | – | ٢٢ | ٤٨٩ |
| بەختیاری | ٤٢ | – | ٥٩ | ١٤٠٥ |
| ئیلام | ٤٣ | – | ١٩ | ٤٤٢ |
| لورستان | ٢٠٣ | – | ١٧٤ | ٨٥٧ |
| کوهگیلویە | ٤٠ | – | ٥٠ | ١٢٥٠ |
| نەینەوا | ٢٥٨ | – | ٨٨٨ | ٣٤٤٢ |
| کەرکووک | ٤٢ | – | ٧٢ | ١٧١٤ |
| دهۆک | ١ | – | ٢ | ٢٠٠٠ |
| هەولێر | ٢٠ | – | ٤٢ | ٢١٠٠ |
| سلێمانی | ٢ | – | ٤ | ٢٠٠٠ |

**برنج**

لەبەر ئەوەی برنج، ئەورۆ بە یەکێ لە خواردنە سەرەکییەکانی خەڵک دادەنرێ، بایەخی خواردنی ئەم دانەوێڵە هاوینەیە، لەم ساڵانەی دواییدا زۆر زیادی کردووە، ئەمەش وای لە جوتیارەکان کردووە، کە زیاتر بایەخ بە چاندنی بدەن و پانتایی زەوییەکە فراوانتر بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا، برنج لە ڕووی پانتایی زەوی تۆوکراو و بەرهەمی ساڵانەوە، زۆر لە دوای گەنم و جۆوە دێ.

پانتایی زەوی چێندراو بە برنج، لە بیست هەزار هێکتار کەمترە، (١٩٨٦ – ١٦ هەزار هێکتار)، بەرهەمی ساڵانەشی دوو، ئەوەندەی ئەم ژمارەیە دەبێ، (١٩٨٦ – ٣٠ هەزار تەن). تێکڕای دەسکەوت لە یەک هێکتاردا، نزیکەی دوو هەزار کگم دەبێ (١٩٨٦ – ١,٩ هەزار کگم).

لە کوردستاندا چەندین جۆر برنج دێتە بەرهەم، ئەوانەی لە هەموویان زیاتر ناویان دەرکردووە، ئەمانەن: چمپا (نێوچەی قەرەزیادین)، بازیان (نێوچەی بازیان).

برنج لە زۆر نێوچەدا دەچێندرێ. بەڵام لەبەر کەمی ئاوی پێویست و ئاووهەوای گونجاو و زەوی بەپیت، ئەو پانتاییانەی بۆ چاندنی برنج بەکار دەهێنرێ، لە نێوچەیەکەوە بۆ نێوچەیەکی دیکە، جیاوازی هەیە. گەورەترین نێوچەی برنج چاندن، دەکەوێتە پارێزگای موسڵوە، (١٩٨٨ – ٤,٢ هەزار هێکتار). بەرهەمی ساڵانەشی، لە بەرهەمی پارێزگاکانی دیکە زیاترە، (١٩٨٨ – ٧ هەزار تەن). ئەم بەرهەمە لە هیچ پارێزگایەکی دیکەدا وێنەی نەبوو، هەر وەکوو لە خشتەی ژمارە (٣١) دەردەکەوێ.

**خشتەی ٣١ زەوی تۆکراو و درویێنەکراو و بەرهەمی ساڵانەی برنج، ساڵی ١٩٨٨**

| پارێزگا | زەوی هەکتار | | بەرهەم | کگم لە ١ |
|---|---|---|---|---|
| | چاندراو | دروواو | تەن | هەکتاردا |
| ئادیەمان | ١١٤ | ٨٨ | ٢١٢ | ٢٤٠٩ |
| بینگۆڵ | ١٧٣ | ١٧٣ | ٣٨٥ | ٢٢٢٥ |
| بدلیس | ٨٨ | ٨٣ | ٢٠٠ | ٢٤١١ |
| دیاربەکر | ١١٦٣ | ١١٦٣ | ٢١١٤ | ١٨١٨ |
| ئەلازیغ | ٣٥ | ٣٥ | ١٠٦ | ٣٠٢٩ |
| گازی ئانتەب | ٢٠ | ٢٠ | ٤٢ | ٢١٠٠ |
| هەکاری | ٢٩٤ | ٢٩٤ | ٣٤٩ | ١١٨٧ |
| مەلاتیە | ٧٠ | ٧٠ | ١٦٦ | ٢٣٧١ |
| مەرعەش | ١٩١ | ١٩١ | ٣٦٨ | ١٩٢٧ |
| ماردین | ٣٤١ | ٣٤١ | ٥٥٥ | ١٦٢٨ |
| سیرت | ٣٥٦ | ٣٥٦ | ٨٥٥ | ٢٤٠٢ |
| ئۆرفە | ٤٢٥ | ٤٢٥ | ٦٦٠ | ١٥٥٣ |
| ئازەربایجانی غ | ١٢٩٥ | – | ١٥٣٧ | ١١٨٧ |
| کوردستان | ٣٦ | – | ٧٢ | ٢٠٠٠ |
| بەختیاری | ٢٩٦٣ | – | ٧٣٥٠ | ٢٤٨١ |
| لورستان | ١١٥٠ | – | ٨٠٧٠ | ٧٠١٧ |
| ئیلام | ١٧٠٤ | – | ٤٣٨٨ | ٢٥٧٥ |
| نەینەوا | ٤٢٥٠ | – | ١٥٠٠ | ٣٥٣ |
| هەولێر | ٢٥٠ | – | ١٠٠ | ٤٠٠ |
| سلێمانی | ٢٥٠ | – | ١٠٠ | ٤٠٠ |

**بەروبوومی پاقلەیی**

بەروبوومی پاقلەیی وەکوو نیسک (سوور و سەوز)، نۆک، پاقلە، بەزالیا، لۆبیا، ماش، هەرتۆمان، کاوڤیج ( Kaw vetch)، ویلد ڤیچ (Wild vetch)، نزیکەی لە ١٦٪ی گشت زەوییە چاندراوەکان،بە بەروبوومی کێلگە و نزیکەی ٦٪ی گشت بەرهەمی کێلگە دەگرێتەوە. دەسکەوت لە یەک هێکتار زەوی دروێنەکراودا، لە یەک هەزار کگم زیاترە.

پارێزگای ئورفە، دیاربەکر، ماردین، لە ڕووی پانتایی زەوی چاندراو و بەرهەم و دەسکەوتی ساڵانە لە یەک هێکتاردا، بە گەورەترین نێوچەکانی کوردستان دادەنرێن. ئەوەش بۆ چاکی خاکەکەیی و پلەی گەرما و سەرمای ئەو نێوچانە دەگەڕێتەوە. کەمترین جێیەکیش کە بەرهەمی پاقلەیی لێ بروێندرێ، پارێزگاکانی کەرکووک و هەکاری و بدلیسە. بۆ ئەو مەبەستە تەماشای خشتەی ژمارە (٣٢) بکە.

**نیسک**

نیسک بەرهەمێکی پاقلەیی زستانەیە، بەهای خواردنی زۆرە، چونکە مادەی پرۆتین و کاربۆهەیدراتی زۆر تێدایە. خەڵکی کوردستان بە تایبەتی لە گوندەکاندا، بە خواردنێکی ڕۆژانەی گرنگی دادەنێن.

پانتایی ئەو زەوییانەی ساڵانە بە پاقلە دەچێندرێن، خۆی لە ٥٥٠ هەزار هێکتار دەدا، (١٩٨٦ – ٥٣٠ هەزار هێکتار)، بەرهەمی ساڵانەی لە ٧٠٠ هەزار تەن زیاتر نابێ، (١٩٨٦ – ٦٥٥ هەزار تەن)، تێکڕای دەسکەوت لە یەک هێکتاردا، دەگاتە ١٣٠٠ کگم (١٩٨٦ – ١٢٠٠کگم).

بەناوبانگترین نێوچەکانی بەرهەمهێنانی نیسک، پارێزگاکانی ئورفە (١٩٨٦ – ١٦٠ هەزار هێکتار)، ماردین (١٩٨٦ – ١٥١ هەزار هێکتار)، دیاربەکرە (١٩٨٦– ١٠٩ هەزار هێکتار).

بەرهەمی ساڵانەی نیسک لە پارێزگاکانی ماردین (١٩٨٦– ٢٤٧ هەزار تەن)، ئورفە (١٩٨٦– ١٥٥ هەزار تەن)، دیاربەکر (١٩٨٦– ١٣٧ هەزار تەن)، بەرهەمی ئەو شارانە لە بەرهەمی گشت پارێزگاکانی دیکە زیاترە.

تێکڕای دەسکەوتی بەرهەمی نیسک، لە یەک هێکتار زەوی دروێنەکراودا، دەگاتە ئەو پەڕی پلەی بەرزی بەرهەمهێنان. لە پارێزگای ماردین (١٩٨٦ – ١٦٥٦ کگم)ئادیەمان (١٩٨٦ – ١٢٠٠ کگم)، دهۆک (١٩٨٦ – ١١٨٤ کگم).

**خشتەی ٣٢ زەوی تۆکراو و دروێنەکراو و بەرهەمی ساڵانەی باقلەیی، ساڵی ١٩٨٨**

| پارێزگا | زەوی هەکتار | | بەرهەم تەن |
|---|---|---|---|
| | چاندراو | دروا | |
| ئادیەمان | ٧٦٣١٤ | ٧٦٣١٤ | ٨٩٨٦١ |
| ئاگری | ٩١٤٢ | ٩١٤٢ | ٦٥١٠ |
| بینگۆڵ | ١٢٥٩ | ١٢٥٩ | ٧٢٩ |
| بدلیس | ٧٤٧ | ٧٣٥ | ٩٧١ |
| دیاربەکر | ٢٤١٨٣٩ | ٢٤١٨٣٩ | ٢٣٥٦٢٨ |
| ئەلازیغ | ٨٤٦٧ | ٨٤٦٧ | ٨١٥٧ |
| ئەزرنجان | ٨٩٠٩ | ٨٩٠٩ | ١٠١٧٧ |
| ئەرزەڕۆم | ٩٢٨٢ | ٩٢٨٠ | ٦٦٦٢ |
| گازی ئانتەب | ٨٢٨٢٠ | ٨٢٨٢٠ | ٩٨٧٩٠ |
| هەکاری | ٣٨٥ | ٣٨٠ | ٢٥٠ |
| مەلاتیە | ١٦٩٧٥ | ١٦٩٧٥ | ١٩٣٣٦ |
| مەرعەش | ٨٠٢٩٦ | ٨٠٢٩٦ | ٨٤٥٨١ |
| ماردین | ١٧٩٩٩٩ | ١٧٩٩٩٩ | ١٩١٤٧٨ |
| موش | ٤٨١٧٨ | ٤٧٦١٠ | ٥٦٢٩١ |
| سیرت | ٤٢٩١٣ | ٤٢٩١٣ | ٤٧٦٩٣ |
| دەرسیم | ٦٧٩٥ | ٦٧٩٥ | ٦٢٣٦ |
| ئۆرفە | ٢٣٥٩١٩ | ٢٣٥٨١٤ | ٣٠١٣٩٤ |
| وان | ١٦٥٠ | ١٦١٦ | ١٥١٤ |
| ئازربایجانی غ | ٨١٦٨٠ | – | ٣١٤٤٩ |
| کوردستان | ٢٣١١٠ | – | ٧٠٦٧ |
| بەختیاری | ٣٧١٥ | – | ٢٤٩٣ |
| لورستان | ٦٣١٦٣ | – | ٣٧٧٩٨ |
| ئیلام | ٥٦٥٢ | – | ٢٣٩٠ |
| نەینەوا | ١٠١٨٦ | – | ٧٦٢٧ |
| کەرکووک | ٩ | – | ١ |
| دهۆک | ٢٩٥٦ | – | ١٩٢١ |
| هەولێر | ٢٩٧ | – | ٨٢٩ |
| سلێمانی | ١٦٦٧٤ | – | ٢١٧٨ |

### نۆک

نۆک لەو بەرهەمە پاقلەییانەیە، کە توانایەکی سەیری چەکەرەکردن و گەورەبوونی، لە زەوییە کەم پێز و ناوەندی پێزەکاندا هەیە. تەنیا لە زەوییە سوور و زیخاوییەکاندا، خراپ دەڕوێ. بەهای خواردنی گەلێ بەرزە، لەبەر ئەوەی مادەکانی پرۆتین، چەوری، سیلیلۆز، خوێی مەعدەنی، گەلێ تێدایە، هەروەها نرخی پلەی گەرما بەخشینیشی بەرزە.

پانتایی ئەو زەوییانەی بە نۆک دەچێندرێن، چەند هەزار هێکتارێ دەبێ، (١٩٨٦ – ٢٥٢ هەزار هێکتار). بەرهەمی ساڵانەشی، بە تایبەتی لەو ساڵانەی کە ئاو و هەوا خۆش دەبێ، سەر لە چەند هەزار تەنێک دەدا (١٩٨٦ – ٢٨٩ هەزار تەن)، تێکڕای دەسکەوت لە یەک هێکتاردا، لە هەندێ ساڵدا دەگاتە ١٢٠٠کگم (١٩٨٦ – ١١٥٠ کگم).

نۆک لە زۆربەی نێوچەکانی کوردستاندا، لە زستاندا دەچێندرێ. بەرهەمی ساڵانەی لە پارێزگای مەرعەش (١٩٨٦ – ٤١ هەزار تەن)، ئادیەمان (١٩٨٦ – ٤٠ هەزار تەن)، گازی ئانتەب (١٩٨٦ – ٢٩ هەزار تەن)، موش (١٩٨٦ – ٢٤ هەزار تەن). لەو ٤ جێیە، لە نێوچەکانی دیکە زۆر زۆرترە.

تێکڕای دەسکەوتی ساڵانەی لە یەک هێکتار زەوی درووراوەدا، لە پارێزگاکانی هەکاری (١٩٨٦ – ٢ هەزار کگم)، ماردین (١٩٨٦ – ١,٧ هەزار کگم)، مەلاتییە (١٩٨٦ – ١,٥ هەزار کگم)، لە ئەم جۆرە بەرهەمە، لەگەڵ بەرهەمی نێوچەکانی دیکەدا بەراورد نەدەکرا.

بەرهەمە پاقلەییەکانی دیکە، وەکوو بەزالیا، فاسۆلیا، لۆبیا، ماش، هەرتۆمان، کاوڤیچ، ویلدڤیچ، چ لەڕووی زەوی تۆوکراو و چ لە ڕووی بەرهەمی ساڵانە و چ لە ڕووی دەسکەوتی یەک هێکتار، لە هەموو بەرهەمە پاقلەییەکانی دیکەی پێشوو کەمترە و جێگایەکی تایبەتی دیاریکراوی ئەوتۆش، لە پێکەوەنانی دەسمایەی جوتیارەکاندا، بۆ خۆیان داگیر ناکەن.

### بەروبوومی پیشەسازی

بەروبوومی پیشەسازی، نزیکەی لە ٦٪ هەموو زەوییە چاندراوەکان داگیر دەکات. بەرهەمی ساڵانەشی نزیکەی سەدان تەن دەبێ. ژمارەیەکی زۆریش لە کرێکاری کشتوکاڵ، ڕۆژانە کاری تێدا دەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا کە بەرهەمهێنانی ئەم جۆرە ڕووەکانە، ماندووبوونێکی زۆری دەوێ، بەڵام دەسکەوتی جوتیاران، لە یەک هێکتار زەوی چاندراودا، لە چاو زەوییە چاندراوەکان بە بەروبوومی دانەوێڵە و پاقلەیی، دوو تا سێ کەڕەت زیاترە. دەوڵەت بە زۆری پانتایی زەوی ناوچە، نرخی یەک کگم لە بەرهەم دیاری دەکا.

بەرهەمی پیشەسازی لە پارێزگای مەرعەش، ئورفە، ئادیەمان، گازی ئانتەب زۆر

بەرزە، بەپێچەوانەوە بەرهەمی هەکاری، دەرسیم، بینگۆڵ، نزمە، ئەمەش بۆ جیاوازی ئاو و هەوا و جۆری خاکەکەی دەگەڕێتەوە. تەماشای خشتەی ژمارە (٣٣) بکە. گرنگترین بەرهەمە پیشەسازییەکان لە کوردستاندا ئەمانەن: تووتن، لۆکە، چەوەندەری شەکر.

**خشتەی ٣٣ زەوی تۆکراو و دروێنەکراو و بەرهەمی، ساڵانەی پیشەسازی، ساڵی ١٩٨٨**

| پارێزگا | زەوی هەکتار | | بەرهەم تەن |
|---|---|---|---|
| | چاندراو | درواو | |
| ئادیەمان | ١٨٠٩٩ | ١٨٠٩٩ | ١٣٦١٠ |
| ئاگری | ٤١٥٣ | ٤١٥٣ | ٨٦٤٤٥ |
| بینگۆڵ | ٣٨١ | ٣٤٨ | ٨٣١٩ |
| بدلیس | ٢٥٥٠ | ٢٥٠١ | ١٨٧٧٢ |
| دیاربەکر | ٢٧٧٨١ | ٢٧٧٨١ | ٢١٣٨٥ |
| ئەلازیغ | ٦٢٣٦ | ٦٢٣٣ | ١٩٢٦٥١ |
| ئەزرنجان | ٥٦٣٥ | ٥٦٣٢ | ٢٠١٣٧٤ |
| ئەرزەڕۆم | ٥٨١١ | ٥٨١١ | ١٤٠١٦١ |
| گازی ئانتەب | ١٢٧٢٥ | ١٢٧٢٥ | ١٠٥٣٧ |
| هەکاری | ١١٠ | ٩٢ | ١٠٧٤ |
| مەلاتیە | ٤٦٦٢ | ٤٦٣٠ | ١٢٩٨٣٥ |
| مەرعەش | ٤١١٩٢ | ٤١٠٤١ | ٣٠٣٥٣٠ |
| ماردین | ١٥٠٤٥ | ١٥٠٤٥ | ١١١٧٦ |
| موش | ٧١٣٩ | ٦٨٨٦ | ١٣٣٦٢٤ |
| سیرت | ١٠٥٢٤ | ١٠٥٢٤ | ١٢٢٧١ |
| دەرسیم | ١٧٤ | ١٧٤ | ٤٧١٦ |
| ئۆرفە | ٥٢١٦٠ | ٥٢١٦٠ | ٣٨٩٧٧ |
| وان | ١٩٩٢ | ١٩٩٢ | ٥٣١٢٧ |

**تووتن**

تووتن به یەکێ له ڕووەکه پیشەسازییه هەره بەربڵاوەکانی کوردستان دادەنرێ. سالانه به دەیان هەزار هێکتــار زەوی چێندراو، تووتنی تێــدا دەروێندرێ (١٩٨٦ – ٢٩ هەزار هێکتار). بەرهەمی ساڵانەی دەگاته، دەیان هەزار تەن (١٩٨٦ – ٣٠ هەزار تەن). تێکڕای دەسکەوت له یەک هێکتاردا، خۆی له ١١٠٠ کگم دەدا (١٩٨٦ – ١٠٥٠ کگم).

**جۆرەکانی تووتن:**

له کوردستاندا زیاتر له ده جۆر تووتن دەروێندرێ. هەره بەناوبانگەکانیان ئەمانەن:

– پەلکەبێ: تووتنێکی زۆر باشه، پەلکی زۆر دەردەکات، بەڵام له کێشدا سووکه، لەبەر ئەوه تووتنەوانەکان، ئەگەر بۆ خۆیان نەبێ یاخود له لایەن کەسێکی دیاریکراوەوه، بەرادان نەدرێ، نایچێنن.

– میرزا ئەحمەدی: له تووتنه هەره بەناوبانگەکانه. به شێوەیەکی زۆر فراوان دەچێندرێ. گەڵاکانی پانه، هەر بنه تووتنێک له ٢٥ – ٣٠ گەڵا دەردەکات.

– ڕەشۆکی: گەڵای تووتنی ڕەشۆکی مەیلەو شینه. ئەمه وای له تووتنەوانەکان کردووه، که خۆیان له چاندنی ئەو جۆره تووتنه ببوێرن، چونکه له کاتی تەماشاکردن و قەبڵاندنی نرخەکەیدا. له دایەرەی ئینحیساری تووتن، به چاوێکی باش سەیر ناکرێ و به نرخێکی هەرزان لێیان وەردەگرن.

– بافره: گەڵای تووتنی بافره، زۆر تەنکه، بۆیه له کێشاندا سوکه، لەبەر ئەوه تووتنەوانەکان نه خۆیان و نه زەوییەکانیان، به چاندنی ئەم جۆرەوه خەریک ناکەن.

– سێرەمۆ: گەڵای تووتنی سێرەمۆ، بەرەو ژوور هەڵدەکشێ و له هەر چوار لای قەدی ڕووەکەکەوه، دێنه دەرێ.

– زەردە: ڕەنگی گەڵای ئەم جۆره تووتنه زەرده. گەڵاکانی وەکوو گەڵای تووتنی سێرەمۆ، بەرەو ژوور هەڵدەکشێن.

– عەلی کەسافی: گەڵاکانی پانه، هەمیشه گەڵاکانی بەرەو ژوور هەڵدەکشێن. ڕەنگیشی کەمێ تەڵخه. لەبەر ئەو هۆیانه، لەچاو جۆرەکانی دیکەدا، کەمتر دەروێندرێ.

– بێشەما: له کۆنەوه له کوردستاندا دەچێندرێ. بەڵام لەبەر ئەوەی له کێشاندا سوکه و ڕەنگی گەڵاکانی کەمێ تەڵخه، تووتنەوانەکان به زۆری نایچێنن.

**نێوچەکانی چاندنی تووتن:**

جۆری گڵ و ئاو و هەوای زۆربەی نێوچە جیاجیاکانی کوردستان، بۆ رواندنی تووتن دەست دەدەن. بەڵام بە تەواوی کەڵک لەم بارودۆخ و هەلومەرجە، وەکوو پێویست وەرناگیرێ. لەبەر ئەوەی ئەو پانتاییانەی بۆ رواندنی تووتن، لە لایەن فەرمانگاکانی کشتوکاڵی دەوڵەتەوە دیاری دەکرێ، لەم کۆی هەموو پانتایی زەوییە چێندراوەکان، بۆ هەر نێوچەیەک زۆر کەمە و جوتیارەکان ناتوانن لە سنووره زیاتر تێپەڕ بکەن، کە ئەو لایەنانە بۆیان دادەنێن. پانتایی ئەو زەوییانەی کە رێی دراوە، تووتنی تێدا بچێنن، لە ئێستادا نزیکەی چەند هەزار هێکتارێ دەبێ (١٩٨٨ – ٤٣ هەزار هێکتار)، هەروەها بەرهەمەکەشی (١٩٨٨ – ٤٢ هەزار تەن). تێکڕای دەسکەوتی ساڵانەی لە یەک هێکتاردا، پتر لە ١٠٠٠ کگم دەبێ (١٩٨٨ – ١٠٥٢ کگم).

گەورەترین و بەرفراوانترین ئەو زەوییانەی بۆ چاندنی تووتن تەرخان کراون، دەکەوێتە پارێزگاکانی ئادیەمان، سیرت، دیاربەکر. بەرهەمی ساڵانەی ئەم یەکە ئیدارییانە، نزیکەی بەرهەمی هەموو کوردستان پێک دەهێنن. تێکڕای دەسکەوتی هەر یەکێ لەو پارێزگایانە، لە یەک هێکتاردا، لە ١٥٠٠ کگم زیاترە. تەماشای خشتەی ژمارە (٣٤) بکە.

**گیروگرفتەکانی تووتن:**

ڕووەکی تووتن لە کوردستاندا، تووشی چەندین گیروگرفتی هەمەجۆرە دەبێ. هەندێ لەو گیروگرفتانە سروشتین و هەندێکی دیکەشیان مرۆیین.

**گیروگرفتی سروشتی**

نەخۆشی:

ترسناکترین گیروگرفتێکی سروشتی، کە تووشی تووتن دەبێ، چ لە کێڵگە و چ لە ناو عەمارەکاندا، نەخۆشییە. هەرە گرنگەکانیان ئەمانەن:

پچڕێنە: ئەم نەخۆشییە تووشی ڕەگەکانی ڕووەکی تووتن دەبێ. تا وا لە ڕووەکەکان دەکا، بێهێزیان دەکا و سیسیان دەکا و لە شوێنی خۆیاندا ووشک دەبن. هۆکەشی بۆ کرمێکی ورد دەگەڕێتەوە، کە دوای ئاودان شەوانە بەکاردەکەوێ و دەست بە قرتاندن و خواردنی ڕەگە تووتنەکان دەکا. چارەسەری ئەم نەخۆشییە کوشندەیەش، بە هۆی بەکارهێنانی مادەی کروسیاید، یاخود دیدیتی DDT وە دەکرێ.

**خشتەی ٣٤ زەوی تۆکراو و درویْنەکراو و بەرهەمی ساڵانەی توتن، ساڵی ١٩٨٨**

| پارێزگا | زەوی هەکتار | | بەرهەم | کگم لە ١ هەکتاردا |
|---|---|---|---|---|
| | چاندراو | دروا | تەن | |
| ئادیەمان | ١٨٠٩٩ | ١٨٠٩٩ | ١٣٦١٠ | ٧٥٢ |
| بینگۆڵ | ١٦ | ١٦ | ١٩ | ١١٨٨ |
| بدلیس | ١٦٨٣ | ١٦٨٣ | ٢١٨٠ | ١٢٩٥ |
| دیاربەکر | ٢٢٨٦ | ٢٢٨٦ | ٣٣٦٨ | ١٤٧٣ |
| ئەلازیغ | ٣ | ٣ | ٢ | ٦٦٧ |
| گازی ئانتەب | ٤٠ | ٤٠ | ٥٧ | ١٤٢٥ |
| هەکاری | ٢٦ | ٢٦ | ٣٤ | ١٣٠٨ |
| مەلاتیە | ١١٩٧ | ١١٩٧ | ١١٣٧ | ٩٥٠ |
| ماردین | ٨٩ | ٨٩ | ١٨٢ | ٢٠٤٥ |
| موش | ١١٦١ | ١١٦١ | ١٧٥٩ | ١٥١٥ |
| سیرت | ٦١٣١ | ٦١٣١ | ٩٠١٩ | ١٤٧١ |
| دەرسیم | ٢ | ٢ | ٢ | ١٠٠٠ |
| وان | ٢ | ٢ | ٢ | ١٠٠٠ |
| ئازەربایجانی غ | ٢٠١٨ | – | ١٨٤٨ | ٩١٦ |
| کوردستان | ٧٩٥ | – | ٦٤٥ | ٩١١ |
| لورستان | ٣٥ | – | ٢٠ | ٥٧١ |
| ئیلام | ٨٧ | – | ٢٣ | ٢٦٤ |
| کەرکووک | ٦٣ | – | ٢٤ | ٣٨١ |
| دهۆک | ٦٧٥ | – | ٧٦٤ | ١١٣٢ |
| هەولێر | ١٥٠٠ | – | ١٦٧٢ | ١١٢٥ |
| سلێمانی | ٧٢٦٣ | – | ٥٨٦٩ | ٨٠٨ |

هارەیی: هۆی ئەم نەخۆشییە بۆ کرمێکی ورد دەگەڕێتەوە، کە لە مانگی ئەپرێلدا پەیدا دەبێ. نەخۆشییەکە تووشی هەندێ یا هەموو گەڵاکان دەبێ، بە شێوەی پەڵە پەڵە دەردەکەوێ. چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییەش، بە مادەی سایام، میسیل، پرۆمید... هتد دەکرێ. بۆ ئەوەی دەرمانەکان کاریگەرێتی خۆیان زیاتر نیشان بدەن، چاکتر وایە لە کاتی فێنکیدا بە ڕۆژ بەکار بهێنرێن، چونکە لەو کاتانەدا، کرمەکان دەجوڵێن و دەست بە چالاکی دەکەن.

سیسبوون: نەخۆشییەکی یەکجار بڵاوە، بە تایبەتی لەو زەوییانەی کە چەند ساڵ لەسەر یەک و بە بەردەوامی بە تووتن دەچێندرێن. نەخۆشییەکە زیاتر تووشی گەڵا ساواکان دەبێ، وەک لەوەی تووشی گەڵا گەورەکان ببێ. چارەسەرکردنی تەنیا بە ئاونەدانە، دەبێ بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ئاو نەدرێ.

ئەنتراکتۆز: ئەم نەخۆشییە تووشی گەڵاکان دەبێ، ڕەنگەکەی لە سەوزەوە بۆ قاوەیی و مەیلە وسوور دەگۆڕێ، هۆیەکەشی کرمێکی کوارکییە کە تووشی بنە تووتنەکان دەبێ و دەبێتە هۆی سیسبوونیان. چارەسەرکردنیشی تەنیا بە ئاونەدانێتی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەسەر یەک.

**گیروگرفتی مرۆیی:**

لێرەدا پەنجە بۆ هەندێ لەو گیروگرفتە گرنگە مرۆییانە ڕادەکێشین، کە لە کاتی چاندن و پەرەسەندن و فرۆشتندا، تووشی تووتن دەبن:

- دیاریکردنی پانتایی: پانتایی ئەو زەوییانەی بۆ چاندنی تووتن تەرخان دەکرێن، لە ڕووی کەمی یا زۆری پانتاییەوە، لە لایەن دایرەی ئینحیساری تووتنەوە دەسنیشان دەکرێن. تووتنەوانەکان بە هیچ جۆرێ، مافی ئەوەیان نییە، پانتایی زەوییەکانی خۆیان زیاد بکەن. مەبەستی دەوڵەتیش لەم دیاریکردنە، تەنیا بۆ پارێزگاریکردنی نرخی تووتن دەگەڕێتەوە، تا لەو ئاستەی دەسنیشانیان کردووە، نەیەتە خوارەوە.

- دابەشکردنی بەرهەم: بەرهەمی ساڵانەی تووتن، لە نێوان تووتنەوانەکان و خاوەن موڵکەکاندا، بەم شێوەیە دابەش دەکرێ: ئەگەر موڵکدارەکان، ئاو و جووت و تۆو، بۆ تووتنەوانەکان دابین بکەن، ئەوا لە جیاتی ئەوانە، نیوەی بەرهەمەکە بۆ موڵکدارەکان دەبێ. بەڵام ئەگەر هاتوو، تەنیا ئاوەکە هی موڵکدارەکان بێ، ئەوا سێ یەکی بۆ ئەوان دەبێ و ئەوی مایەوە بۆ تووتنەوانەکان دەبێ.

– ڕابەری کشتوکاڵ: ژمارەی ڕابەرە کشتوکاڵییەکان لە کوردستاندا، وەکوو پێویست نییە و زۆر کەمە. ئەو کەمەکەشی کە هەیە، لەبری ئەوەی تووتنەوانەکان، فێری شێوازی نوێی چاندن و ئاودان و هەڵگرتنی تووتن بکەن، بە شـێـوەیەکی هاوچەرخـانە، تەنیـا کارەکانیان خۆی لە تووتن کڕین لە تووتنەوانەکاندا دەبینێ.

– شێوازی چاندن: تووتنەوانەکان، لە زۆربەی نێوچەکانی کوردستاندا، تاکوو ئێستا بە هەمان شێوازی سەد ساڵ لەمەوبەر، تووتن تۆو دەکەن و پاشان بۆ کێڵگەی دەگوزنەوە و دەیچاقێن و ئاوی دەدەن و گەڵاکانی دەقرتێنن و وشکی دەکەنەوە و هەڵی دەگرن و پاشان بۆ فرۆشتن ئامادەی دەکەن. ئەم شێوازی خزمەتکردنە کۆنە، لە لایەکەوە پێویستی بە کاتێکی زۆر هەیە، لە لایەکی دیکەشەوە، ڕێژەی زیان و لەنێوچوونی زیاتر دەکات.

**لۆکە**

لۆکە، بە یەکێ لە هەرە بەرهەمە گرنگە بەروبوومەکانی پیشەسازی دادەنرێ، چونکە دەسکەوتی ساڵانەی جوتیارەکان لە یەک هێکتاردا، بە بەراوردکردن لەگەڵ دەسکەوتی ساڵانەی یەک هێکتار زەوی چاندراو، بۆ نموونە بە بەروبوومی دانەوێڵە، بەرزترە. پانتایی هەموو ئەو زەوییانەی بە لۆکە دەچێندرێن، خۆی لە ٦٥ هەزار هێکتار دەدات (١٩٨٦ – ٦٣ هەزار هێکتار). بەرهەمی ساڵانەشی ئەگەر لەم ژمارەیە زیاتر نەبێ، کەمتر نییە (١٩٨٦ – ٥٦ هەزار تەن). تێکڕای دەسکەوتی ساڵانەشی لە یەک هێکتاردا، لە هەندێ شوێن دەگاتە یەک هەزار کگم (١٩٨٦ – ٨٩١ کگم).

بەناوبانگترین جۆرەکانی لۆکە لە کوردستاندا، ئەمانەن: موسڵی، ژەنگاری، سابوری، کۆکەروڵت. لۆکە لە ناوەڕاستی مانگی مارس و بە درێژایی مانگی ئەپرێل دەچێندرێ، لە هاوینیشدا کۆ دەکرێتەوە.

فاکتەرە گرنگ و پێویستەکانی ڕواندن و گەشەسەندنی لۆکە، وەکوو پلەی گەرما و ئاو و خاکی بەپیت، لە گشت کوردستاندا وەکوو یەک نین، لەبەر ئەوە نێوچەکانی لۆکە چاندن، زۆر سنوور بۆ کێشراو و دیاری کراوە، تەماشای خشتەی ژمارە (٣٥) بکە.

زەوییـەکـانی پارێزگـای ئورفـە گـەورەترین نێـوچەی کـوردسـتـانە، کـە بۆ چـاندن و بەرهەمهێنانی لۆکە بەکار دەهێنرێ، پاشان پارێزگای دیاربەکر دێ. تێکڕای دەسکەوتی ساڵانەی لە یەک هێکتاردا، لە پارێزگای کەرکووک (١٩٨٥ – ١٥٩٦ کگم) و لە موسڵ (١٩٨٥ – ١٥٤٤ کگم)، لە بەرهەمی هەموو پارێزگاکانی دیکە زیاتر بوو، هۆکەش زیاتر بۆ گونجاندنی باری ئاو و هەوای نێوچەکە دەگەڕێتەوە.

**خشتەی ٣٥ زەوی تۆکراو و درویٚنەکراو و بەرهەمی سالاّنەی لۆکە، سالّی ١٩٨٥**

| پارێزگا | زەوی هەکتار چاندراو | زەوی هەکتار دروا و | بەرهەم تەن | کگم لە ١ هەکتاردا |
|---|---|---|---|---|
| ئادیەمان | ٤٢٢٨ | ٤٢٢٨ | ٣٠٢٧ | ٧٣٥ |
| دیاربەکر | ٢٤٢٨٠ | ٢٤٢٨٠ | ١٧٨٤٥ | ٧٣٥ |
| ئەلازیغ | ١٠١٥ | ١٠١٥ | ٦٣٠ | ٥٢٥ |
| گازی ئانتەب | ١١٦٩٠ | ١١٦٩٠ | ٦٥٥٠ | ٦١٢ |
| مەلاتیە | ٣٢ | ٣٢ | ١٧ | ٥٢٥ |
| مەرعەش | ٣٠٥٠٠ | ٣٠٥٠٠ | ١٧٢٩٣ | ٥٦٧ |
| ماردین | ١٤٩٥٥ | ١٤٩٥٥ | ١٠٩٩٢ | ٧٣٥ |
| سیرت | ٤٣٩٣ | ٤٣٩٣ | ٣٢٥٢ | ٧٤٠ |
| دەرسیم | ٢٥ | ٢٥ | ٢١ | ٥٢٥ |
| ئۆرفە | ٥٢١٣٠ | ٥٢١٣٠ | ٣٨٩٥٣ | ٧٣٥ |
| کرماشان | ٥١٠ | – | ٦٥٠ | ١٢٧٥ |
| کەرکووک | ٣١٥ | – | ٣٨٩٠ | ١٥٩٦ |
| دهۆک | ٢٧٥ | – | ٤٩٨ | ١٨١١ |
| هەولێر | ٣٥٥ | – | ٦٣٠ | ١٧٦٤ |
| سلێمانی | ٧١٥ | – | ٦٨٠ | ٩٥٢ |
| نەینەوا | ١١١٠ | – | ١٧١٠ | ١٥٤٤ |

**چەوەندەری شەکر**

چەوەندەری شـەکـر، لە زۆر نێـوچە لە کـوردسـتـاندا دەچێندرێ. توانای فـراوانـکـردنی پانتـایی ئەو زەوییـانەی بە چەوەندەر دەروێندرێ و زیـادکـردنی بەرهەمـهێنـان، کـەم نیـیـە، ئەگەر بێتو زیاتر بایەخ بە چاندنی بدرێ و هەمـوو ئەو گیـروگرفـتـانەی کـە دێنە پێشی، بە تایبەتی گیروگرفتە میکانییەکان چارەسەر بکرێن.

پانتـایی ئـەو زەوییـانـەی ئەورۆ بە چەوەنـدەر دەچێنـدرێ، دەگـاتە ٥٠ هـەزار هێکتـار (١٩٨٦ – ٤٧ هـەزار هـێکتـــار). بـەرهـەمـی ســـالآنـەشـی لـە دەوروبەری ١٣ هـەزار تـەن دایە(١٩٨٦ – ١١ هەزار تەن). تێکرای دەسکەوتی ســـالآنەی لـە یـەک هێکتـــار زەوی چاندراودا، نزیکەی ٢٣ هەزار کگم(١٩٨٦ – ٢٢ هەزار کگم)

لە زۆربەی نێوچەکانی کوردستاندا، توانـای بەرهەمـهێنانی چەوەنـدەر هەیە، بەڵام لە هەموو نێوچەکان زیاتر، ئەو پارێزگایانەن، کە لە خشتەی ژمارە (٣٦) دا ناوەکانیان تۆمار کراوە.

گـەورەترین کـێڵگەی چەوەندەری شـەکـر، ئێسـتـا لە پارێزگـاکـانی ئەرزەرۆم و مـوش و ئەرزنجـان و ئەلازیغ دایە. بەرهەمی ئەم نێوچانە، لە بەرهەمی هـەموو پارێزگـاکـانی دیکەی کــوردســتــان زیاترە. تێکرای دەسکەوتی ســالآنـە لە یەک هـێکتــار زەوی چاندراودا، لە نێـوچەکـانی مـەلاتییـە، ئـەلازیغ، ئەرزنجـاندا، بـە بەراوردکردن لەگـەڵ نێوچەکـانی دیکەدا، هاوتەی نەبوو، لـەم جیـاوزییـە گـەورەیەی بەرهەمـهێناندا، فـاکتـەرەکـانی ئاو و هـەوا و گڵ، ڕۆڵی سەرەکی خۆیان وازی کردووە.

**کەتان**

مەبەست لە چاندنی کەتان، زیاتر بۆ دەرهێنانی دەزووە، کە بە سـەرچاوەیەکی سـەرکی دادەنرێ، بۆ دروسکردن و چنین و دروونی جلوبەرگ و ڕایەخ و بەکرە و کندر دروسکردن و بۆ بەرهەمهێنانی کاغەز... تاد.

پانتایی هەمـوو ئەو زەوییانەی ساڵانە بە کەتـان دەچێندرێ، دەیان هەزار هێکتار دەبێ. بـەرهـەمـی ســـالآنـەشـی خـــۆی لە چـەند هـەزار تـەنێک دەدا. تێکرای دەسکـەوتـی لە یـەک هێکتاردا، دەوروبەری چەند سەد کگم دەبێ.

**خشتەی ٣٦ زەوی تۆکراو و دروێنەکراو و بەرهەمی ساڵانەی چەوەندەری شەکر، ساڵی ١٩٨٨**

| پارێزگا | زەوی هەکتار | | بەرهەم | کگم لە ١ |
|---|---|---|---|---|
| | چاندراو | درواو | تەن | هەکتاردا |
| ئادیەمان | ١٤٥ | ١٣٣ | ٢٥٨٠ | ١٩٣٩٨ |
| ئاگری | ٤١٥٣ | ٤١٥٣ | ٨٦٤٤٥ | ٢٠٨١٥ |
| بینگۆڵ | ٣٦٥ | ٣٣٢ | ٨٣٠٠ | ٢٥٠٠٠ |
| بدلیس | ٨٦٧ | ٨١٨ | ١٦٥٩٢ | ٢٠٢٨٤ |
| دیاربەکر | ١٧ | ١٧ | ١٧٢ | ١٠١١٨ |
| ئەلازیغ | ٥٢١٨ | ٥٢١٥ | ١٩٢٠١٩ | ٣٦٨٢١ |
| ئەزرنجان | ٥٦٣٤ | ٥٦٣١ | ٢٠١٣٧٢ | ٣٥٧٦١ |
| ئەرزەڕۆم | ٥٨١١ | ٥٨١١ | ١٤٠١٦١ | ٢٤١٢٠ |
| هەکاری | ٨٤ | ٦٦ | ١٠٤٠ | ١٥٧٥٨ |
| مەلاتیە | ٣٤٣٣ | ٣٤٠١ | ١٢٨٦٨١ | ٣٧٨٣٦ |
| موش | ٥٩٧٨ | ٥٧٢٥ | ١٣١٨٦٥ | ٢٣٠٣٣ |
| دەرسیم | ١٤٧ | ١٤٧ | ٤٦٩٣ | ٣١٩٢٥ |
| وان | ١٩٩٠ | ١٩٩٠ | ٥٣١٢١ | ٢٦٦٩٤ |

**بەروبوومی تۆوە ڕۆنییەکان**

پشکی بەرهەمی تۆوە ڕۆنییەکان، لە زەوی چاندراودا، لە چاو بەرهەمەکانی دیکەی کشتوکاڵدا، لە ٢٪ زیاتر نابێ. بەرهەمی ساڵانەی تۆوە ڕۆنییەکان، کە لە چەند هەزار تەنێ پێک دێ، بەتەواوی بازاڕەکانی کوردستان تێر و پڕ ناکات. لەبەر ئەو هۆیە، بۆ مسۆگەرکردنی ڕۆن، زەیت، کەرە، مارگرین، دبێ بەشی زۆری لە بازاڕەکانی دەرەوە پەیدا بکرێ و پارەیەکی زۆری پێ بدرێ.

چەشنی گڵ، ئاو و هەوا، لە فراوانبوونی پانتایی زەوی چاندراو و بەرهەمی ساڵانەدا، ڕۆڵی لەبەر چاویان گێڕاوە. پارێزگاکانی ئورفە، دیاربەکر، مەرعەش، لە ڕووی بەرهەمهێنانی تۆوە ڕۆنییەکانەوە، بە گەورەترین نێوچە دادەنرێن. بە پێچەوانەشەوە، پارێزگاکانی دەرسیم، ئاگری، هەکاری، بە کەمترین نێوچە لە قەڵەم دەدرێن. تەماشای خشتەی ژمارە (٣٧) بکە..

بەرهەمی تۆوە ڕۆنییەکان، لەم ڕووەکانە پێک دێن: دەنکی لۆکە، کونجی، گوڵەبەڕۆژە، کەتان، خەشخاش Poppy Seed، دەنکە قەنەفر، فستقی کێڵگە، فولی سۆیا... هتد. وا لە خوارەوە باسی هەندێکیان دەکەین:

**کونجی:**

مەبەست لە چاندنی کونجی، زیاتر بۆ خوادنی ڕۆژانەیە و توێکڵەکەشی وەک ئالیک، بۆ خواردنی ئاژەڵ بەکار دەهێندرێ.

پانتایی هەموو ئەو زەوییانەی ساڵانە بە کونجی دەچێندرێ، ئێستاکە دەوروبەری ٦٠ هەزار هێکتار دەبێ (١٩٨٦ – ٥٨ هەزار هێکتار). بەرهەمی ساڵانەشی نزیکەی ٢٢ هەزار تەن دەبێ (١٩٨٦ – ٢٠ هەزار تەن). تێکڕای دەسکەوت لە یەک هێکتار زەویدا، لە ٤٠٠ کگم کەمترە (١٩٨٦ – ٣٣٠ کگم). بەناوبانگترین نێوچەکانی چاندنی کونجی لە کوردستاندا:

پارێزگای ئورفە (١٩٨٦ – ٤٨ هەزار هێکتار)، دیاربەکر (١٩٨٦ – ٤ هەزار هێکتار)، ئادیەمان (١٩٨٦ – ٤ هەزار هێکتار)، بەرهەمی ساڵانەی ئورفە (١٩٨٦ – ١٤ هەزار تەن)، دیاربەکر (١٩٨٦ – ٢ هەزار تەن)، ئادیەمان (١٩٨٦ – یەک هەزار تەن)، دوو تا سێ کەڕەت لە بەرهەمی پارێزگاکانی دیکە زیاترن. تێکڕای دەسکەوت لە یەک هێکتار زەویدا دەگاتە ئەوپەڕی لە پارێزگاکانی ئەلازیغ (١٩٨٦ – ١٠٤٢ کگم)، سیرت (١٩٨٦ – ٩٥٨ کگم)، ماردین (١٩٨٦ – ٨٢٤ کگم) .

خشتەی ٣٧ **زەوی تۆکراو و درویێنەکراو و بەرهەمی سالانەی دەنکە ڕۆنییەکان، ساڵی ١٩٨٨**

| پارێزگا | زەوی هەکتار | | بەرهەم |
| --- | --- | --- | --- |
| | چاندراو | درواو | تەن |
| ئادیەمان | ٣٠٠٧ | ٣٠٠٧ | ٥٥٠٣ |
| ئاگری | ٢١ | ٢١ | ٣٢ |
| دیاربەکر | ١١٤٤٠ | ١١٤٤٠ | ٣٩٤٦٣ |
| ئەلازیغ | ١٧٢ | ١٧٢ | ١١٤٠ |
| ئەرزەڕۆم | ١٨٤٨ | ١٨٤٨ | ٣٥٩١ |
| گازی ئانتەب | ١٧٤١ | ١٧٤١ | ١١٤١٨ |
| هەکاری | ٢٣ | ٢٣ | ٣٢ |
| مەلاتیە | ٢٦٠ | ٢٦٠ | ٢٩٥ |
| مەرعەش | ٦١٢٦ | ٦١٢٦ | ٣٨٩٣٧ |
| ماردین | ١٦٥ | ١٦٥ | ١٠٦٨٦ |
| موش | ٤٦٣٦ | ٤٦٣٦ | ٦٦٦٧ |
| سیرت | ١١٥ | ١١٥ | ٥٢٩٧ |
| دەرسیم | – | – | ٣٣ |
| ئۆرفە | ٥٠٢٨٠ | ٥٠٢٨٠ | ٨١٥٣٩ |

## گوڵەبەڕۆژە

گوڵەبەڕۆژە، گەورەترین و زۆرترین بەرهەمی تۆوە ڕۆنییەکان، لە زۆربەی نێوچەکانی کوردستاندا، پێک دەهێنێ و بە شێوەیەکی بەرفراوان دەڕوێندرێ. ئەویش بە پلەی یەکەم، بۆ دەرهێنانی ڕۆن دەچێندرێ، پاشان وەک پەرژین، بۆ پاراستنی کێڵگەکانی تووتن و لۆکە لە کارتێکردن بای بەهێز، بەکار دەهێنرێ.

لەو ساڵانەی دواییدا، فەرمانگاکانی کشتوکاڵ، زیاتر بایەخیان بە چاندنی گوڵەبەڕۆژە داوە، هەوڵی فراوانکردنی پانتایی زەوی چاندراو و زیادکردنی بەرهەمیان داوە. هانی جوتیارەکان دەدەن، تا بەرهەمی تۆوە ڕۆنییەکان زیاد بکەن، بۆ ئەوەی بازاڕەکانی نێوخۆ، بە ڕۆن و چەورییەکانی دیکە دەوڵەمەند بکەن.

پانتایی زەوی چاندراو بە تۆوە ڕۆنییەکان، ئەوڕۆ خۆی لە دەیان هەزار هێکتار دەدات. (١٩٨٦ – ٣١ هەزار هێکتار)، بەرهەمی ساڵانەش لە یەک هێکتاردا، چەند هەزار تەنێ دەبێ (١٩٨٦ – ٣٠ هەزار تەن). دەسکەوت لە یەک هێکتار زەویدا دەگاتە یەک هەزار کگم (١٩٨٦ – ٩٥٦ کگم).

فراوانترین و گەورەترین کێڵگەی گوڵەبەڕۆژە، ئەوڕۆکە لە پارێزگاکانی موش (١٩٨٦ – ٥ هەزار هێکتار) و دیاربەکر (١٩٨٦ – ٦ هەزار هێکتار) و سلێمانی (١٨٨٦ – ٥ هەزار هێکتار) دان. بەرهەمی ساڵانەی پارێزگاکانی موش (١٩٨٦ – ٧ هەزار تەن) و مەرعەش (١٩٨٦ – ٦ هەزار تەن) و دیاربەکر (١٩٨٦ – ٦ هەزار تەن) و سلێمانی (١٩٨٦ – ٥ هەزار تەن) دەبێ. بەرهەمی ئەم چوار پارێزگایە، زیاتر لە دوو تا سێ بەشی، بەرهەمی هەموو نێوچەکانی کوردستان پێک دەهێنن. تێکڕای دەسکەوت لە یەک هێکتار زەویدا، لە مەرعەش (١٩٨٦ – ١,٥ هەزار کگم)، لە ئورفە (١٩٨٦ – ١,٤ هەزار کگم)، لە ئاگری (١٩٨٦ – ١,٤ هەزار کگم) دەبێ و لە تێکڕای دەسکەوت هەموو پارێزگاکانی دیکە زیاترن.

## بەروبوومی بۆندار

بەرهەمی بۆندار، لە هەندێ ڕووەکی وەکوو پیاز و سیر و پەتاتە... تاد پێک هاتووە، نزیکەی لە ١٪ گشت زەوییە چاندراوە کشتوکاڵییەکان دەگرنەوە. (١٩٨٦ – ٤٩ هەزار هێکتار). بەرهەمەکانیان بەسەر یەکەوە خۆی لە ٨٠٠ هەزار تەن دەدات (١٩٨٦ – ٧٧٠ هەزار تەن). تێکرای دەسکەوتی ساڵانەیان لە یەک هێکتار زەویدا، لە دەوروبەری ١٨ هەزار کگم دایە (١٩٨٦ – ١٦ هەزار کگم).

بەرهەمە بۆندارەکان، لە خواردنی ڕۆژانەی خەڵکیدا، بایەخێکی یەکجار زۆریان هەیە و بە شێوەیەکی فراوان بەکار دەهێنرێن، لەبەر ئەوە دانیشتووانی زۆربەی زۆری نێوچەکانی کوردستان، کەم و زۆر، ئەم ڕووەکانە دەڕوێنن، بە تایبەتی لە نێوان دێراوی باخەکاندا، یا لە سوچێکی کێڵگەکاندا دەیانچێنن.

پارێزگاکانی ئازەربایجانی غەربی، ئەرزەڕۆم، لوڕستان، لە ڕووی پانتایی زەوی چاندراو و بەرهەمی بۆندارەوە، لە پێش هەموو پارێزگاکانی دیکەوە دێن. بەرهەمی ساڵانەی ئەم پارێزگایانە، نزیکەی دوو لەسەر سێی بەرهەمی گشتیی هەموو کوردستان پێک دەهێنن. تێکرای دەسکەوتی ساڵانە لە یەک هێکتار زەویدا، لە نێوچەکانی سیرت و لوڕستان و مەرعەش، لەگەڵ بەرهەمی نێوچەکانی دیکەدا، بەراورد ناکرێ. تەماشای خشتەی ژمارە (٣٨) بکە.

## •پیاز

پیاز بە زۆری بۆ چێشت لێنان بەکار دەهێنرێ و بە کاڵیش دەخورێ، بەکارهێنانی یەکجار باوە. لەبەر ئەوە، ساڵانە زەوییەکی زۆر بۆ چاندنی پیاز، تەرخان دەکرێ (١٩٨٦ – ١٠ هەزار هێکتار). بەرهەمی ساڵانەشی دەگاتە ٢٠ هەزار تەن (١٩٨٦ – ١٧ هەزار تەن) تێکرای دەسکەوت لە یەک هێکتار زەویدا، خۆی لە ١٨ هەزار کگم دەدات (١٩٨٦ – ١٩ هەزار کگم).

پیاز توانایەکی سەیری هەیە بۆ چەکەرەکردن و سەوزبوون و گەورەبوون. ئاو و هەوای جیاواز، چەشنی خاک و بێپیزی خاکەکەی، هیچ کۆسپێ لە ڕێی چاندن و نەشونماکردنی پیازدا، دروست ناکات. لەبەر ئەوە دەبینین، بە مەبەستی دابینکردنی خواردنی ڕۆژانە و بۆ فرۆشتن، لە هەموو نێوچە جیاجیاکاندا دەچێندرێ.

لە نێوچە بەناوبانگەکانی بەرهەمهێنانی پیاز، پارێزگاکانی ئەرزنجان (١٩٨٦ – ١,٣ هەزار هێکتار)، گازی ئانتەب (١٩٨٦ – ١,٣ هەزرا هێکتار)، ئازەربایجانی غەربین

**خشتەی ٣٨ زەوی تۆکراو و درویێنەکراو و بەرهەمی ساڵانەی بۆندار، ساڵی ١٩٨٨**

| پارێزگا | زەوی هەکتار چاندراو | دروێنە | بەرهەم تەن |
|---|---|---|---|
| ئادیەمان | ١٠٩٢ | ١٠٩٢ | ٢٥٠٧٠ |
| ئاگری | ١٢٢٨ | ١٢٢٨ | ١٨٧٧٠ |
| بینگۆڵ | ٢٧٩ | ٢٧٤ | ٢٤١١ |
| بدلیس | ١٤٠٣ | ١٣٣٨ | ٢٨٤٤٦ |
| دیاربەکر | ٢٤٤٩ | ٢٤٤٩ | ٦٠٤٥٥ |
| ئەلازیغ | ٢٣٢٧ | ٢٣٢٧ | ٣٢١١١ |
| ئەزرنجان | ٣٠٥٨ | ٣٠٥٨ | ٦٠٣١٣ |
| ئەرزەڕۆم | ٧٤٨٥ | ٧٤٨٥ | ١٦٩٠٩٢ |
| گازی ئانتەب | ٣٣٩١ | ٣٣٩١ | ٧٦٣٦٤ |
| هەکاری | ٢٧٨ | ٢٦٣ | ٢٣٠٣ |
| مەلاتیە | ١٥٦٨ | ١٥٦٨ | ٢٢٣٥٩ |
| مەرعەش | ٢٠٩٩ | ٢٠٩٩ | ٣٣٥٧٩ |
| ماردین | ٧٢٢ | ٧٢٢ | ٧٨٨٩ |
| موش | ٤٩٠ | ٤٨٢ | ٥٧٢٧ |
| سیرت | ٤٧٣ | ٤٧٣ | ٨٦٠٢ |
| دەرسیم | ٤٠٦ | ٤٠٦ | ٥٨٨٢ |
| ئۆرفە | ٥٧٢ | ٥٧٢ | ٥٨٣٤ |
| وان | ١١٤٢ | ١١٣٨– | ١٩٤٤٢ |
| ئازەربایجانی غ | ١٠٨٢٤ | – | ١٣٥٤٩٢ |
| کوردستان | ٢١٠٨ | – | ٢٥٠٥٧ |
| بەختیاری | ٥٧٨ | – | ٧٨٥١ |
| ئیلام | ٧٤٩٩ | – | ١٢٩٩٢٥ |
| لورستان | ٥١٠ | – | ٢٨٤٠ |

(١٩٨٩ – يەک هەزار هێکتار). بەشێکی زۆر لە بەرهەمی ساڵانەی کوردستان، لە پارێزگاکانی گازی ئانتەب (١٩٨٦ – ٣٣ هەزار تەن)، ئەرزنجان (١٩٨٦ – ٢٨ هەزار تەن)، ئازەربایجانی غەربین (١٩٨٩ – ١٦ هەزار تەن)، دیاربەکر (١٩٨٦ – ١٣ هەزار تەن) دێتە بەرهەم. تێکڕای بەرهەم لە یەک هێکتار زەویدا، لە پارێزگاکانی گازی ئانتەب (١٩٨٦ – ٢٥ هەزار کگم)، ئەرزنجان (١٩٨٦ – ٢١ هەزار کگم)، سیرت (١٩٨٦ – ٢١ هەزار کگم)، بدلیس (١٩٨٦ – ٢١ هەزار کگم)، لە لوتکەیان تێپەڕاندووە.

## سیر

پانتایی زەوی چاندراو بە بەرهەمی سیر، لە چاو پانتایی بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی دیکەدا، زۆر کەمترە. ئەوڕۆ نزیکەی پێنج هەزار هێکتار زەوی بە سیر دەچێندرێ. (١٩٨٦ – ٣ هەزار هێکتار). هەروەها بەرهەمی ساڵانەشی، دەوروبەری ١٧ هەزار تەن دەبێ (١٩٨٦ – ١٥ هەزار تەن). تێکڕای دەسکەوت لە یەک هێکتار زەویدا، لە هەندێ ساڵدا دەگاتە ٨,٥ هەزار کگم. (١٩٨٦ – ٨ هەزار کگم).

سیر لە زۆربەی نێوچەکاندا دەچێندرێ. لە پارێزگا بەناوبانگەکان، کە بەزۆری سیری تێدا دەچێندرێ، گازی ئانتەب (١٩٨٦ – ٦ هەزار تەن)، ئەلازیغ (١٩٨٦ – ٥,٥ هەزار تەن)، ئادیەمان (١٩٨٦ – ٠,٥ هەزار تەن) و لە هەندێ شوێنی دیکەش دەچێندرێ.

## پەتاتە

پەتاتە بە مەبەستی ناردنە دەرەوە دەچێندرێ. لەم ساڵانەی دوییشدا، پەتاتە لە خواردنی ڕۆژانەی کۆمەڵانی خەڵکدا، جێگەیەکی تایبەتی بۆ خۆی داگیر کرد. لەبەر ئەوە دەبینین، زەوییە چاندراوەکان لە چاو ساڵانی پێشوودا، زۆر فراوان بوون، بە شێوەیە کە ئەوڕۆ نزیکەی خۆی لە ٣٠ هەزار هێکتار دەدا، (١٩٨٦ – ٢٤ هەزار هێکتار). بەرهەمی ساڵانەشی لە دەوروبەری ٣٧٠ هەزار تەن دایە، (١٩٨٦ – ٣٦٥ هەزار تەن). تێکڕای دەسکەوت لە یەک هێکتار زەویدا، دەگاتە ١٦ هەزار کگم.

گەورەترین نێوچەکانی چاندنی پەتاتە، خۆی لە پارێزگاکانی ئەرزەڕۆم (١٩٨٦ – ٩ هەزار هێکتار) و ئازەربایجانی غەربی (١٩٨٩ – ٤ هەزار هێکتار) و ئەلازیغ (١٩٨٦ – ٢ هەزار هێکتار) دا دەبینێ. بەرهەمی ساڵانە لە پارێزگاکانی ئەرزەڕۆم (١٩٨٦ – ١٧٧ هەزار تەن) و لە ئازەربایجانی غەربی (١٩٨٩ – ٣٩ هەزار تەن) و لە ئەلازیغ (١٩٨٦ –

٢٧ هەزار تەن) و لە ئاگری (١٩٨٦ – ٢٢ هەزار تەن) دەبێ، کە دوو لەسەر سێی، بەرهەمی گشت کوردستان پێک دەهێنن.

## دووەم: میوە - Fruits

لەگەڵ ئەوەشدا، کە هەموو فاکتەرەکانی بەرهەمهێنانی میوە لە کوردستاندا، زۆر لەبارن، کەچی هێشتا پشکی میوە لە پێکهێنانی بەرهەمی نیشتمانیدا، لە باشترین حاڵەتیدا، ناگاتە ١٠٪. ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە، ڕۆڵی لە پێکهێنانی دەرامەتی جوتیارەکاندا، دیسانەوە زۆر کەمە. هۆیەکەشی زیاتر بۆ نەبوونی ڕێگەی هاتوچۆی چاک دەگەڕێتەوە، تا جوتیارەکان بتوانن، بەرهەمی ساڵانەی خۆیان، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و لە کاتی خۆیدا، بگەیەننە بازاڕ. هەروەها نەبوونی عەماری ساردای تایبەتی، بۆ هەڵگرتنی بەرهەمەکان و فرۆشتنی لە کاتێکی دیکەدا، بە یەکێ لە هەرە گیروگرفتە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنانی میوە دادەنرێ. جگە لەوەی تاکوو ئێستا کارگەی تایبەتیمان نییە، تا هەموو ئەو بەرهەمانەی ساڵانە نافرۆشرێن و زیادن، لە قتودا هەڵبگیرێن و بخرێنە بازاڕەوە و لە کاتی زستاندا بفرۆشرێن، یاخود بۆ دەرەوەی وڵات بنێردرێن.

ژمارەی هەموو درەختە میوەدارەکان، ئێستا نزیکەی ١١٣ ملیۆن دەبێ. (١٩٨٨ – ١١٥ ملیۆن درەخت)، لەوانەش لە ٦٧٪ درەختی بەردار بوون و لە ٣٣٪ کەی دیکەشی، درەختی بێبەر بوون.

گەورەترین نێوچە، لە ڕووی ژمارەی درەختەوە، لە پارێزگای دهۆک دایە، پاشان پارێزگاکانی گازی ئانتەب و سلێمانی و هەولێر و ئورفە دێن. بەرهەمی ئەم نێوچانە هەموو پێکەوە، زیاتر لە ٥٠٪ بەرهەمی گشت کوردستان پێک دەهێنن، کە ئەوەش بۆ گونجاوی ئاو و هەوای باش و جۆری خاکەکەی دەگەڕێتەوە. تەماشای خشتەی ژمارە (٣٩) بکە.

درەختە میوەکان، بەپێی نەرمی و ڕەقی ناوکەکانیان، بەپێی ورد و درشتی و تامیان و ڕەگەزیان، بەسەر چوار دەستەی گەورەدا، دابەش دەکرێن:

١– میوەی ناوک وردی نەرم – Pome Fruits

٢– میوەی ناوک درشتی ڕەق – Stone Fruits

٣– میوەی ناوک – Nuts

٤– میوەی ترێ – Grape - like fruits

## خشتەی ٣٩ ژمارەی درەخت و بەرهەمی ساڵانەی مێوە، ساڵی ١٩٨٨

| پارێزگا | ژمارەی درەخت (هەزار) | | | بەرهەم هەزار تەن |
|---|---|---|---|---|
| | کۆ | بەبەر | بێبەر | |
| ئادیەمان | ٥٩٣٤ | ٣٧٧٥ | ٢١٥٩ | ٨٨ |
| ئاگری | ٢٢ | ٦ | ١٦ | ٠,٥ |
| بینگۆڵ | ٤٠٥ | ٢٥٨ | ١٤٧ | ٧ |
| بدلیس | ٦٨٥ | ٣١٩ | ٣٥٦ | ٨ |
| دیاربەکر | ١٧٢٦ | ١٣٦٣ | ٣٦٣ | ١٣٠ |
| ئەلازیغ | ١٦٧٣ | ١١٦١ | ٥١٢ | ٨٠ |
| ئەزرنجان | ٢١٨٣ | ١٧٢٢ | ٤٦١ | ١٠١ |
| ئەرزەڕۆم | ٨٠٧ | ٦٦٤ | ١٤٣ | ٢١ |
| گازی ئانتەب | ١٦٣٥١ | ١١٧٨٨ | ٤٥٦٣ | ٣١٨ |
| هەکاری | ٣٩٠ | ٢٣١ | ١٥٩ | ٥ |
| مەلاتیە | ٥٧٣٢ | ٤٠٨٥ | ١٦٤٧ | ٢١٥ |
| مەرعەش | ٣٢٨٦ | ٢٠٨٩ | ١١٩٧ | ١٤٤ |
| ماردین | ١٣١٦ | ٧٨٢ | ٥٣٤ | ١٦١ |
| موش | ٤٦ | ٢٢ | ٢٤ | ١ |
| سیرت | ٢١٦٦ | ١٠٠٥ | ١١٦١ | ٣١ |
| دەرسیم | ٨٥٨ | ٥١٢ | ٣٤٦ | ٢١ |
| ئۆرفە | ١٠٠١٧ | ٥٩٠١ | ٤١١٧ | ٨٣ |
| وان | ٣٩٢ | ٢٦٠ | ١٣١ | ٩ |
| نەینەوا | ٢٢٩٤ | ١٥٣٥ | ٧٥٩ | ١٧٩ |
| کەرکووک | ٢٩١٠ | ١٩٤٧ | ٩٦٣ | ١٥٦ |
| دهۆک | ٢٧٣٤٤ | ١٨٢٩٣ | ٩٠٥١ | ٤٢٥ |
| هەولێر | ١٠٩٦٥ | ٧٣٣٥ | ٣٦٣٠ | ١٨٣ |
| سلێمانی | ١١٥٥٧ | ٧٧٣٢ | ٣٨٢٥ | ١٩٤ |

## میوەی ناوک وردی نەرم

میـوەی ناوک وردی نـەرم، بریتـییـە لە هـەرمـێ، سـێـو، بەهـێ، مـوش مـەلا، یـەنگی دونیـا. ڕێژەیان نزیکەی ٢١٪ لە گشت درەخت و بەرهـەمی میوە پێک دەهێنن.

هـەرمـێ – Pears

ئـەورۆکـــە، نزیکەی ٢,٧ هـەزار دار هـەرمـێ هـەیە، (١٩٨٦ – ٢,٥ ملیـــۆن درەخت). بـەرهـەمـی ســـاڵانـەیان لـە دەوروبـەری ٨٣ هـەزار تەنـدا دەبـێ. (١٩٨٦ – ٨١ هـەزار تـەن). هـەرمێ یەکێکە لەو دارمـیـوانەی، کە لـە بـاخـچـەی زۆربەی خـەڵکیدا دەڕوێندرێ. بە تایبـەتی جوتیارەکانی نێوچە شـاخـاوییـەکان، زۆری دەڕوێنن.. هـەرمـێ زۆر جـۆری هـەیە، بەڵام هـەرە بەباوبانگەکانیان ئەمانەن: لاسوور، کرۆسی.

بەهـێ – Quences

ژمـارە و بەرهـەمی سـاڵانەی داربەهێ، لەچـاو ژمـارە و بەرهـەمی دار هـەرمێ و سـێـودا، زۆر کـەمـتـرە. لەبەر ئەوەی درەخـتی بەهـێ، ئەرکی زۆرە و درەنگ پێدەگـا و بـارودۆخـێکی تایبەتیشی بۆ ڕواندن دەوێ، لە هـەموو باخـەکاندا ناچێندرێ.

سێو – Apples

درەختی سـێو، یەکێکە لە دارمیـوە هـەرە بڵاوەکان. ئـەورۆ ژمـارەی دارسـێوەکـان ، خۆی لە ٥,٥ ملیـۆن دەدات، (١٩٨٦ – ٥ ملیـۆن). بەرهـەمی سـاڵانەی دەگـاتـە ٢,٥ ملیـۆن تـەن (١٩٨٦ – ٢,٢ ملیۆن تەن).

لەبـەر گـونجـانـی ئاو و هـەوا و جـۆری گڵ، هـەمـوو ئـەو مـەرجـە سـروشـتـیـیـانـە، بارودۆخـێکیـان سـاز کـردووە، کـە دارسـێـو ، زۆر بە ئـاسـانی بـڕوێندرێ و نەشـونما بکا و گـەورە ببێ و بەرێکی باش بدا و چـەندین جـۆری نوێش لە دەرەوە بهێندرێ و لە تەک جـۆرە خۆماڵییەکاندا بڕوێندرێ و هـەندێ جوری نوێی دیکەش، بە سـەرکەوتوویی بە بەرهـەم بێ.

ئەو جـۆرە دارسـێوانەی لە کـوردسـتـانـدا دەڕوێندرێن، وەکـوو سـێـوە لاسـوورە، سـێـوە ترشـە، سێوە ڕۆک، گۆڵدن... هتد.

موش مەلا – Medlar

لە باخچەکاندا، ژمارەیەکی کەم لە دار میوەی موش مەلا دەڕوێندرێ، کە ژمارەیەن لە چەند هەزارێ تێپەڕ ناکات. بەرهەمی ساڵانەشی خۆی لە چەند هەزار تەنێ دەدات.

یەنگی دونیا – Loquats

لە باخچەکاندا لەگەڵ دار پرتەقاڵ و سێو... هتد دا دەڕوێندرێ. ژمارەیان چەند هەزارێ دەبێ. بەرهەمی ساڵانەی لە چەند هەزار تەن تێپەڕ ناکات.

## میوەی ناوک درشتی ڕەق

ئەم دەستەیە بریتییە لە گۆیژ، بەلاڵوک، قەیسی، هەڵوژە، قۆخ، گێلاس، ڤیشنی (گێلاسی ترش) زەیتوون، قەرەنی، ڕێژەیان نزیکەی ١٨٪ی گشت دار و بەرهەمەکانی میوە، پێک دەهێنێ.

گۆیژ – Plums

دار میوەیەکی ناسراوە، ژمارە و بەرهەمی ساڵانەی چەند هەزار دانەیەک دەبێ، بەرهەمی ساڵانەشی چەند سەد تەنێ دەبێ.

بەلاڵوک – Jujbe

ئەم دار میوەیە، بە ژمارە کەمە. بەرهەمی ساڵانەی لە چەند سەد تەنێ زیاتر نابێ. بەشی زۆری بەرهەمەکەی بۆ خواردنی نێوخۆ بەکاردەهێنرێ.

هەڵوژە – Wild Apricots

یەکێکە لە دار مێوە بڵاوەکان، بە دەیان هەزار داری هەڵوژە لە باخچەکاندا چاندراون. بەرهەمی ساڵانەی خۆی لە دەیان هەزار تەن دەدا. بەشێکی ئەو بەرهەمە دەنێردرێتە بازاڕ و دەفرۆشرێ.

قەیسی – Apricots

چەند هەزار دار قەیسییەک هەیە. بەرهەمی ساڵانەی چەند سەد تەن دەبێ، بەشێکی زۆریشی بۆ دەرەوە ڕەوانە دەکرێ. دەسکەوتی ساڵانەی کەم نییە.

گێلاس – Cherris

له باخچەکانی وولاتدا، چەند هەزار دار گێلاسێ دەروێ. بەرهەمی ساڵانەی چەند سەد تەنێ دەبێ.

قەرەنی – Cornel

دار قەرەنی، له لایەن ژمارەیەکی دیاریکراو له خەڵکی، له باخچەکانیاندا دەچێندرێ. ژمارە و بەرهەمی ئەم دار میوەیە زۆر نییە.

قۆخ – Peachs

ئەورۆ نزیکەی ۷٥۰ هەزار دار قۆخ هەیە، (۱۹۸٦ – ۷۰۰ هەزار). بەرهەمی ساڵانەی نزیکەی ۲٥ هەزار تەن دەبێ،(۱۹۸٦ – ۲٥ هەزار تەن). درەختی قۆخ له درەختە میوە بڵاوەکانە. بەرهەمەکەی نەک هەر بۆ خواردن بەکار دەهێنرێ، بەڵکوو جوتیارەکان دەشیفرۆشن.

ڤیشنی (گێلاسی ترش) – Sour Cherries

ڤیشنێ له هەندێ نێوچەدا، بە مەبەستی خواردن و فرۆشتن، دەچێندرێ و دێتە بەرهەم. ژمارەی درەختەکان ، چەند هەزار دانەیک دەبێ. بەرهەمی ساڵانەشی چەند سەد تەنێ دەبێ.

ەیتون – Olive

مەبەست له ڕواندنی نەمامی زەیتون، بۆ خواردن و دەرهێنانی چەورییە. نزیکەی ۱,۷ ملیۆن داری زەیتون هەیە، (۱۹۸٦ – ۱,٥ ملیۆن درەخت). بەرهەمی ساڵانەی ٥۸ هەزار تەن کەمتر نابێ. (۱۹۸٦ – ٥,٥ هەزار تەن).

له پارێزگا بەناوبانگەکان، کە بە زۆری زەیتونی تێدا ڕواوە، له ساڵی ۱۹۸٦دا، ئەمانە بوون: گازی ئانتەب (۳٥٥ هەزار درەخت، بەرهەم – ۳۸ هەزار تەن)، مەرعەش (٥٥۰ هەزار درەخت، بەرهەم – ٦ هەزار تەن)، ماردین (۱۳۱ هەزار درەخت، بەرهەم – ۰,۸ هەزار تەن)، ئورفە (٦۰ هەزار درەخت، بەرهەم – ۰,٤ هەزار تەن)، ئادیەمان (۲۸ هەزار درەخت)، موسڵ.

## میوەی ناوک

میـوەی ناوک، بریتـییـە لە فـستـقی ئانتـەبی، گـوێز، بایەم، فندق، کـەسـتـانە. ڕێژەیان نزیکەی ٣٢٪ی گشت دارە میوە بەرهەمدارەکانی کوردستان پێک دەهێنێ.

فستقی ئانتەبی – Pistachios

میوەیەکی زۆر بڵاوە. ئەوڕۆ ژمارەی زیاد لە ٣١ ملیۆن دار فستق هـەیە. بەردارەکانیان ٥٩٪ و بێبەرەکانیان ٣١٪ پێک دەهێنن. بەرهەمی ساڵانەشی زیاد لە ١٤ ملیۆن تەن دەبێ. بەناوبانگترین پارێزگاکان، کە فستقی ئانتەبییان لێ دەڕوێندرێ، لە ساڵی ١٩٨٨دا، بریتی بوون لە: گازی ئانتەب (١٢ ملیۆن درەخت، بـەرهەم – ١١ ملیۆن تەن)، ئورفە (٩,٥ ملیۆن درەخت، بـەرهەم – ٨ ملیـۆن تەن)، ئادیەمـان (٥,٤ ملیـۆن درەخت، بەرهـەم – ٢ ملیـۆن تەن). هەروەها لە پارێزگاکانی سیرت و مەرعەشیش دەڕوێندرێ.

گوێز – Walnuts

زیاتر لە نێوچە شاخاوییەکاندا دەڕوێ، ژمارەی درەختـەکانی چەند هـەزار دار گـوێزێ دەبێ. بەرهـەمی ساڵانەی خۆی لە چەند ملیۆن گوێز دەدات.

بایەم – Almonds

لە زۆربەی نێوچـەکاندا دەڕوێ، بە تایبەتی لـە نێوچە فێنکەکاندا، زۆر بە باشـی دەڕوێ. ژمارەی درەختەکانی بە چەند هەزار دار بایەمێ دادەنرێ. بەرهەمی ساڵانەشی چەند سەد تەنێ دەبێ.

فندق – H azelnuts

ژمـارەی درەخـتـەکانـی لە چەند هەزار دارێ تێپـەڕ ناکات. بەرهەمی ساڵانەی بە دەیان هەزار تەن لە قەڵەم دەدرێ. زیاتر لە نێوچە شاخاوییەکاندا دەڕوێندرێ.

کەستانە – Chestnuts

ژمـارەیەکی زۆر کـەم لە داری کـەسـتـانە هـەیە، نزیکەی دوو هـەزار یاخـود کـەمـتـر دەبێ. بەرهـەمی ساڵانەی دەیان تەن دەبێ. لە ساڵی ١٩٨٨دا، بەناوبـانگترین نێوچـەی کەستـانە، پارێزگای بدلیس بوو.

## میوەی ترێ

ژمارەی دار مێوەکان، بەرهەمی ساڵانەی ئەم بەرهەمە، دوو تا سێ کەڕەت لە ژمارەی درەخت و بەرهەمی ساڵانەی، هەر سێ دەستەکەی پێشوو زیاترە. میوەکانی ئەم دەستەیە، لە هەنجیر و هەنار و ترێ و مۆز و خورمای تەرابزۆنی و Carobs و Mulberry و Strawberries پێک هاتووە. ڕێژەیان نزیکەی لە ٢٩٪ی گشت درەخت و بەرهەمی میوەی کوردستان دەبێ.

دارمێو – Grapes

بە بڵاوترین داری بەرهەمدار دادەنرێ. ژمارەی هەموو دارمێوەکان، زیاتر لە ١,٢ ملیۆن دەبێ. بەرهەمی ساڵانەی دەگاتە ٥٠٠ هەزار تەن. چەشنەکانی ترێ لە کوردستاندا ئەمانەن: تایەفی، گوار، زێڕین، شێخ نوورەدین، تولی، خۆشناو، پەسیرانی، سپی هاوینی، سپی پایزی، ڕەشۆکی، ئاویلکە، ڕەشمیریی، چومیلکە، حەوتبەر، کشمیشی، حوسێنی، خەلیلی، تولخی و گەلیکی دیکەش.

هەنار – Pome granates

دوای ترێ، لە ڕووی ژمارەی درەختی چێندراو و بەرهەمی ساڵانەوە، دار هەنار دێ. دار هەنار لە هەموو نێوچەکانی کوردستاندا دەچێندرێ و بەردەدات. هەنار زیاتر لە دار میوەکانی دیکە، بەرگەی سەرما دەگرێ و خۆی لەبەر گۆڕانی پلەی سەرما و گەرمادا ڕادەگرێ. بەهای خواردەمەنی زۆرە. گەڵاکانی بۆ پێستەخۆشکردن و ڕەنگکردن بەکار دەهێنرێ.

هەنجیر – Figs

ژمارەی دار هەنجیرەکان و بەرهەمی ساڵانەی، لە هەردوو دار میوەکانی پێشوو کەمترە. بەڵام بەهای خواردەمەنی لەوان کەمتر نییە. بەناوبانگترین پارێزگاکانی کوردستان، کە لە ساڵی ١٩٨٨دا بە هەنجیر چاندرا بوون، ئەمانەن: ماردین (٢٥ هەزان درەخت، بەرهەم – ١٤٨ هەزار تەن)، دیاربەکر (٢٢ هەزار درەخت، بەرهەم – ١١٦ هەزار تەن)، ئادیەمان (١٧ هەزار درەخت، بەرهەم – ٧٧ هەزار تەن)، ئورفە (٢٠ هەزار درەخت، بەرهەم – ٧٢ هەزار تەن).

## سێیەم: ڕووەکی ئالیک Fodder Crops

ڕووەکی ئالیک وەکوو گەنمەشامی، وێنجە – Alfalfa، ساین فوین – Sainfoin. ئەم ڕووەکانە بە مەبەستی دابینکردنی ئالیک بۆ ئاژەڵە جۆربەجۆرەکانی بە لەش گەورە و شیردەری وەکوو چێڵ، گامێش دەڕوێندرێ. هەروەها بۆ دابەستن و قەڵەوکردنی مەڕ و مالاتیش، لە ڕۆژە ساردەکانی زستاندا بەکار دەهێنرێ.

پانتایی ئەو زەوییانەی بەم جۆرە بەرهەمانە دەچێندرێن، خۆی لە ٤٠٠ هەزار هێکتار دەدا، (١٩٨٦ – ٣٦٤ هەزار هێکتار). بەرهەمی ساڵانەی دەگاتە ٢,٥ ملیۆن تەن، (١٩٨٦ – ٢ ملیۆن تەن). تێکڕای دەسکەوتی ساڵانەی لە یەک هێکتار زەویدا، دەوروبەری شەش هەزار کگم دەبێ، (١٩٨٦ – ٥,٥ هەزار کگم).

ڕووەکی ئالیکی لە زۆربەی نێوچەکان دەچێندرێ. پانتایی ئەو زەوییانەی بە بەروبوومی ئالیک، لە پارێزگاکاندا چێندراوە، وەکوو ئازەربایجانی غەربی (١٩٨٩ – ١٠٦ هەزار هێکتار)، کوردستان (١٩٨٩ – ٦١ هەزار هێکتار)، ئەرزەڕۆم (١٩٨٦ – ٤٧ هەزار هێکتار)، لە بەرهەمی پارێزگاکانی دیکە زۆرتر بوون.

بەرهەمی ساڵانەی پارێزگاکانی ئەرزەڕۆم (١٩٨٦ – ٦٨٥ هەزار تەن) و لورستان (١٩٨٩ – ١٣٨ هەزار تەن) و بەختیاری (١٩٨٩ – ١٣٤ هەزار تەن) و کوردستان (١٩٨٩ – ١٣٣ هەزار تەن) بوون، کە بەشی هەرە زۆری بەرهەم پێک دەهێنن.

تێکڕای دەسکەوتی ساڵانە لە یەک هێکتار زەویدا، لە گازی ئانتەب (١٩٨٦ – ٥٠ هەزار کگم) و لە مەلاتییە (١٩٨٦ – ٢٣ هەزار کگم) و لە ماردین (١٩٨٦ – ١٩ هەزار تەن) بوون، کە دوو تا سێ ئەوەندەی بەرهەمی پارێزگاکانی دیکە زیاتر بوون.

## چوارەم: بەروبوومی سەوزە - Vegetables

بەروبوومی سەوزە لەو جۆرە ڕووەکانەیە، کە هەمیشە پێویستی بە ئاودان و بژارکردن و دەرمان پێوەکردن و پاککردنەوە و بڕین و ڕنین و قرتاندن هەیە. هەروەها پێویستی بەوە هەیە کە بەزوویی بگەیەندرێتە بازاڕ. هەتا ئەو کارانە هەمووی لە کاتی خۆیدا بکرێن، ئەوا دەسکەوتی جوتیارەکان زیاتر دەبێ.

سەوزە نرخی خواردەمەنی زۆر بەرزە و گەلێ دەوڵەمەندە. لە سەوزەدا چەندین جۆر ڤیتامین هەیە. مادەیەکی زۆری وەکوو: نەشە و شەکر و چەوری و پرۆتینێ تێدایە، کە بۆ لەش زۆر پێویستن، بۆ ئەوەی بەربەرەکانی ئەو میکرۆبانە بکات، کە تووشی دەبێ و کەمتر تووشی نەخۆشی ببێ.

خواردنی سـەوزە بە کاڵی یا چێشتی لێ دروست بکرێ، لەبەر ئەوەی ئێستا بەهای سەوزە بە چاکی دەزانرێ، چ لە گوندەکان و چ لە نێو شارەکاندا، لەم ساڵانەی دواییدا، وەک شتێکی ڕۆژانەی لێ هاتووە. جگە لەوەی نرخی سەوزە، لە چاو بەرهەمەکانی دیکەدا هەرزانترە.

پانتایی هەموو ئەو زەوییانەی ئەورۆ، بە بەروبوومی سەوزە چاندراون، لە ١٥٠ هەزار هێکتار تێدەپەڕێ، (١٩٨٦ – ١٤٠ هەزار هێکتار). بەرهەمی ساڵانەی لە ٢,٥ ملیۆن تەن نزیک دەبێتەوە، (١٩٨٦ – ٢ ملیۆن تەن). تێکڕای دەسکەوت لە یەک هێکتار زەویدا، دەگاتە ١٦ هەزار کگم. (١٩٨٦ – ١٥ هەزار کگم).

سەوزە لە ڕووی گەڵا و دەنک و بۆنەوە، بەسەر ٤ دەستەدا دابەش دەکرێن:

١) سەوزەی گەڵا – Leafy or sten vegetables

٢) سەوزەی پاقلە – Laguminous vegetables

٣) سەوزەی میوە ـ Fruit bearing vegetables

٤) سەوزەی سەلک – Root, buld and tuberous vegetables

## سەوزەی گەڵا:

بەرهەمەکانی ئەم دەستەیە بریتییە لە: لەهانە، (سەلک و گەڵا)، سلْق، پیاز، کەرەوز، کەوەر، سپیناغ، Garden orach , Leaf lettuce, Artichokes Purslan, Head lettuce. پانتایی بەروبوومی هەموو زەوییە چێندراوەکان بەم بەرهەمانە، ئەورۆکە نزیکەی لە ٣٪ی گشت زەوییە چاندراوەکانی دیکە بە سەوزە دەبێ. بەرهەمی ساڵانەشی، خۆی لە چەند هەزار تەنێک دەدات.

## سەوزەی پاقلە:

بریتییە لە فاسۆلیای تەڕ، بەزالیا، پاقلەی تەڕ، گاگۆز – Calavence. پانتایی زەوی چێندرا و و بەرهەمەی ساڵانەی زیاتر لە ٣٪ی گشت بەرهەمەکانی سەوزەی دیکە دەبێ.

## سەوزەی میوە:

پانتایی زەوی چاندراو بە کاڵەک، شوتی، کولەکە، خەیار، بامێ، باینجان، تەماتە، بیبەر (Stuff pepper , Green pepper)، Pumpkins، زیاترە لە ٩٥٪ی گشت زەوییە چاندراوەکان بە بەروبوومی سەوزە. بەرهەمی ساڵانەی چەندین هەزار تەن دەبێ.

دەسکەوتی ساڵانەی جوتیارەکان لە یەک هێکتار زەویدا، لە بەروبوومی سەوزە دەگاتە سەدان دینار، بۆیە جوتیارەکان بە تایبەتی لە نزیکی شارەکاندا، بایەخێکی زۆر بە چاندنی سەوزە دەدەن و کاتێکی زۆریشی بۆ تەرخان دەکەن.

## کاڵەک:

لە کوردستاندا سەوزە میوەیەکی زۆر بڵاوە، لە پانتایی زەوی و بەرهەمی ساڵانەدا، دوای شوتی دێ. بەناوباگگترین جۆرەکانی کاڵەک ئەمانەن: چەپ (قورسایی لە ٥ – ١٠ کگم)، کولاهیل (قورسایی لە ١٠ – ١٥ کگم)، ئاسمە (قورسایی لە ٤ – ٨ کگم)، مەلاکۆیی (قورسایی لە ٤ – ٨ کگم)، باجی (قورسایی لە ١ – ١٠ کگم). کاڵەک هەندێکیان بە دێم و هەندێکی دیکەشیان بە بەراو دەچێندرێ.

## شوتی:

شوتی لە ڕووی پانتایی زەوی چێندراو و بەرهەمی ساڵانەوە، بە گەورەترین سەوزەی میوە دادەنرێ. بەناوبانگترین جۆرەکانی شوتی ئەمانەن: سورمە (قورسایی ٨کگم)، فەریق پاشا (قورسایی لە ٤ – ١٠ کگم)، یافا (قورسایی لە ٤ – ١٠ کگم)، ڕەش (قورسایی لە ١٠ – ١٥ کگم)، قەلاچە (قورسایی لە ٥ – ١٠ کگم)، حەمەدەمینی (قورسایی لە ٤ – ١٠ کگم)، گعێتلی.

## تەماتە:

سەوزە میوەیەکی زۆر بڵاوە. لە هاویناندا خواردنێکی سەرەکییە. پانتایی زەوی چاندراو و بەرهەمی ساڵانەی، چەند هەزار تەنێ دەبێ.

## سەوزەی سەلک:

بەرهەمەکانی ئەم دەستەیە لەمانە پێک هاتوون: سیر، پیاز، گوێزەر، توری سوور و سپی، Hors rahish ، Jerusalem artichoker. لە کوردستاندا، ساڵی سەدان هێکتار زەوی بە سەوزە دەچێندرێ. بە سەدان تەنیش دێتە بەرهەم.

## ٠٣ گیروگرفتەکانی کشتوکاڵ

### یەکەم: گیروگرفتی سروشتی

- **کاتی پەڵەدان**: زۆربەی بەروبوومی کشتوکاڵی لە کوردستاندا، بە شێوەی دێم دەروێندرێ، لەبەر ئەوە پەڵەدان لە کاتی پێویستی خۆیدا، یەکێ لە گیروگرفتە سەرەکییەکان پێک دەهێنێ. جاری وا هەیە، باران پێش کاتی خۆی دەبارێ، دەغڵودان بە تەواوی سەوز دەبێ، لە دوییدا باران دەبڕێ، یاخود باران نابارێ هەتا کاتێکی درەنگ و لە پاشا دەبارێ، بەڵام کاتی گەشەکردن و نەشونماکردنی ڕووەکەکان بەسەرچووە، بۆیە دەغڵودانەکە بە تەواوی فریا ناکەوێ، شیر لە گوڵەکانیدا دروست بکا و تا لەپڕ کاتی دروێنەکردن دێ. یاخود بارانێکی زیاد لە پێویست دەبارێ و دەغڵودانەکە تووشی نەخۆشی ژەنگهەڵهێنان دەبێ، کە هێشتا کاتی گوڵکردنی نەهاتووە. ئەمانە هەموویان پێکەوە، کار لە کەم و زۆری بەرهەمی ساڵانەی بەروبوومی کشتوکاڵ دەکەن.

گیروگرفتی کاتی پەڵەدان و زۆر و کەمی باران، بە تەواوی سەرنجی دەوڵەتی ڕاکێشاوە. بۆ چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتە گەورەیەش، چەندین ئاوبەند لەسەر ڕووبارەکان دروست کراون. بەڵام هەندێکیان سوودێکی ئەوتۆیان نەبووە، لەبەر ئەوەی لە شوێنێکدا دروست کراوە، یا زەوی کشتوکاڵی لێ کەمە، یاخود لە نێوچە شاخاوییەکاندا دروست کراون. بۆ دابینکردنی ئاو بۆ بەرهەمە کشتوکاڵییەکان، پێویستی بە پرۆژەی ئاوی پچوک هەیە، وەک لە هی گەورە.

- **کەمئاوی لە هاویندا**: لەبەر ئەوەی باران لە هاویندا لە کوردستاندا نابارێ، ئاو لە هاویندا لە چاو زستاندا کەمترە. کەمی ئاوبەند و پرۆژەی ئاو بە تایبەتی پرۆژەی گچکە و ڕۆچوونی ئاوی ژێر زەوی، ئەمانەش دیسانەوە بە هۆی سەرەکی کەمئاوی لە هاویندا دادەنرێن. کەمی ئاو بۆتە هۆی تەنگبوونەوەی پانتایی زەویی بەراو. ئێستا ڕێژەیان لە ١٥٪ی گشت زەوییە چاندراوەکان زیاتر نییە. ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە، بۆتە هۆی کەمکردنەوەی بەرهەمی کشتوکاڵە هاوینییەکان.

توانای زیادکردنی ڕێژەی پانتایی زەوی کشتوکاڵی بەراو و بەرهەمی کشتوکاڵی هاوینە لە کوردستاندا زۆرە، ئەگەر بێتو پرۆژەی ئاو، ئاوبەند، کەناڵی ئاو، بەکارهێنانی ئامرازی پرژاندن... زیاد بکرێ.

- **نەخۆشیی ڕووەک**: بەروبوومی کشتوکاڵ، تووشی چەندین نەخۆشی سروشتی دەبن، کە لە ئەنجامدا، بەشێ یا هەموو بەرهەمی ساڵەکە دەفەوتێ. ئەمەش لە لایەکەوە بە دەوری خۆی، کار لە ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی جوتیارەکان دەکا و لە لایەکی دیکەشەوە، کار لە بۆدجەی ساڵانەی دەوڵەت دەکات. گرنگترین نەخۆشییەکانیش ئەمانن:

ژەنگ: ژەنگی دەریایی، مەراکیشی، مامەلی، بە سامناکترین نەخۆشی دەغڵودان دادەنرێن. بارانبارینی ناوەخت، بە گەورەترین هۆی پەیدابوونی ئەم نەخۆشییە زانراوە. نەخۆشی ژەنگ نەک هەر بە تەنیا تووشی دەغلودان دەبێ، بەڵکوو تووشی چەوەندەر و لۆکە و گەنمەشامی و میوەش دەبێ.

مێشومەگەزی زیانبەخش: زیانی ئەم جانەوەرانە لە بەرهەمی کشتوکاڵ، لە زیانی نەخۆشی ژەنگ کەمتر نییە. ئەم جانەوەرانەش دوو جۆرن:

٠١ ئافات: وەکوو ئەسپێی واوی سێو، ئەسپێی ئاسیایی هەڵوژە، گەنە (جاوەلۆکە)، کرمی سێو، مێشولەی گێلاس، مێشی بایەم خۆر، ترترە، گرم.

٠٢ بیماری: دۆکەی مێو، دۆکەی هەڵوژە، گەلاپێچە، قارچی (کوارک)، ڕەگ ڕزین، خاڵەڕەشەی سێو، خاڵە زەردەی بایەم.

٠٣ ئافاتی دیکە: کلۆی مەراکیشی و خۆولانی، مشکەکوێرە، سونەی گەنم، مڵە، ترترە، سیسکە، مێشەپیاز، مێشەشیناوەرد، کاردینای نۆک و ێنجە و چەوەندەر، کرمی بڕکبڕ، کرمی ڕیشەخۆر، شەیتانۆکە، ئەسپێی چەوەندەر، دۆکەی سپی توتن، گەلاڕزیوە، دۆکەی گوڵەبەڕۆژە، دۆکەی بێستان، دۆکەی پەتاتە. بڕکە مردە.

دەوڵەت لە ڕێی دەزگاکانی کشتوکاڵەوە، هەوڵی کەمکردنەوە و لەنێوبردنی نەخۆشییە جۆربەجۆرەکانی کشتوکاڵی داوە. بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش، بە دابەشکردن و فرۆشتنی دەرمانی قەلاچۆکردنی نەخۆشی و جانەوەرەکان هەستاوە. بە سەدان تەن دەرمانی کیمیاوی جۆراوجۆری، بەسەر جوتیارەکاندا دابەش کردووە.

- جوتیاری بێزەوی:

بەشێکی زۆر لە جوتیارەکان بێزەوین. ئەورۆ ڕێژەی ئەو جوتیارانەی کە خاوەنی زەوی تایبەتی خۆیان نین، لە ٤٠٪ هەموو ئەو جوتیارانە پێک دەهێنن، کە ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، پەیوەندییان بە کاری کشتوکاڵییەوە هەیە. ئەم بارودۆخەش، لە ئەنجامی پرۆسەیەکی مێژوویی و ئابووریی و ڕامیاریی و کۆمەڵایەتیدا، هاتۆتە کایەوە.

بەرزترین ڕێژەی جوتیارە بێزەوییاکان، دەکەوێتە پارێزگاکانی بدلیس (١٩٨١ – ٥٨٪)، موش (١٩٨١ – ٥٤٪)، هەکاری (١٩٨١ – ٤٦٪)، دیاربەکر (١٩٨١ – ٤٥٪)... تاد.

هەروەکوو لەمەوپێش بە درێژی لێی دواین، دەوڵەت لە ساڵی ١٩٤٣دا، یەکەمین یاسای چارەسەرکردنی کشتوکاڵی دەرکردووە، ئەویش بۆ دابەشکردنی زەوی بوو، بەسەر جوتیارەکاندا و تا لەو ڕێیەوە، بەرهەمی ساڵانەی خۆیان زیاد بکەن.

- بەکارهێنانی کەرەسەی کۆن:

بەکارهێنانی کەرەسەی کۆن، بە شێوەیەکی بەردەوام و بۆ ماوەیەکی دور و درێژ، وەکوو کەرەسەکانی هەوجارِ، گاسن، داس، جەنجەر، لە کاروباری کشتوکاڵیدا، توانای بە ئەنجامدانی ئەم کەرەسانە، لەچاو کەرەسەی نوێ و مەکینەکانی سەردەمدا، زۆر زۆر کەمترە.بۆ نموونە، توانای جووتکردنی جووتە هێسترێک، بە درێژایی یەک ڕۆژ، بە بەراوردکردن لەگەڵ توانای یەک کاژمێر جووتکردنی تراکتۆرێکدا، زۆر کەمترە. هەروەها دروێنەکردنی پارچە زەوییەکی دیاریکراو، لە لایەن پێنج سەپانەوە بە داس، لە ماوەی دە کاتژێردا، لەچاو دروێنەکردنی هەمان پارچە زەویدا، ناگاتە ١٪ی دروێنەکردن بە کۆمباین، لە ماوەی دە چرکەدا و هەرگیز بەراوردیش ناکرێ. هەروەها خەرمان کوتاندنێ، ئەگەر بە جەنجەرِ و وڵاخ پێویستی بە مانگێ هەبێ، ئەوا هەمان خەرمان، بە مەکینە لە ماوەی نیو کاتژێردا، دەکوترێ و تەواو دەبێ.

- کەمی مەکینەی کشتوکاڵی نوێ:

ئێستا لە کوردستاندا، نزیکەی ٦٨ جۆر مەکینەی جۆراوجۆری کشتوکاڵی، وەکوو مەکینەی کێڵان و وردکردنی کەرسەک و نەرمکردنی خۆڵ، تۆو چاندن، ئاودان، دروێنەکردن، گواستنەوە، تەتەڵەکردن، داکردن، مەکینەی دەرمان پرژاندن... هتد بەکار

دەهێنرێ، کـە ژمـارەیان لە دەیان هـەزار دانە تێپـەڕ دەکـات، (١٩٨٨ – ١٠٠ هـەزار دانە). بەڵام بەگوێرەی پێویستی کێڵگەکانی کوردستان، ئەو ژمـارەیە هێشتا هـەر کەمـە، نێوچەی واش هـەیە، کە هێشتا دەستی مەکینەی نەگەیشتۆتێ.

پارێزگـاکـانی ئـەرزەڕۆم و ئورفـە و مـەرعـەش، لە ڕووی ژمـارەی کـەرەسـەی تازەی کشـتوکاڵەوە، بە دەوڵەمـەندترین پارێزگـاکانی کـوردسـتـان دادەنرێن. بەڵام پـارێزگـاکـانی ئیـلام، کـوردسـتـان، ئازەربـایجـانی غـەربـی، بە هـەژارتـرینیـان لە قـەڵەم دەدرێن. تەمـاشـای خشتەی ژمارە (٤٠) بکە.

**خشتەی ٤٠ ژمارەی کەرەستە کشتوکاڵییەکان، ساڵی ١٩٨٨**

| پارێزگا | کەرەستە | پارێزگا | کەرەستە |
|---|---|---|---|
| ئادیەمان | ٣٨٣٦٠ | مەرعەش | ٦٠٦٥١ |
| ئاگری | ٤٣٩٢١ | ماردین | ٧٩٢٣٩ |
| بینگۆڵ | ٢٢٨٤٦ | موش | ٥٧٧٣٨ |
| بدلیس | ١٣١٨٢ | سیرت | ٢٤٤١٥ |
| دیاربەکر | ٥٠٦٢٩ | دەرسیم | ١٨٣٧٢ |
| ئەلازیغ | ٣٤٥٣٧ | ئۆرفە | ٦٣٣٣٢ |
| ئەزرنجان | ٦٠١٧٧ | وان | ٢٧٢٧٩ |
| ئەرزەڕۆم | ١٠٨٢١٠ | ئازەربایجانی غ | ١٧٦٤ |
| گازی ئانتەب | ٥٠٦٩٨ | کوردستان | ٤٠٦ |
| هەکاری | ٢٣١٤٠ | لورستان | ٢٦٣٠ |
| مەلاتیە | ٤٦٠٣٦ | ئیلام | ٥٥٦ |

### – خراپی ڕێگەوبان:

ڕێگەوبان یەکێکە لە هۆکارە گرنگەکانی پێشخستنی کشتوکاڵ، چونکە، هەرچەندە ڕێگەوبان زۆر بن و خۆش بن، ئەوەندە زووتر و زیاتر دەتوانرێ، بەرهەمە کشتوکاڵ بگەیەندرێتە بازاڕ و نرخی گواستنەوەشی کەمتر ببێتەوە. بەڵام ڕێگەوبانی زۆر و چاک لە کوردستاندا زۆر کەمن. لەبەر ئەوە دەبینین، هەموو ساڵێ بەشێکی زۆر لە بەرهەمی کشتوکاڵی، بە تایبەتی ئەو بەرهەمانەی زوو تێک دەچن و خۆیان لە هەفتەیەک زیاتر ڕاناگرن و دەڕزێن، لە ئەنجامدا لە داهاتی ساڵانەی بەروبوومەکە کەم دەکاتەوە و کارێکی خراپ لە دەسکەوتی ساڵانەی جوتیارەکان دەکات. هەروەها کارێکی خراپیش لە بەرز و نزمی نرخی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان دەکا، کاتێ بەرهەمێکی کەم دەخەنە بازاڕەوە، داواکاری لەسەر زیاد دەبێ، بەو پێیە نرخ بەرز دەبێتەوە.

### – گیروگرفتی هەڵگرتن و پاشەکەوتکردن:

زۆربەی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان، بە تایبەتی میوە، سەوزە، بەشی هەرە زۆریان لە هاویناندا دەخورێن، ئەوەی کە دەشمێنێتەوە، یاخود ئەوەتا دەگوشرێ و هەڵدەگیرێ، وەکوو تەماتە و دۆشاوی تەماتەی لێ دروست دەکرێ، یاخود وشک دەکرێتەوە و هەڵدەگیرێ، وەکوو ترێ.بەڵام ناتواندرێ، زۆربەی بەروبوومەکانی کشتوکاڵی بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و زانستانە هەڵبگیرێ، تا لە کاتی پایز و زستاندا بەکار بهێندرێن، چونکە عەماری گەورە و ژووری سارد و یەخچاڵی گەورد، لە کوردستاندا زۆر کەمن.

### – ئاڵوگۆڕکێ و گۆڕاندن:

ئەوڕۆ ڕێژەی هەموو ئەو کرێکارانەی لە بواری کشتوکاڵدا کار دەکەن، لە ڕێژەی هەموو ئەو کارگەرانەی لە بوارە جیاجیاکانی دیکەی بەشەکانی ئابووریدا کار دەکەن، زیاترە (١٩٨٦ – ٥٦٪). لە ڕاستیدا، ئەم ڕێژەیە گەلێکی لە پێویستییەکانی کاروباری بەرهەمهێنانی کێڵگە زیاترە. بۆیە جۆرێ لە کرێکاری بێکاری شاراوە، لە بەشی کشتوکاڵدا دروست دەکا، ئەمە لە لایەک و لە لایەکی دیکەشەوە، بێکارییەکی زۆر لە نێو کرێکارە کشتوکاڵییە ڕاستەقینەکاندا دەخولقێنێ، بە شێوەیە وایان لێ دەکا، کە بۆ پاروویە نان، ڕوو لە شارەکان بکەن و بە دوای کاردا بگەڕێن، بە تایبەتی لە پایز و زستاندا. بەو شێوەیە ژمارەی بێکارەکان لە شارەکاندا زیاد دەکا. لە کاتێکیشدا کە ئەم کرێکارە بێکارانە، لە شارەکاندا کار دەدۆزنەوە، یەکەم لەسەر حیسابی کرێکاری بێکاری

شارەکان دەیدۆزنەوە، دووەم بە نرخێکی هەرزان کار دەکەن و نرخی کاتژێری کار دێتە خوارەوە، کە هەموو ئەمانەش بە شێوەیکی گشتی، زیانێکی گەورە لە ژیانی کرێکارانی شارەکان و ئابووری وولات دەدەن.

**- بەکارهێنانی سیستەمی بەیار:**

جوتیاران، سالانە زەویی کشتوکاڵی دەکەنە دوو بەشەوە، بەشی هەرە زۆری (٩٧ ٪)، بە بەرهەمی کشتوکاڵی جۆراوجۆر دەچێندرێ. بەشەکەی دیکەشی (٣ ٪)، بە چۆڵی بەجێ دەهێڵن، کە پێی دەوترێ زەوی بەیار. بە بڕوای جوتیارەکان، ئەم زەوییە بۆیە ناچێنن، تاکوو بەهێز و بەپیت ببێتەوە و لە ساڵی داهاتوودا، بە بە رهەمێکی دیکە تۆوی بکەن، تا بەرهەمێکی باش بەدەستەوە بدا. ئەوە جگە لەوەی جوتیارەکانی کوردستان، توانای مادی تەواویان نییە، هەتا هەموو ساڵێ، هەموو زەوییەکانی خۆیان بکێڵن و تۆوی کەن و دروێنەی کەن.

**- بەکارنەهێنانی پەین:**

بەکارنەهێنانی پەین، بەتایبەتی پەینی کیمیاوی لە کێڵگەکاندا، بە بەراوردکردن لەگەڵ پانتایی هەموو ئەو زەوییانەی، سالانە بە بەرهەمی کشتوکاڵی جۆربەجۆر دەچێندرێ، یەکجار کەمە. لەبەر ئەوەی زۆربەی زۆری جوتیاران، نەخوێندەوار و نەزانن، زانیارییان دەربارەی زۆر شتی نوێ نییە، بەکارهێنانی پەینی کیمیاوی، بەکارێکی زیاد و بە خەرجییەکی لاوەکی دادەنێن، جگە لەوەی ئەگەر کەڵکی بەکارهێنانی پەینی کیمیاویش بزانن و بیانەوێ بەکاری بهێنن، زۆربەیان دەستیان کورتە و ناتوانن پەینێکی زۆر بکڕن و لەگەڵ زەوییەکانیاندا تێکەڵی بکەن. هەروەها ناتوانن، زەوییەکانیان بە ڕیخی ئاژەڵ پەین بکەن، چونکە جوتیارەکان تەپاڵە، زیاتر بۆ ئاگرکردنەوە و چێشتلێنان و نان کردن بەکار دەهێنن. بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا، لە ئەنجامی فێربوون و بڵاوبوونەوەی زانیاریی کشتوکاڵیدا، بیر و بۆچوون و هەڵوێستی خۆیان گۆڕیوە و زۆربەیان گەیشتوونەتە ئەو بڕوایە، کە بەکارهێنانی پەین، کارێکی باش و پێویستە، بۆیە ئەورۆ پەینی کیمیاوی، لە لایەن جوتیارەکانەوە بەکاردەهێنرێ، بە تایبەتی ئەو جوتیارانەی زەوییەکانیان، بە بەروبوومی کێڵگەی پیشەسازی دەچێنن. بۆ نموونە، ساڵی ١٩٨٩ جوتیارەکانی پارێزگای کوردستان نۆ هەزار تەن پەینی کیمیاویان کڕێ و کردیان بە زەوییەکانیانەوە. هەروەها لە بەختیاری – ١٤ هەزار تەن و لە لوڕستان – ٣٦ هەزار تەن و لە ئیلامیش ــ ٧ هەزار تەن.

**– چەشنی تۆو:**

جۆری ئەو تۆوانەی لە چاندنی زەوییە کشتوکاڵییەکاندا بەکار دەهێنرێ، لە زیاد و کەمکردنی بەروبوومی کشتوکاڵ و دەسکەوتی ساڵانەی جوتیارەکاندا، ڕۆڵێکی زۆر گرنگ وازی دەکا. هەرچەندە تۆوەکە خاوێن بێ، شۆرابێتەوە، لە نەخۆشییەوە بە دوور بێ، نوێ بێ، ئەوەندە زیاتر بەرهەم دەدا و بە پێچەوانەشەوە.

جوتیاران، هەموو ساڵێ بەشێک لە بەرهەمەکانیان، بۆ تۆوکردن تەرخان دەکەن، تا لە ساڵی داهاتوودا، بۆ چاندن بەکاری بهێنن. لە کاتێکدا ئەوان بەو کارە هەڵدەستن، بەبێ ئەوەی گوێ بە چاکی و خراپی بەرهەمەکەیان بدەن، یاخود بزانن تۆوەکەیان پاکە یا نەخۆشە، تا بەرهەمەکانی ساڵی ئایندەیان، تووشی نەخۆشی نەبن. هەندێ جاریش یەکسەر لە بازاڕەکان دەیکڕن و زەوییەکەی خۆیانی پێ تۆو دەکەن.

لەو ساڵانەی دواییدا، دەزگاکانی کشتوکاڵ، تۆوی هەمەجۆرەی خاوێن و شۆراوەی، بە جوتیارەکان دەفرۆشت، هەندێ جاریش بۆ تاقیکردنەوە و هاندانی جوتیارەکان، بە خۆڕایی بەسەریاندا، دابەشیان دەکرد.

**– چاندنی یەک بەرهەم:**

زۆربەی زۆری جوتیارەکان، ساڵی یەک جار زەوییەکانیان دەچێنن و بەرهەمەکانیان هەڵدەگرن. ئەمەش زیاتر بۆ هەندێ هۆی وەکوو ڕاهاتن و فریانەکەوتن و کەمی زەویی و نەبوونی ئاوی پێویست و مەرجەکانی چاندن و گەورەبوونی ڕووەکەکان دەگەڕێتەوە. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی، کە دەسکەوت و دەرامەتی ساڵانەی جوتیارەکان، لە سنوورێکی دیاریکراودا چەق ببەستێ و زیاد نەکات. بۆ ئەوەی جوتیارەکان لە دەست ئەو گیروگرفتە ڕزگاریان بێ و واز لەو نەریتە بێنن، پێویستە پانتایی زەویی کشتوکاڵ زیاد بکرێ، چەند پرۆژەیەکی ئاو دابمەزرێندرێ، جوتیارەکان فێری چاندنی بەرهەمی هەمەچەشنە بکرێن، گرنگی بە بارودۆخی ئابوورییان بدرێ.

**– دروێنەنەکردنی هەموو زەوییە چاندراوەکان:**

هەموو ساڵێ، لەبەر خراپی، نەخۆشی، گەورە نەبوون، کەمی ئاو و بەکارنەهێنانی پەین، نزیکەی لە ١٠٪ی کۆی گشت زەوییە چاندراوەکان نادورێنەوە. بۆ نموونە پانتایی

زەوی چاندراوی نەدوراوە، لە ساڵی ١٩٨٦دا، لە پارێزگاکانی ماردین – ٣٣ هێکتار و لە مەلاتییە – ٢٠ هێکتار و لە سیرت – ١٦ هێکتار و لە وان – ٥ هێکتار و لە ئاگری ـ ١ هێکتار بوون.

– سوتاندن بە دەستی ئانقەست:

لە هەندێ نێوچەدا، لەبەر هەر هۆیەک بێ، سوتاندنی بەروبوومی کێڵگە بە دەستی ئانقەست، بووە بە کارێکی سروشتی و ئاسایی ڕۆژانەی هەندێ خەڵک، کە زیانی ساڵانەی لە سەدان تەن گەنم و جۆ تێپەڕ دەکا.

## بەشی دووەم: سامانی ئاژەڵ

سامانی ئاژەڵ، نزیکەی ٢٠٪ی دارایی نیشتمانی پێک دەهێنێ. واتە بە پلەی سێیەم، لە دوای نەوت و بەروبوومی کشتوکاڵەوە دێ. ڕێژەی ئاژەڵدارەکان، لە ٥٪ی گشت دانیشتووانی چالاکی ئابووری کەرتی کشتوکاڵی تێپەڕ ناکات. لەگەڵ ئەوەشدا، بەرهەمی ساڵانەی لە دەیان ملیۆن دۆلار زیاترە، (١٩٨٥ – نزیکەی ٧٠ ملیۆن دۆلار). بەرهەمی ئاژەڵ لە کوردستاندا، لەچاو بەرهەمی ئاژەڵی وڵاتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریادا، زۆر کەمتر نییە.

### ١٠ جۆرەکانی ئاژەڵ

ئاژەڵ، کە تاکوو ئێستا ژمارەیان لە ٨٠ ملیۆن سەر زیاترە، (١٩٨٥ – ٨٨ ملیۆن سەر)، لە ڕووی کێش و قەبارەی لەشیان و کەڵک لێ وەرگرتنیانەوە، بەسەر سێ دەستەی گەورەدا، دابەش دەکرێن. تەماشای خشتەی ژمارە (٤١) بکە.

**- ئاژەڵی بارکێش**

ئەم جۆرە ئاژەڵانە، لە هێستر و بارگیر و ماین و ئەسپ و کەر پێک هاتوون. لە ساڵی ١٩٨٥دا، ژمارەیان نزیکەی یەک ملیۆن و ١٣٥ هەزار دانە بوو. واتە لە ٣٪ی کۆی گشتی هەموو ئاژەڵەکانی کوردستان بوو.

هێستر:

هێستر بۆ کاروباری جووتکردن، ئاژەڵێکی زۆر پێویستە، هەروەها بۆ بارکێشان و سواریش بەکار دەهێنرێ. ژمارەی هێستر لە کوردستاندا، دەوروبەری ٣٧٣ هەزار دانە دەبێ، واتە لە ٥٥٪ی هەموو ئاژەڵە بارکێشەکانی دیکە دەبێ. هێستر بە زۆری لە لایەن دانیشتووانی نێوچە شاخاوییەکانەوە بەخێو دەکرێ و ڕادەگیرێ، لەبەر ئەوەی لەو نێوچانەدا، زیاترلە ئاژەڵە بارکێشەکانی دیکە، خۆی لەبەر سەختی و دژواری ئەو نێوچانە پێ ڕادەگیرێ.

هێسترەکانی کوردستان دوو جۆرن: هێستری ئاسایی (ئەوانەی دایکیان ماینە و باوکیان کەرە)، گاویلکە (ئەوانەی دایکیان ماکەرە و باوکیان ئەسپە). ئەم جۆرەی دووەمیان، لە جۆری یەکەمیان، بە لەش کەمێ پچوکترن. نرخی هەر یەکێ لەم هێسترانە، بە سەدان دۆلار دادەنرێ.

## خشتەی ٤١ ژمارەی ئاژەڵە جۆربەجۆرەکان، ساڵی ١٩٨٥

| سەرناوچە | ئاژەڵ (هەزار) | | | کۆ |
|---|---|---|---|---|
| | بارکێش | ورد | درشت | |
| ئادیەمان | ٤٤ | ٥٧٣ | ١١٥ | ٧٣٢ |
| ئاگری | ٣٤ | ٢١٣٦ | ٣٤٩ | ٢٥١٩ |
| بینگۆڵ | ١١ | ١٧٥ | ١١٢٢ | ١٣٠٨ |
| بدلیس | ١٢ | ٢١ | ٩٤٠ | ٩٧٣ |
| دیاربەکر | ٦٤ | ٤١٣ | ١٣٠٣ | ١٧٨٠ |
| ئەلازیغ | ٣٠ | ٢٩٢ | ٨٣١ | ١١٥٣ |
| ئەزرنجان | ٣٧ | ٢٣٨ | ٦٩٩ | ٩٧٤ |
| ئەرزەڕۆم | ٤٤ | ١٢٧٥ | ٢٦٨٧ | ٤٠٠٦ |
| گازی ئانتەب | ٣١ | ٤٩ | ٧٦٦ | ٨٤٦ |
| هەکاری | ٣١ | ٤٤ | ١٤٢٤ | ١٤٩٩ |
| مەلاتیە | ٢٩ | ١٨٨ | ٧٦٣ | ٩٨٠ |
| مەرعەش | ٤٢ | ٢٠٩ | ٩٤٦ | ١١٩٧ |
| ماردین | ٧٤ | ١٥١ | ١٨٥٦ | ٢٠٨١ |
| موش | ١٢ | ٥١٦ | ١٤٧١ | ١٩٩٩ |
| سیرت | ٦٢ | ١٠٣ | ١٤٠٥ | ١٥٧٠ |
| دەرسیم | ١٧ | ١٦١ | ٨٠٢ | ٩٨٠ |
| ئۆرفە | ٤٥ | ١٤١ | ٢٥٣١ | ٢٧١٧ |
| وان | ١٩ | ٣٩٣ | ٢٩٢٤ | ٣٣٣٦ |
| ئازربایجانی غ | ٦٨ | ٤٥٤٣ | ٥٩٧ | ٥٢٠٨ |
| کرماشان | ٥٩ | ١٦٨٠ | ٤٣٨ | ٢١٧٧ |
| کوردستان | ٦١ | ٢٨٨٣ | ٥٢٤ | ٣٤٦٨ |
| بەختیاری | ٣٢ | ١٧٠٦ | ١٢٦ | ١٨٦٤ |
| ئیلام | ٥٩ | ١٨٦ | ٣٣ | ٢٧٨ |
| لورستان | ٢٢ | ١١٤٥ | ٤١ | ١٢٠٨ |
| کوهگیلویە | ٣٢ | ٩٣٠ | ١٦ | ٩٧٨ |
| نەینەوا | ٦٣ | ٢٢٧٢ | ١١٤ | ٢٤٤٩ |
| کەرکووک | ١٧ | ٥٨٨ | ٥٠ | ٦٥٥ |
| دهۆک | ٩ | ٢٨٧ | ١٤ | ٣١٠ |
| هەولێر | ١٧ | ٥١٤ | ٣٦ | ٥٦٧ |
| سلێمانی | ١٢ | ٧٧٣ | ٨٤ | ٨٦٩ |
| هیتر | ٤٦ | ٣٦٦٣٤ | ٥٠٢ | ٣٧١٨٢ |
| کۆ | ١١٣٥ | ٦١٢١٩ | ٢٥٥٠٩ | ٨٧٨٦٣ |

### بارگیر (بارگین)

کۆچەرییەکان زیاتر لە جوتیارەکان، بایەخ بە بەخێوکردنی بارگیر دەدەن، چونکە زۆربەی بارەکانیان، لە گەرمیانەوە بۆ کوێستان و بە پێچەوانەشەوە، بە بارگیر دەگوێزنەوە. لە هەندێ نێوچەش بۆ جووتکردن و ناعور گێڕان بەکار دەهێندرێ. ژمارەی بارگیر لە ساڵی ١٩٨٥دا، نزیکەی ٢٧٥ هەزار دانە بوو. بارگیر ئەسپی خەساوە و لە چاککردنی ماین و ئەسپ پەیدا دەبێ. نرخی یەک بارگیر لە کوردستاندا، خۆی لە چەند سەد دۆلارێ دەدا.

### ماین

لە ماڵە دەوڵەمەندەکاندا، لە هەندێ نێوچەدا، هەندێ کێڵگەی بەخێوکردنی ماین بەدی دەکرێ. ئەمەش زیاتر بە مەبەستی سواربوون و زاووزێکردنە. ساڵی ١٩٨٥ نزیکەی بیست هەزار ماین هەبوو، واتە لە ٣٪ی گشت ئاژەڵە بارکێشەکان دەکا. هەرە چەشنە بەناوبانگەکانی ماین لە کوردستاندا ئەمانەن: ئاسایی، کەحێل، عەرەبی... هتد. لە هەندێ شوێن، نرخی ماینێک دەگاتە یەک هەزار دۆلار.

### ئەسپ

ساڵی ١٩٨٥، نزیکەی ١٤ هەزار ئەسپ هەبوو، واتە لە ٢٪ی گشت ئاژەڵە بارکێشەکانی پێک دەهێنا. ئەسپ ، بە زۆری لە لایەن دەسەڵاتدار و دەوڵەمەندەکانەوە، بۆ سواریی و ڕاوکردن و لافوگەزاف لێدان، ڕادەگیرێ و بەخێو دەکرێ.

### کەر

کەر بە زۆری بۆ بارکێشان و سواربوون بەخێو دەکرێ. سەرەڕای ئەمانەش، لە هەندێ نێوچەدا، جوتیارە دەسکورتەکان، بۆ جووتکردنیش بەکاری دەهێنن. کەر زۆر زیاتر لە ئاژەڵە بارکێشەکانی دیکە، بەرگەی ماندووبوون و برسێتی دەگرێ. لە بەرچاوترین جۆرەکانی کەر ، ئەمانەن: سابلاغی، مەندەلی، ئیلامی، ئاسایی. ساڵی ١٩٨٥، نزیکەی ٢٧٢ هەزار کەر هەبوو، واتە لە ٤٠٪ی هەموو ئاژەڵە بارکێشەکانی وڵاتی دەگرتەوە. کەر بە هەرزانترین ئاژەڵی بارکێشان دادەنرێ.

- **ئاژەڵی ورد**

ساڵی ١٩٨٥ نزیکەی ٦١ ملیۆن سەر مەڕ و بزن هەبوو، واتە لە ٧٠٪ی گشت ئاژەڵەکانی دیکەی پێک دەهێنا. زۆری مەڕوماڵات، بۆ گونجاندنی ئاو و هەوا و بوونی لەوەڕگای بەپیت و شێوازی بەخێوکردن و بایەخدان پێیان لە لایەن جوتیارەکان و بەرزی نرخ و بازاڕ گەرمییان دەگەڕێتەوە. گرنگترین ئاژەڵە وردەکان ئەمانەن:

**مەڕ**

ئاژەڵێکی زۆر بەکەڵکە، یەکێکە لە ئاژەڵە شیردەرەکان. لە شیرەکەی کەرە و پەنیر و ماست دروست دەکرێ. لە خورییەکەی جلوبەرگ و هەندێ پێویستی نێو ماڵ وەکوو: فەرش و جاجم و دووگرد، دروست دەکرێ. پێستەکەی لە پیشەسازیدا بەکار دەهێندرێ. بەزیندوویەتیش دەفرۆشرێ و خاوەن مەڕەکان پارەیەکی زۆریان لێ دەست دەکەوێ.

ساڵی ١٩٨٥ نزیکەی ٤٤ ملیۆن سەر مەڕ هەبوو، ئەم ڕێژەیە، لە ٧١/ ی گشت ئاژەڵە وردەکانی پێک دەهێنا. ئەم ژمارەیە کەمێ لە ژمارەی ئاژەڵە وردەکانی عێراق و سووریا زیاتر بوو.

مەڕی کوردستان بە زۆری لەو جۆرە مەڕانەن کە ساڵی جارێ زاووزێ دەکەن. بەرخەکانیان لە ٤ – ١٠ ڕۆژ، لە دایکەکانیان جیا ناکەنەوە، بۆ ئەوەی بەتاقەت بێت. پاشتر ڕۆژی دوو جار، دوای دۆشینی بەیانیان و چێشتەنگاوێکی درەنگ، بەرخەکان لە دایکە مەڕەکانیان بەر دەدەن. دوای ئەوەی مەڕ بەرە بەرە شیرەکەی کەم دەبێ، ئەو کاتە ڕۆژی جارێ دەدۆشرێ، هەتا لە دواییدا بە تەواوی چۆڕبڕ دەبێ.

مەڕ ڕۆژانە لە ٣٠٠ تا ١١٠٠ گم شیر دەدات، واتە ساڵانە لە ڕۆژی زاووزێ کردنیانەوە، تا شیربڕانیان، کە ماوەی ٤ – ٦ مانگێ درێژە دەکێشێ، لە ٤٠ – ٥٠ لیتر شیر دەدات.

مەڕدارەکان، مەڕەکانیان لە رووی تەمەنەوە بەم شێوەیە پۆلێن دەکەن: بەرخ (پەز کە تەمەنی لە شەش مانگ کەمتر بێ)، کاوڕ (پەزی شەش مانگ)، شەک (پەزی یەک ساڵە)، شەک مەڕ (پەز کە تەمەنی لە نێوان ١,٥ – ٣ ساڵ بێ)، خرت (پەزی سێ ساڵە)، مەڕی سەرە (پەزی ٤ – ٥ ساڵە).

مەڕ، لە سەرەتای بەهارەوە تاکوو نیوەی هاوین، لە لەوەڕگاکاندا دەلەوەڕێن، پاشان هەتا سەرەتای پایز، واتە دوای دروێنەکردنی دەغڵودان، خواردنی ڕۆژانەی خۆیان لە پەرێزەکاندا دابین دەکەن. لە دواییدا، جارێکی دیکە بەرەو لەوەڕگا سروشتییەکان و دەشتەکان دەبرێنەوە. لە زستاندا، هەندێ جار کاو و جۆیان دەدرێتێ، یاخود خواردنیان

لەسەر ئەو گژوگیایانەی لە بەهاردا کۆکراونەتەوە و وشک کراونەتەوە دەبێ. چەشنەکانی مەڕ لە کوردستاندا، ٣ جۆرن: خۆماڵێ و لە دەرەوە هێندراو و تێکەڵاو:

– نەژادی کوردی: نەژادی کوردی (پەل سوور)، لەشیان مامناوەندییە، ڕەنگیان سووری تۆخە، گەردنیان خورمایی کراوەیە، کەلەیان درێژە، لمۆزیان گەورە و باریکە، گوێچکەکانیان قیت و بەلادا هاتوون. مەڕ بەرانەکانیان بێ قۆچن، گەردنیان بڵندە، قیت بەڕێوە دەڕۆن، سەلکیان مامناوەندییە، ئەندامانی لەشیان ڕێکوپێکە، پشتیان ڕێکە.

نەژادی کوردی، هەموو چەورییەکانیان لە دوگەکانیاندا کۆ دەکەنەوە. دوگەکانیان لە سێ چینی جیاواز پێک هاتووە، چینی سێیەمیان بە کلک کۆتایی دێ. بە شێوەیەکی گشتی، ئەم جۆرە مەڕە، شیری لە پێویستی ڕۆژانەی بەرخەکانی زیاترە. هەر سەر مەڕێ، لە ماوەی شیردانیدا، نزیکەی دوو کگم ڕۆن دەدا، کە لە سەرەتای بەهارەوە دەست پێ دەکا و لە سەرەتای پایزدا تەواو دەبێ. ڕێژەی چەوری لە شیری نەژادی کوردیدا، لە نێوان ٣٠٪ – ٥٠٪ دەبێ. هەر سەرە مەڕێ هەتا دوو کگم خوری دەدا، کە بۆ درسکردنی فەرشی جۆربەجۆر بەکار دەهێنرێ، بەڵام خوری ئەم جۆرە مەڕە، بۆ دروسکردنی جلوبەرگ، باش نییە.

– نەژادی عەواسی: دوگەکەی لە دوو چین پێک دێ. خورییەکەی لە خوری نەژادی کوردی نەرمترە. شیرەکەی لەچاو شیری نەژادی کوردیدا کەمترە، بەڵام چەورترە. ئێسکەکانی نەرمە. هەندێکیان ساڵی دوو زاووزێ دەکەن. زۆربەی چەورییەکانی لەشی، لە ماسولکەکانیدا کۆ بۆتەوە. لەبەر هەندێ هۆ، گۆشتەکەی لە گۆشتی نەژادی کوردی خۆشترە.

– نەژادی حەمدانی: ئەم جۆرە لە کوردستاندا زۆر کەمە. جیاوازی لەگەڵ هەردوو جۆرەکەی پێشووشدا، لە بەرهەمی شیر و ڕێژەی چەوری و چەشنی خوری و گۆشتەکەی دایە.

– نەژادی ڕەنگی سوور و شین: ئەم جۆرە بەدەگمەن لە نێو مێگەلەکانی کوردستاندا دەبینرێ. ئەو مەڕدارانەی هەشیانە، هەوڵی بلاوکردنەوەیان نادەن، بەڵکوو تەنیا بۆ خۆیان بەخێویان دەکەن.

– نەژادی لوڕی: ئەم جۆرە، زۆربەی خەسڵەتەکانی لە نەژادی کوردی دەچێ، تەنانەت هەندێ کەس، بە هەمان جۆری لە قەڵەم دەدەن. زیاتر لە نێوچەی لوڕستاندا بلاوە.

– نەژادی بەختیاری: ئەم چەشنە بە زۆری لە نێوچەکانی بەختیاریدا بەخێو دەکرێ. جیاوازی لەگەڵ نەژادەکانی پێشوودا، بە پلەی یەکەم لە شێوەی لەشی دایە و توانای ڕۆیشتنیشی بۆ ماوەیەکی درێژ و بەبێ ماندووبوون، لەوانی دیکە زیاترە.

**بزن**

بزن لە سەرانسەری کوردستاندا بەخێو دەکرێ. بەڵام لەبەر ئەوەی توانایەکی زۆری لە ڕۆیشتن و هەڵگەڕان بە چیاکاندا هەیە، دەتوانێ لەسەر گژوگیای کورت بلەوەڕێ، زیاتر لە نێوچە شاخاوییەکاندا ڕادەگیرێ و بەخێو دەکرێ. بزن ئەگەر تێر سکی خۆی خواردنیش نەخوا، شیری خۆی هەر دەدات، ئەمەش وای لە زۆربەی دانیشتووانی نێوچە جیاجیاکانی کوردستان کردووە، تەنانەت شارەکانیش، کە بزن بەخێو بکەن.

ژمارەی بزن، لە ساڵی ١٩٨٥دا، نزیکەی ١٨ ملیون سەر بوو، واتە لە ٢٩٪ی گشت ئاژەڵە وردەکانی پێک دەهێنا. بزن لە ماوەی ٥ – ٧ مانگدا، نزیکەی ٥٥ لیتر شیر دەدات، ساڵانە یەک کگم موو بەرهەمی هەیە. نەژادە بەناوبانگەکانی بزن ئەمانەن:

– بزنی ئاسایی: ئەم جۆرە بزنە، لە نێوچە دەشتاییەکاندا بەخێو دەکرێ. لاشەکەی بە مووی خورمایی سوور و سپی داپۆشراوە. بەرهەمی ساڵانەی لە ٥٠٠ – ١٠٠٠ گم موو دەبێ. گۆشتەکەی زۆر چەورە. هەرسکردنی خواردنەکەی گرانە، لەبەر ئەوە نرخی یەک کگم لە گۆشتەکەی، لەچاو نرخی یەک کگم گۆشتی مەڕدا، هەرزانترە.

– بزنی مەرغەزی: ڕەنگەکەی سپی مەیلەو خەنەیی تێکەڵاوە. هەر یەک سەر بزن، ساڵانە یەک هەتا ١,٥ کگم موو دەدات. مووەکەی تا ڕادەیەک نەرمە. هەندێ جار بۆ دروسکردنی ڕایەخ، لەگەڵ خوری تێکەڵ دەکرێ.

– بزنی مەرەز: جوانترین بزنە لە کوردستاندا. ساڵانە یەک هەتا دوو کگم موو دەدات. مووەکەی زۆر شل و نەرمە، هەرچەندە کەم تەمەن بێ، مووەکەی ئەوەندە نەرمتر دەبێ. کێشی بزنی نێر لە تەمەنی ١٨ مانگاندا، ٥٥ – ٧٠ کگم دەبێ، کێشی بزنی مێ لە هەمان تەمەندا، ٣٠ – ٤٠ کگم دەبێ. درێژی تاڵە مووەکانی بزنی شەش مانگانە، لە نێوان ١٠ – ١٨ سم دەبێ، بزنی ١٢ مانگان لە نێوان ١٥ – ٢٠ سم دایە.

– بزنی دووڕە: ئەم جۆرە بزنە، لە بەرهەمی زاووزێی بزنی چەشنی ئاسایی و چەشنی مەرەز پەیدا بووە. لەشی گەورەیە. شیر زۆر دەدا. ماسولکەکانی نەرمە. لەبەر ئەوە بە بەراوردکردن لەگەڵ بزنی ئاساییدا، زیاتر بۆ خواردن بەکار دەهێندرێت.

- **ئاژەڵی درشت**

وەکوو چێڵ، گامێش، حوشتر. ئەم جۆرە ئاژەڵانە، لە لایەکەوە بۆ شیر و گۆشت بەخێو دەکرێن، لە لایەکی دیکەشەوە بۆ جووت و بارگواستنەوە ڕادەگیرێن. ساڵی ١٩٨٥ نزیکەی ٢٦ ملیۆن سەر ئاژەڵی درشت هەبوو، واتە ٢٥٪ی گشت ئاژەڵی خۆماڵی دەکرد.

**چێڵ:**

جوتیارەکان بایەخێکی تایبەتی بە بەخێوکردنی چێڵ دەدەن، چونکە لە لایەکەوە، بە سەرچاوەیەکی لەبن نەهاتووی شیر و ماست و گۆشت، بۆ خۆی و بۆ فرۆشتن دادەنرێ، لە لایەکی دیکەشەوە، لە کاتی گەرمێن و کوێستاندا، بۆ گواستنەوەی کەلوپەلەکانی بەکاریان دەهێنێ. جگە لەوەی لەچاو مەڕ و بزندا، ماندوو بوونی کەمترە و مەسروفاتیشی کەمترە.

ساڵی ١٩٨٥ ژمارەی چێڵەکان، لە ١٣ هەزار سەر زیاتر بوو، واتە لە ٥١٪ی گشت ئاژەڵە درشتەکانی دەکرد. ئێستا نرخی یەک چێڵ، سەدان دۆلار دەبێ، بۆیە خەڵکی توانای کڕینیان نییە.

لەبەر خراپی و ناتەواوی ئالیک، تەویلەی خراپ، بڵاوبوونەوەی نەخۆشی، ماندووبوونی زۆر، چێڵ بە گشتی شیرکەم دەدات. لە هەر ژەمە دۆشینێکیدا، نزیکەی چوار کگم شیر دەدات. ژمارەی ڕۆژە شیردەرەکانی چێڵ، لە نێوان ٨٠ – ٢٢٠ ڕۆژ دایە، لەو ماوەیەدا، دەوروبەری ٥٠٠ – ٨٠٠ لیتر شیر دەدات. ڕۆژی دوو جار (بەیانیان و چێشتەنگاوان) دەدۆشرێ. لە نەژادە بەناوبانگەکانی چێڵ ئەمانەن:

– نەژادی کوردی: بڵاوترین جۆرە. ڕەنگیان هەمەچەشنەیە، بەڵام ڕەنگی ڕەشیان. لە هەموو ڕەنگەکانی دیکەیان زیاتر بڵاوە. قەبارەی لەشیان وەکوو یەک نین، زۆربەیان مامناوەندین. قورساییان لە نێوان ٣٥٠ – ٤٠٠ کگم دەبێ. هەموویان وەکوو یەک شیر نادەن.

– نەژادی شەرابی: ڕەنگەکانیان سوورێکی تاریکە یاخود ڕەشێکی پەڵەدارن. پشتیان ڕێکە. لەشیان مامناوەندییە. قورساییان لە نێوان ٤٥٠ – ٥٠٠ کگم دەبێ. ئەم جۆرە زیاتر لە نێوچەکانی ژەنگار و تەلەعەفەر بەخێو دەکرێن.

– هەندێ نەژادی دیکە: لەو ساڵانەی دواییدا، دەزگاکانی کشتوکاڵ بە مەبەستی چاککردنی نەژادە خۆماڵییەکان، بە تایبەتی بۆ زیادکردنی شیر، چەند ژمارەیەکیان لە جۆرەکانی فریزیان، جێرسی، جۆنس، ڕۆستاکی... هتد بۆ کوردستان هێناوە.

## گا

بۆ جووتکردن لە زەوی ڕەقەڵانی و بەردەڵانی و هەورازدا، زیاتر گا بەکار دەهێنرێ، چونکە ئەم کارانە بەگا بە شێوەیەکی ئاسانتر دەکرێ، لەبەر ئەوە بەخێوکردنی ئەم ئاژەڵە بۆ جوتیارەکان، زۆر پێویستە، هەر بۆیە جوتیارەکان، بە زۆری هەوڵی کڕینی گا دەدەن. لەبەر ئەوە نرخی گا بەرزە، بۆ نموونە، جووتێ گا لە پارێزگای کوردستان، لە ساڵەکانی هەشتادا، نزیکەی بە دوو هەزار تمەن بوو. ساڵی ١٩٨٨ لە نزیکەی ١١ هەزار سەر گا هەبوو، واتە لە ٤٢٪ گشت ئاژەڵەکانی پێک دەهێنا.

## گامێش

لە هەندێ نێوچەی گوند و شارەکاندا، بە مەبەستی شیر وەرگرتن بەخێو دەکرێ. گامیش لە نێوچە ئاویدا باشتر دەژین، چونکە هەمیشە پێویستییان بە ئاو هەیە، بە تایبەتی لە هاویناندا، دەچنە نێو ئاوە و تێیدا پاڵ دەکەون و دەحەوێنەوە.

نەژادی گامێشەکانی کوردستان، بە زۆری خۆماڵین و لە ئەنجامی لەیەکدان و زاووزێکردنی، هەردوو نەژادی قەفقاسی و هیندی هاتونەتە کایەوە. لە ساڵی ١٩٨٥دا، ژمارەی گامێش، خۆی لە دەوروبەری ١٨ هەزار سەر دەدا، واتە لە ١٪ی گشت ئاژەڵە درشتەکان دەبوو.

## حوشتر

لە هەندێ نێوچەدا، حوشتر بەخێو دەکرێ، وەکوو پارێزگاکانی ئورفە و گازی ئانتەب. حوشتر زیاتر بۆ بارگاستنەوە و شیر و گۆشتەکەی بەکار دەهێنرێ. ژمارەیان بە چەند هەزار سەرێ دەقەبلێندرێ.

## ٠٢ پەلەوەڕ

بەخێوکردنی مریشک، کەڵەشێر، مراوی، سۆنە، قاز، قەل، چین و ماچین، کۆتر و هەندێ پەلەوەڕی دیکەش، لە گوند و شارەکان، بە کارێکی ئاسایی ڕۆژانەی خەڵکی دادەنرێ. کەم ماڵ هەیە، چەند دانەیە پەلەوەڕی بۆ هێلکە و گۆشت و فرۆشتن، ڕانەگرتبێ.

باری ژیان و پێشکەوتنی پەلەوەڕ لە کوردستاندا خراپە، چونکە خاوەنەکانیان زۆر گرنگی بە ژیانیان نادەن و خواردنیان بۆ ناکڕن، بەڵکوو زیاتر بەرەڵا دەکرێن و پەلەوەڕەکان خۆیان، لە کۆڵان و سەرەنوێلکەکاندا، خواردنی ڕۆژانەی خۆیان پەیدا دەکەن، لەبەر ئەوە دەبینین، ئاستی بەرهەمهێنان نزمە.

ژمارەی پەلەوەڕەکان لە ساڵی ١٩٨٥دا، نزیکەی ١١ ملیۆن دەبوو. ئەم ژمارەیە، کەمی لە ژمارەی پەلەوەڕەکانی تورکیا و ئێران کەمترە و هەندێکیش لە ژمارەی پەلەوەڕەکانی عێراق و سووریا زیاترە.

پارێزگای دیاربەکر بە گەورەترین نێوچەی بەخێوکردنی پەلەوەڕ دادەنرێ، پاشان پارێزگاکانی مەرعەش، مەلاتیە، ئورفە، دێن. هەروەکوو لە خشتەی ژمارە (٤٢) دەردەکەوێ.

### مریشک

مریشک و کەڵەشێر، زیاد لە ٩٥٪ی هەموو پەلەوەڕەکان پێک دەهێنن. سەرەمر ساڵانە، نزیکەی ٢٥٠ هێلکە دەکا و دوو کیلۆ گۆشت دەدا، باڕۆکەش ساڵانە ١٨٠ هێلکە دەکا و نزیکەی یەک کیلۆ گۆشت دەدات.

نەژادی مریشکی کوردستان، بە زۆری خۆماڵین. ڕەنگەکانیان تێکەڵاو وجۆراوجۆرە، لە نێو ئەو ڕەنگانەشدا، ڕەنگی زەرد و سوور لە هەموو ڕەنگەکانی دیکە زۆرترن. لەم ساڵانەی دواییدا، بە هۆی زیادبوونی خواردنی هێلکە و گۆشتی مریشک و بەرزبونەوەی نرخی گۆشتی ئاژەڵ، چەند کێڵگەیەکی بەخێوکردنی مریشک، لە زۆربەی شارەکاندا دامەزراوە، کە بەرهەمی ساڵانەیان، خۆی لە چەند هەزار باڕۆکەیەک و چەندین ملیۆن هێلکە دەدا. ژمارە و بەرهەمی پەلەوەڕەکانی دیکە، بایەخێکی ئەوتۆیان نییە، بۆیە لێرەدا پەنجەیان بۆ ڕاناکێشین.

**خشتەی ٤٢** **ژمارەی پەلەوەر، ساڵی ١٩٨٥**

| پارێزگا | ژمارە (هەزار) | پارێزگا | ژمارە (هەزار) |
|---|---|---|---|
| ئادیەمان | ١٣٥ | دەرسیم | ١٩٥ |
| ئاگری | ١١٧ | ئۆرفە | ٥٥٣ |
| بینگۆڵ | ١١٣ | وان | ١٧٧ |
| بدلیس | ١٠٧ | ئازەربایجانی غ | ٥٣١ |
| دیاربەکر | ٦٤٠ | کرماشان | ٤٧٥ |
| ئەلازیغ | ١٨٥ | کوردستان | ٢١٣ |
| ئەزرنجان | ٤٤٥ | بەختیاری | ٢٨٥ |
| ئەرزەڕۆم | ٥٢٦ | ئیلام | ٤٠٣ |
| گازی ئانتەب | ٤٢٥ | لورستان | ٢٥٠ |
| هەکاری | ١٣٣ | کوهگیلویە | ٢٩٥ |
| مەلاتیە | ٥٦٢ | نەینەوا | ٦٢٣ |
| مەرعەش | ٦٠٤ | کەرکووک | ١٩٢ |
| ماردین | ٤١٠ | دهۆک | ٢٤٨ |
| موش | ٢٤٣ | هەولێر | ٢٦٥ |
| سیرت | ١٧٤ | سلێمانی | ٥٠٢ |

## ٠٣ پەروەردەکردنی هەنگ

مەرجەکانی بەخێوکردنی هەنگ وەکوو ئاووهەوا، جەنگەڵ، لەوەڕگەی تەڕ، گوڵ و گیای جۆراوجۆر هەن. بەناوبانگترین نێوچەی پەروەردەکردنی هەنگ ئەمانەن: شەمزینان، کاغیزمان، سەردەشت، گوندەکانی دەوروبەری شاری ئەرزەڕۆم، ئوستانی ئیلام (تولاب میشخاس، چوار، مەلەک شاهی، شێروانی، میمەی زڕین ئاباد) ... هتد.

لە کوردستاندا بە دەیان هەزار شانەی هەنگ هەیە. بۆ نموونە، ساڵی ١٩٨٠ لە پارێزگای کوردستان نزیکەی نۆ هەزار کەندو (مۆدێرن – ٤ هەزار و خۆماڵیش – ٥ هەزار)، لە نێوچەی خۆی ١٢٥ هەزار کەندو (مۆدرێن – ٩٠ هەزار و خۆماڵیش – ٣٥ هەزار) بوون. بەخێوکردنی هەنگ.

## ٠٤ گیروگرفتەکانی ئاژەڵ

بە شێوەیەکی گشتی، ئاژەڵ تووشی کۆمەڵی گیروگرفتی سروشتی و مرۆیی دەبێ. لێرەدا هەندێکیان پێش چاو دەخەین:

– نەخۆشی:

هەندێ لە نەخۆشییەکانی ئاژەڵ ئەمانەن: دانو (بە زۆری دەبێتە هۆی بەر هاویشتن)، سکچوون، لەرز، پژمە، کۆکە، گوان یەشە (ئاوەش)، تەپەک (سمەخۆرە)، زادیش (زمان یەشە)، وەرەم، تووشی هەندێ نەخۆشی پیسی جۆراوجۆری دیکەش دەبن. ئەو نەخۆشییانە، بە زۆری لە لایەن خاوەنەکانیانەوە، بە گژوگیای سرۆشتی چارەسەر دەکرێن، کە لەگەڵ تاقیکردنەوەکانی ڕۆژگاردا، فێری بوون.

– کەمی دەرمان و خزمەتگوزاری بەیتاڵخانەکان:

ژمارەی بەیتاڵخانەکان لەچاو پێویستدا زۆر کەمە و هەموویان لە شارەکاندا دامەزراوون. بە تایبەتیش خزمەتی ئاژەڵی نێو شارەکان دەکەن، بەڵام ئاژەڵی گوندەکان، بە درێژایی ژیانیان لەو خزمەتەوە دوورن.

– دەسبڵاوی لە سەربڕیندا

بەو زانیارییانەی لە سەرژمێرە کشتوکاڵیەکاندا دەردەکەون، وامان نیشان دەدەن، کە

ژمارەی ئاژەڵە سەربڕاوەکان، زۆر لەو ژمارەیە زیاترە کە ساڵانە زیاد دەکەن.لە هەندێ شوێندا، ژمارەی ئاژەڵە سەربڕاوەکان، دوو ئەوەندەی زیادبوونی ساڵانەیە، دیارە لە ئەنجامی ئەم بەرنامە نازانستانەیەدا، ڕۆژ بە ڕۆژ، ژمارەی ئاژەڵەکان لە کوردستاندا، بەرەو کەمی دەڕوات.

- کەمبوونی لەوەڕگە:

لەوەڕگاکان بە شێوەیەکی بەردوام، لە لایەکەوە تووشی پاوانکردن و کێڵان دەبن، لە لایەکی دیکەشەوە، لەبەر بارودۆخی نالەباری کوردستان، چوونەناویان و بەکارهێنانیان وەکوو لەوەڕگا، لە زۆربەی نێوچەکاندا، قەدەغە کراوە. ئەم هۆیانەش کارێکی کردووە، کە ئاژەڵەکان بە درێژایی وەرزی لەوەڕاندنیان، لەسەر یەک پارچە زەوی بلەوەڕێن، لەبەر کەمی خواردنیش لەو شوێنانەدا، ئاژەڵەکان گیاکە بە شێوەیە دەخۆن، کە جارێکی دیکە بە زەحمەت سەوز دەبێتەوە.

- بێ جێگایی

ئاژەڵەکان بە شەو لە تەویلە و هۆڵ دەکرێن، ئەم جێیانە زۆر تاریک و نزمن، هیچ جۆرە مەرجێکی تەندروستییان تێدا نییە، زۆر پیسن، هەوای پاکی بۆ ناچێ. بۆیە ئاژەڵەکان لە ئەنجامدا، تووشی چەندین جۆر نەخۆشی دەبن، کە لەبەر نەبوونی خزمەتگوزاری بەیتاڵی، چارەسەرکردنیان زۆر زەحمەت دەبێ.

- کەمئاوی

ئاژەڵ لە نێوچەکانی گەرمیان ڕۆژی دوو جار ئاو دەدرێن. لە ماوەی ئەو دوو جارەشدا، لەبەر تینوێتی زۆر ئاو دەخۆنەوە، کە پاشان تووشی نەخۆشی سک ئاوسان دەبن.

- کەمی ئالیک

لە هەندێ ڕۆژانی زستاندا نەبێ، مەڕوماڵات ئالیک نابینن. هەموو ڕۆژێ شوانەکان، ئاژەڵەکان بۆ لەوەڕاندن، چەند کیلۆمەترێ لە شوێنەکانی خۆیان دوور دەخەنەوە و بە تەواوی ماندوویان دەکەن، جگە لەوەی لە ئەنجامیشدا تێر نابن و بە برسێتی دەمێننەوە.

## بەشی سێیەم: سامانی کانزا

دەزگا جیۆلۆجییە جۆربەجۆرەکانی ئەوروپایی و وولآتانی دەوروبەری کوردستان، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە تاکوو ئێستا، بەردەوام خەریکی هەڵکۆڵین و پشکنین و دیاریکردنی سنوور و شوێن و قوولایی و جۆر و قەوارەی کانزاکانن. لەوکاتەوە گەڵێ کاری گرنگ و مەزنیانی جیۆلۆجییان بە ئەنجام گەیاندووە و تاکوو ئەورۆش لەسەر کارەکانیان بەردەدام لە هەوڵدان دان. دوای هەوڵوتەقەلایەکی زۆر بۆیان دەرکەوتووە، کە خاکی کوردستان بە کانزا جۆراوجۆرەکان، زۆر دەوڵەمەندە.

لێکۆڵینەوە جیۆلۆجییەکان کە تاکوو ئێستا لە کوردستان و وولآتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریادا کراوە، شوێنی بیست کانزایان دیاری کردووە، هەرچەندە گومانی تێدا نییە، کە لەو ژمارەیە گەلێ زیاتر هەیە. تەماشای نەخشەی ژمارە (١٠) بکە.

سامانی کانزاکان جگە لە نەوت، لە پێکهێنانی بەرهەمی نیشتمانیدا، ڕۆڵێکی ئەوتۆی دیاریکراویان نییە. ئەمەش لە لایەکەوە بە کەمی ژمارەی کرێکاراندا دەردەکەوێ، کە لە ساڵی ١٩٥٨ ی زایینیدا، تەنیا لە ٢٪ی ژمارەی دانیشتووانی چالاکی ئابوورییان پێک دەهێنا، لە لایەکی دیکەشەوە، بەرهەمی ساڵانەی کانزاکان، لە چەند تەنێکی خۆلآویی زیاتر نییە.

### چەشنەکانی کانزا

بۆ پۆلێنکردنی کانزاکان، زاناکان شێوازی جیاجیایان گرتۆتە بەر. یەکێ لەوانە ئەوەیە، کە لێرەدا بۆ پۆلێنکردنی کانزاکانی کوردستان، بەکار هێنراوە.

### ٠١ سەرچاوەکانی وزە

یەکێکە لە سەرچاوە بنەڕەتییەکانی وزە و کەرەسەیەکی خاوی سەرەکییە، کە لە چەندین کاری پیشەسازی گەورە و گچکەدا بەکاردەهێنرێ. ئەم کەرەسەیە لە رووی ساڵی دەرهێنان و بەکارهێنان و ژمارەی کرێکاران و فرۆشتن و زۆری بەرهەم و دابەشبوونی جوگرافی و پاشەکەوتکردن و بەکارهێنانی لە ژیانی ڕۆژانە و پڕکردنی خەزێنەی دەوڵەتدا، بە گرنگترین و سەرکیترین کەرەسە دادەنرێ. بە شێوەیەکی گشتی، مەتیریاڵەکانی سووتەمەنی لە مانەی خوارەوە پێک دێ:

## نەخشەی کانزاکان



**نەوت**

خەڵکی کوردستان هەر لە کۆنەوە، لەگەڵ نەوتدا ئاشنایەتییان هەیە. لە بابەگوڕگوڕ و کفری و مەندەلی و شوێنەکانی دیکەدا، نەوت بە شێوەیەکی سروشتی، لە ژێر زەوییەوە هەڵقوڵاوە و جۆگەی بەستووە و لە شوێنێکدا لەسەر زەوی وەک گۆمە نەوت کۆ بۆتەوە. خەڵکیش بە ئامرازی ئاوکێشان، وەکوو کوندە و مەشکە و گۆزە و تەنەکە، لەسەر پشتی وڵاخەکانیان گواستویانەتەوە و بۆ پێویستییەکانی ژیان بەکاریان هێناوە، وەکوو ئەوەی لە شەوانی تاریکدا، ماڵەکانیان پێ ڕووناک کردۆتەوە، نەخۆشی پێستیان پێ چاک کردۆتەوە، هەندێ ئامرازی کشتوکاڵ و نێو ماڵیشیان پێ سواغ داوە، هەندێ جاریش بۆ بازاڕەکانیان بردووە و هەندێکیان لێ فرۆشتووە.

هەڵقوڵانی نەوت لە کوردستاندا بە شێوەیەکی سروشتی، سەرنجی زۆر لە گەشتگەرەکانی ئەوروپایی، پێش سەدەی بیستی بە لای خۆیدا ڕاکێشاوە. ئەوانیش لە ڕاپۆرتەکانیان و لە نامەی تایبەتی ڕۆژانە و لە یاداشتەکانییاندا، لێپرسراوی دەوڵەتەکانی خۆیان، لەم سامانە گرنگە ئاگادار کردۆتەوە. لە هەمان کاتدا، پێشنیازی ناردنی کۆمەڵێ لە پسپۆڕان و زانایانیان کردووە، ڕێگەشیان لەکاربەدەستانی دەزگاکانی دەوڵەتەکانی ئەو سەردەمانە، بۆ وەرگرتوون، تا کە هاتن، مافی گەڕان و پشکنینیان بە دوای نەوتدا هەبێ و هەوڵ بۆ دەرهێنان و دۆزینەوە و فرۆشتنی بدەن.

**دابەشبوونی جوگرافی چاڵگە نەوتییەکان**

چاڵگە نەوتییەکان لە ڕووی ستراتیژییەوە، گەلێ نالەبار هەڵکەوتوون. زۆربەیان یا ئەوەتا لە سنووری نێودەوڵەتی نزیکن، یا ئەوەتا سنوورەکە بە نێوانیاندا تێدەپەڕێ. چاڵگە نەوتییەکان لە ڕووی هەڵکەوتی جوگرافییانەوە، بەسەر ٣ نێوچەدا دابەش دەکرێن. تەماشای نەخشەی ژمارە (١١) بکە.

یەکەم: نێوچەی نەوتی باکوور

بە گچکەترین نێوچەی نەوتی کوردستان دادەنرێ. ئەم نێوچەیە لە پارێزگاکانی سیرت، باتمان، دیاربەکر، موسڵ و قەزای مالکیەدا هەڵکەوتووە. ئەم نێوچەیە نزیکەی ٣٪ی گشت بەرهەمی ساڵانەی هەموو نەوتی خاوی کوردستان پێک دەهێنێت. لە ساڵی ١٩٤٠ی زایینیدا، نەوت لە شوێنێ بە ناوی ڕامانشەلۆ، نزیکی شارۆچکەی باتمان دۆزراوەتەوە. نێوچەی نەوتی باکوور، لەم چاڵگە نەوتییانە پێک هاتووە:

## نەخشەی چاڵگەی نەوتی



سیرت ــ دیاربەکر

ئەم چاڵگەیە لە کۆمەڵە بیرێک پێک هاتووە، لە نێوان ڕامان شەلمۆ، بەشیری، گەرزان و گرمیکی هەڵکەوتووە. نەوتەکەی کەوتۆتە سەر ئەو چینە بەردە گێچانەی کە سەر بە قۆناغی سێیەمی جیۆلۆجین و لە قوڵایی ١٠٥٠ – ٢١٠٠ مەتر دایە. کۆمەڵە بیرێکی دیکەی ئەم چاڵگە نەوتییە، لە دەوروبەری شارۆچکەی کورتەلان و کەحاتە هەڵکەوتووە. یەدەکی نەوتی زانراو، ٥٠٠ ملیۆن تەن لە نەوتی خاو و نزیکەی یەک ملیارد مەتری سێگۆشە لە گازی سروشتی دەبێ.

قەرەشوک (قەرەچوغ)

دەکەوێتە قەزای مالکییەوە. درێژاییەکەی لە ٢٣ هەتا ٣٨ کێلۆمەتر دەبێ. نەوت لە قوڵایی ١٧٠٠ – ٢٠٠٠ مەتردا دەردەهێندرێ.

سوێدی

چاڵگەیەکی دەوڵەمەندە بە نەوت. درێژاییەکەی ١٨ کیلۆمەترە و پانایییەکەی ١٤ کیلۆمەتر. دەکەوێتە باشووری چاڵگەی نەوتی قەرەچوغەوە. لە ساڵی ١٩٦٨زایینییەوە، نەوت لەم چاڵگەیەدا دەردەهێندرێ. ژمارەی بیرە جۆراوجۆرەکانی، هەتا ساڵی ١٩٧٩ز، گەیشتە ٢٩٦ بیر. ساڵی نزیکەی نۆ ملیۆن تەن نەوتی لێ هەڵدەهێنجرێ. تێکڕای بەرهەمی ڕۆژانە، بە ٤١٤ بەرمیل نەوت لە ڕۆژکێکدا دادەنرێ. نەوتی یەدەک بە ٤١٠ ملیۆن تەن دەقەبلێندرێ.

ڕۆمێلان

ئەم چاڵگەیە لە درێژبوونەوەی چاڵگەی نەوتی سوێدی پێک هاتووە و دەکەوێتە ڕۆژئاوایەوە. درێژاییەکەی ١١,٥ کیلۆمەترە و پانایییەکەی ٣,٥ کیلۆمەترە. ژمارەی بیرە هەڵکەندراوە بەرهەمدارەکان، لە ساڵی ١٩٧٨ی زایینیدا، گەیشتبووە ٣٥ بیر. تێکڕای بەرهەمی ڕۆژانەی یەک بیر، بە ٢٢٨٣ بەرمیل نەوت دادەنرێ، نەوتی یەدەکیش خۆی لە بیست ملیۆن تەن دەدا.

عەینزالە

لە ساڵی ١٩٣٩ی زایینیدا، نەوت لە عەینزالە دۆزرایەوە. نەوتەکەی خڵتەی زۆرە، لەبەر

ئەوە پێویستی بە سەربار هەیە، تا تاوتوێ بکرێ. عەینزالە دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای شاری موسڵەوە و ٦٥ کیلۆمەتر لێوەی دوورە.

بێتمە

لە چاڵگەی عەینزالەوە نزیکە، لە ساڵی ١٩٥٢دا نەوتی لێ دۆزراوەتەوە، نەوتەکەی خلتەی هەیە.

نەوت لە نێوچەی نەوتی باکوور، لە لایەن کۆمپانیاکانی شێل – Sell، موبیل پانۆیل – Mobil Panoil، ئەرسان – Ersan، کۆمپانیای تورکی – TPAO، کۆمپانیای عێراق بۆ کاروباری نەوت، دەزگای گشتی بۆ پیترۆڵی سووری،... هتد دەردەهێندرێ، لە ڕێی هەمان ئەو کۆمپانیانەوە، بۆ دەرەوە دەنێردرێ و بەبۆری و تەنکی نەوتی گەورە و بە شەمەندەفەر، بۆ پاڵێوگاکانی نیشتمانی و بیانی دەنێردرێ. بەرهەمی ساڵانەشی بە دەیان هەزار تەن نەوت دەبێ.

دووەم: نێوچەی نەوتی نێوەڕاست

نێوچەی نەوتی نێوەڕاست، نەک هەر بە یەکێ لە گەورەترین نێوچە نەوتییەکانی کوردستان دادەنرێ، بەڵکوو یەکێکە لە نێوچە گەورە و گرنگەکانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و هەموو جیهانیش. دۆزینەوەی نەوت لەم نێوچەیەدا، بۆ نیوەی دووەمی چەرخی نۆزدەیەم دەگەڕێتەوە. لە ١٤ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٧ی زایینیدا، بۆ یەکەمین جار، لە یەکێ لە بیرە نەوتەکانی بابەگوڕگوڕ، نەوتیان دەرهێنا.ئەوڕۆ ئەم نێوچەیە، لە ٤٥٪ نەوتی گشت کوردستان پێک دەهێنێ. نەوتی یەدەکی نێوچەی نەوتی نێوەڕاست، لە نیوەی یەکەمی نەوەدەکاندا، بە هەزاران ملیۆن تەن دەخەملێندرێ. ژمارەی بیرە نەوتەکانی ئەم نێوچەیە، لە ٣٥٠ دانە زیاترە، کە تەنیا ژمارەیەکی کەمی نەبێ، ئەوڕۆکە لە کاردان و نەوتی لێ هەڵدەهێنجدرێ، ئەوانی دیکە بە تەواوی سەریان داپۆشراوە و هێشتا نەوتی لێ دەرنەهێندراوە. گرنگترین چاڵگە نەوتییەکانی ئەم نێوچەیە، ئەمانەی لای خوارەوەن:

بابەگوڕگوڕ

یەکەمین بیر بە مەبەستی دۆزینەوەی نەوت لەم چاڵگەیەدا، لە مانگی حوزەیرانی ١٩٢٧ی زایینیدا لێ درا، لە لایەن کۆمپانیای نەوتی عێراق، لە ١٤ی نۆڤەمبەری هەمان ساڵدا، بیری دووەمیش لێ درا. لە سەرەتادا، نەوت بە شێوەیەکی سروشتی لە بیری

بابەگوڕگوڕەوە فیچقەی کردووە، بە شێوەیە کە ئەو نێوچەیەی دەورووپشتی خۆی، بە نەوت داپۆشی بوو، تەنانەت ماوەی دە ڕۆژێکی خایاند، تا کۆنترۆڵیان کرد و پاشتریش چەند ساڵێکی ویست، تا بە تەواوی گۆمە نەوتەکانیان وشک کردەوە. ژمارەی بیرەکانی دەگاتە ١٥٠ بیــرە نەوت، (١٩٧٣ – ١٤١ بیــر، لەوانە بیــری بەرهەمــدار – ٤٧ بیــر و بیــری چاوەڕوانکراو – ٨٤ بیر و بیری ئاو تێکردن – ١١ بیر). درێژاییەکەی بە دەیان کیلۆمەتر دەبێ، پانایییەکەشی لە هەندێ جێدا، لە سێ کیلۆمەتر زیاترە.

بای حەسەن

ئەم چاڵگەیە، ٣٢ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژئاوای شاری کەرکووکەوە دوورە. بۆ جاری یەکەم، لە ساڵی ١٩٥٣ی زایینیدا ،لە قوڵایی ١٥١٥ مەتردا نەوت لەم چاڵگەیەدا دۆزرایەوە. نەوتەکەی لە ڕووی پێکهاتن و ڕێژەی گۆگردەوە، لە نەوتی بابەگوڕگوڕ دەچێ. لە ساڵی ١٩٧٠ی زایینیدا، ئەم چاڵگەیە ١٢ بیری نەوتی بەرهەمداری هەبوو. نەوتی ئەم چاڵگەیە، بە بۆری بۆ دەزگاکانی بابەگوڕگوڕ ڕاکێشراوە، لەوێشەوە بە هەمان شێوە، بۆ دەرەوە دەنێردرێ.

زەنبوور

ئەم چاڵگەیە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوکدا دایە و تەنیا ٤٥ کیلۆمەتر لێوەی دوورە. لە ساڵی ١٩٥٤ی زایینیدا، بۆ یەکەم جار نەوتی لێ دۆزراوەتەوە. قوڵایییەکەی ١٤٧٠ مەتر دەبێ. جۆری نەوتەکەی زۆر باشە. درێژایی ئەستێڵکەکەی ٢٠٠ کیلۆمەترە و پانایییەکەشی ٣ – ٣,٥ کیلۆمەترێ دەبێ. نەوتەکەی لە شاری کەرکووکەوە، بە بۆری بۆ دەرەوەی کوردستان دەنێردرێ.

نەوتخانە:

سەرەتای دۆزینەوەی نەوت لەم چاڵگەیەدا، بۆ ساڵی ١٩٢٧ی زایینی دەگەڕێتەوە. ئەم چاڵگەیە ٣٢ کیلۆمەتر، لە باشووری شارۆچکەی خانەقینەوە دوورە. بۆ بازاڕەکانی نێوخۆ، یەکەم سەرچاوەی نەوت بوو. تاکوو ئێستا، بە دەیان بیرە نەوت لەم چاڵگەیەدا لێ دراوە، کە هەندێکیان خاوەنی نەوتێکی زۆرن. درێژایی ئەستێلکەی چاڵگەی نەوتخانە، ١٥ کیلۆمەترە و پانایییەکەی دوو کیلۆمەترە و قوڵایییەکەشی ٢٢٠٠ مەترە.

### شیوەشۆک

دەکەوێتە ناحیەی تەقتەقی سەر بە پارێزگای هەولێر. لە ساڵەکانی حەفتاوە، نەوتی لێ بەرهەم دەهێنرێ. بەرهەمی ساڵانەی بە دەیان ملیۆن بەرمیل نەوت دادەنرێ، کە لە نزیکەی پانزە بیری نەوتی بەرهەمدارەوە، دەردەهێندرێ. هەموو توانا و تاقەتی بەرهەمهێنانی ئەم چاڵگەیە، تاکوو ئێستا بە تەواوی بەکار نەهێندراوە. لەم چاڵگەیەدا، بیرە نەوتێکی زۆر هەیە، کە تاکوو ئەورۆ سەریان داپۆشراوە و بەکار نەهێندراون.

نەوتی ئەم چاڵگانەی لەسەرەوە باسمان کردن، هەتا سەرەتای حەفتاکان، لە لایەن کۆمپانیای نەوتی عێراقەوە دەردەهێندران، کە لە کۆمەڵە کۆمپانیایەکی ئەمەریکی و ئینگلیزی و فەڕەنسی و هۆڵەندی و هەندێ وڵاتانی دیکە پێک هاتبوون. بەڵام لە مانگی یونی ساڵی ١٩٧١ێ زایینییەوە، کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی عێراق، دەستی بەسەر ئەم چاڵگانەدا گرت، بەرپرسیاری دەرهێنان و بەرهەمهێنان و ناردنەدەرەوەی نەوتی، لە ئەستۆی خۆی گرت.

### سێیەم: نێوچەی نەوتی باشوور

بە گەورەترین نێوچەی نەوتی کوردستان دادەنرێ. ئەورۆ نزیکەی لە ٤٩٪ی گشت نەوتی وڵات، لەم نێوچەیەدا دێتە بەرهەم. درێژاییەکەی زیاتر لە سی کیلۆمەتر و پاناییەکەشی لە دەوروبەری پێنج کیلۆمەتردا دەبێ. ئەم نێوچەیە، دەکەوێتە هەمان هێڵی نێوچەی باکوور و باشوور. بۆ یەکەمین جار لەم نێوچەیەدا، لە ساڵی ١٩٠٨ی زایینیدا، نەوت دۆزرایەوە، تاکوو ئەورۆکە بە سەدان بیر نەوت، لەم نێوچەیەدا لێ دراوە، کە هەندێکیان لە ڕووی بەرهەمهێنانی نەوتەوە، لەسەر ئاستی جیهانی بەناوبانگن. گرنگترین چاڵگە نەوتییەکانی ئەم نێوچەیە، ئەمانەن:

### ئاغاجاری

کۆمپانیا نەوتییەکان، بە مەبەستی دۆزینەوەی نەوت، لە ساڵی ١٩٢٦ی زایینیدا، لەم چاڵگەیەدا دەستیان بە بیرهەڵکەندن کرد. لە ساڵی ١٩٣٦ی زایینیدا و لە کاتی هەڵکەندنی بیری سێیەمدا، بۆ جاری یەکەم چاویان بە نەوت کەوت، پاشان درێژەیان بە بیرلێدان دا، بە شێوەیە تاکوو ئەورۆ، بە سەدان بیرە نەوتیان لێ داوە. (١٩٥١ – ٣٢ بیر). بیرەکانیش خاوەنی نەوتێکی یەکجار زۆرن. بۆ نموونە، بیری ژمارە ٥٣، بە گەورەترین بیری ئەو چاڵگەیە دادەنرێ و بەرهەمی ڕۆژانەشی پەنجا هەزار بەرمیلێک دەبێ.

نەوتی ئاغا جاری، لە ساڵی ١٩٤٤ی زایینییەوە، بە بۆری نەوتی گەورە، بۆ پاڵێوگەی نەوتی ئەبادانی ئێرانی دەبرێ. پێویستییەکانی ئاغا جاری، لە رووی وزەی کارەباوە. لە هەمان دەزگا دابین دەکرێ، ئاویشی لە رووباری (مارون)ەوە بۆ دەهێنرێ، کە ٣٢ کیلۆمەتر لە رۆژهەڵاتی ئاغاجاریەوە دوورە.

پازنان

پازنان لەسەر ڕێگەی نێوان شارۆچکەکانی بەهبەهان و ئاغاجاری دایە. لە ساڵی ١٩٢٦ی زایینیدا، یەکەمین بیری نەوت لەم چاڵگەیەدا لێ دراوە. پاشان لەبەر نەبوونی نەوت، سەریان داپۆشییەوە. دواتر لە نێوان ساڵەکانی ١٩٣٥ – ١٩٣٧ی زایینیدا، سێ بیری دیکەیان لێ دا، کە لە هەرسێکیاندا، نەوت و گاز دۆزرایەوە. نەوتی پازنان، لە ساڵەکانی جەنگی دووەمی جیهانییەوە، بە بۆری نەوت بۆ پاڵێوگەکانی نەوت ڕەوانە دەکرێ.

گەچساران

سەرەتای بیرهەڵکەندن و دۆزینەوەی نەوت، لە چاڵگەی گەچساراندا، بۆ ساڵی ١٩٢٨ دەگەڕێتەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی نەوتەکە، خڵتەیەکی زۆری هەبوو، لەو سەردەمەشدا توانای پاڵاوتنی نەبوو، ئەم کارە دواکەوت، تا لە ساڵی ١٩٣٦ز دا، دووبارە دەست بە چالاکی نواندن و قوڵکردنەوەی بیرەکانی پێشوو کرایەوە. لە ئەنجامدا لە بیری ژمارە سێدا، نەوتێکی زۆر دۆزرایەوە و تێکڕای بەرهەمی ڕۆژانەشی گەیشتە ٢٥ هەزار بەرمیل. دواتریش هەر لەم چاڵگەیەدا، لە ماوەی چوار ساڵی دواییدا، دە بیری دیکەش لێ دران. ئەوڕۆ ژمارەی بیرە نەوتەکانی ئەم چاڵگەیە، دەورووبەری چل دانە بیر دەبن، (١٩٥١ – ١٢ بیر). نەوتی گەچساران، بە بۆرییەکی سی سانتیمەتری، بۆ پاڵێوگەی ئەبادان دەنێردرێ.

لالی

دۆزینەوەی نەوت لە چاڵگەی لالیدا، بۆ ساڵی ١٩٤٨ز دەگەڕێتەوە. لەو ساڵەوە هەتاکوو ئەوڕۆ، بە دەیان بیری نەوت لەو چاڵگەیەدا لێ دراوە، (١٩٥١ – ١٥ بیر). هەندێ لەم بیرانە، بەرهەمدارن. تێکڕای ڕۆژانەی بەرهەمهێنانی نەوت، لە دەورووبەری هەشت هەزار بەرمیل دایە. لالی ٥٦ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژئاوای مەسجیدی سلێمانەوە دوورە.

ماموتین

گەڕان بە دوای نەوتدا لە کوردستاندا و بۆ جاری یەکەم، لەساڵی ١٩٠٧زدا، لەم نێوچەیەدا دەستی پێ کرد. دوای ئەوەی کۆمپانیاکانی نەوتی ئینگلیزی و فەرەنسی زانییان، گەڕانەکەیان هیچ ئەنجامێکی باشی لێ چاوەڕوان ناکرێ، هیچیشیان دەست نەکەوت، ئیدی درێژەیان بە کارەکەیان نەدا و وازیان لێ هێنا و ڕوویان لە نێوچەی مەسجیدی سلێمان کرد.

مەسجیدی سلێمان

خەڵکی مەسجیدی سلێمان هەر لە کۆنەوە، وەکوو خەڵکی نێوچەکانی دیکەی کوردستان، بابەگوڕگوڕ و کفری و مەندەلی، ئاشنایەتییان لەگەڵ نەوتدا هەبووە و بۆ پێویستییەکانی ڕۆژانە بەکاریان هێناوە و بازرگانیشیان پێوە کردووە. ئەم کارە وای لە کۆمپانیا ئاوروپاییەکان کرد، بایەخی تایبەتی بەو نێوچەیە بدەن. ئەمەش بۆ جاری یەکەم، لە کوردستان و هەموو ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا، لە بەرەبەیانی ڕۆژی ٢٦ی مانگی مای ساڵی ١٩٠٨ی زایینیدا، لە مەیدانی نەفتوون (دوایی ساڵی ١٩٢٦ز مەسجیدی سلێمان) نەوت دۆزرایەوە،. ئەم ڕووداوە، بە یەکێ لە ڕووداوە هەرە گرنگە مێژووییەکانی کوردستان دەژمێردرێ و بە تەواویش نەخشەی نێوچەکەی گۆڕی.

بەرزایی چاڵگەی نەوتی مەسجیدی سلێمان، (مەیدانی نەفتوون) لە سەر ئاستی ڕووی زەریا، لە نێوان ١٨٣ – ٣٠٥ مەتر دایە، پانتاییەکەشی ١١٧ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە،. ژمارەی بیرە نەوتەکانی لە سەرەتای دۆزینەوەی نەوت و هەتا ساڵی ١٩٥١ز، گەیشتبووە ٢٤٦ بیر. ئەوڕۆکە ژمارەیان ئەوەندە و نێو زیادی کردووە. لە هەمان کاتیشدا، بەرهەمی ڕۆژانەی ١٥٠ هەزار بەرمیل بوو، کە ئەوڕۆ دوو تا سێ هەزار بەرمیل زیادی کردووە.

نەوتی سەفید

پانتایی چاڵگەی نەوتی سەفید، ٤٨ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە. ٣٢ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژئاوای هەفت کل و ٧٢ کیلۆمەتر لە باشووری ڕۆژهەڵاتی مەسجیدی سلێمانەوە دوورە.

کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی و فارسی، لە ساڵی ١٩٣٤ز دا، دەستیان بە بیرهەڵکەندن کرد. لە ئەنجامدا گازی سروشتییان دۆزییەوە. بەڵام بەمەشەوە نەوەستان و وازیان نەهێنا، بەڵکوو لەسەر بیرلێدان بەردەوام بوون. لە دواییدا لە بیری ژمارە پێنج و لە ساڵی



**یەکەم بیری نەوت لە کوردستان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا - مەسجدی سلێمان، ١٩٠٨**

١٩٣٨ز دا، بۆ جاری یەکەم نەوتیان لەم چاڵگەیەدا دۆزییەوە. بەرە بەرە ژمارەی بیرەکانیان زیاد کرد و بە دەیان بیریان لێ دا، (١٩٥١ – ٢٥ بیر). نەوتی نەفت سەفید، بە بۆری بۆ پاڵێوگەی ئەبادانی ئێرانی دەنێردرێ.

نەوتی شاه

نەوت لە نەوتی شا و نەفتخانەدا، لە ساڵی ١٩٢٧ز دا دۆزرایەوە. ئەم چاڵگەیە، دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای دامێنی چیای زاگرۆسەوە. ژمارەی بیرەکانی هەتا ساڵی پەنجاکان، تەنیا شەش بیر بوون، کە زۆربەیان بەرهەمدار بوون، بیری دووەمیشیان لە هەموو بیرەکانی دیکەیان، زیاتر نەوتی تێدایە.و بە سەرچاوەیەکی گرنگی نەوت دادەنرێ و لە ٩٠٪ی نەوتی دەرهێندراوی ئەم چاڵگەیە پێک دەهێنێ.

هەفت کل

ئەم چاڵگەیە، ١٠٤ کیلۆمەتر لە باشووری ڕۆژهەڵاتی مەسجیدی سلێمانەوە دوورە. لە ساڵی ١٩٢٧ز دا، نەوتی لێ دۆزرایەوە و بە یەکێ لە دەوڵەمەنترین چاڵگە نەوتییەکانی کوردستان دادەنرێ. پانتاییەکەی دەوروبەری ٤٨ کیلۆمەتری چوارگۆشە دەبێ. ژمارەی بیرەکانی لە دەیان بیر تێپەڕ دەکا، (١٩٥١ – ٤٤ بیر)، نەوتەکەشی بە بۆری بۆ پاڵێوگەی ئەبادان دەبرێ.

### گازی سروشتی

دووەمین کەرەسەی مەتیریاڵی سووتەمەنییە لە کوردستاندا. بەشی هەرە زۆری لەگەڵ نەوتدا دێتە بەرهەم. ئەوڕۆ ئەو بیرانەی تەنیا گاز دێننە بەرهەم، لە وولاتدا زۆر کەمن. شوێنە گرنگەکانی دەرهێنانی گاز ئەمانەن:

– نێوچەی کەرکووک: بەناوبانگترین جێگای دەرهێنانی گازی سروشتییە لە کوردستاندا. بەرهەمی ساڵانەی خۆی لە سەدان هەزار مەتری سێگۆشە دەدات. یەدەکی دەست لێ نەدراوی دوو تا سێ جار زیاترە.

– تەنگەی بیجاڕ و بەبەقیر

دەکەوێتە ڕۆژئاوای کرماشانەوە. قەبارەی گازی سروشتی زانراوی تەنگەی بیجاڕ، نیو ترێلیۆن و هی مەیدانی بەبەقیریش دوو ترێلیۆن مەتری سێگۆشە دەبێ. قەبارەی گازی نەزاندراویشی، لە نێوچەی یەکەمدا، بە یانزە ترێلیۆن و لە دووەمیشدا بە ٢ – ٥ ترێلیۆن دەخەملێندرێ.

### بەردەڕەژوو

تاکوو ئێستا، بەردەڕەژوو لە چەندین نێوچەی کوردستاندا دۆزراوەتەوە و دەردەهێندرێ، شوێنی هەندێکی دیکەش، بە تەواوی دەسنیشان کراوە. گەورەترین کانگای بەردەڕژوو، دەکەوێتە نزیک شارۆچکەکانی ئەلبیستان و جزیرە و سیلوان.لێکۆڵینەوە جیولۆجییەکان، لە لایەن کۆمپانیا ئەوروپاییەکانەوە، بە تایبەتی ئەڵەمانەکان، لە ناوەڕاستی حەفتاکانەوە دەستی پێ کردووە و تاکوو ئەوڕۆش هەر بەردەوامە. پانتایی

ئەستێڵکی ڕەژووی ئەلبیستان و دەوروپشتی، نزیکەی یەک هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەیە، ئەستووراییی ڕینەکانی بەردەڕەژوو لە نێوان ٤٠ – ٨٠ مەتر دەبێ. یەدەکی زاندراوی بەردەڕەژوو ٤,٦ ملیۆن تەن دەبێ. لەم نێوچەیەدا، گەلێ کانگای بەردەڕەژوو هەیە، لە هەموویان بەناوبانگتر، ئەوەی گوندی (کیفلی) یە، کە یەدەکی دەست لێ نەدراوی، بە ٣,٢ ملیۆن تەن دادەنرێ.

## ٠٢ کەرەسەی خانووبەرە

کەرەسەی خانووبەرە لە زۆربەی نێوچوکانی کوردستان هەن، بە تایبەتی لە نێوچە شاخاوییەکاندا، بە زۆری دەست دەکەوێ. بەڵام تاکوو ئێستا، بە تەواوی سوودیان لێ وەرنەگیراوە. لێرەدا هەندێ لە کەرەسەکانی خانووبەرە، باس دەکەین:

– مەڕمەڕ

لە کانەکانی دیکەی کەرەسەی خانووبەرە، زیاتر دەردەهێندرێ و بەکار دەهێندرێ. بەناوبانگترین جێگای دەرهێنانیشی، ئەمانەن: پێنجوین، چوارتا، قەڵادزێ، هەڵەبجە، ماوەت، گەلاڵە، کێوی ئارتا، خۆشخان، ڕایات، دەربەند، مەمی خەلان، بێخمە، شەنگار، پردی چۆمان، کارونی، پرپیشە، سوورسوور، خان ئاباد، قەڵای شێخان، سرخە و زج، شترمل، ئەسفەند ئاباد.

– گەچ

گەچ ، کەرەسەیەکی خانووبەرەی گەلێ بڵاوە و لە دروسکردنی خانووبەرەدا، بە تایبەتی لە شارەکاندا، زۆر بەکار دەهێندرێ. ئەو شوێنە گرنگانەی گەچی لێ دەردەهێندرێ، ئەمانەن: سەری ئابلە، بابامورادی سەروو، ماربرە، شیروان، بلین جۆی زڕ، بانوشان، سەرتەنک، تاقتاری، شلم، ئابدانان. ئەم جێگایانە هەموویان، دەکەونە پارێزگاکانی ئیلام و کرماشان و لوڕستان و بازاڕگەش لە پارێزگای هەولێر دایە.

– کەرەسەی دیکە

کەرەسەی خانووبەرەی دیکەش، لە خۆڵ و زیخ و چەو پێک هاتووە و لە زۆربەی نێوچەکاندا، دەست دەکەون.

### ٠٣ کانە بریسکەدار و نابریسکەدارەکان

کانە بریسکەدار و نابریسکەدارەکان، لە کوردستاندا زۆرن. بەڵام تاکوو ئەورۆ، شوێنی بوونیان و قەبارە و چەشن و هەندێ شتی دیکەیان، بە تەواوی نەزاندراوە، هەر لەبەر ئەم هۆیەش، بە شێوەیەکی کورت لە خوارەوە، باسیان دەکەین و بەپێی توانا، شوێنەکانیان دەسنیشان دەکەین:

ئاسن:

تاکوو ئێستا، کانی ئاسن لە زۆر شوێن دۆزراوەتەوە و بەکار دەهێندرێ. گرنگترین نێوچەکانی ئەمانەن: ئاسناوا، ڕانیە، دەربەند، ڕایات، قەسری شیرین، ئاسیاب (٨٠ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژهەڵاتی کرماشانەوە دوورە)، دیڤریکی، حەکیم خان، گوڵەمان، ڕاجۆ، کری، عەلەمدار، میرانلی و هەندێ شوێنی دیکەش.

لیگنیت:

نێوچەکانی وان و بینگۆڵ و ئەرزەڕۆم و ئەرزنجان و مەرعەش... هتد، لە نێوچە بەناوبانگەکانی دەرهێنانی لیگنێتن لە کوردستاندا.

زەڕنیخ:

تا ئەورۆ لە کوردستاندا، بەناوبانگترین شوێنی دەرهێنانی، لە نێوچەی زرەشوراتی نزیک شارۆچکەی تکابە، کە دەکەوێتە پارێزگای ئازەربایجانی غەربی.

کرۆم:

شوێنە بەناوبانگ و زانراوەکانی ئەم کانە، بریتین لە پارێزگاکانی مەلاتییە، گازی ئانتەب، ئەلازیغ، ئەرزنجان و نێوچەکانی چیای کورد و گۆڵەمان.

مس: ئەم کانە، لە زۆر شوێن دۆزراوەتەوە، هەرە گرنگەکانیان ئەمانەن: پالۆ، پێنجوین (کانی مانگا)، چوارتا (ڕۆشان، کوڕەداوێ، کانجرین)، ماوەت (تیسالاوا، سفیک)، جیرا، شێخ ئەوداڵان و سەرگە.

مەنگەنیز:

لە نێوچەکانی سلێمانی و پێنجوین و ڕانیە و مەرعەش و ئەرزنجان و گازی ئانتەب و

گەلێ شوێنی دیکە دۆزراوەتەوە و بەکار دەهێندرێ.

گۆگرد:

ئەم کانە لە نێوچەکانی کەرکووک و ڕەئسولعەین و هەندێ جێگای دیکە، دۆزراوەتەوە و بەکار دەهێندرێ. دوور نییە لە شوێنی دیکەش هەبێ.

ڕەساس:

نێوچەکانی ڕۆژهەڵاتی زاخۆ، و باکووری ئامێدی و ڕۆژهەڵاتی ڕانیە و ئەرغەنی، ئەم کانەیان لێ دۆزراوەتەوە.

فۆسفات:

ماردین و گازی ئانتەب و چیای کورد، بە نێوچە هەرە بەناوبانگەکانی دەرهێنانی فۆسفات دادەنرێ لە کوردستاندا.

یۆرانیۆم:

ئەگەر پێکهاتەی جیۆلۆجی کوردستان لەبەر چاو بگرین، ئەوا بوونی یۆرانێم، بە دور نازاندرێ. دەڵێن لە چیای گارەی سەر بە پارێزگای دهۆک و هەندێ شوێنی دیکەش هەیە.

## بەشی چوارەم - پیشەسازی

بە شێوەیەکی گشتی، دانیشتووانی کوردستان بەشێکی زۆر لە پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەیان، لە کەلوپەلی دروسکراو، بە هۆی ئاسنگەر و دارتاش و جۆلا و چەخماچی و زێڕینگەر و بەرگدروو و پێلاودروو و سەفارچییەوە، دابین دەکەن. بەشێکی دیکەش، بە تایبەتی کەرەسەی نێومالّ و کشتوکالّ، وەکوو بەرمالّ و دووگرد و جاجم و ڕایەخ و فەرش و جەوالّ و شەڵتە و هەگبە و تورەکە، ژنان لە مالّەوە بە تەون دەیانهێننە بەرهەم. ئەوانەشی کە توانای بەرهەمهێنانی لە کوردستاندا نییە، بە تایبەتی هۆیەکانی گواستنەوە (ئۆتۆمۆ بێل، ماتۆڕ، پاسکیل)، چەک و ڕادیۆ و ئامرازی کشتوکالّی، لە دەرەوە دەهێندرێن.

پیشەسازی لە کوردستاندا، بە لقێکی ئابووری دواکەوتوو دادەنرێ، ئەمەش لە چەند خالّێکدا دەردەکەوێ، بە تایبەتی لە هاوبەشیکردنی سالانەی ئەم لقە ئابوورییەدا، لە پێکهێنانی بۆدجەی نیشتمانیدا، بە تەواوی دیارە، کە ڕێژەکەی لە ٥٪ کەمترە. هەروەها ژمارەی کرێکاران، کە ڕێژەکەیان لە ١٪ی گشت دانیشتووانی چالاکی ئابووریی زیاتر نییە. ئاستی هونەری کە لە کوردستاندا زۆر نزمە، لەبەر تەشەنەنەکردنی خوێندەواری و نەبوونی خوێندنگای زانستیە لە نێو کرێکاراندا. خالّێکی گرنگی دیکە ئەوەیە، کە دەولّەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، بەرنامەی هێشتنەوەی کوردستان، بە دواکەوتوویی پەیڕەو دەکەن. هەروەها بە شێوەیەکی ڕێکوپێک، پارە و سەرمایە چ لە لایەن خەلّکییەوە و چ لە لایەن دەولّەتەوە، لە بواری پیشەسازیدا بەگەڕ ناخرێ، ئەویش لەبەر ئەوەی، لەوە دەترسن قازانج نەکەن و دەسمایەکانیان لە کیس بچێ. جگە لەو بارودۆخە نائاسایی و نائاسایش و جەنگەی، ئەوڕۆ لە سەرتاپای کوردستاندا، بە شێوەیەکی بەردەوام لە ئارا دایە. سەرەڕای ئەمانەش هەمووی، لە دەسچوونی سەربەخۆیی ڕامیاریی و نەبوونی دامودەزگایەکی ناوەندی و قەوارەیەکی کوردستانی، تا هەموو جۆرە پلانە پیشەسازییەکانی سالانە دابڕێژێ و لە چوارچێوەی کۆمەلّگەی کوردەواریدا، وەگەڕی بخات. خەسلّەتە گرنگەکانی پیشەسازی کوردستان، کە لە ئاکامی ڕوونکردنەوەکانی پێشوودا هاتونەتە کایەوە، هەندێکیان ئەمانەن:

*بچوکی دەزگاکانی کار:

ژمارەی دەزگاکانی پیشەسازی لە سالّی ١٩٨٠دا، نزیکەی ٣٧ هەزار دەزگا بوو،

لەوانە ٩٦٪ (٣٥ هەزار) یان، لەو جۆرە دەزگایانە بوون، کە لە ١٠ کرێکار کەمتر، کاریان تێدا دەکردن، واتە دەزگای پچوک پچوک بووون. تەنیا لە ٤٪ (دوو هەزار) یان نەبێ، لەو دەزگایانە بوون کە دە کرێکار و زیاتر کاریان تێدا دەکردن، واتە دەزگای گەورە بوون.

+یەکجۆری بەرهەم:

زۆربەی زۆری دەزگاکانی پیشەسازی (٩٠٪)، بۆ بەرهەمهێنانی کەرەسە پێویستییەکانی خواردن تەرخان کراون، چونکە ئەم بەرهەمە، نە پێویستی بە سەرمایەیەکی گەورە هەیە و نە شارەزاییەکی زۆریشی دەوێ، لە هەمان کاتیشدا، بازاڕی ساغبوونەوەشی کەم نییە.

+ هەڵسوکەوت نەکردن لەگەڵ بازاڕی دەرەوەدا

بەرهەمی پیشەسازی کوردستان، بازاڕی پیشەسازی دەرەوەی زۆر کەمە، چونکە بەرهەمەکانی لە ڕووی چەندایەتییەوە، زۆر نزمن. لەبەر ئەوە دەبینین، بازاڕەکانی نێوخۆ بە یەکەمین سەرچاوەی سەرفبوونی بەرهەمە پیشەسازییەکانی کوردستان دادەنرێن.

+ کرێکارەکانی دەزگا جۆربەجۆرەکانی کوردستان، زۆربەیان لەو جۆرە کرێکارانەن، کە لە ڕووی خوێندەوارییەوە دواکەوتوون و پلەی شارەزاییان لە کاروباری پیشەسازیدا نزمە، یاخود هەر شارەزاییان نییە، جگە لەوەی پیشەسازییەکانی کوردستانیش، لەو جۆرە پیشەسازییانە نین، کە لەو جۆرە کرێکارانەیان زیاتر پێویست بێ.

+دواکەوتوویی ئامرازەکانی پیشەسازی

خاوەن پیشەکان هەتاکوو ئێستا، هەمان ئامراز لە دروسکردنی بەرهەمەکانی پیشەسازیدا بەکار دەهێنن، کە سەدان ساڵ لەمەوبەر، باووباپیرانمان لە پیشەسازیدا، بەکاریان هێناوە، وەکوو هەمووشمان دەزانین، توانای ئەم ئامرازانە، لە بەرهەمهێناندا زۆر کەمە.

+نزمی تێکڕای ژمارەی کرێکار

ئەوڕۆ تێکڕای ژمارەی کرێکار، لە دەزگا پیشەسازییەکاندا لە دە کرێکار کەمترە، (١٩٨٠ – ٦ کرێکار). ئەم ژمارەیە لە دەزگا گەورەکاندا، شەش جار زیاترە، (١٩٨٠ –

٥٤,٤ کرێکار) و له دەزگا پچوکەکاندا سێ جار کەمترە، (١٩٨٠ – ٢,٣ کرێکار).
بچوکی شوێنی دەزگا پیشەسازییەکان

بەرهەمهێنانی شتومەکی پیشەسازی، زیاتر له ماڵەکان و دوکانەکاندا دەکرێ، وەک لەوەی له کارگەکاندا بهێندرێتە بەرهەم، ئەوەش هۆکەی بۆ پچوکی دەزگاکانی بەرهەمهێنان و کەمی ژمارەی کرێکاران و نزمی ئاستی بەرهەمهێنان دەگەڕێتەوە.

+ خڕبوونەوەی دەزگا پیشەسازییەکان له شارەکاندا

ئاماری گشتی پیشەسازی وا نیشان دەدات، کە بەشی هەرە زۆری دەزگا پیشەسازییەکان (گەورە و گچکە)، له شارە گەورەکانی کوردستاندا کۆ کراونەتەوە. ئەمەش زیاتر بۆ بوونی کرێکاری شارەزا و بازاڕ و ڕێگەی هاتوچۆکردنی ئاسان و باجی کەم دەگەڕێتەوە. له نێو هەموو شارەکانی کوردستانیشدا، شارەکانی گازی ئانتەب، ورمێ، ڕیزی پێشەوەیان بۆ خۆیان داگیر کردووە. بڕوانه خشتەی ژمارە (٤٣).

**گرنگترین پیشەسازییەکانی کوردستان و دابەشبوونی شوێنی جوگرافییان:**

دابەشکردنی کەلوپەله پیشەسازییەکان، له نێوان جوگرافیزانەکان و پسپۆڕانی پیشەسازیدا، به چەند ڕێگایەک به ئەنجام دەدرێن، وەک قورسی و سوکی، دەسکرد و کارگەیی، کۆن و نوێ، دەرهێنان و گۆڕین... تاد. هەر یەکێ لەم جۆرە دیاریکردنانە، بۆ کۆمەڵگەیەکی تایبەت و بارێکی ئابووری دیاریکراو دەگونجێن و هەمووشیان به تەواو و ڕێکوپێک دادەنرێن، ئەگەر بێتو به شێوەیەکی ڕاست بەکار بهێندرێن. نووسەر به لەبەرچاوگرتنی باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و جۆری کەرەسە خاوەکان و ڕادەی بەکارهێنانیان، ئەم ڕێگەیە دەگرێتە بەر، کە پیشەسازی بەسەر دەرهێنان و گۆڕیندا، دابەش دەکات:

**خشتەی ٤٣ دەزگای پیشەسازی و کرێکاران لە پارێزگاکاندا، ساڵی ١٩٨٠**

| سەر ناوچە | دەزگە | | کرێکار | |
|---|---|---|---|---|
| | گچکە | گەورە | گچکە | گەورە |
| ئادیەمان | ٥٧٨ | – | – | – |
| ئاگری | – | – | – | – |
| بینگۆڵ | ٢٠٦ | – | – | – |
| بدلیس | ٢٦١ | ٨ | – | – |
| دیاربەکر | ١٠٣٨ | ٢٨ | – | – |
| ئەلازیغ | ١١٥٥ | ٤٦ | – | – |
| ئەزرنجان | ٦٢٣ | ٤٧ | – | – |
| ئەرزەڕۆم | ١٠٦١ | ٧٠ | – | – |
| گازی ئانتەب | ٤٥٩٢ | ٥٥٥ | – | – |
| هەکاری | ٦٧ | ١ | – | – |
| مەلاتیە | ١٥٧٠ | ٥١ | – | – |
| مەرعەش | ١٨٤٠ | ٧٧ | – | – |
| ماردین | ٨٧٢ | ١١ | – | – |
| موش | ٢١٨ | ٣ | – | – |
| سیرت | ٥٦٤ | ١١ | – | – |
| دەرسیم | ١٣٧ | – | – | – |
| ئۆرفە | ١٦٤٤ | ٣٠ | – | – |
| وان | ٥١٨ | ٣٢ | – | – |
| نەینەوا | ٣٩٥٧ | ١٧ | ٨٨١٧ | ١٢٥٤٠ |
| کەرکووک | ١٦٨٥ | ٤٢ | ٣٢٦٦ | ٢٥٠٢ |
| دهۆک | ٢٧١ | ٧ | ٤٧٦ | ٦١٥ |
| هەولێر | ١٥٢٠ | ٥٢ | ٣٤٠٨ | ٧٥٢١ |
| سلێمانی | ١٤٩٧ | ٤١ | ٢٨٩٧ | ٣٢٩١ |
| ئازربایجانی غ | – | ١٣٠ | – | ٥٣٥٣ |
| کرماشان | – | ٥٥ | – | ٤٨٧٢ |
| کوردستان | – | ٤٩ | – | ١١٢٠ |
| بەختیاری | – | ٨٦ | – | ٩٥٥ |
| ئیلام | – | ٦١ | – | ٤٥٩٠ |
| لورستان | – | ٥ | – | ١٦٢ |
| کوهگیلویە | – | ٧ | – | ١٤٨ |

## ١. پیشەسازییەکانی دەرهێنان

بریتییە لە دەرهێنانی نەوت و گازی سروشتی و گۆگرد و ئاسن و گەلێ کانزای دیکە.

### ١/ پیشەسازی دەرهێنانی نەوت:

کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەوروپایی، وەکوو کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی – فارسی (١٩٠٩ز)، کۆمپانیای نەوتی بەختیاری، کۆمپانیای نەوتی ئێرانی نیشتمانی (١٥ مارسی ١٩٥١)، کۆنسۆریم (ئۆگەستی ١٩٥٤ز)، کۆمپانیای نەوتی ئەڵەمانی (١٨٨٨ز)، کۆمپانیای مافەکانی ئەفەریقا و ڕۆژهەلات (١٩١٠ز)، کۆمپانیای نەوتی تورکی (١٩١٤ز)، کۆمپانیای نەوتی عێراق (١٩٢٩ز)، کۆمپانیای نەوتی خانەقین (١٩٢٧ز)، کۆمپانیای پالاوتنی نەوتی عێراق (١٩٥٢ز) کۆمپانیای تاووتوێکردنی نەوتی بەریتانیا (موسڵ ــ ١٩٢٥ز)، کۆمپانیای عێراق بۆ کارەکانی نەوت (١٩٧٢ز)، کۆمپانیای نەوتی کۆنکۆردیای ئەڵەمانی (١٩٥٦ز)، کۆمپانیای مونهیل لە کۆمپانیای نەوتی ئەمەریکی، کۆمپانیای گشتی بۆ پترۆڵی سووری (١٩٥٨ز)، کۆمپانیای نەوتی تورکی، کۆمپانیای نەوتی ئەرسان، کۆمپانیای نەوتی مۆبیل ڕانت، کۆمپانیای شێڵ.. هتد. ئەمانە هەموویان، هەریەکەیان لەسەردەمێکدا، بە دوای نەوتدا گەڕاون و دەریان هێناوە و پالاوتوویانە و بۆ دەرەوەشیان ناردووە.

نەوت لە ٢٦ مانگی مای ساڵی ١٩٠٨دا، بۆ جاری یەکەم لە کوردستاندا، ڕەنگە لە باشووری ڕۆژئاوای ئاسیاشدا، لە قولایی ١٢٠٠ مەتر. لە نێوچەی مەیدانی نەفتون (دواتر مەسجیدی سلێمان) و لە شوێنێ بە ناوی خەروەسان، دوای زیاتر لە بیست ساڵ، بە واتەیەکی دیکە، لە ١٤ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٧زدا، لە نێوچەی بابەگوڕ.گوڕی شاری کەرکووک، لە هاوینی ١٩٤٠زدا، لە ڕامانشەلۆی (باتمان) و لە ١٩٥٦ لە قەرەشۆک (قەرەچوغ) (قەزای مالکیە) دۆزراوەتەوە. لەو کاتەوە تا ئەوڕۆ، هەزاران ملیۆن تەن نەوت، لە خاکی کوردستان دەرهێنراوە، هەر هەمووشی بێگانەی داگیرکەر، زۆربەیان بۆ خۆیان بردووە و خێراتەکەشیان خواردووە، لەبری ئەوەی کوردستانی پێ ئاوەدان بکەنەوە، بە پێچەوانەوە، بە تەواوی لات و وێرانیان کردووە.

ئاماری نەوتی کوردستانمان (لە ساڵی دەرهێنانییەوە تاکوو ئەوڕۆ) لەبەر دەستدا نییە، چونکە ئاماری هەر نێوچەیەکی نەوت، بە تەنیا بلاو ناکرێتەوە، بەڵکوو بە شێوەیەکی گشتی هەندێ ژمارە پێش چاو دەخەن. بە پشتبەستن بەم ژمارانە و ئەوانەی دەزگا نێونەتەوەییەکان بلاوی دەکەنەوە، لەگەڵ هەندێ ئاماری دیکەشدا، ژمارەکانی نێو خشتەی ژمارە (٤٤) پێشنیاز دەکەین لەگەڵ گرافی ژمارە ٨.

**خشتەی ٤٤ بەرهەمهێنانی نەوت (ملیۆن بەرمیل)، ١٩٦٥-١٩٩٠ (خاملاندن)**

| ساڵ | کۆ | چاڵگە | | |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| | | باکوور | ڕۆژهەڵات | باشوور |
| ١٩٦٥ | ٩٩١٩٥ | ١٥٣٤١ | ٤٥٤٧٧ | ٣٨٣٧٧ |
| ١٩٦٦ | ٨٩٥٥٦ | ٢٠٤١ | ٣٩٧٧٣ | ٤٧٧٤٢ |
| ١٩٦٧ | ٨٣١١٦ | ٢٧٢٥ | ٣٩٤٥٦ | ٤٠٩٣٥ |
| ١٩٦٨ | ٩٥٦٤٥ | ٣١٠٣ | ٤٥٩٥١ | ٤٦٥٩١ |
| ١٩٦٩ | ١١٧٣٦٩ | ٣٥٩١ | ٥٧١٩٥ | ٥٦٥٨٣ |
| ١٩٧٠ | ١٢٤٣٤٧ | ٧٧٨٧ | ٥٨٦٩٦ | ٥٧٨٦٥ |
| ١٩٧١ | ١٣٥١٦٢ | ٨٤٥٦ | ٦٣٤٥٢ | ٦٣٢٥٤ |
| ١٩٧٢ | ١٢٩٧٥٩ | ٩٢٥١ | ٦٣٨٢٥ | ٥٦٦٨٣ |
| ١٩٧٣ | ١٤٠١٣٦ | ٩٧٣٥ | ٦٧٦٢٢ | ٦٢٧٧٩ |
| ١٩٧٤ | ١٥١٨٥٢ | ١٢٥٦٧ | ٦٩٧٤٢ | ٦٩٥٤٣ |
| ١٩٧٥ | ١٤٥١٢٤ | ١٢٦٣٤ | ٦٦٧٢٤ | ٦٥٧٦٦ |
| ١٩٧٦ | ١٥٥٥٢٦ | ١١٨٣٠ | ٧٠٢٧١ | ٧٣٤٢٥ |
| ١٩٧٧ | ١٥٦١٧٩ | ١١٨٤٧ | ٧٠٣٩٦ | ٧٣٩٣٦ |
| ١٩٧٨ | ١٥٧٧٨٥ | ١١٤٩٧ | ٧٢٤٥٩ | ٧٣٨٢٩ |
| ١٩٧٩ | ١٦٢٦٩١ | ١١٩٢٤ | ٧٣٥٣٢ | ٧٧٢٣٥ |
| ١٩٨٠ | ١٥٧٣٧٤ | ١١٧٤٧ | ٧٢٨٩٩ | ٧٢٧٢٨ |
| ١٩٨١ | ١٤١٤١٢ | ١١٨٥٦ | ٦٦٩٣٥ | ٦٢٦٢١ |
| ١٩٨٢ | ١٣٥٠١٨ | ١١٣٤٣ | ٦٤٢٩١ | ٥٩٣٨٤ |
| ١٩٨٣ | ١٠٣٨٤٢ | ١١٥٦٢ | ٤٣٢٩٨ | ٤٨٩٨٢ |
| ١٩٨٤ | ١٠٠٣٠٩ | ١١٥٠١ | ٤٢٨٢٩ | ٤٥٩٧٩ |
| ١٩٨٥ | ١٧٦٥٦٦ | ٩٢٣٨٣ | ٤١٢٨٩ | ٤٢٨٩٤ |
| ١٩٨٦ | ١٠٩١١٦ | ١١٧٦١ | ٤١٣٣٣ | ٥٦٠٢٢ |
| ١٩٨٧ | ١٣٣٧٢٣ | ١٤٧٩٢ | ٥٠٩٠٨ | ٦٨٠٢٣ |
| ١٩٨٨ | ١٥٠٨٢٨ | ١٦٧٣٣ | ٦٥٠٧٠ | ٦٩٠٢٥ |
| ١٩٨٩ | ١٧٣٧٦٣ | ٢١٢٠٥ | ٦٨٣٠٢ | ٨٤٢٥٦ |
| ١٩٩٠ | ١٧٣٤٧٩ | ٢٠٤٨٥ | ٦٨٤٢٥ | ٨٤٥٦٩ |

بەرهەمی نەوت لە کوردستاندا، وەکوو لە ژمارەکانی نێو خشتەکەی سەرەوەدا دەردەکەوێ، لەم چارەکە سەدەیەی دواییدا، لە١٩٥ ٩٩ ملیۆن تەنەوە بووە بە ٤٧٩ ١٧٣ ملیۆن تەن، واتە زیادەکە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٥ – ١٩٩٠ززدا، ٢٨٤ ٧٤ ملیۆن تەن نەوت بووە، ئەگەر هەر تەنێکی بە ١٢ دۆلاریش فرۆشرابێ، ئەوا پارەکەی ٧٤٨ ٠٨١ ٢ ملیۆن دۆلار دەکات.

بەرهەمی ساڵانەی نەوت لە کوردستاندا، لە سێ نێوچەی سەرەکی نەوت پێک دێت، کە هەریەکەیان بە ئەندازەی توانای خۆیان، لە پێکهێنانی ئەو داراییەدا هاوبەشن. سەیری خشتەی ژمارە (٤٤) و گرافی ژمارە ٩ بکە.

– بەرهەمی نێوچەی نەوتی باکوور

بەرهەمی ئەم نێوچە نەوتییە، لە ١٢٪ی تێکرای نەوتی کوردستان دەبێ. نەوت بەردەوام لە زیادبوون دایە و لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٥ – ١٩٩٠ززدا، لە ٣٤١ ١٥ ملیۆن تەنەوە زیادی کرد بۆ ٤٨٥ ٢٠ ملیۆن تەن، واتە زیادییەکەی زیاتر لە نزیکەی پێنج ملیۆن تەن بوو. کۆمپانیا نەوتییەکان، ئەم بەرهەمە بەو شێوەیە لە نێوان خۆیاندا دابەش دەکەن. کۆمپانیای شێل – ٤٤٪ و کۆمپانیای نەوتی تورکی – ٣٩٪ و کۆمپانیای نەوتی مۆبل یانۆیل – ١٦٪ و کۆمپانیای نەوتی ئەرسان – ١٪ی گشت بەرهەمەکەیان بەردەکەوێ.

– بەرهەمی نێوچەی نەوتی ناوەڕاست

نێوچەی نەوتی نێوەڕاست، ساڵی لە ٣٩٪ی نەوتی گشت کوردستانی لێ بەرهەم دەهێنرێ، قەبارەی بەرهەمەکەشی هەر لە زیادبوون دایە، پاش ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٥زدا، ٤٧٧ ٤٥ ملیۆن تەن بوو، لە ساڵی ١٩٩٠دا، گەیشتە٤٢٥ ٦٨ ملیۆن تەن، واتە لەو ٢٥ ساڵەی دواییدا، ٩٤٨ ٢٢ ملیۆن تەنی زیاد کردووە. هەموو نەوتەکە، لە لایەن کۆمپانیای نەوتی عێراق بۆ کاروباری نەوت بەرهەم هێنراوە.

– بەرهەمی نێوچەی نەوتی باشوور

ڕێژەی بەرهەمی ئەم نێوچە نەوتییە، لە ٤٩٪ی هەموو بەرهەمی نەوتی ساڵانەی کوردستان پێک دەهێنێ. بەرهەمەکەی لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٥ – ١٩٩٠ زز، لە٣٧٧ ٣٨ بەرمیل نەوتەوە بۆ ٥٦٩ ٨٤ ملیۆن بەرمیل زیادی کردووە، واتە لەو ماوەیەدا ١٩٢ ٤٦ ملیۆن تەن زیادی کردووە. نەوتی ئەم نێوچە نەوتییە، لە لایەن کۆمپانیای نیشتمانی ئێران و کۆنسۆریم (کۆمەڵەی کۆمپانیای نەوتی ئەوروپا) دێتە بەرهەم.

**گرافی ٩**


باکوور
ڕۆژهەڵات
باشوور
11.8%
39.4%
48.7%
بەرهەمی نەوتی هەرێمەکان،١٩٩٠

**پیشەسازی دەرهێنانی گازی سروشتی**

بەرهەمی ساڵانەی گازی سروشتی، لە نێوچە نەوتییەکانی کوردستان، باکوور و نێوەڕاست و باشوور، چەندین ملیۆن مەتری سێگۆشە دەبێ، بەڵام بە داخەوە بەشی هەرە زۆری، هەر لە شوێنی بەرهەمهێنانی بە خۆڕایی دەسوتێندرێ، بەشەکەی دیکەشی لە هەندێ شوێن، بۆ دروسکردنی گۆگرد بەکار دەهێنرێ، لەم ساڵانەی دواییشدا، لە سنوورێکی زۆر دیاریکراودا، بۆ پێویستی ڕۆژانەی خەڵکی بەکار هێنراوە. لەبەر ئەوەی لە کوردستاندا، کەرەسەیەکی خاوی گازی سروشتی زۆر و زەبەندەی تێدایە، بازاڕیشی گەرمە، دیارە پیشەسازی گازی سروشتی، دواڕۆژێکی باشی دەبێ.

**پیشەسازی دەرهێنانی مەتیریاڵە جۆربەجۆرەکانی دیکە**

پیشەسازییەکی دواکەوتووە و بەرهەمی ساڵانەشی لە چەند هەزار تەنێ تێپەڕ ناکات. بۆ نموونە، لە نێوچەی دێڤریگی – ٩٠ هەزار تەن لە خۆڵی ئاسن، لە نێوچەی مەلاتیە – ٤٥ هەزار تەن لە خۆڵی کرۆم و ٤،٢ ملیۆن تەن بەردەخەڵوز، لە نێوچەی کەبان – ٢٠ هەزار تەن لە خۆڵی قورقوشم، لە نێوچەکانی مەعدەن و ئەرغەنی ــ٣٠ هەزار تەن لە خۆڵی مس، لە نێوچەی عەفرین – ٦٠ تەن گۆگرد.

## ٠٢ پیشەسازییەکانی گۆڕین

پیشەسازییەکانی گۆڕین، لە ڕووی بەرهەمی ساڵانە (٨٥٪) و ژمارەی کرێکار (٥٩٪) و دەزگاکانی بەرهەمهێنانەوە (٩٦٪)، لە ساڵی ١٩٨٥ی زایینیدا، گەورەترین سەرچاوەی بەرهەمی نیشتمانی پێک دەهێنا. پیشەسازییەکانی گۆڕین ئەمانەن:

- **پیشەسازییەکانی خۆراک**

بریتییە لە هەموو ئەو جۆرە پیشەسازییانەی کە لە ماڵەکاندا بە ئەنجام دەگەیەندرێ، وەکوو نانکردن، چێشتلێنان، خۆشاو دروسکردن، دۆ و ماست و پەنیر و کەرە دروسکردن، ڕۆنگرتن، دۆشاوگرتن و گەلێ خواردنی دیکەش، کە تا کۆتایی پەنجاکان، بە زۆری لە ماڵەکان دروست دەکران، خەڵکی ئەو نێوچانەی کە خواردەمەنییەکانی لێ دروست دەکرا، پێویستییان بە بازرنە بوو. بەڵام دوای ماوەیە، لە ئەنجامی گۆڕانە کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەکاندا، خەڵکی وردە وردە بۆ دابینکردنی نەک هەر خواردنی ساڵانەیان، بەڵکوو بۆ

کڕینی خواردنی ڕۆژانەشیان، ڕوویان کردە بازاڕ و کڕین و فرۆشتن، لە ماڵەکاندا کەم بۆوە. ئەمانە هەموو پێکەوە، بوونە هۆی ئەوەی، بواریێ بخولقێنێ و کارێکی زۆر لەو بوارانەدا پەیدا ببێ، بە سەدان دەزگای بەرهەمهێنانی خواردەمەنی، لە دوکان و کارگە و فابریکەکاندا بەرهەم بهێندرێ. پیشەسازییەکانی خواردن گەلێکن، بەڵام ئێمە لێرەدا هەندێکیان باس دەکەین:

– پیشەسازی هاڕین

هاڕین بە یەکێ لە کۆنترین پیشەسازییەکانی کوردستان دادەنرێ. دۆزینەوە و پەیدابوونی ئەم پیشەسازییە، بۆ سەرەتای چاندنی دەغڵودان لە گردی چەرمۆ و شوێنەکانی دیکەی وڵات دەگەڕێتەوە. لە سەرەتاوە خەڵکی گەنم و جۆیان، بە بەرد دەکوتا و دەهاڕی. لە دوایی‌دا بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، جۆنیان بەکار هێنا، دواتریش دەستاڕ و ئاشی ئاو هاتە کایەوە. لە چلەکانیشەوە خەڵکی ئاشی ئاگر و لە کۆتایی حەفتاکانیشەوە، مەکینەی هاڕینی ئاردی کۆڵانان بەکار هێنرا. ئەم ئامرازانە، لە هەموو شارەکان و زۆربەی گوندەکانی کوردستان هەن.

ئارد بە پلەی یەکەم بۆ نانکردن بەکار دەهێندرێ، ئینجا بۆ ماکەرۆنی و هەڕشتە و پاقلاوە و هەندێ پیشەسازی خواردنی دیکەش دەبێ. پێویستی ساڵانەی کوردستان لە ئارد، دەگاتە چەند هەزار تەنێک، کە بەشێکی زۆری لە نێو وڵاتەکە خۆیدا، بەرهەم دەهێندرێ.

– پیشەسازی ڕۆنی ڕووەک

بەرهەمی کوردستان لە ڕۆنی ساغ، تا سەرەتای پەنجاکان، بەشێکی زۆری لە پێویستییەکانی کۆمەڵانی خەڵکی ئەم وڵاتە، دابین دەکرد. بەڵام دوای زیادبوونی ژمارەی دانیشتووان و کەمبوونەوەی ڕۆنی ساغ، لە ئەنجامی سەربڕینێکی زۆری بێسەروبەری ئاژەڵەکان و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لە نێویاندا و بەرزبوونەوەی پلەی مردنی ئاژەڵەکان و گەشەکردنی باری ئابووریی و گەرمبوونی بازاڕی کڕین و فرۆشتن و تەسکبوونەوەی پانتایی لەوەڕگاکان و ماندوبوونی بێ ڕادەی ئاژەڵدارەکان بە بەخێوکردنی مەڕوماڵاتەوە، بەرهەمهێنانی ڕۆنی ساغ، بە شێوەیەکی لەبەرچاو کەمی کرد، بە ڕادەیەک خەڵکی ناچار بوون، لە خواردنی ڕۆژانەیاندا، ڕۆنی ڕووەک بەکار بهێنن. بەشی زۆری ئەو جۆرە ڕۆنە، لە ڕووەکەکانی گوڵەبەڕۆژە و کونجی و تۆوی لۆکە و کەتان... تاد دەردەهێندرێ. ئەوەی

دڵخۆشکەرە، ئەم جۆرە ڕووەکانە لە کوردستاندا دەڕوێن. ئەوڕۆ لە شارە گەورەکاندا، چەندین جۆر کارگەی بەرهەمهێنانی ڕۆنی ڕووەک دامەزراوە.

- پیشەسازی شەکر

توانای بەرهەمهێنانی کەرەسەی خاوی شەکر (چەوەندەر و قامیشی شەکر)، بە نرخێکی هەرزان و پەرەسەندنی بەکارهێنانی شەکر لە کوردستاندا، لە ئەنجامی نەشونماکردنی ژمارەی دانیشتووان و پەیدابوون و گەرمبوونی بازاڕەکانی نێوخۆ و گەشەکردنی بازرگانییەکنی دەرەوەی وولات و پاراستنی پارەی قورس، ئەمانە هەمووی وای لە کاربەدەستانی دەوڵەت کردووە، لە هەندێ لە شارەکانی وولاتدا، بیر لە دامەزراندنی کارگەی شەکر بکەنەوە. لێرەدا پەنجە بۆ هەندێ لەو کارگانە ڕادەکێشین:

- کارگەی شەکری ئیسلام ئابادی غەربی: ئەم کارگەیە لە ئیسلام ئابادی غەربی سەر بە پارێزگای کرماشان، لە ساڵی ١٩٣٤ی زایینیدا دروست کراوە. بەرهەمی ساڵانەی تەنیا ٦٥٠ تەن شەکرە. سەرچاوەی کەرەسەی خاوی، لە چەوەندەری کێڵگەکانی دەوروبەری هەمان پارێزگا پێک هاتووە. کارگەیەکی زۆر پچکۆلەیە و بەرهەمەکەشی، تەنیا بەشێکی کەم لە پێویستییەکانی دانیشتووانی ئەم بەشە ئیدارییە دابین دەکات.

- کارگەی شەکری کرماشان: ئەم کارخانەیە لە ساڵی ١٩٦٣ی زایینیدا دروست کراوە، بەرهەمی ساڵانەی ٧٠٠ تەن شەکر و قەندە. بەرهەمەکەی گەلێ کەمترە، لە پێویستی پارێزگای کرماشان، بەڵام دەتواندرێ بەرهەمەکەی زیاد بکرێ، ئەگەر بەرهەمی چەوەندەر و قامیشی شەکر لە کێڵگەکان، زیاتر بچێندرێ.

- کارگەی کۆمپانیای گشتی شەکری موسڵ: یەکێکە لە کارخانە گەورەکانی شەکری کوردستان، لە ساڵی ١٩٥٧ی زایینیدا، لە باشووری شاری موسڵ، دەست بە دروسکردنی کراوە و لە کۆتایی ساڵی ١٩٥٨دا تەواو بووە و لە مانگی دێسەمبەری هەمان ساڵدا، دەستی بە بەرهەمهێنانی شەکر کردووە. ئەم کارگەیە دوو ملیۆن و نیو دیناری عێراقی تێچووە.

توانای بەرهەمهێنانی ئەم کارگەیە، لە سەرەتای دامەزراندنیدا تەنیا ٨٠ تەن شەکری سپی بوو، کە لە ٨٠٠ تەن چەوەندەر دەردەهێنرا و زۆربەشی لە دەوروبەری شارۆچکەی

مـەخـمـور دەچێندرا. هەر بە تەواوبـوونی چەوەندەری وولات، هەمـوو سـاڵێ کـارگـەکـە لە کارکردن و بەرهـەمـهێنان دەوەستێ، تا کەژی ئایندەی کشتوکاڵ دەست پێ دەکاتەوە.

کـارگـەرانی کـارگـەکـە بیـر لـەوە دەکـەنەوە، کـە بە شـێـوەیەکی بـەردەوام کـار بکەن و کارگەکە لە کـارکردن و بەرهـەمـهێنان ڕانـەوەسـتێ، تا بەو شـێـوەیە بتـوانن، بەرهـەم زیاد بکەن و قـازانجـێکی پتـر بە دەست بهـێنن، بۆیە پاش تەواوبوونی وەرزی چـەوەندەر، هـەمـوو سـاڵێ لە دەرەوەی وولات، ١٠٨ تەن شـەکری خـاویان بۆ دەهێنا، لەو شـەکرە خـاوەش، ١٠٠ تەن شـەکری سپییان دەردەهێنا. بەو شێوەیە توانای بەرهـەمهێنانی کارگەکە زیادی کرد و بەرهـەمی سـالانەی گـەیشـتـە ١٨٠ تەن. کـارگـەی شـەکری مـوسڵ، لەبـەر نەبوونی کـرێکاری شـارەزا و لێـزان، کـەمـی بەرهـەمـی سـالانەی وولات لە کـەرەسـەی خـاو – چەوەندەر، هەتا ئەورۆ هـەموو توانایەکی بەرهـەمـهێنانی بەگەڕ نەخسـتووە. بەرهـەمی ئێستـای ئەم کارگەیە، لـە دەوروبـەری ١٥٠٠ تـەن (١٩٧١ – ١٧٣٠ تـەن)، (١٩٧٢ – ٨٩٠ تـەن)، (١٩٧٣ – ٣٤١ تەن). لە شـەکری سپی، کلۆ، ئالیک، نورە، هـەویربەترشـە.

– کارگەی شـەکری میاندواو: کەوتۆتە شارۆچکەی میـاندواوی ئازەربایجانی غەربی، لە سـاڵی ١٩٣٤ی زایینیـدا دروست کـراوە. بەرهـەمـی سـالانـەی لە سـەرەتای دروسکردنیـدا، تەنیـا ٦٥٠ تەن بوو، لە ساڵی ١٩٨٩ی زایینیدا، دوو تا سێ جار بەرهەمی سالانەی زیادی کرد و گەیشـتە ٢٠١ ٢٦ تەن. ئەم کارگەیە ساڵی تەنیا ٢٠٧ ڕۆژ کـار دەکا، ڕۆژەکانی دیکە لەبەر نەبوونی کەرەسەی خاو، لە کارکردن دەوەستێ.

– کـارگـەی شـەکری ورمێ: ئەم کـارگـەیە لە سـاڵی ١٩٣٩ی زایینیدا، لـە شـاری ورمێ دامـەزراوە، بەرهـەمـی سـالانەی لە سـەرەتادا، تەنیـا ٧٠٠ تەن شـەکر بوو، لە دواییدا زیادی کرد تا لە سـاڵی ١٩٨٩ی زایینـیدا، گەیشـتـە ٢٥٤ تەن لە شـەکری ورد و کلۆ. کـارخـانەی شـەکـری ورمێ، لەبەر نەبـوونی کـەرەسـەی پێـویست، هـەمـوو ڕۆژەکـانـی سـاڵ کـار نـاکـات، بەڵکوو کە چەوەندەری لێ بڕا، ئیدی لە کارکردن دەوەستێ.

– کـارگـەی شـەکری خـوڕەم ئـاباد: لەم سـالانەی دواییدا دامـەزراوە. تێکڕای بەرهـەمی ڕۆژانەی ١٢٠٠تەنە لە شـەکر و کلۆ. بەرهـەمی سالانەشی لە ساڵی ١٩٨٩ی زایینیدا ٨٣٠٠ تەن بوو. ساڵی تەنیا ٦٢ ڕۆژ کار دەکات، ڕۆژەکانی دیکە لەبەر نەبوونی کەرەسەی خاو، لە کار دەوەستێ.

– پیشەسازی سپیایی

مەڕدارەکان و خاوەن مانگا و گامێشەکان، لە شیری ئاژەڵەکانیان ماست و پەنیر و کەرە و دۆ و کەشک، بە هەموو جۆرەکانییانەوە، دروست دەکەن. ئەم کارانەش بە شێوەیەکی گشتی، لە لایەن ژنانەوە بە ئەنجام دەگەیەندرێ و بە هەمان شێوەی دەیان ساڵی لەمەوبەر، تاکوو ئێستاش لە ماڵەکاندا، مەشکە و مەنجەڵی سفر و زنجیردار و پێستە و هەموو جۆرێ لە ئامرازە سەرەکییەکانی ئەم پیشەیە، نەوەک هەر لە نێو کۆچەرەکان، بەڵکوو لە نێو نیشتەجێکانیشدا بەکار دەهێندرێ. بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا، لە زۆر نێوچەی کوردستان، بە تایبەتی لە شارە گەورەکاندا، بۆ بەرهەمهێنانی سپیایی، گەلێ کارگە پەیدا بوون، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو گۆڕانەدا بوو، کە بەسەر شێوازی بەخێوکردنی مەڕوماڵاتدا هات و هەندێ کێڵگەی پەروەردەکردنی ئاژەڵ کرایەوە، کە خۆی لە بەخێوکردنی مانگا و گامێشدا دەبینی. کۆمپانیای بەرهەمهێنانی سپیایی لە شارەکانی ئەرزنجان و وان و هەولێر و کرماشان... هتد دامەزران، هەندێکاین وەکوو ئەمانەی لای خوارەوە، بایەخی تایبەتییان هەیە:

– کۆمپانیای سپیایی ورمێ

ئەم کۆمپانیایە لە ساڵی ١٩٨١ی زایینیدا، بۆ بەرهەمهێنانی ماست و پەنیر و کەرە و سەرتو و ڕۆنی خاو، لە شاری ورمێ دروست کراوە. بەرهەمی لە ساڵی ١٩٨٩ی زایینیدا، ٣٢١٦ تەن بوو، (١٩٨١ – ٤٢٥٥ تەن) و دەسکوتی ساڵانەشی ٢٠٦ ملیۆن ڕیاڵ بوو (١٩٨١ – ١٧٣ ملیۆن ڕیاڵ).

ـ کۆمپانیای سپیایی جەیلان پینار

کۆمپانیایەکی گەورەی بەرهەمهێنانی سپیایی و بەخێوکردنی ئاژەڵە لە کوردستاندا. بەرهەمی ساڵانەی لە ماست و پەنیر دەگاتە سەدان تەن و لە گۆشت لە چەند هەزار تەنێ تێپەڕ دەکات. لەم کۆمپانیایەدا سێ هەزار کرێکار کار دەکەن.

– پیشەسازی لە قتوکردن

ئەگەرچی هەڵگرتنی گۆشت و پەنیر و دۆشاو و دۆشاوی تەماتە و هەندێ بەرهەمی دیکەش، لە گۆزەی شین و مەشکە و پێستە و مەنجەڵدا لە کوردستاندا باوە، لە قوتوکردن تاکوو ساڵەکانی شەستیش نەبوو، بەڵام لەو ساڵانە بە دواوە، لە هەندێ شوێن کارگەی

تایبەتی بۆ لە قوتوکردنی خواردەمەنی، بە تایبەتی بەرهەمی کشتوکاڵ، لە هەریر و دهۆک و دیاربەکر و کرماشان و هەندێ شوێنی دیکە، پەیدا بوون. پیشەسازی لە قوتوکردن لە لایەکەوە، بەشێکی زۆری بەرهەمی کشتوکاڵ، لە نێوچە دوورەکان لە بازاڕەوە، لە ڕزین و لەنێوچوون ڕزگار دەکات و لە لایەکی دیکەشەوە، خواردەمەنی جۆراوجۆر، لە وەرزەکانی بەرهەم نەهێناندا، بۆ خەڵکی دابین دەکات.

– پیشەسازییەکانی دیکە

پیشەسازی سرکە لە کوردستاندا زۆر بڵاوە، بە تایبەتی لەو نێوچانەدا کە میوەیەکی زۆری لێ دەڕوێ، وەکوو ترێ و هەرمێ و هەنار و هەنجیر. هەروەها وشککردنەوەی ناوکە کولەکە و دەنکە گوڵەبەڕۆژە و بایەم و فستق... تاد لە زۆربەی زۆری نێوچەکانی کوردستاندا پەیڕەو دەکرێ.

**٢/ پیشەسازییەکانی چنین و ڕستن**

پیشەسازی چنین و ڕستن، بە یەکێ لە هەرە پیشەسازییە کۆنەکانی کوردستان دادەنرێت. ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووان، بە تایبەتی ژنان لە ماڵەکان و لە کارخانەکان، لەم بوارەدا چالاکی ئابووری خۆیان دەنوێنن. بەرهەمی ساڵانەی پیشەسازی خۆماڵی، خۆی لە چەند هەزار تەنێ دەدات و بەشێکی گەورە لە پێویستییەکانی دانیشتووانی وولات. دابین دەکات. ئەم پیشەسازییانەش بریتین لەم جۆرانەی خوارەوە:

– پیشەسازی لۆکە

مەبەست لە ڕستنی لۆکە بە تەشی و مەکینە، زیاتر بۆ ئەوەیە کە چەند کەرەسەیەکی پیویستی وەکوو قوماش و فانیلە و گۆرەوی و چارشێو و چەرچەف و هەندێ جاریش بۆ بەرماڵ و کڵاشی... تاد لێ دروست بکرێ. ئەوڕۆ ئەم جۆرە پیشەسازییە، زیاتر لە نیوەی پێویستییەکانی خەڵکی لەو کەلوپەلانەی لە لۆکە دروست دەکرێن، دابین دەکات. هەروەکوو لە کارگەکانی موسڵ و دیاربەکر و گازی ئانتەب و ئادیەماندا هەیە.

– پیشەسازی ڕستن و چنینی خوری

بەرهەمی ساڵانەی وولات لە خوری، بە دەیان هەزار کگم دەبێ. بۆ دابینکردنی

پێویستییەکانی خەڵکی، لە قوماش و گۆرەوی و فەرش و جاجم و ڕایەخی جۆراوجۆر، چەند کارگەیەک لە شارەکانی کوردستاندا، دروست کراون. هەندێکیان لە سەرەتای سییەکاندا دامەزراون. جگە لەو کارخانانە، ڕستن و چنین کە بە دەست لە لایەن ژنانەوە ساز دەدرێ، بە تایبەتی لە گوندەکاندا .و بەرهەمەکانیان، زیاتر لە لایەن خۆیانەوە ساغ دەکرێتەوە.

- کۆمپانیای ڕستنی کرماشان

ئەم کۆمپانیایە لە شاری کرماشان، لە ساڵی ١٩٧١ی زایینیدا، بۆ ڕستنی خوری و لۆکە دامەزراوە. بەرهەمی ساڵانەی بریتییە لە ٦٠٠هەزار مەتر قوماشی جۆراوجۆر. ئەگەر بێتو کرێکاری لێزان و کەرەسەی خاو مسۆگەر بکرێ، ئەوا دەتواندرێ بەرهەمی ساڵانە زیاد بکرێ.

- کۆمپانیای چنین و ڕستن لە موسڵ

یەکێکە لە کۆنترین کارخانەکانی چنین و ڕستن لە کوردستاندا، ساڵی ١٩٥٣ی زایینی لە شاری موسڵ دروست کراوە، لە مانگی فێبروەری ١٩٥٧ی زایینیەو تاکوو ئەوڕۆ، چەندین ملیۆن مەتر قوماشی جۆراوجۆری هێناوەتە بەرهەم، (١٩٧٢ - ٣٣ ملیۆن مەتر). ئەم کارخانەیە تاکوو حەفتاکانیش، شەش ملیۆن و ٦٩٨ هەزار دیناری تێچووە. ژمارەی کرێکارەکانی لە ساڵی ١٩٧٢دا، ١٧٩ ٢ کەس بوون (کرێکار - ١٥٤ ٢، فەرمانبەر - ١٢، خزمەتکار - ١٢، پسپۆڕ - ١).

- پیشەسازی درومان و جلوبەرگی ئامادەکراو

ئەم پیشەسازییە لە کوردستاندا، پیشەسازییەکی تازەیە. بەڵام لە ئەنجامی زیادبوونی ژمارەی دانیشتووان و پێویستییەکانی ژیان و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا، لەبەر هەرزانی و تەواوبوونی خێرایی ئەو جۆرە جلوبەرگانە، لە شارەکاندا زۆر بە خێرایی بڵاو بۆوە. کارخانەکانی ئەم کەرتە چەندین جۆر گۆرەوی و فانیلە و بلوزی پیاوانە و ژنانە و جلوبەرگی منداڵانە دێننە بەرهەم. کارگەی چنینی دیاربەکر، گازی ئانتەب، ئەرزەڕۆم، ئەرزنجان، موسڵ، ورمێ و گەلێ شوێنی دیکەش، بە گرنگترین کارخانەکانی جلوبەرگی ئامادەکراوی کوردستان دادەنرێت. بەرهەمی ساڵانەیان دەگاتە چەند هەزار تەن و ساڵی بە سەدان کرێکار کاری تێدا دەکات.

– پیشەسازی فەرش:

بەناوبانگترین و کۆنترین و بڵاوترین پیشەسازی لە کوردستاندا، پیشەسازی فەرش دروست کردنە، بە تایبەتی بە تەون، بە شێوەیە ماڵ نەبوو لە زۆربەی نێوچەکانی کوردستاندا، تا کۆتایی پەنجاکان کەرەسەی تەونی لە ماڵدا نەبێ. لەم دەزگایانەدا، ساڵانە بە سەدان مەتری چوارگۆشە، لە فەرش دروست دەکرا. لەو ڕووەوە نێوچەی بەختیاری و سنە ناوبانگیان دەرکردووە. لەو ساڵانەی دواییشدا، بە مەبەستی زیادکردنی بەرهەم و سودوەرگرتن لە تەونکردن و خوری وڵات و لەنێوبردنی بێکاری لە نێو ژنان و پڕکردنەوەی پێویستییەکانی بازاڕەکانی نێوخۆ و دەرەوە، چەندین کارخانەی فەرش دروسکردنیان دامەزراند. وەکوو:

کارخانەی فەرشی دەست لە هەولێر

ئەم کارخانەیە لە ساڵی ١٩٧١ی زایینیدا دانراوە و هەتا ساڵی ١٩٧٤، بەرهەمی سەرەکی فەرشی نەخشداری نۆگرێ بوو. بەرهەمی مانگانەی ٨٨٢ مەتر چوارگۆشە بوو، بەڵام لەو ساڵانەی دواییدا، نەوەک هەر بەرهەمی ٤ – ٥ جار زیادی کرد، (١٩٧٣ – ٧٥٨٦ مچگ، ١٩٧٤ – ٥٧٩ ١٠ مچگ)، بەڵکوو هەروەها بەرهەمی فەرشی جۆراوجۆریش زیادی کرد. ژمارەی کرێکارانیش لە ساڵی ١٩٧٢ی زایینیدا، لە دەوروبەری ١٩٤ کەسدا بوو، (فەرشچن – ١٣٧ کەس، فەرمانبەر – ٥٧ کەس).

– پیشەسازی هۆنینەوە

بەن بۆ هۆنینەوەی گوریس و کەژی و سەرکەڵە و ڕەشمە و دەسرازە و لفکە و کڵاو و شەدە و هەوری و دوخێن و گول بەکار دەهێندرێ. لەو ساڵانەی دواییشدا، لە کارخانەکان کندریان لە داوی نایلۆن و ئەلیاف و گوش دروست دەکرد. بەرهەمی ساڵانەی چەند هەزار مەترێ دەبێ. ژمارەی کرێکارانیش، خۆی لە چەند سەد کەسی دەدات.

**٣/ پیشەسازی چەرم**

کەرەسەی خاوی ئەم پیشەسازییە لە کوردستاندا زۆرە و توانای پەرەپێدانیشی کەم نییە. بەرهەمی ساڵانەی بەشێکی کەم لە پێویستییەکانی کۆمەڵانی خەڵکی دابین دەکات. مەبەست لە پیشەسازی چەرم، ئەمانەن:

- پیشەسازی پێستەخۆشکردن

خەڵکی پێویستییەکانی لە مەشکە بۆ دۆ ژەندن، دودانە بۆ دۆ هەڵگرتن، کوندە بۆ ئاوهێنان و ساردکردن و هەڵگرتن و خواردنەوە، فەرو و قاپوتی چەرم لە پێستەی خۆشکراو بە دەست دەهێنن.

- پیشەسازی پێڵاو

بازاڕەکانی کوردستان، ساڵانە پێویستی بە سەدان ملیۆن جووت پێڵاو هەیە. بۆ دابینکردنی ئەم پێویستییە، لە هەندێ شار کارخانەی دروسکردنی پێڵاو، لە قایش و پێستەی دروسکراو دامەزراوە. لە هەندێ شوێنی دیکەش، هەندێ لە دانیشتووان بە کاری پێڵاو دروسکردن و سۆل و قەڵتاغ و کلاش درونەوە، بە دەست و بە مەکینەی پچوک خۆیان خەریک کردووە.

- پیشەسازی جامتا

بەشێک لەو پێستە خۆشکراوانە، بۆ دروسکردنی جامتای گەورەی بۆ هەڵگرتنی جلوبەرگ و جامتای دەستی پیاوانە و ژنان و جامتای مندالانی قوتابخانەکان بەکار دەهێندرێت. ئەم پیشەسازییە لە شاری موسڵ و دیاربەکر و ورمێ و ئەرزەڕۆم... تاد زۆر گەرمە.

**٤/ پیشەسازی کەرەسەی خانوو**

پیشەسازی کەرەسەی خانوو، شوێنێکی دیاریکراو لە کەرتی پیشەسازی وولاتدا، بۆ خۆی دیاری دەکات. لەو ڕێیەوە کارێکی ڕاستەوخۆ، لە دروسکردنی خانوو و چالاکییە ئابوورییەکانی وولات دەکات. کەرەسەی خانووبەرە بریتییە لە مانەی خوارەوە:

- پیشەسازی خشتی سوور

لە ئەنجامی گەشەکردنی دانیشتووان و پێویستییەکانی زیادبوونی ژمارەی خانووی تازە، شارەکان بە شێوەیەکی بەردەوام، پێویستییان لە خشتی سوور، ساڵ لە دوای ساڵ بەرز دەبێتەوە و لە زیادبوون دایە. ژمارەی کارخانەکانی ئەم جۆرە پیشەسازییە لە کوردستاندا، لە ساڵی ١٩٨٩ز دا، نزیکەی ٨٠٠ کورەخشت بوو، (ئازەربایجانی غەربی -

٥٢ کوره، بەختیاری – ١١ کوره، کرماشـان – ٤٢ کوره، کوردسـتان – ٥ کوره، لوڕسـتان – ٢٣ کوره، هەندێ شـوێنی دیکه ش – ٦٢٧ کوره). ژمـارەی کرێکارانیش زیاتر له پێنج هەزار کەس دەبوون. بەرهەمی ساڵانەشیان له ده ملیۆن خشتی سوور تێدەپەڕی.

– پیشەسازی قسڵ و گەچ

قسڵ و گەچ، له کوردستاندا دوو مەتریاڵی سەرەکی خانوو دروست کردنن، به تایبەتی بۆ ئەوکەسـانەی که له خشتی سوور خانوو دروست دەکەن. کارخانەی قسڵ و گەچ له زۆر جێگەی کوردسـتان هەن، بۆ نموونه، له ئازەربایجانی غەربی – ٤ کارخانه، له کرماشان – ١٣ کارخانه، هەندێکی دیکەش له شارەکانی دیکەدا هەن. ئەم دوو مەتریاڵه، له سوتاندنی قسڵەبەرد و وردکردنی دێته بەرهەم.

– پیشەسازی چیمەنتۆ

ئەم پیشەسازییه، به بەراوردکردن لەگەڵ پیشەسازییەکانی دیکەی کەرەسەی خانوودا، بایەخێکی تایبەتی هەیه. بەرهەمهێنانی چیمەنتۆ له کوردستاندا، بۆ ساڵی پەنجاکان دەگەڕێتەوه. هەندێ لەو کارخانانەی ئەورۆ کاردەکەن، ئەمانەن:

کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار

ئەم کارگەیه له ساڵی ١٩٥٦ی زایینیدا، له لایەن کۆمپانیایەکی فەرەنسی دروست کرا. سەرەتا به ناوی مەسڵەحەی چیمەنتۆی سەرچنارەوه دامەزرا، پاشان له ساڵی ١٩٧٠دا، ناوەکەی گۆڕا و بوو به کۆمپانیای گشتی چیمەنتۆی سەرچنار.

ئامانجی سەرەکی له دامەزراندنی ئەم کارگەیه له سەرچنار، له سەرەتادا زیاتر بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی هەردوو ئاوبەندی (دوکان و دەربەندیخان) بوو له چیمەنتۆ. هۆی دووەمیش ئەوه بوو، که له نێوچەکەدا کەرەسەیەکی خاوی زۆر بۆ دروسکردنی چیمەنتۆ هەیه، وەک بەردی کلس و خۆڵی سپی، که یەکەمیان یەک کیلۆمەتر و دووەمیان سێ کیلۆمەتر، له شوێنی کارگەکەوه دووره.

کارگەی سەرچنار له ساڵی دامەزراندنییەوه تاکوو ئەورۆ، گەلێ گۆڕانی گرنگی به خۆیەوه دیوه. له هەموویان لەبەر چاوتر، زیادکردنی تەندورێکه، که توانای بەرهەمهێنانی له ڕۆژێکدا، ٤٠٠ تەنه، لەگەڵ دوو دەستاڕی گەورەدا، که یەکەمیان توانای هاڕینی ٤٠ تەنه و دووەمیشیان توانای هاڕینی ٣٠ تەنه له یەک کاژمێردا. بەرهەمی ساڵانەی کارگەی چیمەنتۆ ئەورۆ، سەدان هەزار تەن دەبێ، (١٩٧٣ – ١٠٥ هەزار تەن، ١٩٧٤ – ١٧١ هەزار

تەن). ئەگەر ژمارەی کرێکارەکان و کەرەسەی خاوی بۆ زیاد بکرێ، کارگەکە توانای زیادکردنی بەرهەمی هەیە.

- پیشەسازی بلۆک

ئەم کەرەسەیە، لە کوردستاندا کەرەسەیەکی خانوودروسکردنی تازەیە. سەرهەڵدانی ئەم پیشەسازییە بۆ سەرەتای حەفتاکان دەگەڕێتەوە. لەبەر هەرزانیّ و گەورەیی و کەم ماندووبوون بە دروسکردنییەوە، بلۆک لە کوردستاندا و لە دروسکردنی خانوودا، بە تەواوی جێگەی خشتی سووری گرتۆتەوە.

**٥/ پیشەسازییە کیمیاوییەکان**

کەرەسەی خاوی پیشەسازییە کیمیاوییەکان لە کوردستاندا زۆرە. ئەگەر بێتو بایەخ بەو کەرەسە کیمیاوییانە بدرێ، وەکوو ئەوەی پارەی زیاتری بۆ تەرخان بکرێ، ژمارەی کرێکاران زیاد بکرێ، بازاڕ بۆ فرۆشتنی بەرهەمەکانی بدۆزرێتەوە، ئەوا ئەو پیشەسازییە دوارۆژێکی باشی دەبێ و جێگایەکی تایبەتیش لە ڕیزی کەرتەکانی دیکەی پیشەسازییەکانی وولاتدا، بۆ خۆی داگیر دەکات. پیشەسازییەکانیش بریتین لەمانەی خوارەوە:

**١. پیشەسازی نەوت**

بە یەکێ لە هەرە پیشەسازییە گرنگە پیترۆکیمیاوییەکان دادەنرێ. لە دوارۆژدا بۆی هەیە، لە نێو پیشەسازییەکانی دیکەی وولاتدا، جێگایەکی تایبەتی و مەزن بۆ خۆی بگرێ. هەندێ لەم پیشەسازییانە لێرەدا باس دەکەین:

- پیشەسازی پالاوتن

ئامانجی سەرەکی ئەم جۆرە پیشەسازییە، پالاوتنی نەوت و جیاکردنەوەی بەرهەمەکانێتی، بۆ ئەوەی کۆمپانیاکانی نەوت و دانیشتووان لە نێوخۆدا بەکاری بهێنن. زۆربەی پالێوگاکانی نەوت پچکۆلەن و توانای پالاوتنیان لە ساڵێکدا، لە چەند هەزار بەرمیلێ زیاتر نابێ، ئەگەرچی لە وولاتەکانی جیهانی سێیەمدا، ڕۆژانە لە سەروو نیو ملیۆن بەرمیلەوەیە. بۆ نموونە، توانای پالێوگەکانی کوێت، لە ساڵی ١٩٧٧ی زایینیدا، ڕۆژانە گەیشتە ٦٠٠ هەزار بەرمیل، لە عەرەبستانی سعوودییە - ٦٢٤ هەزار بەرمیل،

ئێران – ٩٤٠ هەزار بەرمیل، ئەندەنووسیا – ٥٣٤ هەزار بەرمیل، فەنزەوێلا – یەک ملیۆن و ٤٨٠ هەزار بەرمیل. گرنگترین پاڵێوگەکانی کوردستان ئەمانەن:

– پاڵێوگەی ئەڵوەند:

کۆنترین پاڵێوگەی نەوتی کوردستانە و لە ساڵی ١٩٢٧ی زایینیدا، لە لایەن کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی – فارسییەوە دروست کراوە. لە ساڵی ١٩٧١ی زایینیدا، عێراق دەستی بەسەردا گرت و هەتا ئەوڕۆکەش موڵکی عێراقە. ئەم پاڵێوگەیە حەوت کیلۆمەتر لە باشووری شارۆچکەی خانەقینەوە دوورە. نەوتی خاوی بە لولەیەکی ٣٧ کیلۆمەتر درێژیی و تیرەی دە ئینجی، لە چاڵگەی نەوتی نەفتخانەی باشووری ڕۆژهەڵاتی خانەقینەوە بۆ دێ.

بەرهەمی ڕۆژانەی پاڵێوگەی ئەڵوەند، لە ساڵی ١٩٧٨ز دا، ١١ هەزار بەرمیل بوو، (١٩٦٨ – ١٢ هەزار بەرمیل)، هەمووی بۆ بازاڕەکانی نێوخۆ بوو. بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا، بەشێکیان بۆ زیاد کردووە، کە لە ڕۆژێکدا پێنج هەزار تەنەکە نەوتی سەرمۆر بەرهەم دەهێنێ.

– پاڵێوگەی بابەگوڕگوڕ:

کۆمپانیای نەوتی عێراق، لە ساڵی ١٩٢٧ی زایینیدا، لە نزیک شاری کەرکووکەوە، بۆ بەرهەمهێنانی بەرهەمە جۆراوجۆرەکانی نەوت، ئەم پاڵێوگایەی دروست کرد. ئەو بەرهەمانەی لەم پاڵێوگایەدا جیا دەکرێنەوە، بریتین لە گازۆیل و نەوتی سپی (کیرۆسین) و ڕۆنی سووتەمەنی و نەوتی خاو. توانای بەرهەمهێنانی ساڵانەی بە ١٥٠ هەزار تەن دادەنرێ.

دەزگای پاڵێوگەی نەوت، لە ساڵی ١٩٧٣ز دا، دوو بەشی تازەی دیکەی دروست کرد. لە بابەگوڕگوڕەوە بە بۆرییەکی دە ئینجی نەوتی بۆ دەهێنا، کە ١,٥ کیلۆمەتر لێوەی دوورە. توانای پاڵاوتنی پاڵێوگەی بابەگوڕگوڕ لە ڕۆژێکدا، بریتییە لە ٤٢ هەزار گالۆن کیرۆسین و ٣٠ ملیۆن گالۆن گازۆیل و ١٠٧ ملیۆن گالۆن نەوتی ڕەش.

– پالێوگەی باتمان

دۆزینەوەی نەوت لە دۆڵەکانی چیای مەیمون، لە ساڵی ١٩٤٠زدا، فاکتەرێکی سەرەکی بوو بۆ دروسکردنی ئەم پاڵێوگایە. ئەم پاڵێوگایە لە ساڵی ١٩٤٤زدا، لە لایەن ئینستیتوتی جیۆلۆجی دەوڵەت، بۆ دۆزینەوەی نەوت دروست کرا. توانای پاڵاوتنی لە نەوتی خاو، لە سەرەتاوە تەنیا دوو ملیۆن تەن بوو لە ساڵێکدا. دوایی بە هۆی زیادبوونی بەرهەمهێنانەوە، کۆمپانیای نەوتی تورکی، لە هەمان شوێندا و بە توانای پاڵاوتنی ٧٠٠ هەزار تەن لە ساڵێکدا، دەزگایەکی گەورەتری دروست کرد.

- پاڵێوگەی کرماشان

پاڵێوگەی کرماشان، بۆ مەبەستی پالاوتنی نەوتی چاڵگەی نەوتی شا و دابینکردنی پێویستی بازاڕەکانی نێوخۆ، لە بەرهەمەکانی نەوت، وەکوو کیرۆسین، بەنزین، گازۆیل، ڕۆنی ئۆتۆمۆبیل و گریس... هتد، لە لایەن کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی – فارسی، لە ساڵی ١٩٣٥زدا، دروست کراوە.

توانای ڕۆژانەی پالاوتنی پاڵێوگەی نەوتی کرماشان، ئەوڕۆکە (١٩٩٣ز)٨٩٥٤ هەزار بەرمیلە لە ڕۆژێکدا، (١٩٧٦ – ٦٦٩٩ هەزار بەرمیل، ١٩٩٠ – ٩٧٩٢ هەزار بەرمیل).

- پاڵێوگەی نەوتی مەسجیدی سلێمان

لە نزیک شارۆچکەی مەسجیدی سلێمانەوە هەڵکەوتووە. لە لایەن کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزەوە دروست کراوە. لە سەرەتای دۆزینەوەی نەوت لەم نێوچەیەدا، توانای پالاوتنی ڕۆژانەی لە نەوت، لە ساڵی ١٩٩٣دا،٢٥٢٠ بەرمیل بوو (١٩٥٠ – ٢٥ هەزار، ١٩٧٧ – ٢٧ هەزار بەرمیل).

**٠٢ پیشەسازی گازی شل**

توانای گەشەکردنی ئەم پیشەسازییە لە کوردستاندا زۆرە، ئەگەر هاتوو کەرەسەی خاو بە تایبەتی گۆگرد، بە شێوەیەکی زۆر دابین بکرێ. بەڵام تاکوو ئێستا، نە دەوڵەت و نە کۆمپانیا نەوتییەکان، کارێکی ئەوتۆیان لەو بارەیەوە نەکردووە، بۆیە ئەوڕۆ، کوردستان بۆ کارگەکانی پیشەسازی گازی شلی دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق، بە تەنیا سەرچاوەیەک دادەنرێ، کە کەرەسەی خاو بۆ ئەو کارگانە دەنێرێ.

**٠٣ پیشەسازییە پیترۆکیمیاوییەکان**

کەرەسەی خاو لە بەرهەمەکانی نەوت، وەکوو بەنزین، نەوتی سپی ــ کیرۆسین، نەوتی ڕەش، هەروەها گازی سروشتی لە کوردستاندا، گەلێ زۆرە. بۆیە ئەگەر بێتو پسپۆڕ و کرێکاری شارەزا و ئامرازی تەکنیکی بۆ دابین بکرێت، دەبێتە پیشەسازییەکی گەشەدار لە وڵاتدا. بەڵام ئەم توانایانە تاکوو ئەوڕۆ، بێسوود ماونەتەوە. لقە گرنگەکانی ئەم پیشەسازییە، کە ئەوڕۆ لە کوردستاندا لە کارکردن و بەرهەمهێنان دان، ئەمانەن:

- پیشەسازی پاککردنەوەی گۆگرد

گۆگرد لە گازی سروشتی پاقژ دەکرێت و توانای بەرهەمهێنانی لە زۆر نێوچەی

کوردستـاندا هەیە، بە تایبـەتی لە چاڵگە گازەکـانی دەوروبەری کـەرکـووک و مـەسـجـیدی سلێمان و باتمان... تاد.

ئەورۆ پرۆژەی پاقـژکـردنـەوەی گـۆگـرد لە گـازی سـروشـتـی لە شـاری کـەرکـووکـدا، بەناوبانگترین و مـەزنترین کارگـەیە لە کوردستاندا. ئـەم دەزگایە لە شـەستـەکاندا، لە لایەن کۆمـپانیـایەکی پۆڵۆنییـەوە دروست کرا. بەرهـەمی سـاڵانەی بە سـەدان تەن دەبێ. ژمـارەی کارگەرانیشی لە پسپۆڕ و کرێکار و پاسەوان، زیاتر لە ٢٥٠ کەسێک دەبێ.

– پیشەسازی جگەرە

داگرتنەوەی جگەرە لە ماڵان و دوکانەکان، بە کۆنترین پیشەسازییەکانی کوردستان لە قەڵەم دەدرێ. لەم شوێنانەدا، ساڵی بە سـەدان هەزار تەن جگەرە دێتە بەرهـەم و بە سـەدان کـەس کـاریان تێدا دەکـات. کـارگـەی جگەرە لە شـارەکانی بدلیس و سلێمـانی و هەولێر و کرمـاشـان، لە سـەرەتای شـەستـەکان و بە دواوە دامەزراوە. هـەر یەکێ لەم کارگـانە، ساڵانە بە هـەزاران گڵۆز پاکەتی جگـەرەی جۆراوجـۆر، دەهێنێتـە بەرهـەم و کاری ڕۆژانـەشیـان بۆ سـەدان کرێکار لە ژن و پیاو مسۆگەر کردووە.

**٠٤ پیشەسازی سابوون و بابەتی پاککردنەوە:**

سـابوونی دەستـشـتن و جلشتن و ڕیشـتاشـین، تۆزەکـانی جلشـتن (تاید)....تاد، دەرمـانی دان خـاوێنکردنەوە، دەرمـانی قـاپوقـاچاغ شـتن، دەرمـانی شـوشـە پاککردنەوە، لە کـارگـەی دروسکردنی سابوونی شارەکانی گازی ئانتـەب و دیاربەکر و سنە و هەولێر و موسڵ... هتد دروست دەکرێن. لەم کارگانەدا، ڕۆژانە بە سەدان کرێکار کاری تێدا دەکات.

**٠٥ پیشەسازی خواردنەوە**

دروسکردنی شـەربەتی هـەنار و مـێوژ و کـاڵەک و بەرهـەمـێنانی خـواردنەوە گـازییەکـانی وەکـوو سـیـڤـۆن و بیـبـسی... تاد، لەگـەڵ هەندێ خـۆشـاوی دیکەدا، لە مـاڵان و دوکـانی شـارەکان دروست دەکرێن. بەرهـەمی ئەم جۆرە پیشـەسـازییە، لـە هـاویناندا دوو ئەوەندەی بەرهـەمی زستانان دەبێ.

**٠٦ پیشەسازییە بنچینەییەکانی کانزاکان**

دواکەوتووترین کەرتی پیشەسازی لە کوردستاندا، چ لە ڕووی جۆراوجۆر و چەشن و چ

له ڕووی بەرهەمی ساڵانە و چ لە ڕووی ژمارەی کرێکارەوە و چ لە ڕووی پێکهێنان و هاوبەشیکردن لە بۆدجەی ساڵانەی دەوڵەتدا، ئەم جۆرە پیشەسازییە. گرنگترین لقەکانی ئەمانەن:

– پیشەسازی کەلوپەل و ئامانی مەعدنی نێو ماڵ

لە هەر شارێکی وولاتدا، سێ تا چوار دوکان بۆ دروسکردنی دۆلاب و قەرەوێڵە و کورسی و مێز و ڕەفەی ئاسن و پەردەی مەعدەنی و ئامانی مەعدەنی جۆراوجۆری نێو ماڵ، وەکوو مەنجەڵ، مقەڵی، کەوگیر، کەوچک، چەمچە، تەشت، مەسینە، دەسشۆر و کتری ئاو، هەن.

– پیشەسازی چاککردنەوە

شارەکانی دیاربەکر، گازی ئانتەب، ئەرزەڕۆم، هەولێر، کرماشان، ورمێ، سنە، بە پیشەسازی چاککردنەوەی هۆیەکانی گواستنەوە – وەک کاری فیتەری قەمەرە، پاس، لۆری، پیکاب، جێب و چاککردنەوەی مەکینە و ئامێرەکانی کشتوکاڵی وەکوو – تراکتۆر، کەمباین، تۆوچێن و پەمپی ئاو، ناوبانگیان دەرکردووە.

– پیشەسازی تەنەکەسازی

پیشەسازییەکی زۆر بڵاوە، بە تایبەتی لە شارە گەورەکاندا، بۆ دروسکردن و ڕاسکردنەوەی بۆنیتی ئۆتۆمۆبیل و یەخچاڵ و زۆپای نەوت و گەلێ شتی دیکەش.

## بەشی پێنجەم: ڕێگەوبان

ڕێگەوبان لە ژیانی هەرێم و دەوڵەتانی سەر ڕووی زەمیندا، ڕۆڵێکی یەکجار گەورە وازی دەکا، ئەو ڕۆڵە بە شێوەیەکی تایبەتی، کار لە هەموو لایەنەکانی ژیانی ڕۆژانەی گەلان دەکا. بۆیە هەرچەندە ڕێگەوبان لە هەرێمێکدا یا لە وولاتێکدا، ڕێکوپێک و باش پێشکەوتوو بێ، ئەو هەرێمە یا ئەو وولاتە، ئەوەندە پێشکەوتوو دەبێ و بە پێچەوانەشەوە ئەگەر ڕێگەوبانی چاک لەو وولاتەدا نەبوو، باری وولاتەکە لە زۆر ڕووەوە خراپ دەبێ.

دەتوانین بڵێین، ڕێگەوبان کارێکی زۆر لە ژیانی ئابووری وولات دەکات،ئەمەش تەنیا لەبەر ئەوەیە، کە هەموو جۆرە گواستنەوە و کڕین و فرۆشتن و ئاڵوگۆڕکردنێکی ڕۆژانەی بەرهەمەکانی پیشەسازی و کشتوکاڵی، لە شوێنی بەرهەمهێنانیانەوە و بارکردنیان بۆ شوێنی هەڵگرتن و ساغبوونەوەیان و بۆ بازاڕەکان، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بە بوونی یا نەبوونی سروشت و جۆری ئەو ڕێگا و بانانەوە بەستراوەتەوە، کە لەو وولاتەدا ڕاکێشراون. ئەگەر هاتوو ڕێگەوبانەکان خۆش بوون، ئەوا لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا، توانای بارکردن و گواستنەوەی بەرهەمەکان، زیاتر دەبێ. واتە لە لایەکەوە جوتیارەکان سود لە بەرهەمەکانیان وەردەگرن، کە بە درێژایی ساڵ پێوەی ماندوو بوون، لە ئەنجامیشدا هەم دەبێتە هۆی باشکردنی باری ئابووری جوتیارەکان و هەم زیاتر هانی جوتیارەکان دەدا، بۆ ئەوەی زیاتر خۆیان ماندوو بکەن و بەرهەمی زیاتر و باشتر لە ساڵەکانی داهاتوودا، بهێننە بەرهەم. لە لایەکی دیکەشەوە، بازاڕەکانی نێوخۆ بە بەرهەمە جۆراجۆرە خۆماڵییەکان پڕ دەکرێ و لە ڕووی کەلوپەلە پێویستییەکانی ژیانەوە، کەموکوڕی کەمتر دەبێتەوە و کۆمەڵانی خەڵکیش دەتوانن، بە نرخێکی گونجاو پێویستییەکانی ڕۆژانەیان دەست بکەوێ. بەڵام ئەگەر هاتوو، ڕێگەوبانەکان خراپ بوون، ئەوا بەرهەمە کشتوکاڵییەکان لە شوێنەکانی خۆیاندا دەمێننەوە و زۆربەیان خراپ دەبن، بەبێ ئەوەی کەس کەڵکیان لێ وەربگرێ و هەموو ئەو ڕەنج و تەقەلایەی جوتیارەکانیش، لە ماوەی ئەو ساڵەدا داویانە، بە فیڕۆ دەچێ.

ژیانی کۆمەڵایەتی لە ڕووی پلەی پێشکەوتن یا دواکەوتنەوە، تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەندی، بە بوون و نەبوون و جۆری ڕێگەوبانەکانەوە هەیە. بوونی ڕێگەوبان لە هەر وولاتێکدا، زیاتر پەیوەندی لە نێوان خەڵکیدا دادەمەزرێنێ و تێکەڵاوی لە نێوانیاندا دروست دەکا، بە تایبەتی ئەو تێکەڵاوییە، لە نێوان دانیشتووانی شارەکان و گوندەکاندا، بە هۆی ڕێگەوبانەوە زیاتر ڕەنگ دەداتەوە و گوندنشینەکان زیاتر لە شارەزایی و توانای

شارنشینەکان، سود وەردەگرن، وەک لە شوێنە گشتییەکانی بازاڕ و نەخۆشخانە و قوتابخانە و پەیمانگاکان و زانکۆکان و لە کاروبارە ئیدارییەکاندا دەردەکەوێ. لە لایەکی دیکەشەوە، بە هۆی پەیوەندی بەردەوام و بڵاوبوونەوەی ڕۆشنبیری لە گوندەکاندا، لایەنە خراپ و نێگێتیڤاکانی وەکوو شەڕکردن و ناکۆکی تیرەگەریی و کوشتن و بڕین... تاد، لە کۆمەڵگەی لادێدا کەم دەبێتەوە.

ڕۆڵی ڕێگەوبان لە ڕووی ڕامیاریی و بە تایبەتی لە ڕووی سەربازییەوە، لە لایەنەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری کەمتر نییە. ئەو دەوڵەتانەی کە خاوەنی ڕێگەوبانی باشن، بە بەراوردکردن لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی خاوەنی ڕێگەوبانی خراپن، زۆر توانای داکۆکییان لە خاک و نەتەوەکەی خۆیان گەلێ زیاترە. لە هەمان کاتدا، توانای دامرکاندنەوەی هەموو هەرا و ئاژاوەیەکی نێوخۆشیان زیاترە. بە هەمان شێوەش، لەو نێوچانەدا کە خەباتی چەکداری دژی ڕژێمی ناوەندی تێدا دەکرێ، ئەگەر ڕێگەوبانەکان باش بن، ئەوا لە ڕووی کۆکردنەوەی خەڵکی و دەسوەشاندن لە دوژمن، بۆ پارتیزانەکان گەلێ ئاسانتر دەبێ.ڕێگەوبانەکانی کوردستان، بەم شێوانەی لای خوارەوەن:

## ١- ڕێگاوبانی زەمینی

### ڕێگاوبانی ئۆتۆمۆبیل

ئەم جۆرە ڕێیانە، بریتین لە ڕێگەوبانی خۆشکراو و بەردەڕێژ و قیرتاوکراو بە هەموو جۆرەکانییەوە. درێژایی ئەم چەشنە ڕێگا و بانانە لە کوردستاندا، لە ساڵی ١٩٨٥ز دا، نزیکەی ١٨ هەزار کیلۆمەتر بوو، واتە هەر یەک کیلۆمەتر، بەرامبەر ١,٣ ملیۆن کەس بوو. بۆ زانین، درێژایی ڕێگەوبان لە تورکیادا ساڵی ١٩٧٢ز، ٢٢٧ هەزار کیلۆمەتر بوو. لە ئێران ساڵی ١٩٨٦ز – ١٥١ هەزار کیلۆمەتر بوو. لە عێراق ساڵی ١٩٨٦ز – ٢٩ هەزار کیلۆمەتر بوو. لە سووریا ساڵی ١٩٨٦ز – ٣٠ هەزار کیلۆمەتر بوو.

تۆڕی ڕێگەوبانەکانی ئەوڕۆی کوردستان، لە ئەنجامی فاکتەرەکانی سروشتی و مرۆیی یەوە پێک هاتوون. هەر ئەم دوو هۆیە پێکەوە، ئەم چەند خەسڵەتەیان، بۆ ڕێگەوبانەکانی وڵاتەکە پەیدا کردووە:

– دروسکردنی ڕێگەوبان و ڕاکێشانی جادەکان بۆ هەر کون و قوژبنێکی کوردستان، هەر لەسەرەتاوە بۆ مەبەستی سەربازیی و کۆنترۆڵکردنی نێوچە جیاجیاکان و سەرکوتکردنی هەموو جوڵانەوە نەتەوەییەکانی کورد و جەنگ بەرپاکردن بووە، بۆ ئەوەی

دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستـان بتوانن، زۆر بە زوویی و بە کەمترین کات و بە کورترین ڕێگە، مـەکـینە جـەنگیـیـەکـانی خۆیـان، بگەیەننـە دوورترین شـوێن، تا بتـوانن دەسـەڵاتی دەوڵەتی نـاوەندی، لە هەمـوو کـوردسـتـاندا بچـەسـپـێندرێ و ڕاپەڕین و شـۆڕشـەکـانی جەماوەری گەلیش سەرکووت بکەن.

– پانایـی ڕێگەوبانەکـانی کـوردسـتـان، زۆربەیـان لە نۆ مـەتر زیـاتر نابن، واتـە ڕێگا و بانـەکـان فــراوان نین و باریک و تەسکن. بۆیـە هاتوچۆکـردن بـەم جـۆرە ڕێگەوبانـانەدا، هەرگیز بەبێ مەترسی نییە و چەندین کارەساتی ناخۆشیشیان تێدا ڕوو دەدات.

– زۆربەی ڕێگەوبـان لە کـوردسـتـاندا، قیـرتاو نەکـراون، بگرە لە وەرزی زسـتـاندا، بە تایبـەتی لەو ڕۆژانـەی کـە بەفر و بارانێکی زۆر دەبارێ، لەبەر پاک نەکردنەوەی ڕێگاکان و تێکچوونی لاڕێیەکان، لە هەندێ شوێن لەم جۆرە ڕێیانەدا، هاتوچۆ یا زۆر کەم دەبێتەوە،یا بە تەواوی دەبڕێ.

– کەمی یا نەبوونی دەزگای تایبەتی بۆ پاراستنی جادەکان، بە تایبـەتی لەو شوێنانەدا کـە دوورن لە شارەوە، یا دەکەونە قـەراغ شارەکـان، ئەمـەش وای کردووە، کـە بەشـێکی زۆر لە جادەکان، کەند و کۆسپیان تێبکەوێ و هاتوچۆ لەسەر ئەو ڕێگایانە، ئاسان نەبێ.

– ڕێگا و بانەکان، بە تایبـەتی ئەو ڕێگایانەی لە نێوچە شـاخـاوییـەکاندا هەڵکەوتوون، پێچاوپێچی زۆریان تێدایە و کاتێکی زۆریان دەوێ، تا ئۆتۆمۆبیلەکان لە شوێنێکەوە دەچن بۆ شـوێنێکی دیکـە. دیارە ئەمـەش تەنیـا لـەبەر ئەوەیە، کـە دەوڵەت ئەو ڕێگایانـەی بۆیە لەو شـوێنانەدا دروسـت کـردووە، لەبـەر ئەوەی کـەمـتـرین کـاتـی بۆ تەواوبوونـی ویسـتـووە و کەمترین پارەشی تێچووە.

– زۆربەی جـادەکان یەک لایین. هـاتوچۆ لەسـەر ئەم چـەشنە جـادانـە زۆر خـۆش نیـیـە، لەبەر ئەوەی ئەگەر ئۆتۆمۆبیلێ بیـەوێ لە جادەیەکەوە بۆ جادەیەکی دیکە لا بدا، پێویسـتی بەوەیە کـە مـەودایـەکی درێژ ببـڕێ، تـا شـوێنێکی بۆ هەڵدەکـەوێ و پێـچی لێ دەکـاتەوە و دەچێتەوە سەر جادەکەی دیکەی کە دەیەوێ پێیدا تێپەڕ ببێ.

– لەبەر ئـەو هێڵـە سـەربازییـانەی کـە ئەوڕۆکـە، لە لایەن دەوڵەتە داگیـرکـەرەکـانی کـوردسـتـانەوە، لە نێـو جـەرگـەی وڵاتەکـەدا ڕاکێـشـراون، جـادەکـان لە نێـوان نێـوچە جیاجیاکاندا تێکەڵ بە یەکدی نابن، لەبەر ئەوە لە کاتی هاتوچۆکردن بە ئۆتۆمۆبیل، مرۆڤ ناچار دەبێ، بە یەک شوێنی دیاریکراو و لە ژێر کۆنترۆڵی دامودەزگاکانی ئەو دەوڵەتانەدا بڕوا و لا نەدات.

– گوندنشین زۆر کـەم سود لە جادە قیرتاو دەبین، بە تایبـەتی ئەوانەی لە گوندی دوورە

و لاچەپەدا دەژین، چونکە لەو نێوچانەدا، جادە قیرتاوەکان لقیان لێ نابێتەوە، تا بەو نێوچانە بگات، ئەمەش خۆی لە خۆیدا، بارێکی کۆمەڵایەتی دواکەوتووی، لە نێو دانیشتووانی ئەو نێوچانەدا خوڵقاندووە و بەو زووانەش، ئەو بارە ناهەموارە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەش، چارەسەر ناکرێ.

کوردستان ئێستاکە خاوەنی نزیکەی ١٧٥ هەزار مەکینەی جۆربەجۆرە، (١٩٨٥ – ١٥٠ هەزار). سەیری خشتەی ژمارە (٤٥) بکە. لەوانە لە ٥٠٪ یان بۆ سواری و لە ٣٥٪ یان بۆ گواستنەوە تەرخان کراون و لە ١٥٪ شیان، سەر بە دامودەزگا جیاوازەکانی دەوڵەتن.

**خشتەی ٤٥ ژمارەی مەکینەکانی هاتوچۆ، ساڵی ١٩٨٠**

| پارێزگا | مەکینە | پارێزگا | مەکینە |
|---|---|---|---|
| ئادیەمان | ٨٤٥ | ماردین | ١٧٦٩ |
| ئاگری | ٩٧٧ | موش | ٥٩٩ |
| بینگۆڵ | ٤٦٣ | سیرت | ١٥٣٦ |
| بدلیس | ٩٣٧ | دەرسیم | ٣٤٢ |
| دیاربەکر | ٤٠١٣ | ئۆرفە | ٣١٧٣ |
| ئەلازیغ | ٤١٣١ | وان | ٥٠٢٥ |
| ئەزرنجان | ١٧١٠ | نەینەوا | ٣٢٧٨٢ |
| ئەرزەڕۆم | ٣٦٥٧ | کەرکووک | ١٤٢٤١ |
| گازی ئانتەب | ٦٢٣٠ | دهۆک | ٢٠٥١ |
| هەکاری | ٢١٢ | هەولێر | ٩٧٣٣ |
| مەلاتیە | ٣٢٩١ | سلێمانی | ٥٩٥٧ |
| مەرعەش | ٣٤٥٥ | – | – |

وەکوو لەم خشتەیەی سەرەوەدا، بۆمان دەردەکەوێ، گەورەترین پارێزگای کوردستان، لە رووی ژمارەی مەکینەی هاتوچۆوە، پارێزگای موسڵیە. پچوکترینیشیان پارێزگای دهۆکە.

رێگاوبانی ئۆتۆمۆنیل دوو جۆرن:

**١) رێگای سەرەکی**

مەبەست لە رێگای سەرەکی (جادە، ماگیستراڵ)، ئەو رێگەوبانە پانوبەرین و قیرتاوە درێژانەیە، کە سەرانسەری وولآت بە یەکەوە دەبەستن و لەو رێیانەشەوە، ووڵاتەکە بە رێگاکانی دەرەوەی وڵاتەوە دەبەستنەوە. بڕوانە نەخشەی ژمارە (١٢).

رێگا سەرەکییەکانی باکوور و نێوەڕاست، لەچاو رێگاکانی باشووری ووڵاتدا درێژترن. ئەم رێگا سەرەکییانە، ساڵ دوازدەی مانگ هاتوچۆیان لەسەر نابڕێ. رۆژی بە دەیان ئۆتۆمۆبیل بە بار و بە خەڵکەوە، هاتوچۆیان بەسەردا دەکەن. درێژایی هەموو ئەو رێگا و بانە سەرەکییانە، یەک لەسەر سێی گشت رێگا و بانە قیرتاوکراوەکانی ووڵات پێک دەهێنن. گرنگترین رێگا و بانە سەرەکییەکانی کوردستان، ئەمانەن:

کرماشان – ئەرزنجان

درێژایی ئەم جادەیە سەدان کیلۆمەتر دەبێ. بە زۆربەی شارە گەورەکانی رۆژهەڵاتی کوردستاندا تێپەڕ دەبێ، وەکوو شارەکانی سنە، ورمێ، قەرەکۆسە، ئەرزەڕۆم. ئەم جادەیە بە نێو دۆڵەکاندا دەڕوا و لە زۆر شوێنیشدا، ناچار بوون پرد دروست بکەن، بۆ ئەوەی لە ئەمبەر و ئەوبەری دۆڵەکانەوە بپەڕنەوە.

ورمێ – مەلاتیە

بە یەکێ لە جادە درێژەکانی ووڵات دادەنرێ، چەندین شاری گەورەی وەکوو وان، موش، بینگۆڵ ئەلازیغ، لە نێوەڕاست ووڵاتدا پێکەوە دەبەستێتەوە. ئەم جادەیەش وەکوو جادەی پێشوو، بە نێو دۆڵەکاندا دەڕوا و گەلێ چیای سەخت دەبڕێ، یاخود لە گەلێ شوێندا، هەندێ چیایان بۆ داتاشیوە و لە زۆر شوێنیشدا، پردیان لە میانەی ئەمبەر و ئەوبەری دۆڵەکاندا دروست کردووە.

## نەخشەی ڕێگا سەرەکییەکان



سلێمانی – گازی ئانتەب

ئەم جادەیە، درێژترین جادەیە لە کوردستاندا، بە گەلێ لە شارە گەورەکاندا تێپەڕ دبێ، وەکوو شارەکانی کەرکووک، هەولێر، موسڵ، دهۆک، ماردین، ئورفە. لەو جێگایانەی ئەم جادەیەی پێدا تێپەڕ دەبێ، زۆربەی زۆری لە دەشتاییەکی تەخت پێک هاتووە، یاخود تەپۆڵکەی پچوک پچوکە، بۆیە ئەو پارەیەی لە دروسکردنی ئەم جۆرە جادانەدا خەرج کراوە، لەچاو ئەو پارەیەی لە جادەکانی پێشوودا خەرج کراوە، زۆر کەمترە.

**٢) ڕێگای ناسەرەکی (لاڕێ)**

مەبەست لە لاڕێ، هەموو ئەو ڕێگا و بانانەن، کە دەکەونە نێوان سەنتەری پارێزگاکان و یەکە ئیدارییەکانی دیکەوە و بەردەڕێژ و قیرتاو و خۆش کراون. لاڕێ لەچاو ڕێگا سەرەکییەکاندا، تەسکترن و کەمتر هاتوچۆی پێدا دەکرێ. لەبەر تەسکی و خاوێن نەکردنەوە و بەفربارینێکی زۆر و بەردو خۆڵی قەراغ ڕێگاکان، لە هەندێ ڕۆژانی زستاندا، بە تەواوی هاتوچۆیان لەسەر دەبڕێ. درێژایی ئەم جۆرە ڕێگایانە لە کوردستاندا، لەچاو ڕێگا سەرەکییەکاندا، دوو جار زیاتر دەبێ.

پارێزگای ئادیەمان

ئەم پارێزگایە، ساڵی ١٩٨٠ی زایینی، خاوەنی ٣٦٢ کیلۆمەتری چوارگۆشە لە ڕێگەوبان بوو. درێژایی ڕێگای نێوان شاری ئادیەمان هەتا بەسنی – ٣٧ کم، هەتا چیلکخان – ٦٠ کم، گەرگەڕ – ١١٩ کم، هەتا کەحاتە – ٤٠ کم، هەتا سەمسات – ٣٨ کم دەبێ.

ئادیەمان بە ڕێگەی قیرتاو، بە هەندێ لە شارە گەورەکانی دیکەوە بەستراوە. درێژایی ڕێگای نێوان ئەم شارە و هەتا گازی ئانتەب – ١٥٣ کم، هەتا ئورفە – ١٦٠ کم، هەتا مەرعەش – ١٦٤ کم، هەتا مەلاتیە – ١٧٤ کم، هەتا دیاربەکر – ٢٠٧ کم، هەتا ئەلازیغ – ٢٧٩ کم، هەتا موش – ٢٩٣ کم دەبێ.

پارێزگای ئاگری

درێژایی ڕێگەوبانی ئەم پارێزگایە، لە ساڵی ١٩٩٣ی زایینیدا، نزیکەی ٥٢٠ کم بوو. لە مانە قیرتاوکراو – ٢١٢ کم، بەردەڕێژکراو – ١١٦ کم، ڕێگەی دیکە – ١٩٢ کم.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری قەرەکۆسە هەتا دیادین – ٦٢ کم، هەتا دۆغوبایەزید –

١٠٦ كم، هەتا ئەلەشکیرد – ٣٢ کم، هەتا خامور – ١٢ کم، هەتا پاتنۆس – ٦٨ کم، هەتا تاشلی چای – ٣٠ کم، هەتا توتاق – ٣٦ کم.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری قەرەکۆسە و هەندێ لە شارە گەورەکانی دیکە، بەم چەشنەیە: قەرەکۆسە هەتا وان – ١٩٤ کم، هەتا ئەرزەڕۆم – ١٦٦ کم، هەتا ئیغدیر – ١٧٢ کم.

پارێزگای بینگۆڵ

درێژایی ڕێگەوبانەکانی ئەم پارێزگایە، لە ساڵی ١٩٨٠ی زایینیدا، نزیکەی ٢٩٦ کیلۆمەتر بوو. درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری چەولیک هەتا ئەلازیغ – ١٤٣ کم، هەتا موش – ١١٨ کم، هەتا ئەرزەڕۆم – ١٩٦ کم، هەتا دیاربەکر – ١٥٩ کم.

پارێزگای بدلیس

ڕێگای هاتوچۆی نێوان شاری بدلیس و یەکە ئیدارییەکانی، لە ساڵی ١٩٨٠دا، بەسەر ٢٧٦ کم ڕێگادا دابەش کرا بوو.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری بدلیس هەتا دیاربەکر – ٢٢٥ کم، هەتا ئەلازیغ – ٣٥٨ کم، هەتا موش – ٨٥ کم، هەتا سیرت – ٩١ کم، هەتا وان – ١٦٢ کیلۆمەترە.

پارێزگای دیاربەکر

ئەم پارێزگایە لە ساڵی ١٩٨٠دا، خاوەنی ٩٤٠ کم ڕێگەوبان بوو. ئەمە بە درێژترین جۆری ڕێگای (لاڕێ) دادەنرێ.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری دیاربەکر هەتا بیسمیل – ٥٨ کم، هەتا چەرمیک – ٩٠٠ کم، هەتا چنار – ٣٠ کم، هەتا چونگوش – ١١٤ کم، هەتا دیجلە – ٨٨ کم، هەتا ئەرغانی – ٥٦ کم، هەتا هانی – ١١٩ کم، هەتا حازرۆ – ٧٦ کم، هەتا قوڵپ – ١٣٥ کم، هەتا لیجە – ٩٠ کم، هەتا سیلڤان – ٨٤ کم.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری دیاربەکر هەتا ماردین – ٨٦ کم، هەتا بینگۆڵ (چەولیک) – ١٥٨ کم، هەتا ئەلازیغ – ١٦٥ کم، هەتا ئورفە – ١٨٥ کم، هەتا ئادیەمان – ٢٠٧ کم، هەتا بدلیس – ٢٢٥ کم، هەتا مەرعەش – ٣٧١ کم. هەتا وان – ٣٨٧ کم، هەتا گازی ئانتەب – ٦٨٦ کم.

پارێزگای ئەلازیغ

درێژایی هەموو لاڕێکانی پارێزگای ئەلازیغ، لەساڵی ١٩٨٠دا، گەیشتۆتە ٤٦٥ کم.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری ئەلازیغ هەتا ئاغین – ٧٦ کم، هەتا باسقیل – ٣٨ کم، هەتا قەرەقۆچان – ١١٦ کم، هەتا کەبان – ٤٩ کم، هەتا مەعدەن – ٦٢ کم، هەتا پالو – ٩٤ کم، هەتا سیڤریجە – ٣٠ کم.

درێزایی ڕێگاکانی نێوان شاری ئەلازیغ هەتا دەرسیم – ١٥٣ کم، هەتا دیاربەکر – ١٦٥ کم، هەتا مەرعەش – ٢٧٥ کم، هەتا ئەرزنجان ـ ٢٨٢ کم، هەتا بدلیس – ٣٥٨ کم، هەتا ئەرزەڕۆم – ٣٩٨ کم.

پارێزگای ئەرزەڕۆم

ئەم پارێزگایە لە ساڵی ١٩٨٠دا، نزیکەی ٥١٦ کم لە لاڕێی هەبوو. درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری ئەرزەڕۆم هەتا ئاش قەلا – ٤٤ کم، هەتا چات – ٥٧ کم، هەتا خنس – ٩٦ کم، هەتا حەکیم خان – ٨٢ کم، هەتا پاسینلەر – ٣٨ کم، هەتا تەکمان – ٥٥ کم.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری ئەرزەڕۆم هەتا قەرەکۆسە (ئاگری) – ١٨٣ کم، هەتا ئەرزنجان – ١٩٢ کم، هەتا دەرسیم – ٢٤٥ کم، هەتا مەرعەش – ٢٥٧ کم، هەتا چەولیک (بینگۆڵ) – ٣٤٧ کم.

پارێزگای گازی ئانتەب

ئەم پارێزگایە لە ساڵی ١٩٨٠زدا، خاوەنی ٣١٣ کم لاڕێ بوو. درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری گازی ئانتەب هەتا ئەرغانی – ٦٤ کم، هەتا ئیسلاحیە – ٨٩ کم، هەتا کیلیس – ٦٠ کم، هەتا نیزیب – ٤٥ کم، هەتا ئۆغوزەلی – ١٨ کم، هەتا یاوزئەلی – ٣٧ کم.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری گازی ئانتەب هەتا مەرعەش – ٨٠ کم، هەتا ئورفە – ١٤٤ کم، هەتا ئادیەمان – ١٥٣ کم، هەتا ماردین – ٣٣٢ کم.

پارێزگای هەکاری

درێژایی هەموو لاڕێکانی پارێزگای هەکاری لە ساڵی ١٩٨٠دا، گەیشتۆتە ٥١١ کم.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری جۆلەمێرگ هەتا ماردین – ٦٢٨ کم، هەتا سیرت – ٢٨٥ کم، هەتا وان – ٢٠٤ کم.

پارێزگای مەلاتیە

ڕێگای هاتوچۆی نێوان شاری مەلاتیە و یەکە ئیدارییەکانی، لە ساڵی ١٩٨٠دا، ٥٣٣ کم بوو.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری مەلاتیە هەتا عارەبکیر – ١١٥ کم، هەتا ئەرگوڤان – ٦٠ کم، هەتا دارەندە – ١١٠ کم، هەتا دۆغان شەهیر – ٥٧ کم، هەتا حەکیم خان – ٧٤ کم، هەتا پۆتورگە – ٧٤ کم، هەتا یەشیل یورت – ٩ کم،

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری مەلاتیە هەتا ئەلازیغ – ١٠٠ کم، هەتا ئادیەمان – ١٨٧ کم، هەتا مەرعەش – ٢٢٤ کم، هەتا گازی ئانتەب – ٢٤٨ کم، هەتا دیاربەکر – ٢٥٣ کم.

پارێزگای مەرعەش

درێژایی هەموو لاڕێکانی پارێزگای مەرعەش، لە ساڵی ١٩٨٠دا، گەیشتۆتە ٣٢١ کم.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری مەرعەش هەتا ئەلبیستان – ١٤٨ کم، هەتا پازارچیک – ٤٨ کم، هەتا تورک ئۆغڵۆ – ٢٥ کم.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری مەرعەش هەتا گازی ئانتەب – ٨١ کم، هەتا ماردین – ١٦٨ کم، هەتا مەلاتیە – ٢٢٤ کم.

پارێزگای ماردین

ئەم پارێزگایە ساڵی ١٩٨٠، خاوەنی ٨٧٧ کم لە لاڕێ بوو. درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری ماردین هەتا جیزرە – ١٦٠ کم، هەتا دەریک – ٧٠ کم، هەتا گەرچوش – ٨١ کم، هەتا ئیدیل – ١٣٢ کم، هەتا قزل تەپە – ٢٢ کم، هەتا مازی داغی – ٤٣ کم، هەتا میدیات – ٥٨ کم، هەتا نوسەیبین – ٥٨ کم، هەتا ئۆمەرلی – ١٨ کم، هەتا ساڤور – ٤٤ کم، هەتا سیلۆپی – ١٩١ کم.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری ماردین هەتا دیاربەکر – ٩٤ کم، هەتا ئورفە – ١٨٣ کم، هەتا سیرت – ٢٨٠ کم، هەتا گازی ئانتەب – ٣٢٨ کم، هەتا هەکاری (جۆلەمێرگ) – ٦٢٨ کم.

پارێزگای موش

درێژایی لاڕێکانی ئەم پارێزگایە، لە ساڵی ١٩٨٠دا، ٣٠٦ کم بوو. درێژایی ڕێگاکانی

نێوان شاری موش هەتا بولانیک – ١١٣ کم، هەتا مەلازگیرت – ١٤٠ کم، هەتا وارتۆ – ٥٣ کم بوو. درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری موش هەتا بدلیس – ٨٥ کم، هەتا بینگۆڵ (چەولیک) – ١١٨ کم، هەتا سیرت – ١٨٥ کم، هەتا ئەلازیغ – ٢٧٥ کم، هەتا ئەرزەڕۆم – ٢٥٧ کم، هەتا دیاربەکر – ٢٧٢ کم.

پارێزگای سیرت

ئەم پارێزگایە ساڵی ١٩٨٠، نزیکەی ٧٣٥ کم لە لاڕێی جۆراوجۆری هەبوو. درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری سیرت هەتا بایکان – ٤٨ کم، هەتا بەشیری – ٧٤ کم، هەتا ئەروە – ٥٤ کم، هەتا کۆزلوک – ٧٥ کم، هەتا کور تەلان – ٣٢ کم، هەتا شیرناق – ٩٤ کم، هەتا شیروان – ٢٦ کم.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری سیرت هەتا بدلیس – ٩١ کم، هەتا موش – ١٧٤ کم، هەتا دیاربەکر – ٢١٦ کم، هەتا ماردین – ٢٤٤ کم، هەتا وان – ٢٥٣ کم، هەتا جۆڵەمێرگ (هەکاری) – ٢٨٥ کم.

پارێزگای دەرسیم

درێژایی هەموو لاڕێیەکانی ئەم پارێزگایە، لە ساڵی ١٩٨٠دا، بە سەدان کیلۆمەتر بوو. درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری دەرسیم هەتا ئەرزەڕۆم – ٢٤٥ کم، هەتا ئەلازیغ – ١٥٣ کم بوو.

پارێزگای ئورفە

ڕێگای هاتوچۆی نێوان شاری ئورفە و یەکە ئیدارییەکانی، لە ساڵی ١٩٨٠دا، لە ٧١٨ کم لاڕێی جۆراوجۆر پێک هاتبوو. درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری ئورفە هەتا بیرەجیک – ٨٤ کم، هەتا بۆزۆڤا – ٣٨ کم، جەیلان پینار – ١٤٢ کم، هەتا خالفەتی – ١٢١ کم، هەتا حیلڤان – ٥٤ کم، هەتا سیڤەرەک – ٩٣ کم، هەتا سوروچ – ٤٤ کم، هەتا وێران شەهر – ٩٠ کم.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری ئورفە هەتا گازی ئانتەب – ١٤٤ کم، هەتا ئادیەمان – ١٦٠ کم، هەتا دیاربەکر – ١٨٥ کم، هەتا ماردین – ١٨٨ کم، هەتا ئەلازیغ – ٣٣٨ کم، هەتا مەلاتیە – ٣٣٩ کم، هەتا ئەرزەڕۆم – ٦٨١ کم.

پارێزگای وان

درێژایی هەموو لارێیەکانی ئەم پارێزگایە، لەگەڵ یەکە ئیدارییەکانی دیکەدا، لە ساڵی ١٩٨٠دا، گەیشتۆتە ٤٩٦ کم. درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری وان هەتا باش قەڵا – ١١٢ کم، هەتا چاتاک – ٨٢ کم، هەتا ئەرجیش – ٩٥ کم، هەتا گەڤاش – ٤٠ کم، هەتا گورپینار – ٢١ کم، هەتا مورادیە – ٨٢ کم، هەتا ئوزالب – ٦٤ کم.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری وان هەتا بدلیس – ١٦٢ کم، هەتا هەکاری – ٢٠٤ کم، هەتا قەرەکوسە (ئاگری) – ٢٢٩ کم، هەتا سیرت – ٢٥٣ کم، هەتا دیاربەکر – ٣٨٧ کم، هەتا ئەرزەڕۆم – ٤١٢ کم.

پارێزگای ئازەربایجانی غەربی

ئەم پارێزگایە، لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٣ی زایینیدا، نزیکەی ١٤٧٤ کم ڕێگەوبانی هەبوو، لەوانە جادەی ئەسفەڵتکراو – ١٧٢ کم، بەردەڕێژ – ٣٥٨ کم، ڕێگای گوندەکان – ٤٤٢ کم. درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری ورمێ هەتا خۆی – ١١٦ کم، هەتا مەهاباد – ١١٠ کم، هەتا میاندواو – ١٥٢ کم، هەتا بۆکان – ١٧٢ کم، هەتا نەغەدە – ٨٥ کم، هەتا پیران شەهر – ١٢٤ کم، هەتا ماکۆ – ٢٣٨ کم، هەتا سەلماس – ٨٢ کم.

شاری ورمێ، بە جادەی ئەسفەلت بە شارەکانی دیکەوە بەستراوە. درێژایی ڕێگاکانی نێوان ورمێ و سنە – ٣٤٨ کم، هەتا کرماشان – ٥٠٠ کم، هەتا خوڕەم ئاباد – ٨٤٠ کم، هەتا ئیلام – ٨٠٤ کم.

پارێزگای کرماشان

درێژایی ڕێگەوبانەکانی ئەسفەڵت و بەردەڕێژ و ڕێگا گوندییەکان، هەروەها ئەو ڕێگایانەی کە پێشنیاز کراون، لە ساڵی ١٩٨٤دا، نزیکەی ٤٤٩٠ کم بوو. درێژایی هەر جۆرێکیشیان بەم شێوەیە بوو: ئەسفەڵت (ڕێگای سەرەکی و لارێ) – ٩٢٩ کم، بەردەڕێژ – ١٠٨٣ کم، ڕێگای گوندی دروسکراو – ١٠٦٦ کم، ڕێگا پێشنیازکراوەکان – ١٤١٢ کم.

ماوەی نێوان شاری کرماشان هەتا سنە – ١٣٦ کم، هەتا ئیلام – ٢٠٨ کم، هەتا خوڕەم ئاباد – ١٩٧ کم، هەتا ئیسلام ئاباد– ٥٧ کم، هەتا پاوە – ١١٢ کم، هەتا جوانەڕۆ – ٨٠ کم، هەتا سونقوڕ – ٨٥ کم، هەتا سەحنە – ٥٤ کم، هەتا کریند – ٩٣ کم، هەتا کنگاوەر – ٨٥ کم، هەتا هەرسین – ٤٤ کم.

پارێزگای کوردستان

ئەم پارێزگایە، لە ساڵی ١٩٨٩ی زایینیدا، ٢٢٨٧کیلۆمەتر ڕێگا و بانی تێدا بوو. لەوانە، ڕێگای سەرەکی – ٢٢٨ کم، لاڕێ – ٨٠٩ کم، ڕێگای گوندی – ١١٩٠ کم.

درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری سنە هەتا سەقز – ١٥٨ کم، هەتا مەریوان – ٩٤ کم، هەتا بانە – ٢٠٠ کم، هەتا قروە – ٨١ کم، هەتا بیجاڕ – ١٢٢ کم.

درێژایی جادەی نێوان سنە هەتا کرمانشان – ١٢٨ کم، هەتا ورمێ – ٣٧٨ کم، هەتا خوڕەم ئاباد – ٢٨٠ کم.

پارێزگای ئیلام

ئەم پارێزگایە لە ساڵی ١٩٩٣ی زایینیدا، خاوەنی چەند سەد کیلۆمەتر لە ڕێگەی جۆراوجۆر بوو. درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری ئیلام هەتا دێهلۆ ران – ٢٣١ کم، هەتا دڕەشەهر (بەدرە) – ١٢٨ کم، هەتا میهران – ٩٧ کم، هەتا شیروان و چرداول (لومار) – ٥٤ کم، هەتا ئەبدانان – ١٦٤ کم، هەتا ئەرکەوازی (قەلادرە) – ٥٠ کم، هەتا ئەیوان – ٥٠ کم، هەتا زەرین ئاباد (میمە) – ٩٠ کم، هەتا چوار – ١٤ کیلۆمەترە.

درێژایی جادەی نێوان شاری ئیلام هەتا کرماشان – ٢٠٨ کم، هەتا خوڕەم ئاباد – ٤٠٥ کم، هەتا یاسوچ – ٩٦٩ کم، هەتا شەهری کورد – ٨٨٧ کم، هەتا سنە – ٣٤٤ کم، هەتا ورمێ – ٨٠٤ کم.

پارێزگای لوڕستان

ئەم پارێزگایە، ساڵی ١٩٨٩ی زایینی، ١١٢٤ کم ڕێگا و بانی هەبوو، لەوانە: ڕێگای سەرەکی – ٥٠٨ کم، لاڕێ – ٤٨٧ کم، ڕێگای دیکە – ١٢٩ کم. درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری خوڕەم ئاباد هەتا بروجەرد – ٩٨ کم، هەتا ئەلیگودەرز – ١٣٦ کم، هەتا کرمانشان – ١٩٧ کم، هەتا دێزفول – ١٩٢ کم، هەتا ئیلام – ٤٠٥ کم.

پارێزگای بەختیاری

درێژایی ڕێگا و بانە سەرەکییەکان، لە ساڵی ١٩٨٩ی زایینیدا، ٧٠٣ کم بوو. درێژایی لاڕێیەکان – ١٣٨٠ کم بوو. درێژایی ڕێگا گوندییەکان – ٧٧٤ کم بوو. درێژایی جادەکانی نێوان شەهری کورد هەتا بروجەن – ٨٠ کم، هەتا فارسان – ٤٤ کم، هەتا لوردیگان –

١٦٨ كم بوو.

پارێزگای کوهگیلویه

ئەم پارێزگــایە، ســـاڵی ١٩٨٩ی زایینی، خـــاوەنی ١٥٦٢ کم ڕێگا و بان بوو. لەوانە: ڕێگای سەرەکی – ١٨٠ کم، لاڕێ – ٧٩٩ کم، ڕێگا گوندییەکان – ٥٨٣ کم بوون. درێژایی جادەی نێوان شاری یاسوچ هەتا دەهدەشت – ٢٢٨ کم، هەتا دۆگوبەندان – ١١٦ کم بوو.

پارێزگای هەولێر

درێژایی ڕێگاوبانە قیرتاوکراوەکانی پارێزگای هەولێر، لە سەدان کیلۆمەتر تێپەڕ دەکا. درێژایی ڕێگاکانی نێوان شاری هەولێر هەتا مەخموور – ٣٦ کم، هەتا بارزان – ٧٨ کم، درێژایی نێوان هەولێر و میراوە و هەریر و سپیلک – ٢٥ کم دەبێ.

پارێزگای کەرکووک

ئەم پارێزگایە، خاوەنی سەدان کیلۆمەتر لە ڕێگەی قیرتاوکراوی جۆربەجۆرە. درێژایی ڕێگاکـانی نێـوان شـاری کـەرکـووک هەتا قـادرکـەرەم – ٦٥ کم. درێـژایی ڕێگای نێـوان توزخـورمـاتوو هـەتا کـفری – ٣٥ کیلۆمـەترە. درێژایی ڕێگای نێوان شـوان هـەتا تەقـتـەق – ٤٥ کیلۆمەترە.

پارێزگای سلێمانی

درێژایی ڕێگـاوبانە لاڕێکانی پارێـزگـای سلێـمـانی، خـۆی لە ســەدان کیلۆمــەتر دەدات. درێژایی ڕێگـای سلێـمـانی هـەتا قـەرەداغ – ٤٥ کم، نێـوان پێنجـوین و ســەید سـادق – ٥٢ کیلۆمەترە.

پارێزگای موسڵ

ئەم پارێزگـایە، خـاوەنی ســەدان کیلۆمــەتر لاڕێی جـۆراوجۆرە. درێژایی ڕێگای نـێوان شاری موسڵ، هەتا ئاسکی کەڵەک – ٤٥ کیلۆمەترە.

**٢/ ئاسنەڕێ**

ســەرەتای وەرگــرتنی مـافی ڕاکـێـشـانی هێـڵی ئاسن لە کـوردســتـاندا، بۆ کـۆتایی ساڵەکانی نیوەی دووەمی چەرخی نۆزدەیەم دەگەڕێتەوە. یەکەم جار لە لایەن دەوڵەتەوە، لە

ساڵی ١٨٧٢ی زایینیدا، ئەو مافە بە سەرمایەدارەکانی ئینگلیز درا. لە ساڵی ١٨٨٠شدا، ڕێگە بە بانکی ئەڵەمانی درا، بۆ ئەوەی هێڵی ئاسنی نێوان بەرلین و بەغدا ڕابکێشێ. بەڵام لەبەر گەلێ هۆی ڕامیاریی و ئابووریی، ئەم مافانە زۆر جار لە کۆمپانیاکان دەسێندرانەوە و جێبەجێ نەدەکران، لە دواییدا مافی ڕێگەدان، بە هەندێ کۆمپانیای دیکە دەدرا.

خەسڵەتەکانی ئاسنەڕێ

ڕاکێشانی هێڵی ئاسن لە کوردستاندا، لە سەرەتاوە بە زۆری بۆ گواستنەوەی نەوت و بەرهەمەکانی نەوت بووە، لە پاڵاوگەکانەوە بۆ بازاڕ. لەبەر ئەوەی لە لایەکەوە، کرێی گواستنەوەی یەک تەن هەرزان بووە، لە لایەکی دیکەشەوە، بەرهەمی هەندێ لەو کێڵگە نەوتییانە، ئەوەند نەبووە تاکوو بۆ هەموویان، بۆری نەوت ڕابکێشرێ.

ئامانجی دروسکردنی هەندێ لەو هێڵە ئاسنیانە، بۆ گواستنەوەی هێزەکانی سو پا و چەک و تەقەمەنی بووە، بۆ مەیدانەکانی جەنگ. لە دواییدا کراون بە هێڵی گواستنەوەی ئاسایی، هەر لەبەر ئەوەش بووە، ئێسگەی شەمەندەفەرەکان بەرە بەرە ئاوەدان بونەتەوە و پەرەیان سەندووە و گەورە بوون.

خێرایی ئەو شەمەندەفەرانەی لە کوردستاندا هەن، زۆر کەمە. بۆ نموونە، ئەگەر ماوەی نێوان دوو شوێن، بە شەمەندەفەر ١٣ کاژمێر بێ، ئەوا هەمان ماوە ئۆتۆمۆبیل دەتوانێ، بە شەش کاتژێر بیبڕێ. هەموو ئەو هێڵە ئاسنیانەی لە کوردستاندا ڕاکێشراون، زیاتر بەو شوێنانەدا تێپەڕ دەبن، کە لە یەک کیلۆمەتر ڕێگای ئاسنیدا، کەمترین پارەی تێچوو بێ. واتە لایەنی ئابووری لە کاتی ڕاکێشانی ئەو هێڵە ئاسنیانەدا، زیاتر لە لایەنە ئابوورییەکانی دیکە ڕەچاو کراوە، بۆ نموونە، ئێسگەی شەمەندەفەرەکان لە شوێنی ژیانی خەڵکییەوە، ئەوەندە دوورن، ئەگەر مرۆڤ بیەوێ، بە شەمەندەفەر سەفەر بکات، ماوەیەکی زۆری دەوێ، تا دەگاتە ئەو ئێسگانە و پێویستە قۆناغێ ببڕێ و پارەیەکی زۆریش بە ئۆتۆمۆبیل بدات.

ئاسنەڕێ، لە جۆرە هێڵێکی تەسک (یەک مەتری) و جۆرێکی پان (زیاتر لە یەک مەتر) پێک هاتووە. بەڵام درێژایی جۆری یەکەمیان، دوو تا سێ ئەوەندەی جۆری دووەمیان دەبێ.

درێژایی هێڵی ئاسن لە کوردستاندا بە هەردوو جۆرەکانییەوە، لە ساڵی ١٩٨٥زدا، لە دەوروبەری ١٨٠٠کم دا بوو. بۆ بەراوردکردن، ئەم درێژاییە لە ئێران ساڵی ١٩٧٢ – ٥٢٢٩ کم بوو، لە عێراق ساڵی ١٩٨٦ – ٢٠٢٩ کم بوو، لە سووریا ساڵی ١٩٨٦ – ٢٠٤٧ کم بوو.ئاسنەڕێیەکانی کوردستان ئەمانەن: تەماشای نەخشەی ژمارە (١٣) بکە.

ئەرزەڕۆم ـ دیڤریکی

یەکەمین هێڵی ئاسنی کوردستانە. لە دوا ساڵەکانی چەرخی نۆزدەیەم ڕاکێشراوە.لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، درێژاییەکەی بە سەدان کیلۆمەتر دەبێ. ساڵانە لە نێوان شارەکانی ئەرزەڕۆم و ئەرزنجان و هەندێ جێگەی دیکەدا، بە سەدان نەفەر و بە هەزاران تەن شتومەک دەگوێزێتەوە.

ئۆزالب ـ ئەلازیغ

درێژاییەکەی لە نێوان شاری ئۆزالب ـ ئەلازیغ، بە سەدان کیلۆمەتر دەبێ. ئەم هێڵە بە نێو گۆمی واندا تێپەڕ دەبێ. لە ڕۆشتنیدا بە شارە گەورەکاندا تێناپەڕێ. توانای گواستنەوەی ساڵانەی لە نەفەر و لە کەلوپەل. زۆر نییە.

کورتەلان – عوسمانیە

ئەم هێڵە، بە یەکێ لە درێژترین هێڵە ئاسنینەکانی کوردستان لە قەڵەم دەدرێ. درێژاییەکەی سەدان کیلۆمەتر دەبێ. لە شارۆچکەی کورتەلانەوە دەست پێ دەکات، بەرەو ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە، تاکوو دەگاتە شارۆچکەی عوسمانیە. ئەم هێڵە بە شارەکانی باتمان، دیاربەکر، مەلاتیە و مەرعەشدا تێپەڕ دەبێ. لە مەلاتییەوە هێڵێکی بەرەو باکوور درێژ دەبێتەوە و لەگەڵ هێڵی ئەرزەڕۆم – دیڤریکی، لێک دەدەنەوە، لە دواییدا لە خاکی کوردستان دەچێتە دەرەوە.

موسڵ – گازی ئانتەب

ئەم هێڵە، درێژترین هێڵی ئاسنە لە کوردستاندا. درێژاییەکەی بە سەدان کیلۆمەتر دەبێ. دوای ئەوەی ئەم هێڵە، لە شاری موسڵ دەردەچێ، بە چەند شارۆچکەیەکی وەکوو نوسەیبین، راسولعەین – جەیلان پینار، نیزیبدا تێپەڕ دەکا، هەتاکوو دەگاتە گازی ئانتەب، لەوێشەوە درێژ دەبێتەوە و بەرەو هێڵی کورتەلان – عوسمانیە دەڕوا و لێک دەدەن. ئەم هێڵە، ئەگەرچی بە هێڵی ڕۆژهەڵاتی خێرا ناسراوە، بەڵام هاتوچۆی زۆر لەسەر نییە.

مقدادیە – هەولێر

ئەم هێڵە بە دواکەوتووترین هێڵی ئاسن لە کوردستاندا دەژمێردرێ. لە سەرەتادا، بە

## نەخشەی ئاسنەڕێ



مەبەستی گواستنەوەی نەوت، لە نێوان کەرکووک و هەولێردا دروست کرا، لە دواییدا و لە هەندێ شوێن و کاتدا، خەڵکیشی سوار دەکرد. بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا، نەک هەر لە کارکردن کەوت، بەڵکوو هێڵە ئاسنینەکانیشیان هەڵگرت و بە تەواوی کۆتاییان پێ هێنا، تەنیا ئەو هێڵە نەبێ، کە لە جەلەولاوە بەرەو خانەقین درێژ بۆتەوە، لە کارکردندا بەردەوامە.

خوڕەم ئاباد – دێزفول

ئەم خەتە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا هەڵکەوتووە. درێژاییەکەی لە چەند کیلۆمەترێ زیاتر نابێ. بۆ گواستنەوەی خەڵک و هەندێ شتومەکی نێوان خوڕەم ئاباد و دێزفول بەکار دەهێندرێ.

شەرەفخانی – ڕازی

درێژایی ئەم هێڵە، لە شەرەفخانەوە هەتاکوو دەرەی قتوور، ٩٥ کیلۆمەتر دەبێ. لەم دەرەیەشەوە هەتاکوو ڕازی ٤٥ کیلۆمەترە. ئەم هێڵە، بەسەر یەکێ لە هەرە بەناوبانگترین پردەکانی ڕۆژهەڵاتدا تێدەپەڕێ، کە پێی دەگوترێ – پردی قەتوور. درێژایی ئەم پردە، ٤٤٨ مەترە، بەرزاییەکەی ١٢٧ مەترە و کەمەرەکەشی ٢٣٣ مەترە.

**٣/ بۆری نەوت**

بەرهەمی ساڵانەی کوردستان لە نەوت، بە سەدان ملیۆن تەن دەبێ. ئەم بەرهەمە بە هۆی بۆرییەکانی نەوتەوە، بە ڕێگای جیاواز و بە کەمەر و توانا و ئامانج و درێژایی جیاجیادا، بۆ گوێی دەریای نێوەڕاست و بەندەری ئەسکەندەروون و کەنداوی فارس دەگوێزرێتەوە. لەوێشەوە تانکەری لێ پڕ دەکرێ و بەرەو بازاڕەکانی جیهان ڕەوانە دەکرێ.

کوردستان لە ڕۆژهەڵاتی نێوەندا، لە ڕووی درێژایی بۆرییە نەوتەکانییەوە، بە یەکێ لە گەورەترین وولات دادەنرێ. درێژایی بۆری نەوتوکانی، خۆیان لە سەدان هەزار کیلۆمەتر دەدەن. تەماشای خشتەی ژمارە (٤٦) و نەخشەی ژمارە (١٤) بکە.

بە چاوخشاندنێک بە نەخشەی ژمارە (١٤) دا، بۆمان دەردەکەوێ، کە تەنیا ئەو بۆریانەی لە سیرتەوە بۆ کەناری کەنداوی ئەسکەندەرون و بۆری کێڵگەی کەرکووک بۆ شارۆچکەی دۆرت یۆل، لەسەر هەمان کەنداو، بە تەواوی بە نێو خاکی کوردستاندا تێپەڕ دەبن. ئەگینا ئەوانی دیکە کە زۆربەن، بە خاکی وولاتەکانی دەوروبەردا دەڕۆن. بۆیە لە

**خشتەی ٤٦ درێژایی و کەمەرەی بۆرییەکانی نەوت لە هەشتاکاندا**

| لوولە | درێژی کم/میل | کەمەرە ئینچ |
|---|---|---|
| بای حەسەن – کەرکووک، .............. کم | ٣٢ | ١٦ |
| بێخمە – عین زالە K2 .................... کم | ٢١٦ | ١٢ |
| K2 – دۆرە (عیراق) ....................... کم | ١٧٧ | ١٢ |
| کەرکوک – تەرابلس (لوبنان) .........کم | ٨٥٤ | ١٢ |
| کەرکووک – تەرابلس (لوبنان).........کم | ٨٩٤ | ٣٢/٣٠ |
| کەرکووک – بانیاس (سووریە).........کم | ٨٩٣ | ٣٢/٣٠/٢٦ |
| جەمبور – کەرکووک ....................... کم | ٥٨ | ٨/٦ |
| نەفتخانە – دۆرە (عیراق) .............. کم | ١٣٠ | ١٢ |
| کەرکووک – جەیهان (تورکیا)......... کم | ١٠٤٩ | ٤٠ |
| ناوشار–کرماشان، ...................... میل | ١٤٦ | ٨ |
| گەجساران– شیراز .................... میل | ١٤٣ | ١٠ |
| مەسجدی سلێمان – ئەهواز ......... میل | ٣٤٠ | ٢٤/٨ |
| لەبی سەفید – مەسجدی سلێمان، میل | ٨٠ | ١٢/٨ |
| هەفت گل – ئەهواز ....................... میل | ٧٤ | ١٢/١٠ |
| مارون – عەبادان ......................... میل | ٢٢١ | ٢٤/١٢ |
| ئاغای جاری – دورگەی خارک ... میل | ٤٠١ | ٢٤/١٢ |
| پازنان – دورگەی خارک .............. میل | ٧٠ | ٢٤/١٢ |
| مارون – ڕەگ سەفید .................... میل | ٧٠ | ٢٤/١٢ |
| مارون – دورگەی خارک................. میل | ٨٥ | ٢٤/٢٢ |
| ڕامشیر – ڕەگی سەفید................. میل | ٧٧ | ١٢/٨ |
| گەجساران – دورگەی خارک .........میل | ٣٣٥ | ٥٢/١٢ |
| مەسجدی سلێمان – ئەهواز .........میل | ٦٠ | ١٠ |
| قەرەچوغ – تەرتوس .................... میل | – | – |
| کورتەلان – دۆرت یۆل ................. میل | – | – |

نەخشەی بۆری نەوت



ڕووی ستراتیژییەوە خراپن، لە ڕووی ڕامیاریی و ئابوورییەوە، هەمیشە لە مەترسی دان. لەبەر ئەوە پێویستە، پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریادا، ببەسترێ.

وا لە خوارەوە، باسی بۆرییە نەوتەکان دەکەین:

- بۆری نەوتی جەمبور، بای حەسەن - بۆرییەکانی کەرکووک

کۆمپانیای نەوتی عێراق، لە ساڵەکانی ١٩٥٥ و ١٩٦١دا، بۆ بردنی نەوت لە کیڵگەکانی نەوتی جەمبور و بای حەسەنەوە، ئەم بۆرییانەی ڕاکێشاوە. کەمەرەی بۆرییەکان هەندێکیان ٦ - ٨ ئینچ و هەندێکی دیکەشیان ١٦ ئینچ دەبێ. درێژاییان لە ٣٢ - ٥٨ کم دەبێ. ئەم بۆرییانە نەوت دەگەیەننە بۆرییەکانی کەرکووک و لەوێشەوە دەنێردرێ بۆ شاری تەرابلوس، کە دەکەوێتە سەر دەریای نێوەڕاست.

- بۆری نەوتی عەینزالە - بێتمە - پەمپی کەرکووک K2

دوای دۆزینەوەی نەوت لە کێڵگەکانی نەوتی عەینزالە و بێتمە، لە لایەن کۆمپانیای نەوتی موسڵەوە، دەست بە ڕاکێشانی بۆری نەوت کرا، بۆ بۆرییەکانی نەوتی کەرکووک و لە ساڵی ١٩٥٥دا تەواو بوو. درێژایی ئەم بۆرییە ٢١٦ کیلۆمەترە. کۆمپانیای نەوتی موسڵ لەگەڵ بۆرییەکاندا، سێ مەنجەڵی گەورەی دروست کرد، کە فراوانی هەر یەکێکیان لە ٨٢٠٠ تەن زیاتر بوو.

- بۆری نەفتخانە - دەزگای پاڵێوگەی نەوتی ئەڵوەند

یەکێ لە هەرە کۆنترین بۆرییە نەوتییەکانە، کە لە لایەن کۆمپانیایەکی نەوتەوە لە کوردستاندا ڕاکێشراوە. ئەم بۆرییە، نەوتی کێڵگەی نەفتخانە لە ساڵی ١٩٢٧ەوە، دەگەیەنێتە دەزگای پاڵێوگەی نەوتی ئەڵوەند.

- بۆری نەوتی کەرکووک - تەرابلوس (لوبنان)

مێژووی ڕاکێشانی ئەم بۆرییە، بۆ ساڵی ١٩٣٢ دەگەڕێتەوە، واتە دوای نزیکەی سێ ساڵ، لە دۆزینەوەی نەوت لە کێڵگەی بابەگوڕگوڕدا، ئەم بۆرییانە دانران. لە سەرەتاوە، کۆمپانیای نەوتی عێراق دوو بۆری نەوتی لە K1 (کەرکووک ١) ەوە، بەرەو باکووری ڕۆژئاوا ڕاکێشا، هەتا گەیاندییە پەمپی شارۆچکەی (حدیثە) ی عێراق، لەسەر ڕووباری

دیجله. له دواییدا تاکوو پەمپی K2 درێژی کردەوە، کە لە نزیک شارۆچکەی بێجی عێراقەوە هەڵکەوتووە. لەوێشەوە بەرەو پەمپی K3 درێژ دەبێتەوە، کە دەکەوێتە سەر ڕووباری فورات. درێژایی بۆری نەوتی نێوان کێڵگەی نەوتی بابەگوڕگوڕ، هەتا K3 دەگاتە ٣٩٥ کم.

بۆری نەوتی کەرکووک لە دوای K3 دەبێ بە دوو بەشەوە، ئەوەی دەکەوێتە باکوورەوە،(٤٢٧ کم)ی بە نێو خاکی سووریادا و (٢٧ کم)ن بە نێو خاکی لوبناندا تێدەپەڕێ، هەتا بە پەمپی T1 (تەرابلوس ١) و بە پەمپی T4، لە شاری تەرابلوس کۆتایی پێ دێت. بۆرییەکەی باشووریان، بەرەو ئوردون (٣٢٨ کم)، فەلەستین (٦٤ کم) درێژ دەبێتەوە، دوای ئەوەی بە پەمپی H1 (حەیفا ١)، هەتا پەمپی H5 دەڕوات. درێژایی ئەم بۆرییە ١٠٠٨ کیلۆمەترە.

دوای ئەوەی بەرهەمی ساڵانەی نەوت زیادی کرد، دوای ئەوەی بازاڕی فرۆشتنی نەوت بە تەواوی گەرم بوو، لە ساڵی ١٩٤٥دا، کۆمپانیای نەوتی عێراق، لە کێڵگەی نەوتی بابەگوڕگوڕەوە بۆ شارەکانی تەرابلوس و حەیفا، تا سەر زەریای نێوەڕاست، دوو بۆری نەوتی دیکەی ڕاکێشا، کە کەمەرەی هەر یەکەیان ١٦ ئینجە. ئەم دوو بۆرییە، پەنجا کیلۆمەتریان مابوو تەواو ببن، کە جەنگی دووەمی جیهانی دەستی پێ کرد، بۆیە لەبەر جەنگی نێوان وولاتە عەرەبییەکان و ئیسرایل، کارەکە وەستا و ئەو بۆرییەی کە بڕیار بوو، بۆ شاری حەیفا ڕابکێشرێ، ڕانەکێشرا و تەواو نەکرا. بەڵام بۆرییەکەی تەرابلوس بە بەردەوامی کاری تێدا کرا و لە ساڵی ١٩٤٩دا تەواو بوو، تواناکەشی زیادی کرد بۆ ٧,٥ ملیۆن تەن لە ساڵێکدا.

– بۆری نەوتی K1 – بانیاسی سووری

دوای ئەوەی بەرهەمی نەوت، لە نێوچەی نەوتی نێوەڕاستدا زیادی کرد، بازاڕەکانی نەوت بە تەواوی گەرم بوون، ژمارەی کرێکارە شارەزا و لێزانەکانی نەوت زیادی کرد، ناکۆکییەک لەسەر نەوت، لە نێوان کۆمپانیاکانی ئینگلیزی – ئێرانی لە ساڵی ١٩٥١دا، لەسەر نەوتی نێوچەی نەوتی باشوور دروست بوو. ئەمانە هەمووی بوونە هۆی ئەوەی، کە هەندێ بۆری نەوتی دیکە، لە کەرکووکەوە بۆ سەر زەریای نێوەڕاست ڕابکێشرێ.

لە ساڵی ١٩٥٢دا، بۆرییەکی نەوت لە کەرکووکەوە بەرەو شاری بانیاسی سووری ڕاکێشرا. درێژاییەکەی ٨٨٨ کم و کەمەرەکەی ٣٠ – ٣٢ ئینج و توانای ساڵانەشی ١٣ ملیۆن تەن بوو.

له ئۆگەستی ١٩٦١دا، بۆرییەکی دیکە لە K1 ەوە بەرەو تەرابلوسی سووری ڕاکێشرا. کەمەرەکەی ٣٠ – ٣٢ ئینج بوو. لە ئەنجامدا، بۆرییە نەوتەکان لە باشووری کوردستاندا زیادی کرد و توانای ناردنی نەوت زیادی کرد و لە ساڵی ١٩٧٠دا، گەیشتە ٥٤ ملیۆن تەن نەوت لە ساڵێکدا.

– بۆری نەوتی کەرکووک ــ دۆرت یۆڵ

یەکەمین بۆری نەوتە، کە هەمووی بە نێو خاکی کوردستاندا تێپەڕ دەبێ. ئەم بۆرییە، لە کێڵگەی نەوتی کەرکووکەوە دەست پێ دەکات و لە شارۆچکەی دۆرت یۆڵی سەر کەنداوی ئەسکەندەرون تەواو دەبێ. درێژاییەکەی ١٠٠٥ کیلۆمەترە. ١٥٠ ملیۆن دیناری عێراقی تێچووە. توانای ساڵانەی ٢٥ ملیۆن تەن نەوتە، کە لە داهاتوودا توانای زیادبوونی بۆ ٣٥ ملیۆن تەن هەیە.بەردی بناغەی ئەم بۆرییە، لە مانگی یولی ١٩٧٥دا دانرا. لە دێسەمبەری ١٩٧٦دا، لە ماوەی شەش مانگدا تەواو بوو. بۆری نەوتی کەرکووک – دۆرت یۆڵ، بە یەکێ لە درێژترین و پڕ لە بایەخترین بۆری نەوت، لە جیهاندا دادەنرێ.

– بۆری نەوتی کێڵگەی نەوتی کەرکووک – بەندەری فاو

نەوتی کێلگەی کەرکووک و دەوروبەری، بەم بۆرییە دەگەیەندرێتە شارۆچکەی فاوی عێراق، لەسەر کەنداوی بەسرە. ئامانجی عێراق لە ڕاکێشانی ئەم بۆریە نەوتییە لە حەفتاکاندا، بۆ ئەوە بوو کە بە سەربەستی نەوت بۆ دەرەوەی وولات بنێرێ.

– بۆری نەوتی باتمان – ئەسکەندەرون

ئەم بۆریە نەوتییە، لە ساڵی ١٩٦١دا، بۆ گواستنەوەی نەوت لە کێڵگەی نەوتی باتمان و دەوروبەری، بۆ سەر کەنداوی ئەسکەندەرون، لە لایەن کۆمپانیای نەوتی تورکیاوە (APAO) ڕاکێشراوە. لەوێشەوە تا پلاتفۆڕمی دۆرت یۆڵ درێژ بۆتەوە. پاشان تەنکەرە نەوتییە گەورەکان، بۆ بازاڕەکانی نەوتی ئەورووپای دەگوێزنەوە. تونای ڕۆژانەی دەگاتە ٧٠ ملیۆن بەرمیل.

– بۆری نەوتی مەسجیدی سلێمان ــ عەبادان

دوای ئەوەی بۆ یەکەم جار، نەوت لە کوردستاندا دۆزرایەوە، لە لایەن کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی – ئێرانی، ئەم بۆریە نەوتییە ڕاکێشرا. ئەم بۆرییە، یەکەمین بۆری نەوتە کە لە

سـاڵی ١٩١٢دا تەواو بووە. کـەمـەرەکەی ١٠ – ١٥ سـانتـیـمـەترە. توانای سـاڵانەی ٤٠٠ هەزار تەنە. لەسـەر ئەم بۆرییە، چوار پەمـپی مـەزن کـار دەکەن (تمبی، مـەلا سـانی، کوت عەبدوڵڵا و دارخوێن).

– بۆری نەوتی هەفت کل ـ عەبادان
نەوتی ئەم کـێڵگەیە، بە بۆرییـەکی چـەند ئینجی دەگـەیەندرێتە پەمـپی کوت عـەبدوڵڵا، لەوێشەوە بۆ عەبادان دەنێردرێ.

– بۆری نەوتی سەفید ـ عەبادان
ئەم بۆرییـە نەوتـی کێڵگەی سـەفـید، لە سـەرەتاوە دەگـەیەنێتـە پەمـپی کـوت عـەبدوڵڵا، لەوێشەوە بۆ هێڵی سەرەکی مە سجیدی سلێمان و پاشان بۆ عەبادان دەڕوا. درێژایی ئەم بۆرییانە بە دەیان کم دەبێ.

– بۆری نەوتی ئاغاجاری ـ عەبادان
ئەم بۆریە نەوتییـە لە سـاڵی ١٩٤٤دا ڕاکێشـراوە.بۆ ئەوەی نەوتی کێڵگەی ئاغـاجـاڕی بگەیەنێتـە پاڵێوگەی عـەبادان. لەوێشەوە لە بەندەری ماە شـەهری ئێرانییـەوە، تانکەرەکانی نەوتی لێ پڕ دەکرێ. لە ڕاسـتـیدا ئەم بۆرییـانە، لە حـەوت بۆری پێک هاتوون و لە تەنیشت یەکەوە ڕیز کراون، کە نەوتی کێڵگەی ئاغاجاڕی دەگەیەننە عەبادان و بەندەر مـاە شـەهری ئێرانی.

– بۆری نەوتی گەچساران – عەبادان:
دوای دۆزینەوەی نـەوت لە کـێـڵگەی نەوتی گـەچسـاران، ئەم بۆرییـە ڕاکـێـشـراوە، تا بەرهەمـەکەی بگەیەنێتە عـەبادان. کەمـەرەکەی ٣٠ سانتیمـەترە و درێژاییەکەشی بە دەیان کیلۆمەتر دەبێ.

– بۆری نەوتی لالی – عەبادان:
درێژاییـەکەی سـەدان کم دەبێ. بەرهـەمی کێڵگەی لالی دەگـەیەنێتە بەندەری عـەبادان و لەوێشـەوە بە تانکەری نەوت بۆ بازاڕەکانی ئەوروپای دەنێرن.

- بۆری نەوتی شاه ــ کرماشان

ئەم بۆریە بۆ گەیاندنی بەرهەمی کێڵگەی نەوتی شاه، بۆ پاڵێوگەی کرماشان تەرخان کراوە. درێژاییەکەی دەیان کم و کەمەرەکەی چەند سانتیمەترێ دەبێ.

## ٠٢ ڕێگاوبانی ئاسمانی

کوردستان پەیوەندی ئاسمانی، لەگەڵ دەوڵەتەکانی دەوروبەری وەکوو تورکیا و ئێران و عێراق و سووریادا هەیە، لەو ڕێیانەشەوە، لەگەڵ وولاتەکانی دیکەی جیهانیشدا، ئەو پەیوەندییە دروست دەکات.

ڕۆڵی ڕێگەوبانی ئاسمانی، لەچاو ڕۆڵی ڕێگا و بانەکانی زەمینیدا، (ئۆتۆمۆنیل و شەمەندەفەر) بۆ گواستنەوەی بار و خەڵکی، زۆر کەمە، چونکە ئێستا کوردستان، وولاتێکی ژێردەست و دابەشکراوە، لەبەر ئەوە لە فڕۆکەخانەی جیهانی بێبەش کراوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ساڵی ١٩٨٩ نزیکەی ٤٤٩ هەزار کەس، هاتوچۆیان کرد،(هاتن - ٢١٩ هەزار، چوون - ٢٣٠ هەزار)، چەندین هەزار تەنیش لە کەلوپەلە جیاوازەکان گواسترایەوە. تەماشای خشتەی ژمارە (٤٧) بکە.

وەکوو بەو ژمارانەی نێو ئەو خشتەیەی سەرەوەدا دەردەکەوێ، فڕۆکەخانەی دیاربەکر، لە ڕووی نیشتنەوە و فڕینەوە، چ لە ڕووی ژمارەی خەڵک و چ لە ڕووی گواستنەوەی بارەوە، بە قەرەباڵغترین فڕۆکەخانەی کوردستان دادەنرێت. هۆکەشی تەنیا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، لەبەر ئەوەی شوێنی جوگرافی لە نێو نێوچەکانی دیکەی کوردستاندا، زۆر باش هەڵکەوتووە. کەمترین ژمارەی نیشتنەوە و فڕینیش، لە فڕۆکەخانەی سنەیە، هۆکەشی بۆ بەردەوام نەبوونی کار دەگەڕێتەوە.

**خشتەی ٤٧** **ژمارەی نیشتنەوە و فڕینی کەس و بار لە فڕۆکەخانەکاندا، ساڵی ١٩٨٩**

| فڕۆکەخانە | ژمارەی نیشتنەوە و فڕین | نەفەر، هەزار | | | بار، هەزار کگم | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | کۆ | هاتن | چوون | کۆ | هێنان | بردن |
| دیاربەکر | ٩١٢ | ٩٤ | ٤٧ | ٤٧ | ١٢٣٦ | ٦٦٣ | ٥٧٣ |
| ئەلازیغ | ٧٦٣ | ٢ | ٠,٥ | ١,٥ | ٨ | – | ٨ |
| ئەرزنجان | ٢٠٥ | ٠,٣ | ٠,١ | ٠,٢ | ٤ | ١ | ٣ |
| ئەرزەڕۆم | ١٣٠٨ | ٥٦ | ٣٠ | ٢٦ | ٩٥٠ | ٦٤٣ | ٢٠٧ |
| گازی ئانتەب | ٧٩٢ | ٣٦ | ١٩ | ١٧ | ١٢٩ | ٨٧ | ٤٢ |
| مەلاتیە | ٣١٨ | ١٦ | ٨ | ٨ | ١٩٥ | ١١٤ | ٨١ |
| ئۆرفە | ١٦٨ | ٠,٤ | ٠,١ | ٠,٣ | ٢ | ١ | ١ |
| وان | ٦٠٤ | ٣٥ | ١٨ | ١٧ | ٣١١ | ٢٢٩ | ٨٢ |
| ورمێ | – | ١٠٧ | ٥٤ | ٥٣ | – | – | – |
| کرماشان | – | ٧٠ | ٣٦ | ٣٤ | – | – | – |
| خورەم ئاباد | – | ١٩ | ١٠ | ٩ | – | – | – |
| سنە | – | ١٣ | ٧ | ٦ | – | – | – |

## ٠٣ ڕێگاوبانی ئاوی

لە کوردستاندا، ڕووبار و ئاوێکی زۆر هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەی هاتوچۆی نێوخۆی ئاوی نییە. چونکە زۆربەی ڕووبارەکان بە دۆڵە قوڵ و زۆر تەسکەکاندا دەڕۆن. جگە لەوەی ئاستی ڕووبارەکان لە ئاستی زەوییەوە، زۆر نزم و دوورە. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنی، کە ئیدی ڕووبارەکانی کوردستان، بۆ هاتوچۆکردن بە کەڵک نایەن، بەڵکوو لە هەندێ شوێندا، بە تایبەتی لەو شوێنانەدا کە ئاوی ڕووبارەکان هێور دەبنەوە، بە بەلەم و قەیاغ و چوپ و مەشکە... هتد توانای پەڕینەوە و هاتوچۆکردن هەیە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستییەدا، کە سنووری کوردستان لە باشوور و باکووری ڕۆژهەڵاتەوە، دەگاتەوە سەر کەنداوی عەرەبی و کەنداوی ئەسکەندەرون، ئەو دوو شوێنە بۆ هاتوچۆی ئاوی دەست دەدەن و لەو ڕێیانەشەوە دەتواندرێ، پەیوەندی بە وڵاتەکانی دیکەی جیهانەوە بکرێ. لەسەر کەناری ئەو دوو ئاوە، چەند بەندەرێ هەڵکەوتوون، گرنگەکانیان ئەمانەن:

- بەندەری گناوە

ئەم بەندەرە، لەسەر ڕۆخی کەنداوی فارسە و دەکەوێتە باشووری کوردستانەوە. تێکڕای بەرزایی لە ڕووی زەریاوە، نزیکەی پێنج کیلۆمەتر دەبێ. شوێنی سروشتی ئەم بەندەرە، زۆر باش هەڵنەکەوتووە، لەبەر ئەوە یەکسەر بە زەریاوە نەبەسراوەتەوە، بەڵکوو لە ڕێی کەنداوێکی پچوکترەوە، دەگاتە سەر زەریا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بایەخی بازرگانی کەم نییە و ساڵانە لە ڕێی ئەم بەندەرەوە، چەندین تەن کەلوپەل دەهێندرێ و دەنێردرێت بۆ دەرەوە. لە هەمان کاتیشدا، ژمارەی ئەو پاپۆڕانەی لەسەر کەناری ئەم بەندەرە لەنگە دەگرن، کەمن و ژمارەی ئەو کرێکارەنەشی لەو بەندەرە کار دەکەن، لە چەند سەد کەسێ تێپەڕ ناکات.

- بەندەری ریگ

بە دەیان کیلۆمەتر لە باشووری بەندەر گناوەوە دوورە. ڕاستەوخۆ لەسەر کەنداوی فارسەوە هەڵکەوتووە. لە ساڵی ١٧٥٤ی زایینیدا، کۆمپانیای هیندی - ئینگلیزی ڕۆژهەڵات، کەرەسەیەکی زۆری لێ داگرت، بەو نیازەی لەوێدا و لەسەر قەراغی ئەم کەنداوە، بەندەرێکی گەورە دروست بکەن، تا بتوانن پێشوازی لە گشت کەشتییەکانی گواستنەوە و پاپۆڕە زەریاییەکان بکەن، کە کەلوپەل بۆ بەندەری پوشەهری ئێرانی دەبەن.

لەبەر هەندێ هۆی جوگرافی، هێشتا وەکوو پێویست، بایەخێکی زۆر بەم بەندەرە نەدراوە، بۆیە لە ڕووی ئابووریشەوە، بایەخێکی زۆری نییە.

– بەندەری دەیلەم

ئەم بەندەرە ٧٢ کم لە باشووری شارۆچکەی بەهبەهانەوە دوورە. هەروەکوو بەندەری گناوە، لەسەر کەنداو هەڵنەکەوتووە. لە ڕووی ژمارەی ئەو پاپۆڕانەی ڕۆژانە، لەم بەندەرەدا لەنگەر دەگرن و کەلوپەل هانین و ناردنە دەرەوە و خەڵک گواستنەوەوە، بایەخێکی ئەوتۆی نییە.

– بەندەری ئەسکەندەرون

بایەخی ئەم بەندەرە بۆ کوردستان، لە بایەخی هەموو بەندەرەکانی دیکە زیاترە. لەم بەندەرەوە دەتواندرێ، ساڵانە چەندین هەزار ملیۆن تەن نەوت، بۆ بازاڕەکانی جیهان ڕەوانە بکرێت. مانگانە بە دەیان پاپۆڕ لەم بەندەرەدا، بەتاڵ و بار دەکرێن، بە سەدان کەسیش سەفەری پێ دەکەن.

## بەشی شەشەم - بازرگانی

چالاکی بازرگانی یەکێ لە دواکەوتووترین کەرتەکانی ئابووری کوردستانە. ئەمەش لە دوو ڕووەوە بەدیار دەکەوێ، لە لایەکەوە ڕێژەی ئەو کەسانەی بە بەردەوامی بە کاری بازرگانییەوە خەریکن، لە ۱٪ی گشتی دانیشتووانی چالاکی ئابووریی پێک دێنن. ئەگەرچی ئەم ڕێژەیە لە وولاتەکانی دیکەی باشووری ڕۆژئاوای ئاسیادا، دەگاتە ۱۰٪. لە لایەکی دیکەوە، ڕێژەی سالانەی داهاتی بازرگانی، لە پێکهێنانی بەرهەمی نیشتمانیدا، ئەگەر ئەو ساڵە کاری بازرگانی زۆر باش بێ، لە ۱۰٪ زیاتر نابێ، ئەوە لە کاتێکدا، لە دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا، هەتا ۲۰٪ دەڕوا.

لە خەسڵەتە گرنگەکانی بازرگانی کوردستان ئەوەیە، کە دوو لەسەر سێی نرخی سالانەی بازرگانی، بۆ هێنانی (هێنان – Import) کەلوپەلی جیاواز تەرخان دەکرێ، واتە کوردستان بە پلەی سەرەکی، بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی ڕۆژانەی ژیان، پشتی بە وولاتانی دەرەوە بەستووە. ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە، جولانەوەی بازرگانی بە شێوەیەکی بەردەوام، لە لایەن دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە ئابلۆقە دراوە، تا بە هیچ جۆرێ، نە لە ڕووی ئابووریی و نە لە ڕووی کۆمەلایەتییەوە پێش نەکەوێ. یەکێ لە خەسڵەتەکانی دیکەی بازرگانی ئەوەیە، کە کوردستان هیچ کاتێ ئازاد نییە، لەوەی پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ کام دەوڵەتدا دەبەستێ، بەڵکوو ناچارە تەنیا، پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەدا ببەستێ، کە بۆی دەسنیشان دەکرێ، با جۆری ئەو پەیوەندییەشی لا پەسەند نەبێ، یا لە بەرژەدەندیشی نەبێ، لەبەر دەردی ژێردەستی و بێدەوڵەتی، دەبێ هەر پەسەندی بکات.

### ۱. بازرگانی دەرەوە

پێش ئەوەی دەست بە باسکردنی بازرگانی دەرەوە بکەین، ڕاستییەک هەیە، پێویستە پێش چاو بخرێ، ئەویش ئەوەیە، ئەم جۆرە بازرگانییە، کوردستان ناتوانێ خۆی بە ئەنجامی بگەیەنێت. هۆکەشی بۆ نەبوونی قەوارەیەکی ڕامیاری دەگەڕێتەوە، بۆیە هەموو جۆرە چالاکییەکانی بازرگانی دەرەوە، لە ڕێی دەوڵەتانی سەردەستەوە جێبەجێ دەکرێ.

گەلێ دەوڵەت لە جیهاندا هەن، دەیانەوێ پەیوەندی بازرگانی ڕاستەوخۆ لەگەڵ کوردستاندا دابمەزرێنن، لەبەر ئەوەی لەسەرێکەوە، کەرەسە خاوەکانی بەرهەمی کشتوکاڵی و پەلەوەڕ و ئاژەڵ و سامانی سەر زەوی و ژێر زەوی، لەچاو وولاتەکانی دیکەدا،

به نرخێکی هەرزانتر لەیی دەست دەکەوێ. لەسەرێکی دیکەشەوە، بازاڕەکانی کوردستان، بۆ ساغکردنەوەی کەلوپەلە پیشەسازییەکانی ئەو وولاتانە، بەشوێنێکی باش لە قەڵەقم دەدرێ. بۆیە هەر لە کۆنەوە، دەوڵەتە جیاجیاکانی جیهان، هەوڵی زۆریان داوە، تا دەست بەسەر بازاڕەکانیدا بگرن، بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستەشیان، زۆر جار هەندێ لە نوێنەرەکانی خۆیانیان بۆ ناردووە.

بازرگانی دەرەوە، لەسەرەتای ئەم سەدەیەوە تاکوو ئەورۆ، ورده ورده گەشەی کردووە. بۆ ئەوەی زیاتر لەو گۆڕانکارییانە بگەین، پەرەسەندنی بازرگانی دەرەوە بەسەر چەند قۆناغێکدا دابەش دەکەین:

قۆناغی یەکەم: ١٩٠٠ – ١٩٢٥

نرخی سالآنەی بازرگانی دەرەوەی کوردستان، لەگەڵ دەوڵەتەکانی دیکەدا، بە لەبەرچاوگرتنی بارە کۆمەلآیەتی و ئابوورییەکەی هەردوو لا، لە ٢٥ هەزار دۆلار کەمتر بووە. لەو ڕۆژگارانەدا، زۆربەی پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی، لە جلوبەرگ و پێلآو و کەلوپەلی نێو ماڵ و کەرەسەکانی کشتوکاڵ و هەندێ خواردەمەنی و دەرمان... تاد، جۆلآ، بەرگدروو، کەوشدروو، تەونچن، دارتاش و ئاسنگەر، بە دەستی خۆیان دروستیان کردوون، خواردەمەنیش لە دانەوێڵە و گۆشت و سەپیایی، لە لایەن جوتیارەکان و مەڕدارەکان بە بەرهەم هێندراوە. پێویستی گەورەی ئەو ڕۆژگارانە، تەنیا هەندێ قوماش و چا و شەکر و چەکی سووک بووە، ئەویش لە ڕێگەی بازرگانەکانی ڕۆژهەلآت و دەوڵەتە ئەوروپاییەکانەوە، لە بازاڕەکان دەست کەوتوون و فرۆشراون. لە هەمان کاتیشدا، بەرهەمەکانی کوردستانیشیان کڕیوە و بۆ دەرەوەیان ناردووە، بۆ نموونە، بازرگانە ئەڵەمانییەکان، لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، شاری شنۆیان کرد بوو بە ناوەندێکی گەورەی خوری کڕین، لەوێشەوە بۆ ئەو فابریکەیەیان دەنارد، کە لە تەورێز بۆ دروسکردنی ڕایەخ دایانمەزراند بوو. لەم جۆرە نموونانە، وێنەیان لە شوێنەکانی دیکەی کوردستاندا، کەم نییە.

قۆناغی دووەم: ١٩٢٥ – ١٩٥٠

لەم قۆناغەدا، لە ئەنجامی بەکارهێنانی تەکنیکی نوێی وەکوو تراکتۆر و خەرماشە بۆ جووت کردن، کەمباین بۆ دروێنەکردن، پەمپی ئاو بۆ ئاودان، بەکارهێنانی پەینی کیمیاوی، قەلاچۆکردنی نەخۆشییە جۆربەجۆرەکانی کشتوکاڵ، بەرهەمی کوردستان بە تایبەتی

بەرهەمی کشتوکاڵ، زۆری زیاد کرد. ئەم زیادبوونی بەرهەمە لێپرسراوانی بازرگانییان ناچار کرد، بە دوای بازاڕدا بگەڕێن، بۆ ئەوەی بەرهەمە زیادەکانی لە بازاڕەکانی دەرەوەدا ساغ بکەنەوە. یەکێ لەو بازاڕانەی لەم قۆناغەدا پەیدا بوو، یەکێتی سۆڤیەتی بوو. ئەم وولاتە لە ساڵی ١٩٤٦ی زایینیدا، یەک ملیۆن و هەشت سەد و حەفتا و پێنج هەزار کیلۆ، توتنی لە نێوچەی مهاباد کڕی، کە پارەکەی نزیکەی هەشت هەزار دۆلار بوو.

بازاڕەکانی کوردستان لەم قۆناغەدا، لە لایەکەوە بوژایەوە، لە لایەکی دیکەشەوە، پێویستییەکانی لە شتومەکی دروسکراوزیادی کرد. ئەمە بووە هۆی ئەوەی، کە بوارێ بۆ جولانەوەیەکی بازرگانی چالاک خۆش بکا و بازرگانە بیانییەکان بۆ ئەو مەبەستە، ڕوو لە بازاڕەکانی کوردستان بکەن، بە تایبەتی بازرگانە ئەوروپاییەکان، کە لەو ساڵانەدا و بۆ جاری یەکەم، گرام و ڕادیۆ و ئۆتۆمۆبیل و کارەبا و هەندێ شتی دیکە، کەوتنە بازاڕەکانەوە، بەو شێوەیش نرخی ساڵانەی بازرگانی، بۆ سەدان هەزار دۆلار بەرز بۆوە.

قۆناغی سێیەم: ١٩٥٠ – ١٩٧٥

تایبەتمەندی ئەم قۆناغە، لە زیادبوونی ژمارەی داواکارییەکانی کەلوپەلی دروسکراو دایە، بگرە لە ئۆتۆمۆبیلی جۆراوجۆر، ڕادیۆ، ڕیکۆردەر، تەلەفیزیۆن، ئامرازی کشتوکاڵی وەکوو تراکتۆر و کەمباین... تاد، داوودەرمان و کەرەسەی پزیشکی، جلوبەرگی دوراو، بگرە هەتا خواردنیش، کە زۆربەی ئەم پێویستییانە، لە نێوخۆدا نایەتە بەرهەم، بەڵکوو دەبێ هەمووی لە ڕێگەی بازرگانی دەرەوە پڕ بکرێتەوە. بۆ پڕکردنەوەی هەموو ئەم کەموکوڕییانەش، پێویستی بە سەدان ملیۆن دۆلار هەیە، کە ئەوڕۆ پەیداکردنی ئەو پارەیە، گەلێ دژوارە، چونکە کوردستان تاکوو ئێستا، مافی ئەوەی نییە، کە بە ویست و ئارەزووی خۆی، سامانی سروشتی وولاتەکەی بەکار بهێنێ، بە تایبەتی نەوت و پارەی قورس پاشەکەوت بکات.

بەرهەمی کوردستان بەتایبەتی ئەو بەرهەمانەی بۆ بازاڕەکانی دەرەوە دەنێردرێن، وەکوو دەغڵودان و گیانلەبەری زیندوو و بەرهەمەکانیان، نەک هەر لەو ئاستە کۆنەی قۆناغی پێشوودا نەماوە، بەڵکوو کەمتریش بۆتەوە، واتە بازاڕەکانی کوردستان، زیاتر پشتی بە بازرگانی دەرەوە بەستووە. گومانی تێدا نییە، کە ئەم جۆرە بەرنامە و پلانە لە بازرگانی دەرەوەدا، ئاکامەکەی بۆ ئابووریی نیشتمان باش نابێ. نرخی ساڵانەی بازرگانی (ناردن و هاوردن) زۆر زیادی کردووە و لە دەیان هەزار ملیۆن دۆلاری تێپەڕاندووە.

بازاڕەکـانی کـوردسـتـان لەم سـالانەی دواییـدا، زیاتر بە بازاڕەکـانی جـیـهـانەوە بەسـرایەوە. چونکە کارەکە لەوە دەرچوو، کە تەنیا کەلوپەلە پێویستە کلاسیکییەکانی وەکوو هۆیەکانی گواستنەوە و ئامرازەکانی کشتوکاڵ و پێویستییەکانی نەخۆشخانەکان و قـوماش و هەندێ خـواردەمـەنی تایبـەتی دیکە، لە دەرەوەی وولات بـهـێندرێ، بەڵکوو ئەو شـتـانەی سـالانی ڕابـوردووش، لە دوکـان و بازاڕەکـاندا دروست دەکـران، وەکـوو هەندێ ئامرازی ئاسایی کشتوکاڵ و کەرەسەی دارتاشی و ئاسنگەری و هەندێ بەرهەمی چندراو چ بە دەست و چ بە مەکینە، ئەمانە و گەلێکی دیکە هەموویان لە ڕێگەی بازرگانەکانەوە، لە دەرەوەی کوردستانەوە دابین دەکران.

پرۆسـەی بەرهەمـهێنانی بەروبوومـە باوەکانی کوردسـتـانیش، نەک هەر لەسـەر ئاسـتی سـالانی پێـشـوویان نەمـانەوە، بەڵکوو سـاڵ بە سـاڵ کـەمـتـر بوون و ئاسـتی ناردنە دەرەوەشیان کەم بۆوە. لەم حاڵەتەدا، بۆ جێبەجێکردنی پێویستییەکانی بازرگانی دەرەوە، پێـویسـتی بـە تەرخـانکردنـی پارەیەکی زیاتر هەیە، لەمـەشـەوە گەورەترین کـەمـوکـوڕی لە پارسـەنگی بازرگانی سـالانەدا پەیدا دەبێ، بۆ وێنـە ئەم کورتییـە لە کۆتایی هەشـتـاکاندا، نزیکەی ٦٢ ملیۆن دۆلار بوو.

**هاوردن و ناردن .** Import and Export

بە پشـتبەسـتن بـە ئاماری جۆراجـۆر دەتواندرێ، بابەتی هاوردن و ناردن، زیاتر باس بکرێ و پتـر ڕوون بکرێتـەوە. لە هەمـان کاتدا دەتوانرێ، لایەنە چاک و خـراپەکـانی زیاتر بخـرێتـە ڕوو، جگە لەوەی کـە لەبـەر ڕۆشنایی ئەو ئامـارانەدا دەتوانرێ، هەندێ خـاڵی بە کـەڵک پێـشنیـاز بکرێ. بە داخـەوە تاکـوو ئێـسـتـا ئەم جـۆرە مـەتیریـالانە لەبەر دەسـتی لێکۆڵەرەوەدا نین و بەو زووانەش ئەو پێشبینییە ناکرێ، کە بە دەست بهێنرێن. بەلام لەگەڵ ئەوەشــدا، بە گـوێرەی توانا لێـرەدا هـەوڵمــان داوە، هەر هـیچ نەبێ، لەبـەر ڕووناکـایی ئامـارەکانی بازرگـانی، دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سـووریادا، خشـتـەیەکی خەملێندراو پێشکەش بکەین. تەماشای خشتەی ژمارە (٤٨) بکە.

**خشتەی ٤٨ دینامیکی بازرگانی دەرەوە، ١٩٧٥-١٩٨٨ (خامڵاندن)**

| ساڵ | ناردە | | هاوردە | |
|---|---|---|---|---|
| | چەندایەتی | نرخ | چەندایەتی | نرخ |
| ١٩٧٥ | ١١٥٧٠ | ٣٣٥٥٣ | ١٧١٥١ | ٥٨٣١٣ |
| ١٩٧٦ | ١٢٢٨٠ | ٢٧٠١٦ | ٢١٠٣٢ | ٨٢٠٢٥ |
| ١٩٧٧ | ١٠٩٩٢ | ٢٦٣٨١ | ٢٥٣٧١ | ١٠٤٠٢١ |
| ١٩٧٨ | ١٣٠٦٨ | ٣٧٨٩٧ | ٢١٣١٨ | ٩٣٧٩٩ |
| ١٩٧٩ | ١١٨١٦ | ٢٤٨١٤ | ٢٣٣٥٤ | ٨٦٤٠٩ |
| ١٩٨٠ | ١١١٣٦ | ١٨٩٣١ | ٢٦١٧٤ | ٧٨٥٢٢ |
| ١٩٨١ | ١٤٧١٢ | ٢٩٤٢٤ | ٢٦٨٢١ | ٦٧٠٥٢ |
| ١٩٨٢ | ١٧٩٥٨ | ٣٩٥٠٨ | ٢٦٥٠٨ | ٦٨٩٢١ |
| ١٩٨٣ | ١٦٤٠٦ | ٣٢٨١٢ | ٢٧٨٨٤ | ٨٠٨٦٤ |
| ١٩٨٤ | ١٧٤٦١ | ٣٣١٧٦ | ٣٤٨٠٦ | ١٠٤٤١٨ |
| ١٩٨٥ | ١٧٧٣٢ | ٣٠١٤٤ | ٣٤٠٨٦ | ٩٨٨٤٩ |
| ١٩٨٦ | ١٦٩٣٤ | ٣٠٤٨١ | ٣٣٦١٦ | ١٠٧٥٧١ |
| ١٩٨٧ | ١٧٧٦٦ | ٢٤٨٧٢ | ٣١٣٠٢ | ١٠٠١٦٦ |
| ١٩٨٨ | ٢٣٨٥٨ | ٤٥٣٣٠ | ٣٢٤٦٩ | ١٠٧١٤٨ |

**کەلوپەلی بۆ دەرەوە ناردراو (ناردن)**

ئاستی چەندایەتیی و نرخی ناردنە دەرەوەی کەلوپەلە جیاوازەکان، وەکوو لە ژمارەکانی نێو خشتەکەی سەرەوەدا دەردەکەوێ، بەردەوام لە زیادبوون دایە. لە ساڵی ١٩٧٥دا، ئاستی چەندایەتی ئەو کەلوپەلانەی بۆ دەرەوە نێردراون، ١٢ ملیۆن تەن بوو، لە کاتێکدا لە ساڵی ١٩٨٨دا، ئەو چەندایەتییە زیادی کردووە و گەیشتۆتە ٢٤ ملیۆن تەن، واتە لە ماوەی ئەو ١٣ ساڵەی دواییدا، ١٢ ملیۆن تەن زیادی کردووە. بەو پێیە نرخی ناردنیش زیادی کردووە، لە ساڵی ١٩٧٥دا، نرخی شتومەکە ناردراوەکان بۆ دەرەوەی وولات، ٣٤ ملیۆن دۆلار بووە، بەلام لە ساڵی ١٩٨٨دا، ئەو ژمارەیە بەرز بۆتەوە تا گەیشتۆتە ٤٥ ملیۆن دۆلار، بە واتایەکی دیکە، زیادەکە لە هەمان ماوەدا، بریتی بووە لە نۆ ملیۆن دۆلار.

چەشنەکانی شتومەکی ناردراو بۆ دەرەوەی وولات، لە لایەکەوە بە گەشەکردنی جۆری چالاکی ئابووری هەر وولاتێک دادەنرێ، لە لایەکی دیکەشەوە، نیشانەی پلەی پێشکەوتنی ئەو وولاتەیە لەو بوارەدا. ئەگەر لیستەی شتومەکی ناردراوی ساڵانەی وولات، بهێنینە پێش چاوی خۆمان، ئەوا دەگەینە ئەو ڕاستییە، کە کوردستان نەوەک هەر وولاتێکی کشتوکاڵییە، بەڵکوو وولاتێکی کشتوکاڵی دواکەوتووشە و دەتوانین، لە ڕیزی دوایی دواوەی وولاتەکانی دیکەی، باشووری – ڕۆژئاوای ئاسیادا دایبنێین. ئەو شتومەکانەی لە کوردستانەوە بۆ دەرەوە دەنێردرێ، لەسەر بناغەی سەرچاوەی بەرهەمهێنانیان، بەسەر سێ دەستەدا دابەشیان دەکەین:

– بەروبوومی کشتوکاڵی

بەرهەمهێنانی بەروبوومی کشتوکاڵی، لە گەنم و جۆ و برنج و نیسک و نۆک و ماش و تووتن و لۆکە و ترێ و هەنجیر و قۆخ و هەرمێ و سێو و شوتی و کاڵەک و تەماتە و باینجان و کولەکە و گەلێ بەروبوومی کشتوکاڵی دیکەش، ساڵانە لە کێڵگە و باخچەکانی کوردستاندا، بە سەدان هەزار تەنیان لێ بە بەرهەم دەهێندرێ و دەدورێتەوە و دەڕندرێ و کۆ دەکرێتەوە. ئەم بەرهەمانە، گەلێ لەوە زیاترە، کە بازاڕەکانی نێوخۆ پێویستییان پێی هەبێ، یاخود بە واتایەکی دیکە، بە تەواوی لە بازاڕەکانی کوردستاندا ساغ نابنەوە، لەبەر ئەوە، هەموو ئەو بەرهە زیادانە، بۆ بازاڕەکانی دەرەوە دەنێردرێ و بە پارەی قورس پێیان دەفرۆشرێ. ئەم پرۆسێسە لە لایەن دەزگا تایبەتییەکانی دەوڵەت و کۆمپانیا بازرگانییەکان و هەندێ بازرگانی نێوخۆوە، بە ئەنجام دەگەیەندرێ. بەروبوومەکانی کشتوکاڵ، نەک هەر

تەنیا دەگاتە بازاڕەکانی نێوخۆی، دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا و لەوێ بە باشی ساغ دەبنەوە، بەڵکوو بەشێکی زۆریشی، بۆ بازاڕەکانی چەندین ووڵاتی ئەورووپای وەکوو ئەڵەمانیا و ئیتالیا و ئینگلتەرە و فەڕەنسا و سوید و ووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا... تاد دەنێردرێ.

– بەرهەمی ئاژەڵ

بارودۆخی سروشتی و هەڵکەوتی جوگرافی و ئاو و هەوای کوردستان، زۆر لە بارن بۆ ئەوەی بەروبوومی ئاژەڵ، بە شێوەیکی باش و بە دەسکەوتێکی چاک بەرهەم بهێندرێ. جگە لە ئەزموونی قووڵی سەدان ساڵەی جوتیار و مەڕدار و شوانەکان، لە رووی بەخێوکردنی مەڕومالاتی وردەی وەکوو مەڕ و بزن و درشتەی وەکوو مانگا و گامێش و وڵاخی بەرزەی وەکوو ئەسپ و ماین و بارگیر و هێستر و کەر و پەلەوەڕی وەکوو مریشک و کەڵەشێر و قاز و مراوی و عەلەشیش، کە گەرەنتی بەرهەمێکی باشی ساڵانە دەدا و بازاڕەکانی نێوخۆ، بەو جۆرە بەرهەمانە بە زیادەوە پڕ دەکات. ئەوانەی بەم جۆرە کارانە هەڵدەستن، بۆ ئەوەی پێویستییەکانی ژیانی رۆژانەی خۆیان، لە شتومەکی دروسکرا و و شەکر و چا و... هتد دابین بکەن، بەشێکی زۆری بەرهەمەکانیان، بە جامباز و گۆشتفرۆشەکان دەفرۆشن، ئەوانیش بەشێکی زۆر لەو بەرهەمانە، بۆ دەرەوە رەوانە دەکەن. شتێکی سەیر و کارێکی سەرسوڕهێنەر نییە، ئەگەر بڵێین، بەشێک لە سپیایی (بەروبوومی شیر) کوردستان، لە زۆربەی بازاڕەکانی ئەورووپادا هەیە!

– بەرهەمی دارستان و ڕووەکی سروشتی

زۆربەی زۆری نێوچە جیاجیاکانی کوردستان، بە دارستان و ڕووەکی سروشتی داپۆشراون و ڕازێندراونەتەوە. دارستانەکان سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ بەرهەمهێنانی دار پێک دەهێنێن. لەم ساڵانەی دواییدا، لەبەر زیادبوونی پێویستییەکانی ژیان و داواکاری بەردەوام بۆ دروسکردنی کەلوپەلەکانی وەکوو تەختە و خانوو و موبێلە، هەروەها بۆ دروسکردنی کاغەز و کارتۆن... تاد، بازاڕی بازرگانیکردنی دار، گەلێ گەرم بووە. ئەوە جگە لە بەرهەمی هەندێ لەو درەختە بەردارانە، کە ئەوەندەی دیکە رەواجی زیاد کردوون، وەکوو قەزوان و جەفت و بنێشت و مێو و بەڕو و سیسی و کۆکردنەوەی هەندێ گژوگیای تایبەتی، کە بۆ دروسکردنی شتومەک و دەرمان گرتنەوە بەکار دەهێندرێن.

ئەو جۆرە بەروبوومانەی لە کوردستاندا دێنە بەرهەم و لەسەرەوە باسمان کردن، بۆ دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا دەبرێن و لەوێشەوە بە ڕێگەی ئاسمانی و شەمەندەفەر و ئاویی، بەرەو بازاڕەکانی ئەورووپا دەنێردرێن.

**کەلوپەلی لە دەرەوە هێنراو (هاوردن)**

ژمارەکانی نێو خشتەی دینامیکی بازرگانیی دەرەوە، نیشانمان دەدات، کە ئاستی چەندایەتی و نرخی شتومەکی لە دەرەوە هێنراو.بە شێوەیەکی بەردەوام لە زیادبوون دان. لە ساڵی ١٩٧٥دا، بارستایی چەندایەتی شتومەکی لە دەرەوە هێنراو، ١٧ملێۆن تەن بوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٨٨دا، ئەو چەندایەتییە بۆ ٣٢ ملیۆن تەن زیادی کرد، واتە لە ماوەی ١٣ ساڵدا، نزیکەی دوو جار (١٥ ملیۆن) زیادی کردووە. نرخی کەلوپەلە هێندراوەکانیش لە هەمان ئەو ساڵانەدا، ٥٨ ملیۆن دۆلار بوو، بۆ ١٠٧ ملیۆن دۆلار زیادی کرد، بە واتایەکی دیکە، زیادەکە کەمێکی لە دوو جار (٤٩ ملیۆن دۆلار) کەمتر بوو.

کوردستان بەشی هەرە زۆری کەلوپەلە دروسکراوە پێویستەکانی خۆی، لە وولاتەکانی دەرەوە دەهێنێ. هۆکەشی بۆ دواکەوتوویی باری پیشەسازی دەگەڕێتەوە، کە تاکوو ئێستا، جگە لە هەندێ خواردەمەنی و جلوبەرگ، کە لە چەند دوکان و کارگەیەکی پچوکدا دەهێندرێتە بەرهەم، لەوە زیاتر هیچی دیکەی تێدا نییە. سەرەڕای ئەمانەش، هەموو ساڵێ هێنان، تازەی دێتە سەر. ئێمە لێرەدا شتومەکی هێنراو، بە گوێرەی شێوازی بەکارهێنانی، بەسەر ئەم بەشانەی خوارەوەدا دابەش دەکەین:

– بەروبوومی خواردن و ئاژەڵی زیندوو

ناوی شتومەکە پێویستە لە دەرەوە هێندراوەکانی ئەم لیستەیە، لە دە جۆر زیاتر پێک دێ، وەکوو ئاژەڵی زیندوو، گۆشت، سپیایی، هێلکە، ماسی، دەغڵودان، میوە، سەوزە، شەکر، چا، قاوە، هەنگوین، بەهارات، ئالیک بۆ ئاژەڵ ... و هتد. لە نێو هەموو ئەم شتومەکانەدا، لە ڕووی چەندایەتی و پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەوە، شەکر و چا پێش هەموو شتومەکەکانی دیکەوە دێن. ئەم شتومەکانە، نزیکەی ٣٥٪ی گشت شتومەکە لە دەرەوە هێنراوەکان پێک دەهێنن. کوردستان توانای کەمکردنەوەی ئەم ڕێژەیەی هەیە، ئەگەر بێتو زیاتر بایەخ بە کەرتی کشتوکاڵ بدات و بەرهەم زیاد بکات.

– خواردنەوە و جگەرە

خواردنەوە بە هەموو جۆرەکانییەوە، تووتن و ئەو شتانەی لە تووتنیش دروست دەکرێن، بەشێکی پچوک لە ڕێژەی گشت شتومەکە لە دەرەوە هێنراوەکان پێک دەهێنێ. توانای بەرهەمهێنانی ئەم جۆرە شتومەکانە لە کوردستاندا، خراپ نییە، بۆیە پێویستە بۆ داهاتوو، ئەم ڕاستییە پێش چاو بخرێ.

– کەرەسەی خاو

ئەم جۆرە کەلوپەلانە،بریتین لە پێستە و فەرووی خۆشنەکراو، دەنک و ناوک و تۆوی چەور، تەپەدۆری خاو، دار و فلین، هەویری کاغەز، داوی چنین، مادەکانی (دروسکراو و نەکراو)، پەین سروشتی و کیمیاوی، مەعدەنی خاو، جگە لە بەردەڕوژ و نەوت و بەردی بەنرخ و مادە خاوە مەعدەنییەکان. ڕێژەی ئەم شتومەکە هێندراوانە، نزیکەی لە ٣٪ی گشت کەلوپەلە لە دەرەوە هێنراوەکان پێک دەهێنێ. ئەم شتومەکانە گەلێ پێویستن، چونکە لەو بەرهەمانەن، کە لە کوردستاندا بەرهەم ناهێندرێن، بۆیە پێویستە بە دوای سەرچاوەی هەرزاندا بگەڕێین و تەنیا لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەدا، لەو ڕووەوە پەیوندی بازرگانی ببەستین، کە ئەم شتومەکانەیان بە هەرزان لا دەست دەکەوێت.

– مەعدەن و کەرەسەی سوتەمەنی و مەتیریاڵی چەوری

ئەم شتومەکانە لە خەڵوزی بەردین و پیترۆڵ و بەرهەمە جۆراوجۆرەکانی و گازی سروشتی و دەسکرد. ئەم شتومەکانە هەموویان لە کوردستاندا، نەک هەر هەن، بەڵکوو جێگەیەکی دیاریکراویشیان بۆ خۆیان، لە بەرهەمی جیهانیدا (بە تایبەتی نەوت) داگیر کردووە، بەڵام بە داخەوە لەبەر نەبوونی قەوارەیەکی ڕامیاری کوردستانی، ئێمە ناتوانین، دەسکارییان بکەین و چۆنمان دەوێ، بەو چەشنە بەکاریان بهێنین، بەڵکوو هەموو ئەو کەلوپەلە خاوانە، لەبەر چاوی خۆمان بە تاڵان دەبرێ و بۆ دەرەوە دەنێردرێ، ئێمە خۆشمان بە نرخێکی گرانتر دەیکڕینەوە. ڕێژەی ئەم جۆرە شتومەکانە، لە دەوروبەری ٤٪ی گشت کەلوپەلە لە دەرەوە هێنراوەکان پێک دەهێنێ.

– شتومەکی زەیتی و بەز و چەوری ئاژەڵ و ڕووەک

ڕێژەی ئەم چەشنەشتومەکە هێندراوانە، نزیکەی خۆی لە ١٠٪ی گشت کەلوپەلە لە دەرەوە هێنراوەکان دەدات. ئەم ڕێژەیە بۆ وولاتێکی کشتوکاڵی وەکوو کوردستان زۆرە، بۆیە لە دواڕۆژدا، پێویستە بیرێ لە کەمکردنەوەی بکرێتەوە.

– شتومەکە کیمیایی و بەرهەمەکانی

ئەوڕۆ پیشەسازی لە کوردستاندا، لەو ئاستەدا نییە، کە بتوانێ شتومەکە کیمیاوییەکان بەرهەم بهێنێ. ئەم بەرهەمانەش لە مادە کیمیاویە ئۆرگانیکەکان و نائۆرگانیکەکان، مەتیریاڵی ڕەنگکردن، مەتیریاڵی خۆشکردنی پێستە و ڕەنگکردنیان، بەرهەمەکانی پزیشکی و دەرمان، مەتیریاڵی دروسکردنی خواردنەوە گازییەکان، کەرەسەی ئارایشت (سووراو و سپیاو)، مەتیریاڵی شتن و خاوینکردنەوە، پەینی کیمیاوی، تەقەمەنی و بەرهەمی ئاگری و... تاد. بۆیە کوردستان ناچار دەبی، ئەم جۆرە شتومەکانە لە دەرەوە بهێنێ، تا پێویستییەکانی خەڵک پڕ بکاتەوە. ئەم جۆرە شتوکەمانە، نزیکەی ١٥٪ی بارستایی گشت کەلوپەلە لە دەرەوە هێنراوەکان پێک دەهێنێن.

– هەندێ شتومەکی دروسکراوی دیکە

ئەم جۆرە شتومەکانە بریتین لە پێستەی خۆشکراو، شتومەکی دروسکراو لە تەپەدۆر، دار، کاغەز، کارتۆن، شتی ڕێسراو و چنراو، مەتیریاڵەکانی مەعدەن و ئاسن و پۆلا... تاد. ئەمانە هەمووویان تێکڕا پێکەوە، نزیکەی لە ٣٢٪ی بارستایی گشت کەلوپەلە لە دەرەوە هێنراوەکان پێک دەهێنن. ئەگەر سەرنجێکی ورد لە سامان و توانای کوردستان بدەین، لە بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و سامانە کانزاییە جۆراجۆرەکان ورد ببینەوە، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ و دەتوانین بڵێین، شانسی کەمکردنەوەی ئەم جۆرە شتومەکانە، لە کەرتی بازرگانی دەرەوەدا زۆرە.

– ئامێرەکانی گواستنەوە

ئەم جۆرە کەرەسانە بریتین لە ئامێرەکانی بە دەسهێنانی وزە و ئامێرەکانی ئامادەکردنی هەندێ پیشەسازی تایبەتی و ئامێرەکانی ڕادیۆ و بێتەلەکان و ئامێرەکانی کارەبا و پێویستییەکانی هۆی گواستنەوەی زەمینی. ئەمانە هەمووویان بەسەریەکەوە، نزیکەی ٤٪ی بارستایی گشت کەلوپەلە لە دەرەوە هێنراوەکان پێک دەهێنێن.

– شتومەکی دروسکراوی هەمەچەشنە

ئەم جۆرەیان بریتییە لە پێویستییەکانی گەرمکردنەوە و ڕووناکی و شتومەکەکانی دیکەی وەکوو ڕایەخ و پێویستییەکانی سەفەرکردنی وەکوو جامتا و کەرەسەی بەرگ و پێخەف و پیل و کامێرا و کاتژمێر... تاد. ڕێژەیان لە ١٪ی بارستایی گشت کەلوپەلە لە دەرەوە هێنراوەکان پێک دەهێنن.

**پەیوەندی بازرگانی کوردستان لەگەڵ وولاتانی دیکەدا**

شتومەک هێنان لە دەرەوەی وولات، لە لایەکەوە بۆ زانینی ڕادەی پێشکەوتنی ئابووری و ئاستی پیشەسازی و کشتوکاڵی، بە بەڵگەیەکی سەرەکی دەژمێردرێ. لە لایەکی دیکەشەوە، لە ڕووی پەیوەندی بەستنەوە، لە نێوان لقەکانی ئابووری نیشتمانی دەوڵەت، لەگەڵ بازاڕەکانی جیهانی دەرەوەدا، بە بزووتنەوەیەکی بازرگانی گەلێ گرنگ دادەنرێ. هەروەها لە لایەکی دیکەشەوە، پاشکۆیی ئابووری وولات بە دەوڵەتێکی دیاریکراوەوە، یان بە چەند دەوڵەتێکەوە، یان بە گروپێکی ئابووری مۆنۆپۆلی جیهانی، نیشان دەدات.

کوردستان وەکوو وولاتێکی بەرهەمهێنەر، پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ زیاتر لە سەد دەوڵەتی جیهاندا هەیە. بەڵام ئەو پەیوەندییە ئابوورییە، لەگەڵ زۆربەی ئەو دەوڵەتانەدا، لە بەرژەوەندیدا نییە، چونکە ژمارەیەکی کەمیان نەبێ، کە بەرهەمەکانی کوردستان دەکڕن، ئەوانی دیکەیان تەنیا بەرهەمەکانی خۆیانیان پێ دەفرۆشن. ئەو وولاتانەی پەیوەندی بازرگانیان لەگەڵیدا هەیە، لە ڕووی پلەی پەیوەندییەکانی بازرگانی و چەندایەتی و نرخ و جۆری شتومەک و کارتێکردنیان لە ئابوورییەکەی، بەسەر چەند دەستەیەکدا دابەش دەکەین:

– وولاتانی باشووری – ڕۆژئاوای ئاسیا

کوردستان پەیوەندییەکی زۆری لەگەڵ زۆربەی دەوڵەتەکانی ئەم دەستەیەدا هەیە، لە پێش هەمووشیانەوە، لەگەڵ دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریادا، ئەم پەیوەندییەی زیاد لە حەفتا ساڵە گرێ داوە. جۆری ئەم پەیوەندییە بە شێوەیەکە، کە زیاتر لە ٩٠٪ی گشت لقەکانی ئابووری بازرگانی دەرەوەی ، لەگەڵ ئەم چوار دەوڵەتە دایە، بە واتایەکی دیکە، کوردستان تەنیا لە ڕێگەی ئەم چوار دەوڵەتەوە، پەیوەندی بازرگانی دەرەوەی خۆی، لەگەڵ وولاتەکانی دیکەی جیهاندا، گرێ دەدات، لەبەر ئەوەی هەر یەکێ لەم

دەوڵەتانە، بە ویست و ئارەزووی خۆیان، پەیوەندی بازرگانی دەرەوە، لەگەڵ وولاتانی جیهاندا دەبەستن. کوردستان بە زۆری بەروبوومی کشتوکاڵ و بەرهەمی ئاژەڵ و ئاژەڵی زیندوو، دار و میوە و سەوزە و هەندێ بەرهەمی دیکەش، بۆ ئەو دەوڵەتانە دەنێرێ. لە بەرامبەر ئەمانەشدا، هەندێ شتومەکی پیشەسازی و جلوبەرگ و پێویستییەکانی ڕۆژانەی خەڵکی دەهێنێ.

– وولاتانی ڕۆژئاوای ئەوروپا

وولاتانی ڕۆژئاوای ئەوروپا، بە تایبەتی ئەڵەمانیا و فەڕەنسا و بەریتانیا و پورتوغال و ئیتاليا و یۆنان... هتد، پەیوەندییەکی بازرگانی زۆر توندوتۆڵیان لەگەڵ کوردستاندا هەیە. ئەم دەوڵەتانە بە زۆری کەلوپەلی دروسکراوی بۆ دەنێرن، وەکوو ئۆتۆمۆبێل بە هەموو جۆرەکانییەوە، مەکینەی کشتوکاڵی هەر لە تراکتۆر و کەمباینەوە تا دەگات بە پەمپی ئاو، ئامێری کارەبایی و کەرەسەی پزیشکی و داو و دەرمان. کوردستانیش کەمێک لە بەرهەمی کشتوکاڵ نەبێ، ئەگینا جگە لە نەوت، هیچ شتێکی دیکە، بۆ ئەم دەوڵەتانە ڕەوانە ناکات. لەبەر ئەوە ئەو جۆرە پەیوەندییە بازرگانییەی، لە نێوان کوردستان و ئەو دەوڵەتانەدا هەیە، تەنیا لە قازانجی ئەوان دایە.

– وولاتانی ڕۆژهەلاتی ئەوروپا

کوردستان پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ وولاتانی ڕۆژهەلاتی ئەوروپادا هەیە، بە تایبەتی ڕووسیا و پۆڵۆنیا و... تاد. لە کوردستانەوە گەلێ بەرهەمی کشتوکاڵی و ئاژەڵی و هەندێ بەرهەمی دیکەش، بۆ ئەم وولاتانە ڕەوانە دەکرێ. لە بەرامبەر ئەمانەشدا، هەندێ مەکینە و کەرەسەی کارەبایی... تاد دەهێنرێ. ئەگەرچی تەرازووی بازرگانی لەگەڵ ئەم وولاتانەدا، دیسانەوە لە بەرژەوەندیدا نییە، بەلام ٢ تا ٣ جار لەوەی نێوان کوردستان و وولاتانی ڕۆژئاوی ئەوروپادا کەمترە. .

– وولاتانی ئەمەریکای باکوور

وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لە ڕووی پەیوەندی بازرگانییەوە لەگەڵ کوردستاندا، نەک هەر بە یەکێ لە وولاتە گرنگەکانی ئەمەریکای باکوور دادەنرێ، بەڵکوو بە یەکێ لە هەرە گەورەترین و گرنگترین وولاتەکانی جیهان دەژمێردرێ. بە شێوەیەکی گشتی، ئەم وولاتە تازەترین بەرهەمی پیشەسازی و تەکنیکی بۆ کوردستان دەنێرێ، وەکوو ئۆتۆمۆبیل

و شتومەکی کارەبایی و هەندێ شتومەکی ورد وردی دیکەش. ئەو شتومەکانەی کوردستان بۆ ئەم وولاتەی دەنێرێ، لە هەموو ڕوویەکەوە، شتێکی ئەوتۆ نییە کە لە بازرگانی دەرەوەی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا، بایەخێکی گرنگی هەبێ و جێگەیەک بۆ خۆی داگیر بکات. جگە لە ئەمەریکا، ئەو وولاتانەی دیکەی لەم کیشوەرەدا، پەیوەندی بازرگانییان لەگەڵ کوردستاندا هەیە، مەکسیکە، هەرچەندە پێوەندییەکی کزە.

– هەندێ وولاتی دیکە

جگە لەو وولاتانەی لە سەرەوە باسمان کردن، کوردستان پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ هەندێ لە وولاتەکانی دیکەی جیهاندا هەیە.وەکوو بەرازیل، یابان، چین، هەندێ لە وولاتانی عەرەب لە کیشوەرەکانی ئاسیا و ئەفەریقا و چەند وولاتێکی ئەفەریقایی دیکەش.ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی، پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ ئەم وولاتانەدا بگرین، بە شێکی زۆر کەم لە بازرگانییەکانی دەرەوە پێک دەهێنن و بایەخێکی ئەوتۆیان نییە، کە بە تایبەتی باس بکرێ، چونکە کار لە ئابووری کوردستان ناکەن.

## ٢. بازرگانی ترانسێت

کوردستان بۆ وولاتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا، هەروەها بۆ وولاتە پیشەسازییەکانی ئەورووپا و وولاتە کشتوکاڵییەکانی باشووری ئاسیا، بە ئەڵقەیەکی گرنگی پەیوەندی نێوان ئەو وولاتانە دادەنرێ. خەرجی گواستنەوەی ساڵانەی شتومەکە بازرگانییەکانی ئەم وولاتانە، ئەگەر بە نێو کوردستاندا تێپەڕن، هەروەها بۆ خەڵک ئەگەر هاتوچۆی پێدا بکەن، چ بە هۆی ڕێگەوبانە زەمینییەکانەوە بێ، چ لە ڕێگەی هێڵی ئاسمانییەوە بێ، بۆ ئەوان گەلێ هەرزان دەکەوێ. لە ڕاستیشدا هەر وایە و لە مێژە وولاتەکانی دەوروبەر و ئەورووپا، کەڵکیان لە تایبەتمەندی هەڵکەوتی جوگرافی کوردستان وەرگرتووە، خاکی کوردستانیان بۆ گواستنەوەی کەلوپەلەکانیان، بە لۆری گەورە، وەک ڕێگایەکی سەرەکی بەکار هێناوە، ساڵانە بە دەیان هەزار تەن شتومەکی بازرگانی هەمەچەشنە بار دەکەن و لەم دەوڵەتەوە بۆ ئەو دەوڵەتی دەنێرن.

لەبەر نەبوونی ئاماری بازرگانی ترانسێت، لەبەر نەزانینی قەبارە و پێکهاتەی شتومەکە بازرگانییەکانی نێوان ئەم وولاتانە، ناتوانرێ ڕووی ڕاستی بازرگانی ترانسێتی

کوردستـان، وەکوو هەیـە بخـرێتـە پێش چاو. بەڵام بە لـەبەرچاوگرتنی تایبـەتمـەندییـەکانی ئابووری و پلەی پێشکەوتن، دەتوانین ڕایبگەیەنین، کە شـتومـەکەکان بـە زۆری بریتین، لە شـتومـەکی خواردن و هەندێ کەلوپەلی دروسکراو، ناوبەناویش بەرهەمە جۆراوجۆرەکانی نەوت، وەک بەنزین و گازۆیل و ڕۆنی تێدەکەوێ.

گومـرگی ترانسـێت، لە لایەن کـاربەدەسـتی دازگـاکانی کـوردسـتـانەوە وەرناگـیرێ و ناچێتە گەنجینەکەیەوە.ئەم پارەیە هەمووی لە لایەن دەوڵەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق و سـووریاوە وەردەگـیـرێن، بەشـێکی زۆر کـەمی نەبێ، ئـەوی دیکەی هـەمـووی لە دەرەوەی کوردستـان خەرج دەکرێ. لێرەدا دەبێ ئەو ڕاسـتییەش بدرکێنین، کە لە سـاڵی ١٩٩١ەوە، گومرگی نێوچەی برایم خـەلیل، لە ژێر دەسـتی حـوکومـەتی هـەرێمی باشـووری کـوردستـان دایە، گومرگەکەشـی سـاڵانە خۆی لە سەدان هەزار دۆلار دەدات.

پێویستـە دان بەو ڕاسـتییـەشدا بنێین، کە هـەر زۆر لە کۆنەوە، لە نێوان دانیشـتووانی سـەر سنوورەکـان بزووتنەوەیەکی بازرگـانـی کـڕین و فـرۆشـتنی گـەرم هـەیە، کـە لە ڕووی یاسـاییـەوە بە قـاچاغـچـێتی نێو دەبرێ. ئەم جـۆرە بازرگـانییـە، بایەخـێکی ئابووری گـەلێ گـەورەی بۆ کـوردسـتـان هـەیـە، لەبەر ئەوەی لە هـەندێ کـات و سـەردەمـدا، بۆ دابینـکردنی پێویسـتـییـەکانی ژیانـی ڕۆژانە، تەنیـا تاکـە ڕێگـەیەک بووە، کە خـواردن و کـەلوپـەلەکانی دیکەی لێوە هـاتووە.

## ٣. بازرگانی نێوخۆ

جیاوازی تۆپۆگرافی و ئاووهـەوا، لە نێوچەیەکەوە بۆ نێـوچەیەکی دیکە، کارێکی ئەوتۆی کردووە، کە لە کوردستـاندا گەلێ بەرهـەمی جیاواز لـە سەرتاسـەری سـاڵەکەدا، بهێندرێتـە بەرهـەم. بۆ نموونە، لە نێـوچە شـاخاوییـەکاندا دەتوانرێ، مـەڕومـاڵاتێکی زۆر بەخێـو بکرێ، تووتن بڕوێندرێ، بێسـتـان بکرێ و هەموو چەشنە سـەوزەیەک بە بەرهـەم بهێندرێ و هـەندێ داری بەرهەمـداریش بڕوێندرێ. لە هـەمـان کـاتدا لە نێـوچە دەشـتـاییـەکان و نـێـوان گرد و سـەر تەپۆڵکەکان دەتوانرێ، هـەمـوو ئەو زەوییـانە بۆ چانـدنی دەغڵـودان و گـەلێ بەرهـەمی کێڵگەیی دیکە تەرخـان دەکرێ. لە شـارەکانیـشـدا، بە تـایبـەتی لە گـەورەکـاندا، خـەڵکی بە کـاروبـاری پیـشــەسـازییـەوە خــەریکن. ئەمــە ئەوە دەگـەیـەنێ، کـە هـەر یـەکێ لەو نێـوچە جیاوازانە، جۆرە بەرهـەمێکی تایبەتی دەچێنن و بەو پێیەش، دانیشـتووانی هـەر نێوچەیەک، بۆ دابینکردنی پێویسـتییەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆیان، پێویستیـان بە هـاوکاری و یارمەتی هـەرێمـەکـەی دیکە دەبێ، واتە بـەگوێرەی ئـەو پێویسـتـیـانەی کـۆمـەڵانی خـەڵکی نێـوچە

جیاجیاکانی کوردستان، جوڵانەوەیەکی بازرگانی نێوخۆ لە کڕین و فرۆشتن، لە نێوان هەرێمەکاندا دروست دەبێ، بەرهەمی نێوچەیەکی دیاریکراو بۆ نێوچەیەکی دیکە دەگوێزرێتەوە و بە پێچەوانەشەوە. بەو شێوەیە دەبینین، بازرگانی نێوخۆ لە نێوان نێوچەکاندا پەیدا دەبێ، کە تایبەتمەندییەکانی لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

– ژمارە هەموو ئەو بازرگان و دوکاندار و میوەفرۆش و وردەفرۆشانەی، کە دەوروبەری ٧٥٠ هەزار کەس دەبن، لە ساڵی ١٩٩٤زدا، تەنیا لە ٤٪ی گشت دانیشتووانی چالاکی ئابووری کوردستان پێک دەهێنن. ئەم ژمارەیە بە شێوەیەکی بەردەوام، لە کەم و زۆری دایە، هۆکەشی بۆ جیاوازی وەرزەکانی ساڵ دەگەڕێتەوە. ئەم ڕێژەیە لە هاوین و پایزدا کەم دەبێتەوە، لەبەر ئەوەی خەڵکی زیاتر بە کاروباری کشتوکاڵەوە خەریکن. لە هەردوو وەرزی زستان و بەهاریشدا زیاد دەکات، لەبەر ئەوەی لەم وەرزانەدا، لە گوندەکانی کوردستاندا بێکارییەکی زۆر بڵاو دەبێتەوە.

– ژمارەی هەموو دەزگا بازرگانییەکانی نێوخۆی وەکوو دوکان و عەمارەکان، دەوروبەری ٦٥٠ هەزار دانەیەک دەبێ. لەوانە ١٣٪ی بۆ کڕین و فرۆشتنی تێکڕایی و ٨٧٪ی بۆ کڕین و فرۆشتنی دانەدانە تەرخان کراون.

– ڕێژەی بازرگانی نێوخۆ، لە ساڵی ١٩٨٦دا، لەچاو ڕێژەی گشت دارایی نیشتمانی کوردستاندا، تەنیا لە ٧٪ی پێک هێنا بوو، (١٩٧٦ – ٩٪). ئەم ڕێژەیەش لەچاو ژمارەی بازرگانەکاندا کەمە و ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە زۆربەی ئەوانەی خەریکی کڕین و فرۆشتن، لە دوکاندارە پچوک و بێسەرمایە و عەرەبانچییەکانی سەر شەقامەکانی کوردستان پێک هاتوون.

– ئەو شتومەکانەی لە بازاڕەکانی نێوخۆدا ئاڵوگۆڕیان پێ دەکرێ، هەمەچەشنەن. لە هەمووشیان زیاتر، ئەو کەلوپەلانەن کە ڕۆژانە بەکاردەهێندرێن و ڕێژەشیان دەگاتە ٥٦٪ (خواردن و خواردنەوە – ٢٩٪). پاشان ئەو شتومەکانە دێن، کە بۆ ماوەیەکی درێژ بەکار دەهێندرێن، ڕێژەیان خۆی لە ١٩٪ دەدات. ئینجا ئەو شتومەکانەی پاش ماوەیەک، پێویستیان بە گۆڕین هەیە، ڕێژەیان لە ١٨٪ دەبێ. لە دوا پلەشدا، کەلوپەلەکانی بەرهەمهێنان دێ، کە ڕێژەیان نزیکەی ٧٪ی گشت شتومەکی بازرگانی نێوخۆ پێک دەهێنێ.

– شارەکان بە شێوەیەکی گشتی و شارە گەورەکان بە شێوەیەکی تایبەتی، بە مەڵبەندی سەرەکی بازرگانی نێوخۆ دادەنرێن و لە ٧٠٪ی هەموو بازرگانی نێوخۆ پێک

دەهێنن. لەو شارە بەناوبانگانەش، شارەکانی گازی ئانتەب و موسڵ و هەولێر و ورمێ و دیاربەکرن، کە دەستیان بەسەر زیاد لە ٩٠٪ی بازرگانییەکانی نێوخۆدا گرتووە. گوندەکانیش تەنیا ٣٠٪ی بازرگانی نێوخۆیان، تێدا بە ئەنجام دەگەیەندرێ.

– دوکانەکان لە لایەکەوە شوێنی بەرهەمهێنانە و لە لایەکی دیکەشەوە جێگای کڕین و فرۆشتنە، بە تایبەتی ئەو دوکانانەی بە بەرهەمهێنانی شتومەکی خۆماڵییەوە خەریکن، وەک زێڕینگەری، دارتاشی، ئاسنگەری، کەوش و پێڵاودرووەکان... تاد،

– ئەگەرچی لەم ساڵانەی دواییدا، ژمارەی مەخزەنەکان زیادیان کردووە، بەڵام لەچاو ژمارەی دوکانەکاندا، زۆر کەمن. ئەمەش دواکەوتوویی باری ئابووریی کوردستان نیشان دەدا. لەوانەیە بەرامبەر هەر یەک مەخزەن، ١٥ دوکان هەبێ.

– هەندێ جار، پرۆسێسی کڕین و فرۆشتن، چ لە نێو شارەکاندا و چ لە گوندەکاندا بێ، کاش نییە، بەڵکوو خاوەن دوکانەکان دەتوانن، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو،شتومەکەکانی خۆیان بە خەڵکی بە قەرز بفرۆشن، تا ئەو کاتەی کڕیارەکان توانایان دەبێ و قەرزەکانیان دەدەنەوە. ئەم جۆرە کڕین و فرۆشتنەش، لەو کاتانەدا ڕوو دەدا، کە بڕوایەکی تەواو لە نێوان فرۆشیار و کڕیاردا هەبێ، یاخود جۆرە ناسیاوییەکیان لە نێواندا هەبێ.

– دەزگاکانی هەرەوەزی بەکارهێنان، تا سەرەتای حەفتاکانیش هێشتا دانەمەزرا بوون. کاربەدەستانی دەوڵەت، چەند دەزگایەکیان دامەزراند، ئەمەش بە مەبەستی فرۆشتنی شتومەکی بەکارهێنان بوو، کە بە نرخێکی کەمتر لە نرخی دوکاندارەکان، بە ئەندامانی کۆمەڵەکانی خۆیان دەفرۆشت.

– لە زۆربەی گوندەکاندا، بۆ فرۆشتنی پێویستییەکانی ڕۆژانە، بە تایبەتی شەکر و چا و هەندێ جلوبەرگی ئامادەکراو و پێڵاو و وردەواڵە و پێویستییەکانی کشتوکاڵ، هەندێ دوکان پەیدا بوون و کرانەوە.

– هەموو ئەو کەلوپەلانەی لە دەرەوە دەهێنران، وەکوو شەکر و چا و جگەرە... هتد، لە لایەن وەزارەتی بازرگانییەوە، دەستی بەسەردا گیراوە، ئەوانیش لە ڕێگەی دەزگا تایبەتییەکانی خۆیانەوە، بەسەر وەکیل و دوکاندارەکانی شارەکاندا دابەشی دەکەن، دوکاندارەکانیش بە خەڵکی دەفرۆشن.

**پێکهاتەی شتومەکی بازرگانیی نێوخۆ**

شتومەکی بازاڕی نێوخۆ، لە ڕووی شێوەی بەکارهێنان و دروسکردنەوە، بەسەر چوار دەستەدا دابەش دەکەین:

– شتومەکی کشتوکاڵی: شتومەکی نێوخۆ، زیاتر لە ٧٠٪ی لە شتومەکی کشتوکاڵی، بە تایبەتی خواردن پێک هاتووە. شوێنەکانی بەرهەمهێنانی دەغڵودان، وەکوو گەنم و جۆ و برنج... تاد، لەو شوێنانەی بەرهەم دەهێندرێن، کە ساڵانە خۆی لە سەدان هەزار تەن دەدات، بۆ ئەو شوێنانە دەنێردرێن، کە بەرهەمی ساڵانەیان کەمە و بەشی تێرکردنی سکی دانیشتووانی ئەو نێوچانە ناکات. نرخی یەک تەن خواردن، بە تایبەتی گەنم، ئەگەرچی ساڵ بە ساڵ لە زیادبوون دایە، لە هاویندا لەچاو زستاندا کەمترە. ئەم جیاوازییە لە نێوان نرخی هاوین و زستاندا، وا لە خەڵکی دەکات، کە کاتێ نرخی دەغڵودان هەرزان بوو، بەپێی توانا هەندێ بکڕن و هەڵی بگرن.

– شتومەکی ئاژەڵ: بازرگانی ئاژەڵی زیندوو لەگەڵ بەروبوومەکانیان، نزیکەی لە ٢٠٪ی گشت بازرگانی نێوخۆ پێک دەهێنێ. نێوچە شاخاوییەکان بە گرنگترین نێوچەی بەخێوکردنی ئاژەڵ و بەرهەمهێنانی بەروبوومی ئاژەڵ دادەنرێ. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە، کە نێوچە شاخاوییەکان، لە ڕووی ناردنی ئەو بەرهەمانەوە، بۆ شوێنی بەکارهێنانیان، (بە زۆری شارە گەورەکان دەگرێتەوە) بە نێوچەیەکی سەرەکی لە قەڵەم دەدرێ.

– شتومەکی پیشەسازی؛ شتومەکی پیشەسازی زیاتر لە شارەکاندا، لەچاو گوندەکاندا بە بەرهەم دەهێندرێ. لەبەر ئەوە شارەکان بە یەکەم مەڵبەندی سەرەکی ناردنی کەلوپەلە پیشەسازییەکان، بۆ گوندەکان دادەنرێ.

– بەروبوومی دارستان: نێوچە شاخاوییەکان، نەک هەر تەنیا مەڵبەندی سەرەکی دارستان و بەرهەمهێنانی دارە، بەڵکوو بە هەمان شێوەش، بە جێگایەکی گرنگی بەرهەمهێنانی هەموو چەشنە میوەیەک دادەنرێ. بۆیە دانیشتووانی نێوچە تەختاییەکان، بۆ دابینکردنی پێویستییەکانیان لە میوە، پەنا بۆ بەر نێوچە شاخاوییەکان دەبەن.

* * *

## سەرچاوەکان

**کوردی**

١- ئەمین هەورامانی، کاکەیی، چاپخانەی (الحوادث) بەغدا، ١٩٨٤ .

٢- ڕەشاد میران، ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا، چاپخانەی مەنسوور، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٣ .

٣- شرفخانی بدلیسی، شرفنامە، هەژار کردویە بە کوردەی ١٣٩١ - ١٩٧٢، لە لایەن کۆڕی زانیاری کوردەوە لە چاپ دراوە، چاپخانەی نەعمان - نەجەفی پیرۆز.

٤- شەریف پاشا، یاداشتنامە لە بارەی داخوازییەکانی گەلی کوردەوە، وەرگێڕانی لە فەڕەنسییەوە: فەرهاد پیربال، گۆڤاری ڕابوون، ژمارە دوو، ستۆکهۆڵم، ١٩٩١

٥- عبدالقادر کوڕی ڕوستەمی بابان، ڕەوشی کوردان، مێژووی کوردستان. وەرگێڕانی کەریمی حیسامی، ستۆکهۆڵم - ١٩٩١

٦- عەبدوڵلا غەفور، ئەتنۆ - دیمۆگرافیای باشووری کوردستان، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٥ .

٧- عەبدوڵلا غەفور، جوگرافیای دانیشتووانی کوردستان، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٤ .

٨- عەبدوڵلا غەفور، بیبلۆگرافیای کوردستان، ١٩٠٣ - ١٩٩٥، چاپخانەی ئاپێک، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٥ .

٩- عەبدوڵلا غەفور، دابەشبوونی ئیداری کوردستان، گۆڤاری ڕووناکبیری، ژمارە دوو، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٢ .

١٠- عەلی ئەسغەری شەمیمی هەمەدانی، جوگرافیای کوردستانی ئێران، عەبدولڕەحمان محەمەد ئەمین زەبێحی لە فارسییەوە کردوویە بە کوردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٠ .

١١- فەیسەڵ دەباغ ، کورد و کەمە نەتەوەییەکانی تر لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧دا، بەشی یەکەم، چاپخانەی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٣ .

١٢- کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، وەرگێڕانی سەعید ناکام، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩

١٣- محەمەد ئەمین زەکی، خۆلاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، جلد أول، چاپخانەی دار السلام، بغدا، ١٩٣١ .

١٤- مستەفا شێخ نیعمەتوڵلا، جوگرافیای کوردستانی عێراق، گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ... ، بەغدا، ١٩٤٣ .

**عەرەبی**

١٥- أحمد حامد الصراف. الشبك، من فرق الغلاة في العراق. اصل الشبك، لغتهم، قراهم، عقائدهم، اوابدهم، عاداتهم. مطبعة المعارف، بغداد - ١٩٥٤

١٦– أحمد شريف الماريني، محافظة الحسكة، دراسة طبيعية تأريخية بشرية إقتصادية تحولات و أفاق مستقبلية، دمشق، ١٩٨٦

١٧– جاسم محمد الخلف (الدكتور) جغرافية العراق الطبيعية، الاقتصادية، البشرية، جامعة الدول العربية – معهد الدراسات العربية العالية، دار المعرفة، القاهرة، ١٩٦٥ .

١٨– خطاب صگار العاني، نوري خليل البرازي جغرافية العراق، بغداد، ١٩٧٩

١٩– دولت احمد صادق و محمد السيد غلاب و جمال الدين الديناصوري. الجغرافية السياسية، الطبعة الرابعة، القاهرة، ١٩٧٠

٢٠– رجاء وحيد دويدري جغرافية سورية و الوطن العربي، دراسة في الوضع الطبيعي و الكيان البشري والبناء الاقتصادي، دمشق، ١٩٨٢ .

٢١– لجمهورية العربية السورية، رئاسة مجلس الوزراء، المكتب المركزي للاحصاء، دليل الترميز الجغرافي وفق التقسيمات الادارية في الجمهورية العربية السورية، ١٩٨٠، دمشق، ١٩٨٠ .

٢٢– الجمهورية العربية السورية رئاسة مجلس الوزراء، المكتب المركزي للاحصاء، المجموعة الاحصائية لعام ١٩٨٧، دمشق، ١٩٨٧

٢٣– شاكر خصباك (الدكتور) الكر والمسألة الكردية، الطبعة الثانية، بيروت ١٩٨٩

٢٤– شاكر خصباك (الدكتور) العراق الشمالي، دراسة لنواحية الطبيعية و البشرية، مطبعة الشفيق، بغداد، ١٩٧٣ .

٢٥– صديق الدملوجي. امارة بهدينان الكردية، او امارة العمادية. مطبعة الاتحاد الجديدة، الموصل – ١٩٥٢

٢٦– عادل عبد السلام (الدكتور) جغرافية سورية، الجزء الاول، في الجغرافية الطبيعية و البشرية و الاقتصادية، دمشق، ١٩٧٣ . جغرافية سورية الاقليمية، القسم الثاني (الوحدات الجغرافية الطبيعية)، دمشق، ١٩٨٣ .

٢٧– عبدالرزاق الحسني، العراق قديما و حديثا، ط ٣، مطبعة العرفان، صيدا ١٩٥٨ .

٢٨– عبدالرحمن حميدة جغرافية سوريا البشرية، معهد البحوث و الدراسات الافريقية، قسم البحوث و الدراسات التأريخية و البشرية، مطبعة الجبلاوي، القاهرة، ١٩٧١

٢٩– عبدالله غفور، بيبلوغرافية كردستان، ستوكهولم، ١٩٩٤ .

٣٠– الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنوية، ١٩٨٩، بغداد، ١٩٨٩ .

٣١– كوردن هستد، الاسس الطبيعية لجغرافية العراق، ترجمة جاسم محمد الخلف، المطبعة العربية، بغداد، ١٩٤٨ .

٣٢– محمد أزهر السماك، البترول العراقي بين السيطرة الاجنبية والسيادة الوطنية. الموصل ٨٠– ١٩٨١

٣٣– محمد أمين زكي، خلاصة تأريخ الكرد و كردستان من أقدم العصور التأريخية حتي الآن. ترجمة محمد علي عوني، الجزء الاول، الطبعة الثانية، ١٩٦١ .

**فارسی**


٣٤- أحمد حسین عدل، أب و هوای إیران، چاپخانه‌ی دانشگاه، تهران، ١٣٣٩ .
٣٥- إیرج أفشار سیستانی إیلام و تمدن دیرینه أن، تهران، ١٣٧٣
٣٦- إیرج أفشار سیستانی کرمانشاهان و تمدن دیرینه أن، جلد أول، تهران، ١٣٧١ . جله دوم، تهران، ١٣٧١
٣٧- إیرج أفشار سیستانی نکاهی به خوزستان، تهران، ١٣٦٦
٣٨- جمهوری إسلامی إیران، سازمان برنامه و بودجه، مرکز أمار إیران، سالنامه أماری کشور، ١٣٧٣، تهران، ١٣٧٣ .
٣٩- جمهوری إسلامی إیران سازمان برنامه و بودجه، مرکز أمار إیران، سالنامه أماری کشور، ١٣٦٨، تهران، ١٣٦٩ .
٤٠- جمهوری إسلامی إیران سازمان برنامه و بودجه، مرکز أمار إیران، سرشماری عمومی نفوس و مسکن مهرماه ١٣٦٥، نتایج نهائی کشور، ٨، تهران، ١٣٦٨ .
٤١- جمهوری إسلامی إیران سازمان برنامه و بودجه، مرکز أمار إیران، سرشماری عمومی نفوس و مسکن مهرماه ١٣٦٥، نتایج نهائی، شهرهای کشور ٩، تهران، ١٣٦٨ .
٤٢- حبیب اله تابانی، بررسی أوضاع طبیعی أقتصادی و أنسانی کردستان، چاپ دوم، رضاییه، ١٣٥٨ .
٤٣- حبیب الله زنجانی - فریدون رحمانی راهنمای جمعیت شهرها إیران ١٣٣٥ - ١٣٧٠، تهران، ١٣٦٨ .
٤٤- حسن پیرنیا (مشیر الدوله)، ایران، باستان، جلد سوم، تهران ١٣١١ .
٤٥- حمد الله مستوفی نزهه القلوب، بأهتمام و تصحیح: گای لسترنج، تهران، ١٣٦٣
٤٦- دبیران گروههای أموزشی ، جغرافیای استانها جغرافیای کامل إیران، جلد أول، تهران، ١٣٦٦ .
٤٧- ربیع ودیعی (دکتر) جغرافیای مفصل إیران . جلد أول، جغرافیای طبیعی، جلد دوم، جغرافیای إنسانی. جلد سوم، جغرافیای إقتصادی. تهران، ١٣٦٧ .
٤٨- عباس جعفری شناسنامه جغرافیای طبیعی إیران، تهران، گیتاشناسی، بهمن ماه، ١٣٦٨
٤٩- عباس جعفری گیتا شناسی إیران، جلد أول، کوهها و کوهنامه إیران، تهران، گیتاشناسی، مهرماه، ١٣٦٨ .
٥٠- عزیزالله بیات، (دکتر). کلیات جغرافیای طبیعی وتاریخی ایران. تهران ١٣٦٧ .
٥١- علی أصغر نظری (دکتر) جغرافیای جمعیت إیران، تهران، ١٣٦٨ .
٥٢- فتح الله سعادت جغرافیای إقتصادی نفت إیران، جلد أول، چاپخانه‌ی پارس، تهران، ١٣٦٦ جلد دوم، چاپخانه‌ی پارس، تهران.
٥٣- کاظم ودیعی مقدمه ای بر جغرافیای إنسان إیران، طهران، ١٣٤٩ .
٥٤- مسعود کیهان جغرافیای مفصل إیران، ١ طبیعی، مطبعه مجلس، طهران، ١٣١٠ . جغرافیای مفصل إیران، ٢ سیاسی، مطبعه مجلس، طهران، ١٣١١ . جغرافیای مفصل إیران، ٣

إقتصادی، مطبعه مجلس، تهران، ۱۳۱۱
٥٥- نور محمد مجيدی   تأريخ و جغرافيای كوهگيلويه و برير أحمدی، تهران، ۱۳۷۱ .
٥٦- نور محمد مجيدی   تأريخ و جغرافيای ممسنی، تهران، ۱۳۷۱ .
٥٧- سيد يد الله نجفی   جغرافيای عمومی أستان كردستان، تهران، ١٣٦٩ . .

**رووسی**

٥٨- بەسیم دارکوت     جوگرافیای تورکیا، مۆسکۆ، ١٩٥٩
٥٩- ستار چنكۆڤ گ.ی.  دانیشتووانی کۆماری تورکیا، لێدوانێکی دیمۆگرافی - ئابووری، مۆسکۆ، ١٩٩٠ .
٦٠- شپاژینکۆف گ. أ. ئایینی وولاتەکانی ڕۆژئاوای ئاسیا، مۆسکۆ، ١٩٧٦ .
٦١- ڤاسیلۆڤ ب.ت.  ترانسپۆرتی تورکیا لە سەردەمی نوێدا، مۆسکۆ، ١٩٦٣ .
٦٢- کتێبی مارکۆ پۆلۆ، وەرگێڕانی لە تێکستێکی کۆنی فەڕەنسییەوە، مینایڤای. ن.، مۆسکۆ، ١٩٥٥ .
٦٣- مەتڤێیێف س، ن.   تورکیا (بەشی ئاسیایی - ئەنادۆڵیا)، وەسفێکی جوگرافیای سروشتی، مۆسکۆ، ١٩٤٦

**تورکی**

64- Abdullah Gafur (Dr.)  Kuzey Kurdistan’da Yerlsim yerleri 1980, Stockholm, 1994

65- T.C. Basbakanlık Devlet  istatistik Enstitüsü  Genel  nüfus  Sayımı  nüfusun sosyal ve Ekonomik nitelikleri 20.10.1985.

Adıyaman, Agrı, Bingöl, Bitlis, Diyarbakır, Elazlg, Erzincan, Erzurum, Gaziantep, Hakkari, Hatay,  Malatya, Kars, K.Maras, Mardin, Mus, Siirt, Tunceli, Urfa, Van.

66- T.C.  Basbakanlik Devlet   istatistik Enstitüsü, Tarımsal Yapi ve üretim 1988. Ankara, Ekim 1990.

67- T.C.  Basbakanlik Devlet  istatistik Enstitüsü, Turkiye  istatistik yıllıgı 1989. Ankara, 1989.

68-  Iktisadi Rapor, 1975, Ankara, 1975.

69- Iktisadi Rapor, 1978, Ankara, 1978.

70- Köy Envanter Etüdü 1981, Adıyaman, Agri, Bingöl, Bitlis, Diyarbakır, Elazlg,

Erzıncan, Erzurum, Gaziantep, Hakkari, Malatya, K.Maras, Mardin, Mus, Siirt, Tunceli, Urfa, Van.

71- Yurt Ansiklopedisi, cilt 1 -10, Istanbul, 1982 - 1984

**به ئینگلیزی و زمانەکانی دیکە**

72- Arab oil and Gas, directory, 1987, Beirut-1987.

73- “Bulletin du Center, detudes Kurds” Paris, 1948, no 6.

74- Demographic yearbook, 1989, N.Y., 1990.

75- Edmons C.J., Kurds, Turks andArabs, London, 1957.

76- Ethnic Groups in the Republic of Turkey, wisbaden, 1989.

77- LeStrange Guy, The lands of the Eastern caliphate, Cambridge, 1905.

78- Turkey yearbook, 1983, Ankara, 1983.

**نەخشە**

٧٨- إدارة المساحة العسكرية بدمشق، التقسيمات الادارية، سوريا و لبنان، مقياس ١٧٥٠٠٠٠، أيلول، ١٩٦٩ .

٧٩- أطلس إيران و جهان. سياسي، طبيعي، چاپ هشتم، تهران، ١٣٦٩ .

٨٠- نقشة عمومي، جمهوري إسلامي إيران، مقياس ٠٠٠ ٠٠٠ ١: ١

81- Euro Atlas, Euro- Road Atlas 1:800 000, Turkey Geocenter International Turkey Berlin 1990.

82- Türkiye Haritasi Ölcek 1:600 000, (Yurt Ansiklopdisi), Ankara 1982 - 1984.

83- Türkei Öst, 1:800 000.

84- World Map, world country map. 1:2 million, Iran.

85- World Map, World country map. 1:2 million, Middle East.

* * *

# پاشکۆ

| ڕەسمی | نارەسمی |
|---|---|
| ئاخلات | خەلات |
| ئاداق سوو | شبوق |
| ئاداقلی | ئازاک پەرت |
| ئادیەمان | سەمسوور، حوسنی مەستوور |
| ئاراس | ڤەلی بابا |
| ئاری چاک | میریڤان (میریڤان- قەرەبوغان) |
| ئازگەلە | ئەزگەلە |
| ئاش قەلا | بیرەستیک- دانیشمەنت |
| ئاغجەلەر | قەلاسیوکە |
| ئاغاچلی | جیکس |
| ئاغا چەلی | ئیلیجالار |
| ئافکنی | ئاڤگەنی |
| ئاقار سوو (ئەرزنجان) | ئالاکلیسە |
| ئاقار سوو (ماردین) | ئیستلیل |
| ئاق پەزار | پەری |
| ئاقچەپینار | ڤاسکوڤان |
| ئاق دەمیر | شەڤاک (ئاب شەکر) |
| ئاق شار | خاکیف |
| ئاقینجەلەر | توکاریس |
| ئاقینجی | قەسری قەلەندەران |
| ئاگری | کریداغ، قەرەکلیس، ئارارات، گلیاغ |
| ئالب قوزی | کامەریک (ئالیشو) |
| ئالتون کوزیری | پردق |
| ئالتین بەشاق | حەرران |
| ئایدینلەر (سیرت) | تیللۆ |
| ئوچ دام | ئەستیل |
| ئورفا | روحا، رحا |
| ئورمیە | ورمێ |
| ئوزون چایر | میلیکان |
| ئوزملو | چیمێ |
| ئوزپینار | خاسراس |
| ئوشنویە | شنۆ |
| ئوتلوک بەیلی | قەرەکولاک |

| | |
|---|---|
| ئۆچاغ باشی | سەلەپور |
| ئۆزتەباغ | گەرور |
| ئۆغوس (سیرت) | شیمیز |
| ئۆغوس (ئەرزنجان) | هۆغۆس |
| ئۆڤاباغ | کیلڤان |
| ئۆڤاجیق (ئورفا) | حاسانیک |
| ئۆڤاقیشلە | پورخوس |
| ئۆمجەلی | کیرانلیک |
| ئۆمەرلی | مەحسەرتێ، رەشمیل |
| ئۆبالی | دەلڤی قاسیر |
| ئەحمەتلی | گوران، پیر ئەحمەد |
| ئەربیل | هەولێر |
| ئەرزنجان | ئەرزگان |
| ئەرغانی | عوسمانی |
| ئەروهـ | ئێرون، دهێ |
| ئەغیل | گێل |
| ئەقچەسیر | هیلن |
| ئەسەندەرە | باژێرگە |
| ئەشاغی کولوشاغی | موشار |
| ئەلازیغ | ئەلعەزیز، خەرپوت |
| ئەلبیستان | ئەلبستان |
| ئەلبەیراق | دەرکوێ |
| ئەل بەیلی | عەلی مەنتار |
| ئەلەشکیرد | ئەلەشکرد |
| ئیچ پینار | فەهران |
| ئیدیل | هەزەخ، ئەزەخ |
| ئیغدیر | ئیدر |
| ئینزل | عەنزل |
| باباجانی | باوەجانی |
| باتمان | باتمانێ، یلەح |
| باتوفە | باتیفا |
| باخچە سەرای | موکوس |
| باشاری | ئالۆس |
| باش ینار (ئەرزنجان) | باش ڤارتەنیک |
| باش پینار (سیرت) | ئارانس |
| باش یورت | لە هانی ژێری |
| باش یۆل | ساهان تیل |

| | |
|---|---|
| باغ پینار | چالگان |
| باغ دەرە | باشنیک |
| باغ گوتیز | عەینی لودی |
| باغ لیجە (سیرت) | حوسەینی - سیهیان |
| باغ لیجە (مەلاتیە) | مەستیکانی ژێری |
| باغی شلی | هۆزەکان، هۆزەکیان |
| بالابان | کەرعتەر |
| بال پەیام | دەشت |
| بایجایری | خارقاز |
| بایکان | هاوتل |
| بوغولو | چیهیک- تۆرشۆمەک |
| بولانیک | کۆف |
| بویوک ئارموتلو | ئارمودانامەزن |
| بویوک تیزرت | هەقیس |
| بۆزغلاک | ئیختیکی ژێری- ئیحتیک-سوفلا. |
| بۆلوک یازی | کولتوک- هیڤرس |
| بەرتلە | بەرتللی |
| بەسنی | بیتسنی |
| بەشیری | بشیری، قوبینێ |
| بەعشیقە | باشیکە |
| بەغدەش | ڤەک |
| بەلۆزەن | بەلڤەردن |
| بیتلیس | بدلیس- بتیلیس، بیتریس،بلیس |
| بێجار | گەروس |
| بینگۆل | بنگول، چەپاقچور، چەولیک |
| بێباز | پێراز |
| پازار جیک | پازار چخ |
| پالو | پالۆ، پالی، پالەو |
| پەرتەک | پورتەک |
| پەرقاری | پەرواریا |
| پەیاملی | پەیسوی ژێری |
| پیرانشەهر | خانێ |
| پینارلەر | قاسگیرت (باشاڤەنک) |
| تاتوان | توختەوان |
| تاجرلی | داغیر مەنۆچاغی |
| تاش دەلەن | موتمور |
| تاشلی چای | ئەڤ گەڤیر |

| | |
|---|---|
| توتاق | توتاخ |
| تورک ئۆغلۆ | کورد ئۆغلۆ |
| توزخورماتوو | دوز |
| توزلەگوێزە | مەلەفان |
| تونجەلی | دەرسیم، دێرسیم |
| تەپە | هرامکی |
| جوانرود | جوانرۆ |
| جەلەولا | قەوغان ، گولالە |
| جەویزلیک | بۆمیات |
| جەیلان پینار | رەسولعەین |
| جیزرە | بۆتان، جزیری |
| چاغلەرجە | پەیک ئاموتکە ، پەیک ئاموتکان |
| چاغلەیان | جەنجیکە |
| چاکیر خویوک | کەیسون |
| چالدێران | بایەزید ئاغا |
| چاملی دەرە | مەرجیحان |
| چای باغی | قەرەچور، قەرەچور- چوقور |
| چای تەپە | ڤالیر |
| چای لەر | ئوستوکران، ئۆستوکراتا مەزن |
| چای لەز باشی | هەرهەری |
| چۆلاقلی | جیباس |
| چومە چای | چەمی چەتۆ |
| چۆلەمێرگ | جۆلە مێرگ |
| چەتەل چەم | زەڤکەر |
| چەتەل ئەرموت | ئەسەسی |
| چەتەک کۆپرو | مەلایادی |
| چەرمیک | چەرمک، چەرموک |
| چەمشگەزەک | چەموشگەزەک |
| چیغلی | ئاشوتە |
| حازرۆ | تەرحیل |
| حەریر | هەریر |
| حەسەن کێیف | حەسکێفێ |
| حەکیم خان | حەکیم خانی |
| حەلەبچە | هەڵەبجە |
| خان کەندی | خان کۆی |
| خدر بابە | بالیبەی، دیشیدی |
| خنس | خەنوس |

| | |
|---|---|
| خیزان | قەزاخزان، خێزان، قەسان |
| خەبەرلی | باش پینار |
| خەرمانلی | بەرواریا مەزن |
| دارگەجیت | کەربوران، عەجیبێ |
| داریکەنت | موهوندو |
| داغ باشی | قەرەخان |
| داغ لیجە | ئۆرامار |
| داغ یۆلۆ | شەتەری |
| داملاجیک | تافس- ئالوت |
| دبس | دوبز، دوبس |
| دوتلوجە | ئاشوتکە |
| دوملو | خنس |
| دۆرتای | تاش رومی |
| دۆغان بەیلی | ئەرمەلیک |
| دۆغان پینار | هارال |
| دۆغان جە | خاربور- کەزیل |
| دۆغان دەرە | ئەسیرگاه |
| دۆغان سوو | سوڵتان موت |
| دۆغان یۆڵ | کەفەردز |
| دۆغو بایەزید | بازید |
| دەرباسیە | دەربێس |
| دەرە | رومیکغ |
| دەرێک | دێریکا چیایێ مازێ |
| دەللی باخچە | ئێرەس |
| دەلی چای | کەرتیس |
| دەمیرجی | سەرگیرتی |
| دیاربەکر | ئامید، ئامد |
| دیجلە (دیاربەکر) | پیران |
| دیجلە (سیرت) | کۆسەپینار، ئۆمەرین |
| دیڤریکی | دویریکی |
| دیلەق تەپە | مینار- زەلیکار |
| دێهلۆران | دێلۆران |
| رەسولعەین | سەری کانی |
| رێدار | رێدەر |
| سارای | مەحمودی کازم پاشا |
| ساری سوو | ئاق تەپە |
| ساری قۆناغ | دوهان |

| | |
|---|---|
| ساسۆن | قابل جەوس |
| ساغینلی | سیمۆس |
| ساکچاکوزە | کە فەردز |
| سانجاق | خۆشکار |
| ساوات | خەزان |
| ساڤور | سیتەورێ |
| سنجار | شەنگار، شنگال، ژەنگار |
| سوتلوجە | توللوک |
| سورگوجو | عەوینە |
| سولەیمانلی | زەیتێ |
| سولوجام | موسون |
| سۆغوتلو | چای- تەپە |
| سولخان | بورگیلان |
| سەرپۆلی زەهاب | سەرپێلی زەهاو، زەهاو |
| سەرڤی | سیڤان |
| سەرمان- سوویو | ئەدرەمیت |
| سەرین | سەرمێن |
| سەعدیە | قزل رەبات، گولالە |
| سەلاحەدین | سەربەن |
| سەمسات | سەمیساد |
| سەنەندج | سنە، سنەدژ |
| سیرت | سیرتێ، ئەسعرد، سعرد، سعرت |
| سیڤەرەک | سێورەگی، سیورک |
| سیلڤان | میافارقین، فارقین |
| سیلۆپی | سیلۆپیا |
| شان یۆرت | دیر بێسێ، دەرباسیە |
| شەکەرلی | قەرەچەڤیران |
| شەمدینلی | شەمدینان |
| شەهربازار | شاربازێر |
| شەهید نوسرەتبای | نوسرەتیە (خەرابە رەش مەنگوش) |
| شیرناق | شێرنەخ، شرنەخ |
| شێخ حەدید | شێخۆ |
| عادیلە جەواز | شاباز، ئەلجەواز |
| عاسی | ئاسهێ، ئاسە |
| عەشایەر | ئاوکور |
| عەقرە | ئاکرێ |
| عەمادیە | ئامێدی |

| | |
|---|---|
| عەینكاوە | عەنكاوە |
| عەینولعەرەب | كۆبانی |
| فوزی پاشا | كەللەر |
| ڤارتۆ | گوم گوم |
| ڤازیلەر پەرناڤوت | پەرناڤوت |
| ڤامشلی | ڤامشلۆ، ڤامشلۆك |
| ڤاپاپینار | ئەنكاڤۆ |
| قرمزی كۆپرو | دانزیك |
| قزل تەپە | قزسار، تەل ئەرمەن، قەزێ |
| قزل سرو | شێخەرەش |
| قوش سەرای | بەكر حوسێن |
| قولپ پاسورر | پاسورر |
| قۆچە پینار | ئاغیل |
| قۆچەتەپ | مەشكینان |
| قۆچە قۆچ | پاە |
| قۆناغ كوران | دوغنوك |
| قەحتانیە | ترپاسپی |
| قەرەنۆغلان | كاك بیل |
| قەرەجەداغ | قیرژداغ، قایناك |
| قەرەقۆچان | دەب |
| قەرەكاچی | میزار |
| قەلعەدزە | قەلادزێ |
| كارلۆڤا | كانی رەش |
| كاغیزمان | فاخیزمان |
| كاهرەمان مارش | مەرعەش، گورگوم |
| كاپپاك | سەردار |
| كرمانشاە | كرماشان |
| كرند | كرێند |
| كوچوك سرو | كۆتۆم |
| كوچوك كەندیرجی | مورشید پینار |
| كورتەلان | مسرج |
| كولی | گرللی |
| كوير | گوێر |
| كۆیسنجق | كۆیە |
| كۆپروكۆیۆ | چۆیان دەدە |
| كۆزكوت | تیل |
| كۆزلوك | حەزۆ |

| | |
|---|---|
| گەندیللی | قەرەبویک- خانلەر |
| کەڤاک باشی | خویوت- تاپ |
| کەیاجیک | خەزان- ساڤات |
| کیغی | چتغی |
| کیرک گەچیت | قەسریک |
| کیلیس | کلیس، کلز، کیلس |
| گازی ئانتەب | دیلۆک |
| گۆرزی ماک | چوقور |
| گوزەل سور | خوشاپ |
| گوزەلی | برینگیل- مەرجومەک |
| گوڵ جوک | تیل فیتەس |
| گوڵ دوزو (بدلیس) | ئارین |
| گوڵ دوزو (گازی ئانتەب) | ئیسپاناک- ئوئیوچ |
| گۆڵ یۆرت | تیللو |
| گوموش دەرە | ئەدرەمیت |
| گوینویک | ئۆغنوت |
| گوموشاکار | قۆچگیر، ئاسکی قۆچگیر |
| گۆک دەرە | ئەردیروک |
| گۆک سور | قۆچان |
| گەچساران | دۆگۆیەندان |
| گەچیتلی | لیڤین - پیانیس، پیانیس |
| گەدیک بولاق | جانیک |
| گەدیکلەر | گەرمیلی |
| گەرجوش | کەرجەوس |
| گەرمەلی | گیرێ میرە |
| کەنج | داراهێنێ |
| کەپیک پیناری | کۆلانیس |
| کەپیک سویو | سێ- دەشت، سێ |
| ماردین | میتردین |
| مازی داغی | شەمردخ |
| مالکیە | دیرک |
| مانگیش | مانگیشک |
| مورات | زیرۆ |
| موسابەیلی | مورات خوبوغو |
| موتکی | مۆتکا |
| مەرجیمە قەلا | ئاکجان، ساڤاکی |
| مەزرەع | دانزیک |

| | |
|---|---|
| مەعدەن | پاخر مەعدەن |
| مەلاتیە | مەلەدی |
| مەلازگیرت | میلازگیر |
| مەهاباد | سابلاغ |
| میاندوئاب | میاندواو |
| میقدادیە | شارەبان |
| ئارلی (وان) | گیرەسوور |
| ئارلیدەرە | قاسریک |
| ئوسەیبین | نیستیبین، میتسیرینین |
| ئەقەدە | ئەغەدە |
| ویرانشەهر | ڤەرەنشەهر |
| هانی | هینێ، پالی مەعدەن |
| هەکاری | حەکاری |
| هەمزەلی | بەهمەندان، شێخ هەمزە |
| یاربوز | جەبەل |
| یاربوزلو | بیریشمە |
| یاردیمجی | سوورمەتار(جابیرول ئەنسار-زیارەت) |
| یاشیل کەند | ئەرزین |
| یاشیل یازی | زەرەنیک |
| یاکاجیک | پاڤاز- قەرەجامی |
| یالینجە | دیمکۆی |
| یاماچ | موسون |
| یانارسوو | گارزان- زۆک |
| یایغین | زیارەت |
| یاییلاق | بۆزیکی |
| یاییلا | تاڤسانال- حوسەینان |
| یاییلادەرە | چۆنەک (خولخول) |
| یاییلا کەند | گولەباغ |
| یوجە باغ | جاساس |
| یۆل بویۆ | پیرین جیک |
| یوکاری سەلات | سەلاتە ژووری |
| یەدی سوو | چەرمە |
| یەلکەنلی | رەشادیە |
| یەنی سوو | ئەدەرەن- جانوت |
| یەنی باشاک | ئەردوشین |
| یەنی کۆی | یەنیجە قەلا |
| یۆنجەلی | بیریک |